# فەرموودە (صحیح)ەکانی

# پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)



**هەندێک لەبابەتەکان**

باسی یەکخواناسین و جۆرەکانی
ناو و سیفەتەکانی خوا
موعجیزەی پێغەمبەر
باسی نوێژ
النية - الاخلاص - الرياء
باسی غەیبەت
قضاء الحوائج
باسی زیکر
دایک و باوک
باسی ئافرەت
كتاب الجنائز
باسی دەججال
باسی بەهەشت

بەئەنقەست هیچ فەرموودەیەکی (ضعیف)م لەم کیتابە دانەناوە

ئەو فەرموودانەی لەپێش (رواه) نوسراوە (صحیح) یا (حسن) ئەمانە بە تەحقیقی شێخ ئەلبانین

عبدالحكيم حسن

مەحوی 2
چاپی دووەم
١٤٣٤ك - ٢٠١٣ز

# فەرموودە(صحيح)ەكانی

# پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

بەئەنقەست هیچ فەرموودەیەكی
(ضعیف)م لەم كیتابە دانەناوە

ئەو فەرموودانەی لە پێش (رواه)
نوسراوە(صحیح) یا (حسن)
ئەمانە بە تەحقیقی شێخ ئەلبانین

## هەندێك لەبابەتەكان

باسی یەكخواناسین و جۆرەكانی
ناوو سیفەتەكانی خوا
موعجیزەی پێغەمبەر
باسی نوێژ
النية –الاخلاص- الرياء
باسی غەیبەت
قضاء الحوائج
باسی زیكر
دایك و باوك
باسی ئافرەت
كتاب الجنائز
باسی دەجاڵ
باسی بەهەشت

نووسینی:
عبدالحكيم حسن

چاپی دووەم ١٤٣٤ك -٢٠١٣ز

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إنّ الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوُذ بالله من شرور انفسنا وسيئات اعمالنا، من يهده الله فلا مُضِلَّ لَهُ ومن يُضلل فلا هادي لَه، واشهد ان لا إله إلا الله وحدهُ لا شريك لَهُ، واشهد ان محمداً عبدهُ ورَسولهُ...

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ (آل عمران:١٠٢)

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ (النساء:١)

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا

﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا﴾ ( الأحزاب: ٧٠-٧١)

أما بعد..... فانّ أصدق الحديث كتابُ الله، وخير الهدى هدى (محمد) (ﷺ) وشر الأُمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة وكُل ضلالة في النار.

ئەم نوسراوە وانەبێت هەر سەرپێییەك نوسرابێتەوە بەڵكو ماندووبوونێكی چاكی لەگەڵدا كراوە وەزۆر هەوڵم داوە بەشێوەیەكی زانستیانە بنوسرێتەوە. زۆر مەبەستم بووە كەئینسانە سەرەتاییەكانیش بەئاسانی سوودی لێ وەربگرن بۆیە بەشێوەیەكی ئاسان نوسراوە.

ئەو فەرموودانەی كەلەپێش (رواە) نوسراوە (حسن) یا (صحیح) ئەمانە هەمووی بەتەحقیقی شێخ ئەلبانین.

بەزۆری ئەو فەرموودانەی بوخاری و موسلیم ریوایەتیان كردووە تەنها ناوی ئەوانم بردووە هەروەك ئیمام نەواوی لە (ریاض الصالحین) وای كردووە.

مەرج وانییە كەلەریوایەتی فەرموودەكان ناوی یەك راوی یا دوو راوی یا زیاترم هێنابێت هەر ئەوەندە ئەم فەرموودەیان ریوایەت كردبێت، بەڵكو دەتوانم بڵێم هەموو فەرموودەكان یا زۆربەی فەرموودەكان ئی تریش ریوایەتیان كردووە.

بەئەنقەست هیچ فەرمووودەیەکی (ضعیف)م لەم نوسراوەدا دانەناوە.

وە لەژێر ناو و نیشانی (سوود) گەلێ روونکردنەوەو بابەتی بەسوود نووسراوە.

وەهەتا حەددێکیش قولْ نەبویمەوە لەو بابەتانەی خیلافیان لەسەرە.

هیوادارم ئەم کیتابە بدرێ بەئینسانە سەرەتاییەکان بۆ زیاتر شارەزابوونیان لەئایین، وەئەگەر بەدەرسیش خوێنرا مامۆستا تەنها فەرموودەکان لێك بداتەوە دانە دانە فەرموودەشی لێ لەبەر بکرێ.

داواکارم لەخوا ئەم نوسراوە نەبێتە مایەی توورەیی خوا بۆم بەڵکو ببێتە مایەی خێر و بێرێکی زۆر و دەربازبوون لەدۆزەخ بۆ خۆم و بۆ ئەوانەش کەسوودی لێ وەردەگرن.

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه ومن تعبه بإحسان إلى يوم الدين.

# العقيده - بيروباوەڕ

## روكنەكانى ئیمان و ئیسلام

عن عمر بن الخطاب(رضي الله عنه) قال: بينما نحنُ جلوسٌ عند رسولِ الله(صلى الله عليه وسلم) ذات يوم، إذْ طلعَ علينا رَجُلٌ شديدُ بياضِ الثيابِ شديدُ سَوادِ الشَّعرِ، لا يُرى عليهِ أثرُ السَّفر، ولا يَعرفُهُ منّا أحَدٌ، حتّى جَلَسَ إلى النبيِّ(صلى الله عليه وسلم) فأسْنَدَ رُكبتَيهِ إلى رُكْبَتَيهِ، ووَضَعَ كفَّيهِ على فَخِذَيْهِ وقال يا محمد أَخْبِرني عنِ الإسلامِ؟

فقال رسول الله(صلى الله عليه وسلم) الإسلام أنْ تَشْهَدَ أَن لا اله الا الله وأنّ محمداً رسولُ اللهِ وتُقيمَ الصَّلاةَ، وتُؤْتِيَ الزكاةَ، وتَصُومَ رمضانَ، وتَحُجَّ البيتَ إن اسْتَطعْتَ إليهِ سبيلاً. قالَ: صَدَقْتَ.

قال: فعجبنا له يَسأَلُهُ ويُصَدِّقُهُ.

قالَ: فَأَخْبِرني عَنِ الإيمان؟

قال: أَنْ تُؤْمِنَ بالله، وملائكتهِ، وكُتُبهِ، وَرُسُلِهِ، واليوم الآخر، وتُؤْمنَ بالقَدَرِ خيرهِ وشَرّهِ قال: صدقت.

قالَ: فأَخْبرني عَنِ الإحسان[1]؟

قالَ: أنْ تَعْبُدَ اللهَ كأنّكَ تَراهُ فَإنْ لَمْ تَكُنْ تراهُ، فإِنَّهُ يراك.

قالَ: فَأَخْبرني عَنِ السَّاعةِ؟

---

(1) اخبرني عن الاحسان: الاحسان اتقان العبادة وأداؤها على اكمل وجه.

قالَ: ما المسؤُلُ عنها بأعلمَ مِنَ السَّائِل.

قالَ: فَأَخْبِرني عَنْ أمارتِها؟

قالَ: أن تَلدَ الأمَةُ ربَّتَها[1]، وأنْ ترى الحفاةَ العراةَ العالةَ رِعاءَ الشّاءِ يتطاولون في البنيان. ثُمَّ انْطَلَقَ فلبثتُ مليّاً ثُمَّ قال: يا عُمَر اتدري مَن السائلُ؟

قلتُ الله ورسولُهُ أعلمُ.

قالَ: فإنَّهُ جبريلُ أتاكم يعلمكم دينكم. **رواه البخاري(٥٠) ومسلم(٨).**

**إذْ: حەرفی(مفاجأة) يە(إذ طلع) لە ناكاوێك بەدەركەوت.**

**أمَارَات: كۆيە، تاكەكەی(أمارة)يە، واتە: نيشانە.**

**تَلِدَ: ببيبی.**

**الامَة: كنيزە(جارية) ئەمە بۆ ئافرەتە بۆ بەرامبەرەكەی پياو(عبد)ی بۆ بەكار دێت، ئەوانەی لە كاتی خۆی دەكڕان و دەفرۆشان.**

**ربّتها: واتە(سيّدَتها) گەورەكەی.**

**الحفاة: كۆی ووشەی(حاف)ە واتە: پێ خواس.**

**العراة: كۆی ووشەی(عار)ە واتە: رووت.**

**العالة: كۆی ووشەی(عائل)ە واتە: هەژار.**

---

**(1) ان تلد الامةُ ربتها/ وذلك كناية* عن كثرة الفتوحات الاسلامية/ وكثرة السراری وهن الإماء فتلد ولداً يكون سيدها لأنه ابن سيدها او كناية عن كثرة العقوق فيعامل الولد معاملة فيها جفاء كأنه سيدها وكلا الامرين قد كان.**

رعاء: كۆی(راع)ە واتە: شوان.

الشاء: كۆی(شاة) واتە: مەڕ.

يتطاولون في البنيان: واتە: يتفاخرون بارتفاع المباني وعلوها، یانی شانازی دەكەن لەسەر یەكتر بە بەرزی بنایەكانیان.

ثُمَّ: لە پاشان.

إنطلقَ: ڕۆیشت.

لَبِثْتُ: مامەوە.

ملياً: یانی(زماناً طويلا) واتە: كاتێكی درێژ كە سێ ڕۆژ بوو.

السائل: پرسیار كەر، بەڵام(مَسْؤُل) پرسیار لێ كراو.

أَتاكُمْ: هاتە لاتان. بەڵام(آتاكُمْ) واتە: بۆی هێنان.

*كناية: واتە شتێك لە بری شتێك بەكار هێنان.

واتە: گێردراوەتەوە لە عومەری كوڕی خەتتاب(ڕەزای خوای لێ بێت) كە فەرموویەتی: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوین لەنكاوێك پیاوێكمان لێ بەدەركەوت جل و بەرگی زۆر سپی بوو مووی زۆر ڕەش بوو نیشانەی ڕێبوارانی لێ نەدەدیترا وە هیچ كەسیش لە ئێمە نەیدەناسی تا هات لە لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشت هەردوو چۆكی(ئەژنۆی) خۆی بە هەردوو چۆكی پێغەمبەر(ﷺ) نووساند وە هەر دوو دەستەكانی خۆی لەسەر هەردوو ڕانەكانی خۆی دانا وە گوتی ئەی محمد هەواڵم بدەرێ لە بارەی ئیسلامەوە واتە ئیسلام چی یە؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئیسلام ئەوەیە كە شایەتی بدەیت هیچ پەرستراوێكی بەراستی نی یە تەنها(الله) نەبێت وە(محمد) ڕەوانە كراوی خوایە، وە نوێژ بكەیت، وە زەكات بدەی، وە مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بیت،

وە حەجی ماڵی خوا بکەیت ئەگەر توانیت. پیاوەکە گوتی راست دەکەی.

(امام عومەر) رەزای خوای لیٚ بێت دەڵیٚ: سەرمان لەو پیاوە سوڕمابوو هەر خۆی پرسیاری دەکرد هەر خۆشی دەیگوت راست دەکەی پیاوەکە گوتی: پێم بڵیٚ ئیمان چی یە؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:

ئیمان ئەوەیە: باوەڕت هەبیٚ بە خوا، بە فریشتەکانی، بە کتێبەکانی، بە پێغەمبەرەکانی، بە رۆژی دوایی، وە باوەڕت هەبیٚ بە قەزاو و قەدەر خێرو شەری، پیاوەکە گوتی راست دەکەی.

پیاوەکە گوتی: پێم بڵیٚ چاکە(الاحسان) چی یە؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چاکە ئەوەیە کە بە شێوەیەك خوا بپەرستیت وەك ئەوە بیبینی وا بیٚ، خۆ ئەگەر تۆش ئەو نەبینی ئەوا ئەو تۆ دەبینێت.

پیاوەکە گوتی: پێم بڵیٚ کەی رۆژی دوایی دێت؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پرسیار لیٚ کراو لە کاتی هاتنی رۆژی دوایی زاناتر نییە لە پرسیار کەر(واتە من زاناتر نیم لەو بارەوە لە تۆ).

پیاوەکە گوتی: پێم بڵیٚ نیشانەکانی کاتی هاتنی رۆژی دوایی چی یە؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کنیزە(جاریە) گەورەی خۆی ببی، وە ببینی پیاوی پێخواس و رووت و هەژار شوانی مەران شانازی لەسەر یەکتر بکەن بەبەرزی و جوانی کۆشك و تەلارەکانیان ئیمام عومەر(رەزای خوای لیٚ بێت) دەڵیٚ: لە پاشان پیاوەکە رۆیشت ماوەیەکی زۆر مامەوە[1]، لە پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەی عمر دەزانی ئەوە کیٚ بوو پرسیار کرد؟ گوتم خوداو پێغەمبەرەکەی دەزانن پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە(جبریل بوو

(1) کە سیٚ رۆژ بوو.

هاتە لاتان بۆ ئەوەی دینتان فێر بکات.

## سوود

**١-ئەرکانی ئیمان شەشن:**

١-ئیمان بە خوا.

٢- ئیمان بە فریشتەکان.

٣- ئیمان بە کیتابەکانی خوا.

٤- ئیمان بە پێغەمبەران.

٥- ئیمان بە رۆژی دوایی.

٦- ئیمان بە قەزاو قەدەر.

**٢- ئەرکانی ئیسلام پێنجن:**

١- شایەتمان.

٢- نوێژ.

٣- زەکات.

٤- رۆژووی مانگی رەمەزان.

٥- حەج.

٢- عن عبدالله بن عمر بن الخطاب(رضي الله عنهما) قال: سمعتُ رسولَ الله(صلى الله عليه وسلم) يقولُ: بُنيَ الإسلامُ على خمسٍ: شهادةِ أَن لا اله الا الله، وأَنَّ محمداً رسولُ الله، وإقام الصلاةِ، وايتاءِ الزَّكاةِ، والْحَجِّ، وصَومِ رمضانَ. رواه البخاری (٨) ومسلم(١٦) والترمذي(٢٦٠٩).

واتە: ئیسلام دامەزراوە لەسەر پێنج شت: شایەتمان و نوێژکردن و زەکات دان و حەجی ماڵی خواکردن و بەرۆژوو بوونی مانگی رەمەزان.

# باسی یەکخوا ناسین(توحید)و جۆرەکانی

١-عن معاذ بن جَبَلٍ(رضي الله عنه) قال: بَعَثَني رسولُ اللهِ(صلى الله عليه وسلم) قالَ: إنَّك تأتي قوماً مِنْ أهلِ الكتابِ فادْعُهُم إلى شهادةِ أن لا اله الا الله وأني رسولُ اللهِ فإنْ هم أطاعوا لذلك فأعْلِمْهُمْ أنَّ الله افترضَ عليهم خَمْسَ صلواتٍ في كُلِّ يومٍ وليلة، فإن هُمْ أطاعوا لذلك، فأَعْلمْهُم أنَّ اللهَ افترضَ عليهم صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أغنيائهم فَتُرَدُّ في فقرائهم فإنْ هُمْ أطاعوا لذلك فإيّاكَ وكرائمَ أموالهم، واتَّقِ دَعْوَةَ المظلومِ فإنَّهُ ليست بينها وبين اللهِ حجاب. رواه البخاري(١٤٩٦) ومسلم(١٩).

١- لا اله الا الله: هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نییە بێجگە لە خودا. وە لا اله الا الله پێ ی دەوترێ(كلمة التوحيد) ووشەی یەکخوا پەرستی.

٢- ايّاكَ: إسمي فيعلي ئەمره- واتە: خۆت بپارێزە وە(إيّاكم) واتە: خۆتان بپارێزن.

٣- الكرائم: كۆی(كريمة)يە واتە:(نفيسة) یانی: بەنرخ.

٤- اتَّقِ: واتە:(تَجَنَّبْ) یانی: خۆت بپارێزە

**مانای فەرموودەکە:**

موعاذی کوڕی جەبەل(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) منی نارد بۆ(یەمەن) فەرمووی: تۆ دەچیە لای قەومێك کە ئەهلی کیتابن، (لەیەکەم جاردا) بانگیان بکە بۆ شایەتی دان بەوەی کە هیچ پەرستراوێکی

بەڕاستی نی یە بێجگە لە خودا، وە من ڕەوانە کراوی خوام، جا ئەگەر ئەمەیان گوت ئەوە پێیان بڵێ کە خودا لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون، جا ئەگەر بۆ ئەمەش گوێ رایەڵ بوون پێیان بڵێ: کە خودا زەکاتی لەسەر فەرز کردوون لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ دەدرێتەوە بە هەژارەکانیان، جا ئەگەر گوێ رایەڵ بوون بۆ ئەمەش، خۆت بپارێزە لەوەی نایابی سامان و ماڵەکانیان هەڵبژێری لە باتی زەکات بیبەی، وە خۆشت بپارێزە لە دوعاو پاڕانەوەی ستەم لیٚ کراو چونکە لە نێوانی ئەو و خودا هیچ پەردەیەك نی یە.

## سوود

(توحيد) لە زمانەوانیدا واتە: کردنەیەك چۆن لە دوعادا دەڵێ ی (اللهم وَحّد صفوفنا) واتە: خوایە ریزەکانمان بکە بەیەك، ووشەی(توحيد) چاوگ(مصدر)ە وەك ووشەی(تَجْويد، تَرْتِيل، تَهذِيب) ماضيەکەی(وَحَّدَ، يُوَحّدُ)وە، بەلاّم پێناسەی(توحيد) لە شەرع دا ئەوەیە، (هو افراد الله سبحانه بما يختص به من الربوبية والألوهية والاسماء والصفات) واتە:(توحيد) لە شەرع دا بریتی یە: لە خوا بە تاك ناسین لەوەی کە تایبەتە بە ئەو لە پەروەردگارێتی و پەرستراویتی و ناوەکان و سیفەتەکان.

## یەکخوا ناسین (توحيد) دابەش دەبێ بۆ سێ بەش:

**یەکەم: تَوْحِيْدُ الرُّبُوبِيَّة (<u>یەکخوا ناسین لە پەروەردگارێتی دا</u>) توحيد الربوبية:**

وَهُوَ عِبارَةٌ عَنْ إفرادِ اللهِ تعالى في ثلاثةِ أُمور في الخلق و الملْكِ

والتَّدبير.

واتە: یەك خوا ناسین لە پەروەردگاریّتیدا بریتییە لە خوا بە تاك ناسین لە سیّ شتان لە دورست کردن و خاوەنایەتی و بەرێوەبردن. کەواتە:(توحيد الربوبية) بەم شیّوەیە:

١-بڕوابوون و داننانە بەوەی کە خوای گەورە تاکە بەدیهێنەری بەدیهێنراوەکانە وەك دەفەرموێ(اللهُ خالقُ كلِّ شيءٍ) (الزمر-٦٢). واتە: خودا بەدی هێنەری هەموو شتێکە.

٢- بڕوا بوون و داننانە بەوەی کە خوای گەورە تاکە خاوەنی هەموو شتێك هەر ئەوە.

٣- بڕوا بوون و داننانە بەوەی کە خوای گەورە تاکە بەرێوەبەری هەموو بەدیهێنراوەکانە وەك دەفەرموێ(يُدبِّرُ الأمر) واتە: هەموو کارو باریّ هەڵدەسورێنیّ.

دووەم: (تَوْحِيدُ الأُلُوهِيَّة)یەك خواناسین لەپەرستراویّتیدا.

ئەم جۆرە(توحيد)ە بەم شیّوەیە واتە: بوونی بڕواو دان نانە بەوەی کە خوای پەروەردگار تاکە پەرستراوی راستەقینەیەو شایانە. ئەم جۆرە(توحيد)ە (التوحيد العبادة)یشی پیّ دەوترێت. (التوحيد العبادة) واتە: ئەنجام دانی هەموو جۆرەکانی پەرستن لە وتەو کردەوەی دەرو دەرون بەتەنهابۆ خواو هاوەڵ وهاوبەش دانەنانە[1] بۆی، خوا دەفەرمووێ﴿ وَإِلَـٰهُكُمۡ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحۡمَـٰنُ ٱلرَّحِيمُ﴾(البقره-

(1) ئەم وشەیە (دانەنانە) لەچاپی یەکەمی ئەم کیتابە نووسراوە (دانانە) تکایە راستی بکەوە، واتە بیکە (دانەنانە).

١٦٣)واتە:وەپەرستراوی ئێوە پەرستراوێکی تاك و تەنهایە هیچ پەرستراوێکی راستەقینە نی یە بێجگە لەو کە بەخشندەی میهرەبانە.

وە خوا دەفەرمووێ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ﴾ (الانبياء:٢٥) واتە: وە ئێمە نەمان ناردووە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێك مەگەر نیگامان بۆ ناردووە(بەوەی کە بێگومان جگە لە من هیچ پەرستراوێك نییە کەواتە تەنها من بپەرستن.

## ٣- تَوحِيدَ الأَسْمَاءِ وَالصِّفَات: يەکخوا ناسین لە ناو و سیفەتەکانیدا.

واتە: بڕوا بوون و داننانە بە تەواوی ناوو سیفەتەکانی خوای گەورە رەت نەکردنەوەیان بەم شێوەی کە لە قورئان و سوننەت دا هاتوون و باسیان لیٚ کراوە بە بیٚ(تحریف و تعطیل و تکییف و تمثیل).

### (أ) (تحريف) گۆڕین:

ئەوەیە کە عەینی ووشەی ناوو سیفەتەکانی دەستکاری بکرێن بەکەم و زیاد کردن یاسەرو بۆڕو ژێرگۆڕین وەك ئەوە کە هەندێك لەوانە ویستوویانە سیفەتی قسەکردن لە خودادا لابەرن ئایەتی﴿وَرُسُلًا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلًا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمًا﴾ (النساء:٦٤) ئەم بەشە ئایەتەیان بەم شێوەیە خوێندۆتەوە(وَكَلَّمَ اللهَ مُوسَىٰ تَكۡلِيمًا) واتە: ووشەی(الله) کە بۆری

هەیە سەریان بۆ داناوە یاخود ووشەکانی دەستکاری نەکرێن بەڵام بە شێوەیەك مەعنایان لێ بدرێتەوە کە بێ نێوەرۆك بن وەك ئەوانەی کە هەر کام لە(وجه، یدین، استواء، نزول، غضب، رضی) بە جۆرێك(تأویل) دەکەن کە مەعنای ئەسڵی یان نامێنێ.

(ب) (تعطیل) لەکارخستن:

(تعطیل) (تجرید– داڕووتاندن)یشی پێ دەڵێن: بریتی یە لە لابردن و ئینکار کردنی ناوو سیفەتەکانی خوا.

(ج) (تمثیل) پێ چواندن:

ئەوەش ئەوەیە کە نابێ سیفەتەکانی خودای گەورە بە دورست کراوەکانی بچوێنی.

(د) (تکییف) دیاری کردنی چۆنیەتی ئەویش ئەوەیە کە حەقیقەت و نێوەڕۆکی ئەو ناوو سیفەتانەی خوا دیاری بکرێن و روون بکرێنەوە کە بێگومان ئەمەش بەس لەسەر بنچینەی گومانێکی پووچ دەبێ چونکە زات و ناوو سیفەتەکانی خوا هەمووی(لیس کمثله شيء) مادام وابێ هەروەك چۆن زاتی خوا بۆ ئێمە نەزانراوە سیفەتەکانیشی بە هەمان شێوە کەواتە هەر قسەکردنێك لەو بارەوە جگە لە گومان و گۆترەکاری چیدی نیە.

یقول مالك بن انس(ﷺ) لما سُئل عن قول الله تعالی﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾[1]کیف استوی؟ قال: الاستواء[1] معلوم، والکییف

---

(1) سورة(طه) الایة:٥.

مجهول، والايمان به واجب، والسؤال عنه بدعة)، واته: كاتىٚ كه پرسيار كرا له ئيمام مالك(رەزاى خواى لىٚ بيٚت) دەربارەى ئايەتى﴿ٱلرَّحۡمَـٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ خواى گەورە چۆن(ٱسۡتَوَىٰ)ى كردە سەر عەرش؟ امام مالك فەرمووى(استواء) زاندراوە سيفەتيٚكى خوايە بەلاٚم چۆنيەتى نەزاندراوە وە بڕوا بوون پيٚى واجبە وە پرسيار كردن ليٚى بيدعەيە.

## ريٚگاى خوا يەك ريٚگايە:

١-قال ابن مسعود(رضي الله عنه) خَطَّ لَنَا رَسُولُ اللهِ(صلى الله عليه وسلم) خَطاً وَقَالَ هذا سَبيلُ اللهِ، ثُمَّ خَطَّ خُطُوطاً عَنْ يَمينِهِ وَعَنْ يَسارِهِ، وَقَالَ هذه سُبُلٌ على كُلِّ سَبيلٍ شَيطانٌ يَدْعُو إليهِ[2]، ثُمَّ قَرَأَ﴿وَأَنَّ هَـٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ﴾ (الانعام:١٥٣).

(عبدالله) كوڕى مسعود رەزاى خواى لىٚ بيٚت دەلٚىٚ پيٚغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خەتيٚكى راكيٚشا فەرمووى ئەوە ريٚگاى خوايە، له پاشان چەند خەتيٚكى له لاى راست و چەپى خەتەكە راكيٚشا فەرمووى ئەوانە: كۆمەلٚە ريٚگايەكن

---

(1) الاستواء: له في لغة العرب اربعة معان هي:(علا، وارتفع، وصعد، واستقر). واستواء الله على عرشه: صفة فعلية ثابتة لله سبحانه على ما يليق بجلاله كسائر صفاته.

(2) حديث صحيح، رواه الامام احمد في مسنده والحاكم وقال صحيح الاسناد.

لەسەر هەر ڕێگایەك شەیتانێك هەیە بانگی خەڵكان دەكات بۆی ئینجا لە پاشان ئەم ئایەتەی خویندەوە﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ﴾ (الانعام:١٥٣).

واتە:بێ گومان ئەمە ڕێگای ڕاستی منە كە ڕاست و دورستە، كەواتە شوێنی بكەون وە شوێنی ڕێچكەكانی تر مەكەون چونكە دوورتان دەخەنەوەو لاتان دەدەن لە ڕێگەی خوا، خوا ئەو شتانەی بە ئێوە ڕاسپاردووە بۆ ئەوەی پارێزگار بن.

**سوود**:

١-ڕێگای خوا یەك ڕێگایە كە ئیسلامە.

٢- هەر ڕێگایەكی تر جگە لە ڕێگای خوا ڕێگەی شەیتانەو شەیتانێكی لەسەرە بانگ بۆ ئەم ڕێگایە دەكات.

٣- خوا دەفەرمووێ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ﴾ واتە: وە بە دوای ڕێچكان مەكەون(مەبەست ڕێگاكانی جگە لە ئیسلامە).

## گەورەیی بوونی ئیمان و خۆپاراستن لە شیرك

١-عن عُبادةَ بن الصَّامت(رضي الله عنه) قال: سمعت رسولَ الله(صلى الله عليه وسلم) يقولُ:(مَنْ شَهِدَ أن لا اله الا الله وأن محمداً رسولُ الله حَرَّمَ اللهُ عليه النار) رواه مسلم.

واته: هەر یەكێك شایەتی بدات كە هیچ پەرستراوێكی بە ڕاستی نی یە بێجگە لە خوا وە محمد(ﷺ) ڕەوانە كراوی خوایە خودا ئاگری لەسەر حەرام دەكات.

٢- عن عُبادَةَ بنِ الصَّامتِ(رضي الله عنه) قال: قال رسولُ اللهِ(ﷺ) مَنْ شَهِدَ أن لا اله الا الله وحده لا شريك له وأنَّ محمداً عبدهُ ورسلُهُ وأَنَّ عيسى عَبدُاللهِ ورسولُهُ وكَلِمَتُهُ أَلقاها الى مَريم ورُوحٌ مِنهُ والجنَّةَ حَقٌّ والنّارَ حَقٌّ أدخَلَهُ اللهُ الجنّةَ على ما كان من العمل. رواه البخاري(٣٤٣٥) و مسلم(٢٨).

واته: هەر یەكێك شایەتی بدات كە هیچ پەرستراوێكی بە ڕاستی نی یە بێجگە لە خوا تاكەو شەریكی نی یە وە محمد بەندەو نێردراوی خوایە وە عیسی بەندەو نێردراوی خوایە، دورستی كردوە بە ووتەی(كن) بە جبریل دا ناردی بۆ مەریەم، وە ئەو گیانەی بە بەری كرایە لە لایەن خواوەیە وە بەهەشت حەقە، وە دۆزەخ حەقە، خودا دەیباتە بەهەشت ئیتر كردەوەی هەرچی بێت.

٣- عن أبي ذرّ (رضي الله عنه) قال، قال النبيُّ(ﷺ):(يقولُ الله عَزَّ وجَلَّ: مَنْ جاءَ بالحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ امثالِها أو أَزيَدُ ومَنْ جاءَ بالسَّيِّئَةِ فجزاءُ سَيِّئَةٍ مِثلُها أَوْ اغْفِرُ ومَنْ تَقَرَّبَ مِنَّى شبراً تقربتُ مِنهُ ذِراعاً ومَنْ تَقَرَّبَ منّي ذراعاً تقربتُ منهُ باعاً ومَنْ أَتانى يَمشي أتيتهُ هَرولَةً ومَنْ لَقِيَني بقُراب الارضِ خطيئةً لا يشركُ بي شيئاً لَقِيتُهُ بِمثلِها مغفرةً. رواه مسلم(٢٦٨٧).

واته: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: خوا(عزَّ وجَلَّ) دەفەرمووێ: هەر یەكێك كردەوەیەكی چاك لەگەڵ خۆیدا بێنێ، دە بەرامبەر پاداشتی

دەدرێتەوە یا زیاتریش، وە هەر یەکێك کردەوەیەکی خراپی لەگەڵ خۆیدا هێنا ئەوە تۆڵەی هەر گوناهێك وەکو خۆیەتی یا خۆش دەبم، وە هەر یەکێك یەك بست(بەطاعەت) لەمن نزیك بێتەوە، ئەوە یەك گەز لە ئەو نزیك دەبمەوە، وە هەر یەکێك یەك گەز لە من نزیك بکەوتەوە من یەك باڵ لە ئەو نزیك دەبمەوە وە هەر یەکێك بێت بۆ لام بە رۆیشتن من بەراکردن (هرولة) دەچم بۆ لای، وە هەر یەکێك پێم بگا بە قەد نزیکی زەوی گوناحی پێ بێت شیرکی بۆ بڕیار نەدابم منیش بە قەد نزیکی زەوی لێ خۆش بوونی پێ دەبەخشم.

٤- عن جابر(رضي الله عنه) قال: جاءَ أعرابيٌّ إلى النّبيِّ(صلى الله عليه وسلم) فقال: يارسولَ اللهِ ما الموجبتانِ؟ فقال:(مَنْ ماتَ لا يشرك بالله شيئاً دخَلَ الجنة ومن ماتَ يُشركُ بِهِ شيئاً دخَلَ النّار) رواه مسلم(٩٣).

١)اعرابی: عارەبی دەشتەکی.

٢) الموجبتان: الخصلة الموجبة للجنة، والخصلة الموجبة للنار واته: ئەو شتەی کە بەهەشتی پێ واجب دەکات وە ئەو شتەی کە دۆزەخی پێ واجب دەکات.

واتە: جابر(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ ئەعرابیەك هاتە لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(موجبتان چییە؟ فەرمووی: هەر یەکێك بمرێ هیچ شەریکێك بۆ خوا بڕیار نەدا دەچێتە بەهەشت وە هەر یەکێکیش بمرێ شەریکی بۆ بڕیار بدا دەچێتە ئاگر.

٥- عن مُعاذ بن جبلٍ(رضي الله عنه) قال: كنتُ رَديفَ النبيِّ(صلى الله عليه وسلم) على حمارٍ فقال لي: يا مُعاذ أتدري ما حقُّ اللهِ على العبادِ وما حقُّ العبادِ على اللهِ؟ قلتُ: اللهُ ورسولُهُ أعلمُ قال: حقُّ اللهِ على العبادِ أن

يَعبدوهُ ولا يُشركوا به شيئاً، وحَقّ العباد على الله أَنْ لا يُعَذِّبَ مَنْ لا يُشركُ بِهِ شيئاً قلتُ: يا رسولَ الله افلا أُبَشِّرُ الناس؟ قالَ لا تُبَشِّرهم فَيَتَّكِلوا. رواه البخاري(٥٩٦٧) و مسلم(٥٨).

واته: موعاذى كوڕى جەبەل(ڕەزاى خواى لێ بێت) دەڵێ لە دواى پێغەمبەر(ﷺ) سوارى كەرێك بووم پێى فەرمووم ئەى موعاذ ئايا دەزانى حەقى خوا لەسەر بەندەكانى چییەو وە حەقى بەندەكانیش لە سەر خوا چى يە؟ گوتم: خواو پێغەمبەرى خوا زاناترن فەرمووى: حەقى خوا لەسەر بەندەكانى ئەوەيە كە بيپەرستن و هيچ هاوبەشێكى بۆ بڕيار نەدەن وە حەقى بەندەكانیش لە سەر خوا ئەوەيە ئەو كەسەى كە هيچ هاوبەشێكى بۆ بڕيار نادات سزاى نەدات موعاذ دەڵێ: گوتم ئەى پێغەمبەرى خوا ئايا موژدە نەدەم بە خەڵك، فەرمووى: موژدەيان پێ مەدە ئەگينا پشت بەمە دەبەستن و پشتى لێ دەكەنەوەو لە كردنى كارى باش سارد دەبنەوە.

٦- عن مُعاذٍ(رضي الله عنه) قالَ: قلتُ يا رسولَ اللهِ أخبرني بعملٍ يُدْخِلُني الجنَّة ويُباعِدُني مِنَ النار؟ قالَ: لقد سأَلْتَ عن عظيمٍ، وإنَّهُ لَيَسيرٌ على مَنْ يَسَّرهُ اللهُ تعالى عليه: تَعبُدُ اللهَ لا تُشرِكُ بِهِ شيئاً وتُقيمُ الصلاةَ، وتُؤتِي الزَّكاةَ وتَصُومُ رَمضانَ وتَحُجُّ البيت. حديث صحيح رواه الترمذي(٢٦١٩).

واته: موعاذ(ڕەزاى خواى لێ بێت) دەڵێ: گوتم ئەى پێغەمبەرى خوا كردەوەيەكم پێ بڵێ بە هۆى كردنى بچمە بە هەشت و دوور بخرێمەوە لە دۆزەخ فەرمووى: پرسيارت كردووە لە شتێكى گەورە وە ئەمەش ئاسانە لە سەر كەسێك كە خوداى بەرز لەسەرى ئاسان بكات، خودا بپەرستەو هيچ هاوبەشێكى بۆ بڕيار مەدە وە نوێژ بكەى وە زەكات بدەى وە مانگى

رەمەزان بەرۆژوو بیت وە حەجی ماڵی خودا بکەیت.

## حەقی خوا لەسەر بەندەکانی وەحەقی بەندەکان لەسەر خوا

عن مُعاذ بن جبلٍ(رضي الله عنه) قال: كنتُ رَديفَ[1] النبيِّ(صلى الله عليه وسلم) على حمارٍ فقال لي: يا مُعاذ أتدري ما حقُّ الله على العبادِ وما حقُّ العبادِ على الله؟ قلتُ: اللهُ ورسولُهُ أعلمُ،

قال: حقُّ الله على العبادِ أن يَعبدوهُ ولا يُشركوا به شيئاً، وحَقّ العبادِ على الله أنْ لا يُعَذِّبَ مَنْ لا يُشركُ بِهِ شيئاً قلتُ: يا رسولَ الله افَلا أُبَشِّرُ الناس؟ قالَ لا تُبَشِّرهم فَيَتَّكِلوا.رواه البخاري ومسلم.

واتە: موعاذی کوڕی جەبەل(رەزای خوای لیّ بیّت) دەڵیّ لە دوای پیّغەمبەر(ﷺ) سواری کەریّك بوبووم، پیّغەمبەر(ﷺ) پیّ ی فەرمووم ئەی موعاذ ئایا دەزانی ماف(حقّ)ی خوا چی یە لەسەر بەندەکانی و، ماف(حق)ی بەندەکانیش چی یە لەسەر خوا؟ گوتم خواو پیّغەمبەری خوا دەزانن، پیّغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ماف و هەقی خوا لەسەر بەندەکانی ئەوەیە کە بیپەرستن و هیچ هاوبەشیّکی بۆ دانەنیّن وە هەق و مافی بەندەکانیش لەسەر خوا ئەوەیە کە هەر کەسیّ هیچ هاوبەشیّکی بۆ دانەنیّ عەزابی نەدات، معاذ دەڵیّ: گوتم ئەی پیّغەمبەری خوا ئایا موژدە نەدەم بە خەڵك؟ پیّغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: موژدەیان پیّ مەدە ئەگینا پشتی پیّ

---

(1) رديف: الراكب خلف من يركب الدابة. واتە: کەسیّك کە لە پشت یەکیّکەوەیە لەسەر وولاٌخیّك جا جائزە دوو کەس سواری یەك وولاخ بن بە مەرجیّك وولاخەکە توانای ئەوەی هەبیّت ئەگەر توانای نەبیّت جائز نی یە.

دەبەستن.

## سوود:

شیرك دابەش دەبێت بۆ دوو بەش:

یەكەم: شیركی گەورە(الشرك الأكبر):

(الشِّرك الأَكْبَرُ: وَهُوَ أَنْ يَجْعَلَ الانسانُ لِلهِ نِدّاً فِي رُبُوبيَّتِهِ أَو أُلُوهِيَّتِهِ، او أَسْمائِهِ وَصِفاتِهِ). واتە: شیركی گەورە: بریتییە لەوەی ئادەمیزاد هاوێنەیەك بۆ خوا دابنێت لە پەروەردگارێتییەكەی یا لە پەرستراوێتییەكەی یا لە ناوو سفاتەكانی، جا هەر یەكێك شیركی گەورە(الشرك الاكبر) ئەنجام بدات هەرچی كارو كردەوەی هەیە ڕەش دەبێتەوە خاوەنەكەی دەردەچێ لە بازنەی ئیمان بەهەشتی لەسەر حەرام دەبێت بۆ هەتا هەتایێ لە ئاگری دۆزەخ دا دەمینێتەوە.

دووەم: شیركی گچكە(الشرك الأصغر):

(الشرك الأصغر: وهو ما أَتى فِي النُّصُوصِ أَنَّهُ شِرِكٌ وَلَمْ يَصِلْ الى حَدِّ الشِّركِ الأَكبر). واتە: شیركی گچكە ئەوەیە كە لە دەقەكان بە ناوی شیرك هاتبی بەڵام نەگەیشتبیتە پلەی شیركی گەورە بەم شێوەیە پێناسە كراوە: هەموو ووتەو كردەوەیەك كە مرۆڤ بەرەو هاوبەشی گەورە بەرێ بە مەرجێك نەبوبێ بە پەرستن وە لەگەورەترینی تاوانە گەورەكانە(اكبر الكبائر) ئەم جۆرە شیركە خاوەنەكەی لە بازنەی ئیمان دەرناكا وە لە دوا ڕۆژیشدا ئەگەر خوا بیەوێ عەزابی دەداو موحاسەبەی لەگەڵ دا دەكات وە ئەگەر بیشیەوێ عەفووی دەكات. وە زانایان دەڵێن(الشِّرك أكبرُ مِنَ الكبائِرِ وَلَو كانَ أَصْغَر) واتە: شیرك گەورەترە لە گوناهە گەورەكان ئەگەر شیركی گچكەش بێت كەواتە شیركی گچكە گەورەترە لە گوناهە گەورەكان.

# فریشته، مەلائیکەت

١- عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: قال: رسول الله(ﷺ) خُلِقَت المَلائكةُ مِنْ نُور. وخُلق الجانُّ من مارجٍ مِن نار[1] وخُلِقَ آدَمُ مما وُصِفَ لكم. رواه مسلم(٢٩٩٦).

واتە: فریشتە لە رووناکی دورست کراون وە ئەجندە(جنۆکە) دورست کراون لە بڵێسەی ئاگرێکی بێ دوکەڵ وە ئادەم دورست کراوە لەوەی بۆتان وەسف کراوە (واتە: ئەوەی لە قورئان وەسف کراوە کە لە قور(طین) دورست کراوە).

## سوود:

١-فریشتەکان جیهانێکی نادیارن و خوای گەورە لە رووناکی(نور) دورستی کردوون و هیچ تایبەتمەندییەکی پەرستراویەتییان نییە بەڵکو خۆیان بەندەن و خوا پەرستی دەکەن و پابەندی تەواویان بە فەرمانەکانی خواوە هەیەو توانای جێ بەجێ کردنیان پێ دراوەو چاکەکارن و هەرگیز سەرپێچی ناکەن.

٢- باوەڕ بە فریشتە چوار خاڵ دەگرێتە خۆ کە ئەمانەن:

١- باوەڕ هێنان بە بوونی فریشتەکان.

٢- باوەڕهێنان بەو فریشتانەی کە بە ناوی خۆیان ناویان دەزانین: وەك (جبریل) (میکائیل) (اسرافیل) (نکیر ومنکر) (هاروت و ماروت) (ملك الموت)، هەروەها باوەڕهێنان بە سەرجەم ئەو فریشتانەی ناویان نازانین.

---

[1] (من مارج من نار) واتە: لە زبانەو بڵێسەی ئاگرێکی بێ دووکەڵی لە گڕی زەردو سوورو مەیلەو کەسك(سەوز).

٣- باوەڕهێنان بەوەی کە زانیومانە لە سیفەتەکانیان وەکو سیفەتی(جبریل) کە(عبدالله) کوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ(رای رسول الله(ﷺ) جبریل في صورته وله ستمائة جناح کل جناح منها قد سَدَّ الأفق)[1]. واتە: پێغەمبەر(ﷺ) جبریلی لە شێوەی خۆیدا بینیوە شەش سەد باڵی هەبووە هەر باڵێکیشی ئاسۆی داگرتووە.

٤- باوەڕ هێنان بەوەی کە زانیومانە لە کردەوەکانیان کە پێی هەڵدەستن بە فەرمانی خوا.

## پێغەمبەر محمد(ﷺ) کۆتا پێغەمبەرەو بۆ هەموو خەڵك ڕەوانە کراوە:

خوا دەفەرمووێ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ (الاحزاب:٤٠). محمد باوکی هیچ کەسێك نییە لە پیاوانی ئێوە بەڵام محمد ڕەوانە کراوی خوایەو دواترینی هەموو پێغەمبەرانە.

خوا دەفەرمووێ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا﴾ (الاعراف:١٥٨).

واتە: ئەی پێغەمبەر بڵێ ئەی خەڵکینە بە ڕاستی من پێغەمبەری خواو ڕەوانە کراوم بۆ لای ئێوە هەمووتان.

---

(1) رواه احمد و قال ابن کثیر في البدایة: اسناده جید.

خوا دەفەرمووێ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ (سبا:٢٨).

**واتە: ئێمە تۆمان نەنارد مەگەر بۆ هەموو کەسێ مزگێنی دەرو ترسێنەر بەلأم زۆربەی خەڵك نازانن.**

١- عن ابی هریرة(رضي الله عنه) عن رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أنَّهُ قال: والذي نفسُ مُحَمَّدٍ بيده لا يَسْمَعُ بي أحَدٌ مِنْ هذهِ الأُمَّةِ يَهوديّ ولا نَصْرَانِي ثُمَّ يَموتُ ولَم يُؤْمِنْ بالذي أُرسلتُ بِهِ إلاّ كانَ مِنْ أصحابِ النّار) رواه مسلم(١٥٣).

**واتە: سوێندم بەوەی گیانی محمدی بەدەستە: هیچ کەسێ لەم ئوممەتە گوێی لەمن نابێ جولەکە بێت یا دیان بێت لە پاشان بمرێ و ئیمان نەهێنێ بەوەی کە پێ ی نێردراوم ئیللا ئەو کەسە لە جەهەندەمیەکانە.**

٢- عن جابر(رضي الله عنه) عن النبي(صلى الله عليه وسلم) قال: أُعْطيتُ خَمساً لم يُعطهنَّ أحدٌ قَبلِي: نُصرتُ بالرُّعب مَسيرة شَهر وَجُعِلَتْ لي الارضُ مَسْجِداً وَطَهُوراً فَأيما رجلٍ من أمتي ادركته الصلاة فليصلِّ، وأُحلَّتْ لِيَ الغَنائِمُ ولَم تَحِلَّ لأحدٍ من قبلي، وأُعطِيتُ الشَّفاعَة وكان النبيُّ يُبْعَث إلى قومِهِ خاصة وبُعِثتُ الى الناسِ عامَّة) رواه البخاری(٣٣٥) و مسلم (١١٦٣).

**واتە: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ: پێنج شتم پێ دراوە بە کەسی تر نەدراوە لە پێش من: سەرخستراوم بەسەر دوژمنانم بە ترس بۆ ماوەی**

مانگەرێیەك وە زەویم بۆ کراوە بە جێگەی نوێژو پاکژ کەرەوە جا هەر کەسێ لە ئوممەتم نوێژی گەیشتێ با نوێژ بکات وە غەنیمەتم بۆ حەڵاڵ کراوە لە پێش مندا بۆ کەسی تر حەڵاڵ نەبووە وە شەفاعەتم پێ دراوە پێغەمبەران هەر کەسەیان لەسەردەمی خۆیا ڕەوان دەکرا بۆ قەومی خۆی بەڵام من خودا ڕەوانەی کردووم بۆ لای خەڵکی بە گشتی.

## خۆش ویستنی پێغەمبەر(ﷺ)

١-عن انس(رضي الله عنه) قال: قال النبي(ﷺ): لايُؤمِنُ احدكم حَتَّى أكون احَبَّ إليهِ مِنْ والدهِ وَوَلَدهِ والناسِ أجمعين. **رواه البخاري (١٥) ومسلم (١٦٦).**

١)(وَلَدِهِ) يشمل الذَّكر والانثى واتە: کچ و کورەکانی دەگرێتەوە.

واتە: باوەڕی هیچ یەکێك لە ئێوە تەواو نابێت تاوەکو منی خۆشتر نەوێت لە دایك و باوکی و منداڵەکانی و گشت خەڵکی تر.

### سوود

١)(عُثیمین) لە(القول المفید علی کتاب التوحید) بەرگی دووەم لاپەرە(١٤٧) دەڵێ: هەر کەسێك هیچ خۆشەویستیەکی پێغەمبەری(ﷺ) لە دڵ دا نەبێت ئەو کەسە هیچ ئیمانی نییە.

٢) بەڵام ئەگەر یەکێك پێغەمبەری خۆش دەویست بەڵام خۆی یا یەکێکی تری خۆشتر بوێ لەو ئەو کافر نابێت بەلام ئیمانی ناتەواوە.

٢- عن عبدالله بن هشام(رضي الله عنه) قال: كُنّا مع النبي(ﷺ) وآخذٌ بيد عُمرَ بن الخطابِ فقالَ لَهُ عُمَر: يا رسولَ اللهِ لأنتَ أحَبُّ إليَّ من كُلِّ شيءٍ إلاّ مِنْ نَفسي. فقال النبي(ﷺ) لا والذي نفسي بيدهِ حتى أكونَ أحَبَّ اليكَ مِنْ نَفْسِكَ، فقال عُمَر: فإنَّهُ الآن واللهِ لأنتَ أحَبُّ إليَّ من نفسي فقال النبي(ﷺ) الآن يا عمر. رواه البخاري(٦٦٣٢).

واته: عبدالله كوڕی هشام(ڕەزای خوای لیٚ بێت) دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا بووین(ﷺ) دەستی عومەری كوڕی خەتتابی گرتبوو جا عومەر(ڕەزای خوای لیٚ بێت) پیٚ ی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ لای من لە هەموو شتیٚ خۆشەویست تری تەنها لە خۆم نەبێت، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نا سوێند بەوەی كە گیانی منی بە دەستە تاوەكو منت لا خۆشەویست تر نەبێت لە خۆشت جا عومەر(خوای لیٚ رازی بێت) فەرمووی: بیٚ گومان ئێستا سوێند بە خوا تۆ خۆشەویست تری لام لە خۆشم، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئێستا باوەڕت تەواوە ئەی عومەر.

## سوود

١-گوتمان ئەگەر موسڵمان پێغەمبەری خۆش دەویست بەڵام لە خۆی خۆشتر نەویست ئەوە ئیمانی تەواو نی یە

٢- واجب و پێویستە موسڵمان پێغەمبەری(ﷺ) لە خۆشی خۆشتر بوێت.

# باسی ئەصحابەی پێغەمبەر(ﷺ)

١) عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسولُ اللهِ(ﷺ) لا تَسُبُّوا أَصحابي فَوالّذي نفسي بيدهِ لَو أنَّ أحَدَكُم أَنْفَقَ مِثلَ أُحُدٍ ذَهَباً ما أدْرك مُدَّ[1] أحَدِهِم ولا نَصِيفَهُ[2]. رواه البخاري(٣٦٧٣) ومسلم(٢٥٤٠).

واتە: جنێو بە ئەصحابەكانم مەدەن سوێندم بەوەی گیانی منی بە دەستە بێ گومان ئەگەر یەكێك لە ئێوە بە وێنەی چیای(أُحُد) زێر ببەخشێ هێشتا ناگاتە(خێری) مستێكی ئەوان و نیو مستی ئەوانیش.

## سوود:

١-پێناسەی ئەصحابە لە لێكدانەوەی زانایان بەم شێوەیە:(هو مَنْ لقِيَ النَّبِيَّ(ﷺ) مؤمناً بِهِ ومات على الاسلام) واتە(ئەصحابە ئەوەیە كە گەیشتبێتە پێغەمبەر(ﷺ) بە ئیمانداری وە بە موسڵمانیش مردبی) كەواتە ئەگەر یەكێك بۆ ماوەیەكی زۆر كەمیش پێیگەیشتبێ، یا پێ ی گەیشتبێ بەڵام لەبەر نابینایی نەیدیتبی، غەزای لەگەڵ كردبێ یا نەكردبێ هەر پێ ی دەوترێ ئەصحابە، وە ئەوانەش پێیان ناوترێ ئەسحابە كە بە پێغەمبەر گەیشتبێ بەڵام باوەڕی پێی نەهێنابێ یا باوەڕی پێ ی هێنابێ بەڵام بە كافری مردبێ وەك(عبدالله بن جحش) موسڵمان بوو لەدوایدا بووە دیانو

---

(1) المُدُّ: مكيال وهو ربع الصاع النبوي. واتە(مُدّ) پێوانەیەك بووە كە چارەكەكی(صاع)ی پێغەمبەر بووە كە دەكاتە نیو كیلۆو هەندەك زیاتر. والله اعلم.

(2) (ولا نصيفهُ) قال اهل اللغة: النَّصِيفُ: النِّصْفُ، واتە(النَّصيف) یانی: نیوە.

مرد، وەئەوەش بە ئەصحابە دانانرێ کە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) باوەڕی پیێ ی هێناوە بەڵام نەیبینیوە وەك: نەجاشی.

٢- (ابن الصلاح) دەفەرمووێ: کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد(١٢٤٠٠٠) ئەصحابەی هەبوو.

٣- (ابن تيمية) رەحمەتی خوای لیێ بێت لە(العقيدة الواسطية)دا دەڵێ:(ومن أصول اهل السنةِ والجماعة سلامة قلوبهم وألسنتهم لأصحاب رسول الله(ﷺ) واتە لە بنچینەکانی(اهل السنة والجماعة)یە پاك بوونی دڵیان لە حقدو کینەو بوغزو وە پاراستنی زمانیان لە عەیب گرتن و نەفرەت کردن و جوێن دانی ئەصحابەی پێغەمبەر(ﷺ).

٤- تەنها بە چاکی نەبێ باسی ئەصحابەکان ناکەین‌و بێ دەنگ دەبین لەو جەنگ و ناکۆکیانەی لە نێوانیاندا رووی داوە چونکە هەموویان دادپەروەرن و بە هۆی(اجتهاد) ئەم جەنگانە رووی داوە.

٢) عن انس(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) قال: آيةُ الإيمان حُبُّ الأنصارِ وآيةُ النِّفاق بُغْضُ الأنصارِ. رواه البخاری(١٧) و مسلم(٧٤).

آيَة: علامة: نيشانە.

واتە: نیشانەی بڕواو ئیمان خۆش ویستنی یاریدەدەرەکانە وە نیشانەی(نفاق) رق لێبونەوەیە لە ئەنصاریەکان.

٣- عن عبدالله(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قالَ: خَيرُ النّاسِ قَرنِي، ثُمَّ الذينَ يَلُونَهم ثُمَّ الذينَ يَلُونَهم، ثُمَّ يَجيءُ قَومٌ تَسْبِقُ[1] شهادةُ أحدِهم يمينَه[2] ويمينَهُ شهادتَهُ. رواه البخاري(٣٦٥١) ومسلم (٢٥٣٣).

واته: باشترين خەڵك خەڵكى قەرِنى منن(واته:ئەصحابەكان) لە پاشان ئەوانەى كە لە دوايان دێن(واته: شوێن كەوتووەكان(التابعون) لە پاشان ئەوانەى كە لە دوايان دێن(واته: شوێن كەوتوى شوێن كەوتوەكان(تابعى التابعون) لە پاشان قەومێك دێن(شايەتى دان و سوێند خواردن پێكەوە دەڵێن جا جار وەيە) شايەتى دانى يەكێكيان پێشى سوێندەكەى دەكەوێ (وەجاريش وەيە) سوێندەكەى پێشى شايەتى دانەكەى دەكەوێ.

---

(1) تَسبقُ: به پێش دەكەوێ

(2) (تسبق شهادة احدهم يمينه) هذا ذم لمن يشهد و يحلف مع شهادته ومعنى الحديث أنه يجمع بين اليمين والشهادة فتارة تسبق هذه و تارة هذه.

١- قال ابن عمر: والذي نَفْسُ ابن عُمَرَ بِيَدِهِ لَوْ كانَ لأَحَدِهِمْ مِثْلُ أُحُدٍ ذَهَباً ثُمَّ أنْفَقَهُ في سَبيلِ اللهِ مَا قَبلَهُ اللهُ مِنْهُ حَتّى يُؤْمِنَ بالقَدَر، ثمَّ اسْتَدَلَّ بقولِ النبيِّ(ﷺ) الإيمانُ أنْ تؤْمِنَ باللهِ وملائكَتهِ وكُتُبِهِ ورُسُلِهِ واليومِ الآخِرِ وتُؤْمِنَ بالقَدَرِ خَيرِهِ وشَرِّهِ. رواه مسلم(٨).

واته: عبدالله كوڕی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: سوێند بەوەی کە گیانی(ابن عُمَر)ی بەدەستە ئەگەر هەر یەکێك لەوان بەقەد چیای(أحُد) زێڕی هەبیت لە پاشان بیبەخشێتەوە لە ڕێ ی خوادا لێ ی وەرناگیری تاوەکو بڕوا بە قەدەر نەهێنێ، لە پاشان بەڵگەی بەم فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) هێنایەوە(الإيمانُ أنْ تؤْمِنَ باللهِ وملائكَتهِ وكُتُبِهِ ورُسُلِهِ واليومِ الآخِرِ وتُؤْمِنَ بالقَدَرِ خَيرِهِ وشَرِّهِ).

واتە ئیمان ئەوەیە کە بڕوات هەبێت بە خواو فریشتەکانی و پەرتووکەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی وە باوەڕت هەبێت بە قەدەر بەخێرو شەریەوە.

## سوود:

باوەڕ بە قەدەر چوار شت دەگرێتە خۆ:

١-باوەڕهێنان بەوەی کە خوای گەورە زانستی بە هەموو شتێ هەیە بە(ئەزەلی و بە ئەبەدی)[1] بە هوردو درشتی یەوە لە ناو ئەو شتانەش دا

---

(1) ازل: بەردەوامی هەبوونێکە لە ڕابردوەوە کە سەرەتای نەبێت. أبَد: بەردەوامی هەبوونێکە لە داهاتوودا کە نەمانی نەبێ.

کردەوەی ئینسانەکان.

٢- باوەڕهێنان بەوەی خوای گەورە سەرجەم زانیاری یەکانی دەربارەی ژیان و بونەوەر لە تەختەی پارێزراو(لوح المحفوظ)(١) دا تۆمار کردووە و نوسیووە.

٣- باوەڕ هێنان بەوەی هەر شتێك لە بونەوەردا روو بدات بە ویستی خوا روودەدات پەیوەست بێت بە فەرمانەکانی خواوە یان پەیوەست بێت بە فەرمانەکانی دورست کراوەکانی یەوە.

٤- باوەڕهێنان بەوەی هەرچی لە بونەوەردایە بە خۆی و سیفەت و جوڵەیەوە دورست کراوی خوایە خودا دورستی کردوون بە کردەوەی ئادەمیزادەکانیشەوە.

## دوعا عیبادەتە

عن النعمان بن بشير(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) قال:(الدُّعاءُ هُو العبادَةُ) ثُمَّ قرا﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ (غافر:٦٠). حسن: رواه ابوداود(١٤٧٩) والترمذي(٢٩٦٩).

واتە: پارانەوە(دعاء)پەرستن(عبادة)تە لە پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ

---

(1) بۆیە بە تەختەی پارێزراو(لوح المحفوظ) گوتراوە تەختەی پارێزراو چونکە پارێزراوە لە زیاد کردن و کەم کردن تێیدا.

ﭐلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾.

**واته: وه پەروەردگاری ئێوه فەرمووی لێم بپارێنەوه وەڵامتان دەدەمەوه بێ گومان ئەوانەی خۆ بە زل دەزانن له پەرستنی من به مل کەچی و زەلیلییەوه دەچنە دۆزەخ.**

**سوود:**

**١-باموسڵمان دڵخۆش بێت که ئەو کاتانەی خەریکی دوعاو پارانەوەیه بۆ وەدەست هێنانی سوودی دونیاو دوا رۆژی یا دوورخستنەوەو پاراستنی له زیانی دونیا یا پاراستنی له زیانی دوا رۆژ ئەو کاتانەی هەموو بۆ به خوا پەرستن(عبادە)دادەنرێ.**

**٢- دەبێ موسڵمان زۆر ووریاو ئاگادار بێت هەر شتێك که پێ ی بگوترێ پەرستن(عبادة) نابێ بۆ غەیری خوا ئەنجامی بدات چونکه هەر موسڵمانێك لەوانەی که پێیان دەوترێ عیبادەت بۆ غەیری خوای ئەنجام بدات ئەو کارەی شیرکه.**

# باسی سویند خواردن

## سویند خواردن به غه‌یری خوا شیرکه

١-عن عبدالله(رضي الله عنه) عن رسول الله(ﷺ) انَّهُ أدرَكَ عمر بْنَ الخطاب في ركْبٍ وعمر يَحْلِفُ بأبيه فناداهُمْ رسولُ الله(ﷺ) ألا إنَّ الله عزَّ وجَلَّ ينهاكُمْ أن تَحْلِفُوا بآبائِكُمْ فَمَنْ كانَ حالفاً فَلْيَحلِفْ باللهِ أوْ ليصمت. رواه البخاري(٦١٠٨) ومسلم(١٦٤٦).

واته: عبدالله کوڕی عومه‌ر(ره‌زای خوای لیٚ بیٚت) ده‌لیٚ: پیٚغه‌مبه‌ر(ﷺ) گه‌یشت به عومه‌ری کوڕی خه‌تتاب له کاروانیٚکی ووشتردا عومه‌ر سویٚندی به باوکی ده‌خوارد جا پیٚغه‌مبه‌ر(ﷺ) بانگی کردن فه‌رمووی: ئاگاداربن بیٚ گومان خودا(عزَّ وجَلَّ) قه‌ده‌غه‌ی کردووه له ئیٚوه که سویٚند به باب و باپیرتان بخۆن جا ئه‌وه‌ی سویٚند بخوا با یا سویٚند به خودا بخوا یا بیٚ ده‌نگ بیٚت.

### سوود:

(ابن كثير) له ته‌فسیره‌كه‌ی دا له سه‌ره‌تای سوره‌تی(نجم) ده‌لیٚ:(قال الشعبيُّ وغَيْرُهُ: الخالق يَقسمُ بما شاءَ من خَلْقِهِ والمخلوقُ لا ينبغي لَهُ انْ يقسم إلاّ بالخالق) واته: شه‌عبی و غه‌یری ئه‌ویش گوتویانه: خوا ئه‌وه‌ی ویستی لیٚ بیت سویٚندی پیٚ ده‌خوات له دورست كراوه‌كانی به‌لاّم دورست كراوه‌كانی نابیٚت سویٚند بخۆن به غه‌یری خودا.

٢- سمع ابن عمر رجلاً يَحْلِفُ: لا والكعْبَة فقال لهُ ابن عمر: لا تَحْلِفْ بِغَيرِ الله، فَإنّي سَمِعْتُ رسولَ اللهِ(ﷺ) يقولُ: مَنْ حَلَفَ بِغَير الله فَقدْ اشرَك. صحيح رواه ابوداود(٣٢٥١) والترمذي(١٥٤٠).

واته: عبدالله كوڕى عومەر(ڕەزاى خواى لىٚ بيٚت) گوىٚ ى لە پياويٚك بوو سويٚندى دەخوارد گوتى نا بە كەعبە، جا عبدالله پىٚ ى گوت سويٚند مەخۆ بە غەيرى خوا من گويٚم لە پيٚغەمبەرى خوا بووە دەيفەرموو: هەر يەكيٚك سويٚند بە غەيرى خوا بخوا ئەوە شەريك و هاوبەشى بريار داوە.

**سوود**:

١)عُثيمين(ڕەحمەتى خواى لىٚ بيٚت) لە(القول المفيد على كتاب التوحيد) لە بابى(٤٢) دا دەڵىٚ:(القَسَم بغير الله إن اعتقد الحالف أن المقسم به بمنزلة الله في العظمة فهو شرك اكبر وإلاّ فهو شرك اصغر) واته: سويٚند خواردن بە غەيرى خوا ئەگەر سويٚند خۆر لاى وابوو ئەوەى سويٚندى پىٚ دەخوات وەكو خوايە لە گەورەيى ئەوە شيركى گەورەيە ئەگەر نا شيركى گچكەيە.

٢) (ابن مسعود) ڕەزاى خواى لىٚ بيٚت دەڵىٚ(لان أَحلِفَ باللهِ كاذباً احبُّ إلَّ من أن أَحلِفَ بغيرهِ صادقاً)[1].

واته: ئەگەر سويٚند بخۆم بە خوا بە درۆ پيٚم خۆشترە لەوەى سويٚند بخۆم بە غەيرى خوا بەڕاستى.

جا(ابن مسعود) بۆ يەكەميانى پىٚ خۆشترە لەئى دووەم كەچى سويٚند

---

(1) اخرجه عبدالرزاق٨/٤١٩ والطبراني في الكبير(٨٩٠٢) قال المنذري في الترغيب ٣/٦٠٧ والهيثمي في مجمع الزوائد ٤/١٧٧: رواته رواة صحيح.

خواردنی بەدرۆ بەخوا یەکێکە لە گوناهە گەورەکان(من كبائر الذنوب). چونكە سوێند خواردن بە غەیری خوا شیركە وە شیركیش گەورەترە لە گوناهە گەورەكان ئەگەر شیركی گچكەش بیت(الشرك اكبر من الكائر ولو كان اصغر).

## ئەو کەسەی سوێندی بۆ دەخوری بە خواو قەناعەتی نایێ

١- عن ابن عمر(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله(صلى الله عليه وسلم) قالَ: لا تَحلفوا بآبائكم[١] مَنْ حلفَ باللهِ فلْيُصَدِّق ومَنْ حُلِف لَهُ باللهِ فلْيرض ومنْ لم يرض فليس من الله[٢]. رواه ابن ماجه بسند حسن وقال في الزوائد(رجال اسناده ثقات) وحسنه الحافظ في الفتح).

واتە: سوێند مەخۆن بەباوكو باپیرتان، هەر یەكێك سوێندی خوارد باڕاست بكات، وە هەر یەكێكیش سوێندی بۆ خورا بەخوا بارازی بێت، وە هەر یەكێكیش رازی نەبێت پەیوەستی لەگەڵ خوادا نامێنێ.

(1) آباۆكم: جمع اب ویشمل الاب والجد وان علا. واتە كۆی(أب)ە واتە: باوك وە باوك و باپیریش دەگرێتەوە ئەگەر بەرزیش بێتەوە.

(2) فلیس من الله: ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە لە گوناهە گەورەكانە ئەوەی كە رازی نابێت.

# پچراندنی مافی خەڵکان بە سوێندی درۆ

١- عن أبي أُمامه(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله(صلى الله عليه وسلم) قالَ: مَنْ اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسلمٍ بِيَمينه فَقَدْ أوجَبَ اللهُ لَهُ النارَ وحَرَّمَ عليهِ الجَنَّةَ فقال لَهُ رجُلُ وَإنْ كانَ شيئاً يَسيراً يا رسولَ الله. فقال: وإنْ قَضيباً من أَراك[1]. رواه مسلم(١٣٠٧).

واتە: هەرکەسێك بە هۆی سوێند خواردنەوە مافی موسڵمانێك بپچڕێنی ئەوە خودا ئاگری بۆ واجب دەکات وە بەهەشتی لێ حەرام دەکات پیاوێك گوتی ئەگەر شتێکی کەمیش بێت ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: ئەگەر لقی درەختێکی سیواکیش بێت.

٢) عن عبدالله بن عمرو(رضي الله عنه) قال: جاء أعرابيٌّ الى النبيِّ(صلى الله عليه وسلم) فقال: يارسول اللهِ ما الكبائر؟ قالَ: الإشراكُ باللهِ قالَ: ثم ماذا؟ قالَ ثُمَّ عقوق الوالدين قالَ: ثمَ ماذا؟ قالَ: اليمينُ الغموس. قلتُ وما اليمين الغموس؟ قالَ: الذي يقتطعُ مال امرىء مسلم هو فيها كاذب. رواه البخاري(٦٩٢٠).

واتە: عارەبەکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا گوناهە گەورەکان چین؟

فەرمووی: هاوبەش پەیدا کردن بۆ خودا، گوتی لە پاشان چی؟ فەرمووی لە پاشان ئازاردانی دایك و باوك گوتی لە پاشان چی؟ فەرمووی: سوێندی نقوم کەر. گوتم سوێندی نوقم کەر چییە؟ گوتی: سوێندی بە درۆی ئەو کەسەیە کە ماڵی پیاوێکی موسڵمانی پێ دەپچڕێ.

---

(1) أراك: درەختی سیواك.

**سوود**:

**ئەم قسەیەی کۆتایی لە فەرموودەکە(قلت وما اليمين الغموس؟ قال: الذي يقتطع مال امرئ مسلم هو فيها كاذب) ئەمە قسەی راویەکانی فەرموودەکەیە نەك قسەی پیاوە دەشتەکیەو پێغەمبەر(ﷺ)، والله اعلم.**

## سوێند خواردن لەسەر شت فرۆشتن

١)عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: سَمِعتُ رسولَ اللهِ(ﷺ) يقولُ: الحِلْفُ مَنْفَقَةٌ لِلسِّلعةِ، مَمْحَقَةٌ لِلبركَةِ. **رواه البخاري(٢٠٨٧) ومسلم(١٦٠٦).**

**واتە: سوێند رەواج بە فرۆشتنی کاڵا دەدات، بەڵام پیت و بەرەکەتی کەسابەتەکە دەبا.**

٢) عن أبي قتادة(رضي الله عنه) أنَّهُ سَمِعَ رسولَ اللهِ(ﷺ) يقولُ: إيّاكم[١] وكثرةَ الحِلْفِ في البيعِ فإنَّهُ يُنَفِّقُ ثُمَّ يَمْحَقُ. **رواه مسلم(١٧٣٧).**

**واتە: خۆتان بپارێزن لە زۆر سوێند خواردن لە کرین و فرۆشتن دا زۆر سوێند خواردن لە کرین و فرۆشتندا رەواج بە شتەکە دەدات لە پاشان پیت و بەرەکەتی ناهێڵێ.**

---

(1) **إياكم: خۆتان بپارێزن، (إياكَ) خۆت بپارێزە. اسمی فیعلی ئەمرە).**

**سوود**:

(صالح بن فوزان) له(كتاب التوحيد)دا دەڵێ:

١-تحريم الحلف بغير الله تعالى: كالحلف بالامانة او الكعبة او بالنبيّ(ﷺ) وأنَّ ذلك شرك.

٢- تحريم الحلف بالله كاذبا متعمداً وهو الغموس.

٣- تحريم كثرة الحلف بالله ولو كان صادقاً اذا لم تدع اليه حاجة لأنّ هذا استخفاف بالله سبحانه.

٤- جواز الحلف بالله اذا كان صادقاً وعند الحاجة.

واته:

١-حەرامە سوێند خواردن بە غەیری خوا وەك سوێند خواردن بە(أمانه) یا كەعبە یا پێغەمبەر(ﷺ) ئەم جۆرە سوێندانە شیركن.

٢- حەرامە بە درۆ بە ئەنقەست سوێند بە خوا بخۆن ئەوە سوێندی(غموس)ی پێ دەڵێن.

٣- حەرامە زۆر سوێند خواردن بە خوا ئەگەر ڕاستیش بكات، بێ پێویستی لەبەر ئەوە ئەوە سوكایەتیە بە خوا.

٤- جائزە سوێند خواردن بە خوا ئەگەر ڕاست بكات لە كاتی پێویستی.

# استعانه: داواى يارمەتى كردن له خوا

١) عن ابن عباس(رضي الله عنهما) قال: كُنتُ خَلْفَ النَّبيِّ(صلى الله عليه وسلم) يوماً فقالَ: يا غُلامُ إنّي أُعَلِّمُكَ كَلِماتٍ: احْفَظِ اللهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظِ اللهَ تَجِدْهُ تُجاهَكَ، إذا سألْتَ فَسْأَلِ اللهَ واذا اسْتَعَنْتَ فاسْتَعِن باللهِ، واعْلَمْ: أنَّ الأمَّةَ لَوِ اجْتَمَعَتْ على أنْ يَنْفَعوكَ بِشيءٍ لَمْ ينفعوك إلاّ بِشيء قد كتبهُ اللهُ لك، وإنِ اجتمَعُوا على أن يَضُرُّكَ بِشيءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إلاّ بشيءٍ قدْ كَتَبَهُ اللهُ عليك، رُفِعَتِ الاقلامُ وجفَّتِ الصُّحُفُ. صحيح رواه الترمذي(٢٥٢٤).

واته:عبدالله كوڕى عەبباس(ڕەزاى خواى لىٚ بيٚت) دەڵىٚ:

ڕۆژێكيان له پشتى پێغەمبەرەوە بووم(صلى الله عليه وسلم) (لەسەر وولاغێك) فەرمووى: ئەى ڕۆڵە من چەند ووشەيەكت فێردەكەم: پابەندبە بە ئەمرەكانى خواو خۆت بپارێزە لەوانەى نەهى لىٚ كردوون خوا دەتپارێزىٚ(له دونيا له ناخۆشى له دوا ڕۆژ له عەزاب). پابەندبە بە ئەمرەكانى خواو خۆت بپارێزە لەوانەى كه خوا نەهى لىٚ كردووە بەرامبەر به خۆت دەيبينى(واته: يارمەتى ئەوو سەرپەرشتى ى ئەو له هەموو ئيشێكدا كه ڕووى تىٚ بكەيت ديارەو دەيبينيت)، ئەگەر داواى شتێكت كرد داوا له خوا بكە، وە ئەگەر داواى يارمەتيت كرد داوا له خوا بكە، وە بزانە ئەگەر هەموو خەڵك كۆببنەوە بۆ ئەوەى سوودێكت پىٚ بگەيەنن ناتوانن سوودت پىٚ بگەيەنن بێجگە لەوە نەبێت كه خودا بۆى نوسيوى، وە ئەگەر كۆببنەوە بۆ ئەوەى زيانێكت پىٚ بگەيەنن ناتوانن زيانت لىٚ بدەن بێجگە لەوەى خوا لەسەرى نوسيوى قەڵەم بەرز كراوەتەوەو پەڕەكان ووشك بوينەوە.

**سوود**:

١) خوا دەفەرمووێ ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ (الفاتحه:٥).

واته:(خوایه) بەس تۆ دەپەرستین وە تەنها لە تۆ داوای یارمەتی دەکەین.

٢)داوای یارمەتی کردن(استعانه) بەسێ مەرج دورستە لە بەندە بکرێ:

أ- ئەوەی داوای یارمەتی لێ دەکەی دەبێ زیندوو بێت، داوای یارمەتی کردن لە مردوان بە هەموو شێوەیەك قەدەغەیەو هاوەڵ(شرك) دانانە بۆ خوا.

ب) ئەو یارمەتییەی داوای لێ دەکەی لە توانای دا هەبێت، داوا کردن و خواستنی جۆرە یارمەتیەك کە تەنها لە توانای خوا دابێ و لە زیندوان داوا بکرێ ئەوەش مایەی دەرچوونە لە دین و هاوەڵ دانانە بۆ خوا.

ج) ئەوەی داوای یارمەتی لێ دەکەی نابێ نادیارو بزر بێت یا گوێ ی لە دەنگت نەبێت .

# دۆستایەتی و دوژمنایەتی کردن لە پێناو خوادا (الموالاة والمعاداة في الله)

مُوالاة: ئەویە کە ئینسانی موسڵمان لەبەر خوا ئەو کەسانەی خۆش بوێ و دۆستایەتییان بکات کە دۆست و خۆشەویستی خوان ئاشکراشە کە دۆستانی خوا تەنها ئەهلی ئیمانن.

مُعاداة: ئەوەیە کە ئینسانی موسڵمان لەبەر خوا رقی لەو کەسانە

بێتەوەو دوژمنایەتیان بکات کە دوژمن و ناحەزی خوان ئاشکراشە کە دوژمن و ناحەزی خودا بریتین لە ئەهلی کوفر بە هەموو جۆرو شێوەکانیانەوە بە تایبەت لە کاتێکدا کە دژایەتی ئەهلی ئیمان دەکەن.

١- عن أبي أُمامة عن رسول الله(ﷺ) أَنَّهُ قال:(مَن أَحبَّ لله وأَبغضَ لله وأعطى لله ومنعَ لله فقد استكمَلَ الإيمانَ. صحيح رواه ابو داود(٤٦٨١).

واتە: هەر کەسێك خۆش ویستنی لەبەر خوا بێت و رق لێبونەوەی لەبەر خودا بێت و بەخشینی لەبەر خوا بێت و نەبەخشینی لەبەر خوا بێت ئەوە بێگومان ئیمانی خۆی تەواو کردووە.

٢- قال رسولُ الله(ﷺ) (أَوثقُ عُرى الايمان: الموالاة في الله، والمعاداة في الله والحبُ في الله والبغضُ في الله) رواه ابو داود والطبراني وصححه الحاكم وقال الالباني اسناده حسن.

واتە: پتەوترین قوڵفەو گرێی ئیمان بریتییە لە دۆستایەتی گرتن لەبەر خواو دۆژمنایەتی کردن لەبەر خوا وەخۆشویستن لە پێناوی خواداو رق لێبونەوە لە پێناوی خوادا.

## سوود:

١-خوا دەفەرمووێ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَـٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَـٰرِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ ۚ

فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ فَيُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ نَٰدِمِينَ﴾ (المائدة:٥١-٥٢).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە جولەكەو نەصرانیەكان بە دۆست مەگرن ئەوان هەندێكیان دۆست و پشتیوانی هەندێكیانن وە هەر كەسێك لە ئێوە ئەوان بە دۆست بگرێ ئەوە بێگومان لەوانە وە بەڕاستی خوا ڕێنمایی خەڵكی ستەمكار ناكات، دەبینی ئەوانەی دڵیان نەخۆشی(دوو ڕویی) تیایە خێرایی و پێشبركە دەكەن لە دۆستایەتی ئەو(جوولەكە و گاوور)انەدا دەڵێن دەترسین كە بەڵایەكمان بەسەر بێت دەی نزیكە خوا سەركەوتن و زاڵكردنی تەواو بنێرێت (بۆ پێغەمبەر(ﷺ) یان لە لایەن خۆیەوە كارێكی تر بكات دوایی لەسەر ئەوەی كە لە دڵیان دا پەنهانیان كردووە(كە خۆشەویستی و دۆستایەتی ئەهلی كوفرە) پەشیمان ببنەوە.

٢- وە خوا دەفەرمووێ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِي شَيْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ (ال عمران:٢٨). واتە: بڕواداران نابێت دۆستایەتی كافران بكەن لە جیاتی موسڵمانان وە هەر كەسێك وا بكات هیچ پەیوەندی بە خواوە نەماوە مەگەر وەك پارێز خۆتانیان لێ بپارێزن وە خوا سەبارەت بە خۆی بێدارتان دەكاتەوە دەتانترسێنێ وە بۆ لای خوا دەگەڕێنەوەو سەرەنجامتان هەر بۆ لای ئەوە.

٣- (الموالاة المطلقة) دۆستایەتی رەها ئەوەیە کە ئینسان بە دڵ کوفرو ئەهلی کوفری خۆش بوێ و پێ ی خۆش بێت سەر بکەون یاخود بە کردەوە لە گەڵیاندا بێت و بەرگریی یان لێ بکات و خەڵکیان بۆ بکوژێ و خۆیان لەسەر بە کوشت بدات کە بێ گومان ئەمەیان ئینسانی پێ کافر دەبێت و لە بازنەی دین دەچێتەدەر.

٤- رێزگرتن و تەوقە لەگەڵدا کردن و رووی خۆش نیشان دان لەگەڵ میوانی کافردا ناکەوێتە بابی دۆستایەتی کردن لەگەڵ کافران دا.

## مۆرو ختمی پێغەمبەرایەتی

١)عن جابر بن سمرة قال: رأيتُ خاتماً في ظَهرِ رسول اللهِ(ﷺ) كأنَّهُ بَيضَةُ حمامٍ. رواه مسلم(٢٣٤٤).

واتە: جابری کوڕی سەمورە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: مۆرێکی(پێغەمبەرایەتیم) بینی لە پشتی پێغەمبەر(ﷺ) بە هێلکە کۆتر دەچوو.

٢- عن سائب بن يزيد يقول: ذَهَبَتْ بي خالَتِي الى رسول الله(ﷺ) فقالت: يا رسول الله إنَّ ابْنَ أُختي وَجِعٌ فَمَسَح رَاسي ودعا لِي بالبَرَكةِ ثُمَّ توضّأَ فَشَرِبْتُ منْ وَضُوئه ثُمَّ قمتُ خَلْفَ ظهرهِ فنظرتُ الى خاتمِهِ بين كَتِفَيهِ مثلَ زرِ الَحجَلَةِ. رواه البخاري(١٩٠) ومسلم(٢٣٤٥) والترمذي (٣٦٤٣).

وَضُوء: ئاوی دەست نوێژ بەڵام(وُضوء) واتە دەست نوێژ.

واتە: سائبی کوڕی یزید(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پلکم(خوشکی دایکم) منی برد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کوڕی خوشکمە نەخۆشە ئەویش دەستی هێنا بەسەرمداو دوعای بەرەکەتی بۆ کردم لە پاشان دەست نوێژی شوشت منیش لە ئاوی دەست نوێژەکەیم خواردەوە لە پاشان چوومە پشتی تەماشای مۆرەکەیم کرد لە نێوان هەر دوو شانی وەکو هێلکەی پۆر (حَجَلَة) وابوو.

٣- عن جابر بن سَمُرة(رضي الله عنه) قال: كانَ خاتَمُ رسول الله(صلى الله عليه وسلم) يعني الذي بين كتفيه غُدَّةٌ حمراء مثلُ بَيضةِ الحمامَةِ. صحيح رواه الترمذي(٣٦٤٤).

واته: جابری کوڕی سەموره (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: مۆری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) واته ئەوەی که له نێوان هەردوو شانی بوو پارچه گۆشتێکی سوور بوو وەکو هێلکەی کۆتر بوو.

## هەڵقوڵانی ئاو له نێوان پەنجەکانی

١)عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(صلى الله عليه وسلم) واصحابَهُ بالزَّوراء: والزوراء بالمدينة عند السوق والمسجد فيما ثَـمَّهْ[1] دعا بقَدحٍ فيه ماء فوضع كفَّه فيه، فَجَعَلَ ينبعُ من بين أصابعهِ فَتَوَضأَ جميع أصحابه قال: قلت: كم كانوا يا ابا حمزة؟ قال: كانوا زُهاءَ الثلاثمائة. رواه مسلم(٢٢٧٩).

واته: ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ ئەصحابەکانی له(زوراء) بوون وە(زوراء)یش له مەدینەی بوو لای بازارو مزگەوت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەوێ داوای قاپێکی کرد ئاوی تیابوو جا دەستی له ناو دانا ئاو له نێوان پەنجەکانی دەهاته دەر هەموو ئەصحابەکان دەست نوێژیان تیا شووشت ڕاوی ئەم فەرموودەیه دەڵێ له ئەنەسم پرسی چەند کەس دەبوون ئەو ئەصحابانەی که دەست نوێژیان له قاپەکه شوشت ئەی ئەبا حمزه؟ فەرمووی دەوروبەری سێ سەد دەبوون.

---

(1) ثَمَّهْ: واته: هنا، لەوێ

**سوود:**

هەر وەك لە صحيحى(مسلم)دا هاتووە ئەو قاپە ئاوەى كە بۆ پێغەمبەریان هێنا ئاوەكە زۆر نەبووە پەنجەى دانەپۆشیوە یا بەقەد ئەوە بووە كە پەنجەى داپۆشیوە(فأُتى بإناءٍ لا يَغمُرُ أصابعَه أو قَدرْ ما يواري أصابعَهُ).

## دوعاى پێغەمبەر

١- عن انس بن مالك(رضي الله عنه) أنَّهُ ذكَر أنَّ رجلاً دَخَلَ يومَ الجُمعةِ من بابٍ كان وِجاهَ المِنْبرِ ورسولُ اللهِ(صلى الله عليه وسلم) قائِمٌ يَخطُبُ فاستَقبلَ رسولَ اللهِ(صلى الله عليه وسلم) قائماً فقالَ: يا رسولَ اللهِ هَلكتِ المواشي وانقطعتِ السُّبل فادْعُ اللهَ يُغيثُنا قال: فَرَفَعَ رسولُ اللهِ(صلى الله عليه وسلم) يَدَيهِ فقالَ(اللهم اسْقنا اللهم اسقنا اللهم اسقنا) قالَ انس: ولا واللهِ ما نرى في السماءِ من سَحابٍ ولا قَزعةً ولا شيئاً وما بيننا وبين سَلْعٍ من بيتٍ ولا دارٍ قال: فطلعت من ورائهِ سحابةٌ مثلُ التُّرس فلمّا توسَّطَت السماءَ انتشرتْ ثُمَّ أَمطَرت قال واللهِ ما رأينا الشَّمْسَ سِتّاً ثُمَّ دخَلَ رجلٌ من ذلك الباب في الجمعةِ المُقْبِلَةِ ورسولُ اللهِ(صلى الله عليه وسلم) قائمٌ يخطبُ فاستَقبلهُ قائماً فقال يا رسولَ اللهِ هَلكتِ الاموالُ وانْقطعتِ السُّبُلُ فَادْعُ اللهَ يُمسكْها قالَ: فَرَفَع رسول اللهِ(صلى الله عليه وسلم) يَدَيْهِ ثُمَّ قالَ:(اللهم حوالينا ولا علينا اللهم على الآكامِ والجبالِ والآجام والظِّرابِ والأوديةِ ومنابتِ الشَّجرِ) قالَ: فانقطعتْ وخرجنا نَمشي في الشَّمس قالَ شريك: فَسألتُ أنس بن مالك أَهو الرَّجل الأوَّلُ قال:

لاأدري. رواه البخاري (١٠١٣) ومسلم (٨٩٥).

واته: ئەنەسی كوری مالك(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: له ڕۆژی هەینی پیاویٚك هاته ژوورەوه له دەرگایەك كه بەرامبەر مینبەر بوو وه لەو كاتەش دا پیٚغەمبەر(ﷺ) وەستا بوو ووتاری دەدا پیاوەكه به وەستاوی ڕووی له پیٚغەمبەر(ﷺ) كرد گوتی ئەی پیٚغەمبەر خوا ماراتمان لەناو چوو ڕیٚگاكان پچڕان داوا له خوا بكه كه فریامان بكەویٚ و بارانمان بۆ ببارێنیٚ، پیٚغەمبەر(ﷺ) هەردوو دەستەكانی بەرز كردەوه فەرمووی: خوایه بارانمان بۆ ببارێنه، خوایه بارانمان بۆ ببارێنه، خوایه بارانمان بۆ ببارێنه، ئەنەس دەڵیٚ: سویٚند بەخوا له ئاسمانا هیچ هەورێكمان هیچ پارچ هەورێك و هیچ شتیٚكی ترمان بەرچاو نەدەكەوت وه له نیٚوانی ئیٚمەو چیای(سَلع) كه چیایەكه له مەدینه هیچ ماڵ و خانوەك نەبوو پیٚشمان بگریٚ له بینینی هەور ئەنەس دەڵیٚ: له پشت چیای(سلع) هەورێك دەركەوت وەكو مەنجەڵ خر بوو گچكه بوو كه گەیشته ناوەندی ئاسمان بڵاوبۆوه له پاشان باران باری ئەنەس دەڵیٚ: سویٚند به خوا شەش ڕۆژ ڕۆژمان نەدیت له پاشان پیاویٚك له هەمان دەرگا له هەینی داهاتوو هاته ژوورەوەو پیٚغەمبەر(ﷺ) وەستابوو ووتاری دەدا پیاوەكه به وەستاوی ڕووی له پیٚغەمبەر كرد گوتی: ماڵ و سامان و ماڵات لەناوچوون ڕیٚگاكان پچڕان دوعامان بۆ بكه لەخوا بارانەكه ڕاگریٚ.

ئەنەس دەڵیٚ: پیٚغەمبەر(ﷺ) دەستەكانی بەرز كردەوه له پاشان فەرمووی: خوایه له دەوروبەرمان بیبارێنه بەسەر سەرمانا نا خوایه بیبارێنه بەسەر زورگەگەورەكان و چیاو ئاجام و گرده بچووكەكان و دۆڵ و لەوەرگەكان جا ئەنەس دەڵیٚ: باران نەماو كاتیٚ له مزگەوت چووینه دەرەوه ڕۆژ بەدەركەوتبوو لەبەر ڕۆژ ڕۆیشتین شەریك دەڵیٚ: به ئەنەسم

گوت ئەو پیاوەی دووەم هەمان پیاوی یەکەم بوو ئەنەس گوتی نازانم.

٢- عن سلمة بن الاكوع(رضي الله عنه): أنَّ رجلاً أكَلَ عند رسول الله(ﷺ) بشمالهِ فقالَ كُل بيمينك قالَ: لا أستطيعُ قالَ: لا استَطَعْتَ! ما منَعَهُ إلا الكِبْرُ فما رَفَعَها الي فِيهِ. رواه مسلم.

واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (رەزای خوای لیّ بیّت) دەڵیّ: پیاویّك لە لای پیّغەمبەر (ﷺ) خواردنی خوارد بە دەستی چەپی پیّغەمبەر(ﷺ) پیّ ی فەرموو: بە دەستی راستت بخۆ پیاوەکە گوتی ناتوانم پیّغەمبەر(ﷺ) دوعای لیّ کرد فەرمووی: دە نەتوانی کابرا هیچ شتیّ قەدەغەی نەکرد(کە بە دەستی راست بخوا) تەنها خۆ بەگەورەزانین نەبیّت.

(جا دوعاکەی پیّغەمبەر(ﷺ) گیرا بوو) ئەو پیاوە جاریّکی تر نەیتوانی دەستی ڕاستەی بۆ دەمی ببات.

## زیاد بوونی خواردن:

١-عن جابر بن عبدالله(رضي الله عنه) قال: لما حُفِرَ الخَندقُ رأيتُ برسول الله(ﷺ) خمْصاً فانكفأتُ الى امرأتي فَقُلْتُ لها: هل عندك شيء؟ فإني رأيتُ برسول الله، خمْصاً شديداً فَأخرجَت لي جِراباً فيه صاعٌ مِنْ شعير ولنا بُهيمَةٌ داجنُ. قال: فَذبَحْتُها وطحنَتْ فَفَرغَت الى فراغي فَقَطَّعْتُها في بُرْمَتِها ثُمَّ وَلَّيتُ الى رسول الله(ﷺ) فقالت لا تفضَحْني برسول الله(ﷺ) ومَنْ مَعَهُ، قال: فَجئتهُ فَسارَرْتُهُ فقلتُ: يا رسول الله إنا قَد ذَبَحنا بُهيمةً لنا وطحَنَت صاعاً مِنْ شعيرٍ كان عندنا فتعال أنتَ في نفر معك فَصاح رسول الله(ﷺ)

وقال: يا اهْلَ الخندق إنّ جابراً قد صَنَعَ لكم سُؤْراً فَحَيَّهلاً بكم وقال رسول الله(ﷺ) لاتُنزلُنَّ بُرْمَتكم ولا تَخْبِزُنَّ عجينتكم حتى أجيء. فَجئتُ وجاء رسول الله(ﷺ) يَقدُمُ الناسَ حتى جئتُ امرأتي فقالت: بكَ و بك فقلتُ قد فعلتُ الذي قلتِ لي فأخرَجْتُ له عجينَتَنا فَبَصقَ فيها وبارك ثُمَّ عَمَدَ الى بُرمَتنا فَبَصَقَ فيها و بارك ثُمَ قال (ادْعي خابزةً فَلتخبز مَعَكِ وَقْدَحِي مِن بُرمتكم ولا تَنزلوها وهم أَلْفٌ فأقسِمُ بالله لأكلوا حتى تركوه وانحرفوا وَإنَّ بُرمتنا لَتَغطُّ كما هي وإن عجينتنا أو كما قال الضحاك لَتُخْبَزُ كما هوَ. رواه: البخاري (٣٠٧٠) ومسلم (٢٠٣٩).

**ماناى ووشه:**

١-خمصاً: (الخمصُ) الجوعُ. واته: برسيەتى.

٢- انكفأت: (رجعت) گەرامەوە.

٣- جِراباً: وعاءُ من جلد او نحوه. كيس و جەوالێك لە پێستەو يا لەم شێوە.

٤- صاع: (صاع) چوار(مُدّ)ە يەك(مُدّ)(٥٤٤) غرامە لە گەنم كەواتە يەك(صاع) لەگەنم دەكا دوو كيلۆو(١٧٦) غرام. كەواتە هەموو جۆيەكەى ماڵى جابر لە دوو كيلۆو نيو كەمتر بووە.

٥- بُهَيمَةٌ: شاةٌ صغيرة، كاورێكى گچكە.

٦- داجن: دەستەمۆ(والداجن ما يألف البيوت من البهائم،

داجن: ئەو ئاژەڵەیە کە هۆگری ماڵان بووە.

٧- ففرغَت الی فراغی: پێکەوە لێبوینەوە.

٨- بُرْمَتَها: (بُرمة) مەنجەڵ.

٩- لا تفْضَحْنی: روو زەردم نەکەی(فَضَحَهُ) واتە: کَشَفَ مساویهُ: یانی : خراپەکانی دەرخست.

١٠- سُؤراً: (هو الطعام الذي يُدعی اليه) ئەو خواردنەیە کە خەڵکی بۆ بانگ دەکرێ.

١١- فَحَیَّهلاً: تعالوا: وەرن.

١٢- بك و بك: خاصَمَتهُ وسَبَّتهُ: دەمەقاڵێ لەگەڵ کردو قسەی ناشیرنی بە جابر گوت.

١٣- وبارك: دوعای بەرەکەتی کرد.

**مانای فەرموودەکە:**

جابری کوڕی عبدالله(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لە رۆژی غەزای(خەندەق) کاتێ کە خەندەك لێ دەدراو هەڵدەکەنرا، پێغەمبەرم بینی(ﷺ) برسی بوو، گەڕامەوە بۆ لای خێزانەکەم و پێم گوت: ئایا هیچ خواردنێکت لا هەیە؟ چونکە بێگومان برسیەتیەکی زۆرم بە پێغەمبەری خوا بینیوە(ﷺ)، جا ئەویش هەمبانەیەکی بۆ دەرهێنام(صاع)ێك جۆی تێدا بوو(نزیکەی دەکا دوو کیلۆو نیو) وە کاورۆکەکی دەستەمۆمان هەبوو، جا کاورۆکەکەم سەربری ئەویش جۆیەکەی هاڕی پێکەوە لە کارەکەمان بوینەوە جا کاورۆکەکەم پارچە پارچە کرد لە ناو ئەو مەنجەڵەی کە پێی لێ دەنێن لە پاشان رۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)

خێزانەکەم پێی گوتم نەچی رووزەردم بکەی پێغەمبەرو ئەوانەی لەگەڵی دان هەموویان بێنی جابر(رەزای خوای لیٚ بێت) دەڵیٚ: چوومە لای پێغەمبەر(ﷺ) بەنهێنی پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا کاورۆکەکمان سەربریوە وە(صاع)ێك جۆشمان هەبوو خێزانەکەم هاریتی تۆو چەند کەسێك بفەرموونە ماڵی ئێمە بۆ نان خواردن جابر(رەزای خوای لیٚ بێت) دەڵیٚ: پێغەمبەر(ﷺ) هاواری کرد ئەی خەڵکی خەندەق جابر خواردنێکی کردووە وەرن.

جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: مەنجەڵەکەتان مەهێننە خوارەوە، هەویرەکەشتان مەکەنە نان تا دێم، جابر دەڵیٚ: جا هاتمەوە، وە پێغەمبەریش(ﷺ) ئەویش بە پێش خەڵکەکە کەوت و هات جا کاتێك چوومە لای خێزانەکەم، خێزانەکەم دابەزیە سەرم جا منیش پێم گوت ئەوەی تۆ گوتت من هەر ئەوەندەم گوت و کرد، جا هەویرەکەم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەرهێنا تفێکی تیٚ کردوو وە دوعای بەرەکەتی لەسەر خوێند لە پاشان چووە لای مەنجەڵەکە تفێکی تیٚ کردوو دوعای بەرەکەتی بەسەر ئەویشدا کرد، لە پاشان فەرمووی بە خێزانەکەم نان کەرێکی تریش بانگ بکە با لەگەڵ تۆ نان بکا وە خواردنیش لە مەنجەڵەکە تیٚ بکەن و مەنجەڵەکە مەهێننە خوارەوە جا ئەو خەڵکانەی ئامادە بوون(١٠٠٠) کەس بوون سوێند بە خوا هەموویان نانیان خوارد تا لەبەریان ماوە جا رۆیشتن مەنجەڵەکەمان بلقە بلقی دەهات و وەکو خۆی بوو هیچی لیٚ کەم نەببۆوەو وە هەویرەکەشمان وەکو خۆی مابۆوەو هیچی لیٚ کەم نەبوو بوو.

## شەق بوونی مانگ:

عن أنس(رضي الله عنه) قال: سأَلَ أَهْلُ مَكّةَ أنْ يُرِيَهُم آيةً فأراهم انشقاق القمر. رواه البخاري(٤٨٦٧) ومسلم(٢٨٠٢).

١-آية: واتە(علامە) یانی نیشانە.

٢- إنشقاق: دوو لەت بوون دوو کەرت بوون.

واتە: ئەنەس(رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: خەڵکی مەککە داوایان کرد لە پیٚغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە نیشانەیەکیان پیٚ نیشان بدات جا پیٚغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مانگ شەق بوونی نیشان دان.

## سوود:

١) لەگیٚرانەوەی (مسلم)دا دەڵیٚ:(فأراهُم انشقاق القَمَر مَرّتين) واتە: دوو جار مانگ دوو لەت بوونی نیشان دان.

٢) (قاضي عياض) رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت دەڵیٚ: انشقاق القمرِ من امهات معجزات نبينا(صلى الله عليه وسلم) واتە: مانگ شەق بوون لە موعجیزە گەورەکانی پیٚغەمبەری ئیٚمەیە(صلى الله عليه وسلم).

٢) عن عبدالله بنِ مسعود(رضي الله عنه) قالَ: انشقَّ القَمَرُ على عهد رسول اللهِ(صلى الله عليه وسلم) فِلْقَتين فَستَرَ الجَبلُ فِلْقَةً وكانت فِلْقَةٌ فوقَ الجَبَلِ فقال رسول الله(صلى الله عليه وسلم) أللهُمَّ اشْهد. رواه البخاري(٤٨٦٤) ومسلم(٢٨٠٠).

واتە: عبدالله کوڕی مەسعود(رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: مانگ شەق بوو لە زەمانی پیٚغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو بە دوو بەش بەشیٚکیان سەری چیای داپۆشی وە بەشیٚکیشیان لەسەر چیایەکە بوو جا پیٚغەمبەر فەرمووی خوایە شایەت بە.

**سوود:**

١-ئەم ریوایەتە بەم شێوەی لای سەرەوە لە رێگای(عبدالله) کوڕی عومەرەوە هاتووە لە صحیحی مسلم.

٢- ئەم دەقەی لای سەرەوە لە گێرانەوەی(مسلم)ە گێرانەوەکەی(بخاری) کەمێك جیاوازە.

٣- عن ابن عباس(رضي الله عنه) قال: إنَّ القمر انشقَّ على زمان رسولِ الله(ﷺ). رواه البخاري(٤٨٦٦) ومسلم(٢٨٠٣).

واتە:( ابن عباس) رەزای خوایان لێ بێت دەڵێ: لە زەمانی پێغەمبەر(ﷺ) مانگ شەق بوو.

**سوود:**

باسی موعجیزەی مانگ شەق بوون لە قورئان دا هاتووە لە سەرەتای سورەتی(قمر).

## دابەزینی لقی دارخورما لە دارەکەی و گەرانەوەی بۆ شوێنی خۆی:

١) عن ابن عباس(رضي الله عنه) قال: جاءَ أعرابيٌّ الى رسول الله(ﷺ) قالَ: بِمَ أعرفُ أنَّكَ نبيٌّ؟ قال: إن دعوت هذا العذْق[1] من هذه النخلة، أتشهدُ أني رسولُ اللهِ؟ (ﷺ) فدعاهُ رسول الله(ﷺ) فجعلَ ينزلُ مِن النخلة حتى سقط الى النبي(ﷺ) ثم قال: ارجع فعاد

---

(1) الحذق: هو عنقود التمر.

فأسلم الاعرابي. صحيح رواه الترمذي(٣٦٢٨) دون قولهِ(فأسلم الاعرابي).

واته:(ابن عباس) رەزای خوای لیٚ بێت دەڵیٚ: عارەبەکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی بەچی بزانم کە تۆ پێغەمبەری جا پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر بانگی ئەم ووشیە خورمایە بکەم لەم دارخورمایە شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خوام؟

جا پێغەمبەر(ﷺ) بانگی ووشیە خورماکەی کرد ووشیەکە لە دار خورماکە دابەزی تا وەکو لای پێغەمبەر(ﷺ) کەوت، لە پاشان پێغەمبەر(ﷺ) بە ووشیەکەی فەرموو بگەرێوە ووشیەکە گەرایەوە شوێنی خۆی جا عارەبە دەشتەکیەکە موسڵمان بوو.

## شەهید بوونی عەممار:

١- عن عِكرمة قال لِي ابن عباسٍ ولابنهِ عليّ انطلِقا الى أبي سعيد فاستمعا منْ حديثهِ فانطلقنا فاذا هو في حائطٍ يُصلحُهُ فأخَذَ رداءَهُ فاحْتبى ثُمَّ انشأَ يُحَدِّثُنا حتى أتى على ذكرِ بناء المَسجدِ فقال: كُنّا نَحْمِلُ لَبِنَة وعَمار لَبِنتينِ لَبنتين فرآهُ النبيُ(ﷺ) فَينفضُ الترابَ عَنهُ ويَقولُ: وَيْحَ عَمّار تَقتُلُهُ الفِئةُ الباغية يدعوهم الى الجنَّةِ ويدعونهُ الى النار قال يقولُ عمّار: أعوذُ بالله من الفتن. رواه البخاري(٤٤٧).

١) حائط: باخ

٢) الرِداء: جمع الاردية: ما يَلبس فوق الثياب كالعباءَة، واته:

ئەوەی کە لە سەر جل و بەرگ لەبەر دەکرێ وەك عەباو جوببە.

٣) لَبِنة: خشت.

٤) وَيْحَ: كلمة رحمة.

٥) الباغية: الخارجة عن طاعة الامام العدل: ئەوەی دەرچووە لە گوێ ڕایەڵی ئیمامێکی عەدل.

واتە: عیکرمە دەڵێ: (ابن عباس) ڕەزای خوای لێ بێت بە من و بە عەلی کوڕی گوت: با بچینە لای ابو سعید گوێ لە قسەکانی بگرین کە چووین لە باخەکەی دا بوو چاکی دەکرد جا عەباکەی لەبەر کرد دەستی کرد بە قسە کردن بۆمان تا گەیشتە سەر باسی مزگەوت دوروست کردن گوتی ئێمە یەك خشت یەك خشتمان هەڵدەگرت بەڵام عەممار دوو خشت دوو خشتی هەڵدەگرت، پێغەمبەر(ﷺ) دیتی تۆزو خۆڵی لە(عمار) دادەوەشاندو فەرمووی ئەی هاوار بۆ عەممار کە کۆمەڵێکی باغی[1] دەیکوژن ئەو بانگیان دەکات بۆ بەهەشت ئەوانیش بانگی دەکەن بۆ ئاگر. ئەبو سعید دەڵێ: عەممار دەیگوت خۆم دەپارێزم بە خوا لە(فتنە).

٢- عن اُمّ سَلَمَةَ(رضی الله عنها) قالت قال رسول الله(ﷺ) (تَقْتُلُ عَمّاراً الفِئَةُ الباغِية) رواه مسلم(٢٩١٦).

واتە: (ام سلمە) ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: کۆمەڵێکی باغی عەممار دەکوژن.

٣) عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) أَبْشِر عمّار

---

(1) کۆمەڵێکی باغی: واتە: ئەو کۆمەڵەی کە لە گوێ ڕایەڵی ئیمامێکی(عدل) دەرچووینە.

تَقْتُلُكَ الفِئة الباغية. صحيح رواه الترمذي(٣٨٠٢).

واته: ئەبو هورەیرە(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: موژدەت لیٚ بیٚت عەممار کۆمەڵیٚکی باغی دەتکوژن.

## سوود:

کوژرانی عەممار(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) بە دەستی کۆمەڵیٚکی باغی چەندین ئەصحابە گیٚرایتیانەوە لە پیٚغەمبەر(ﷺ) هەروەکو لەمەپیٚش گیٚرانەوەی سیٚ ئەصحابەمان باس کرد ئەبو سەعیدی خودری لە صحیحی(بوخاری) ام سلمە لە صحیحی(مسلم) ئەبوهریرە لە سونەنی(ترمذي) پیٚغەمبەر(ﷺ) چۆن هەواڵی دا بە کوژرانی لە پاش چەندین ساڵ هەواڵەکەی بەڕاست دەرچوو ئەوەبوو لە شەڕی(صِفّین) لە ساڵی(٣٧) کۆچی دا کە لە نیٚوان ئیمام عەلی و موعاویە ڕووی دا(ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان بیٚت) کوژرا هەر چەندە لە سوپای موعاویە فەرمان درابوو کە کەس عەممار نەکوژیٚت بەڵام دوو ئەعرابی لە سوپای موعاویە بەم فەرمانەیان نەزانیبوو بۆیە عەممار‌یان لەسەر ئەسپ خستە خوارەوەو شەهیدیان کرد کە لەو کاتە تەمەنی(٩١) ساڵ بووە.

## صولحی إمام حسن(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت):

١- عن الحسن البَصريّ، سَمِعَ أبابكرة سمعتُ النبيّ(ﷺ) على المنبَر والحسنُ الى جَنبهِ ينظُر الى الناس مَرَّةً وَاليه مَرَّةً ويقول: إبني هذا سيدٌ ولَعَلَّ الله أن يُصلحَ بهِ بينَ فِئَتينِ منَ المسلمين. رواه البخارى(٣٧٤٦)

واته: حەسەنی بەسرایی(رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: گویٚم لە(ابوبكرة) بوو (رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەیگوت گویٚم لە پیٚغەمبەر بوو (ﷺ) لەسەر مینبەر(حسن)ی كوڕی امام(علی)یش لە تەنیشتی بوو پیٚغەمبەر(ﷺ) جاریٚك تەماشای خەڵكی دەكرد جاریٚكیش تەماشای ئەوی دەكرد وە دەیفەرموو: ئەوە كوڕی منە(سیّد)و گەورەیە رەجا وایە كە خوا بەهۆی ئەوەوە صولح بخاتە نیٚوان دوو كۆمەڵ لە موسڵمانان.

٢-عن أبي بكرةَ(رضي الله عنه) قال: صعد رسول الله(ﷺ) المنبَر فقال: إنَّ ابْني هذا سَيِّدٌ يُصلحُ اللهُ على يديهِ بين فئَتَيْنِ عظيمتين) صحيح رواه الترمذي(٣٧٧٣).

واتە: ئەبوبكرە(رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: پیٚغەمبەر(ﷺ) بەسەر دوانگە(منبر) كەوت فەرمووی (بیٚگومان ئەو كوڕی منە گەورەیە خودا بەهۆی ئەوەوە صولح دەخاتە نیٚوانی دوو كۆمەڵی گەورە.

## ئەم صولحەی ئیمام حسن چۆن بوو:

پاش شەهید كردنی ئیمام عەلی بەیعەت درا بە ئیمام(حسن)ی كوڕی كرا بە خەلیفە ئیمامی حەسەنیش(رەزای خوای لیٚ بیٚت) هەر لە ژیانی باوكیدا هانی باوكی دەدا بە ریٚگە چارەی شەڕ كیٚشەكانی حەل نەكاتەوە ئەو جەنگە نیٚو خۆییانەی موسڵمانانی بە فیتنەیەكی گەورە دەزانی كە هەیبەتو پاشە رۆژی دەولەتی ئیسلامی خستبووە مەترسییەوە هەر چەندە دەیزانی باوكی لەسەر حەقە وەخەفەتیٚكی زۆری بەو جەنگە خویٚناوییانە دەخوارد لە نیٚوان سەحابەكان دا. وە لە لایەكی تریشەوە متمانەی نەبوو بە خەڵكی كوفەو عیٚراق و دەیزانی هەر ئەوان هۆكاری سەرەكی هەموو فیتنەكانن و چەندین جار باوكیان دەستخەرۆ كرد بوو وە لە كاتی تەنگانەدا پشتیان لیٚ هەڵكردبوو بۆیە دەترسا خۆشی وەك باوكی

لیٚ بکەن وە متمانەی ئەوەی پیٚ نەدەکردن تا سەر پشتگیری لیٚ بکەن دژی معاویە بۆیە پاش شەش مانگ لە وەرگرتنی خەلافەت تەنازولی لیٚ کرد بۆ معاویەو خۆشی بەیعەتی دا بە معاویە ئیتر موسڵمانان بە گشتی بەیعەتیان دا بە معاویەو ناکۆکی و دوو بەرەکی کۆتایی پیٚ هات و موسڵمانان هەموو یەك ریزو دەنگ بوونەوەو ئەو ساڵەش ناونرا ساڵی(الجماعة). وە بە کۆتایی هاتن بە خەلافەتی ئیمام حسن(رەزای خوای لیٚ بێت) خەلافەتی راشدی کۆتایی هات کە(سی) ساڵی رێکی خایاند، پێغەمبەریش(ﷺ) سەبارەت بەوە فەرموویەتی(الخلافة بعدی ثلاثون سنة ثم ملك بعد ذلك)[1].

واتە: خەلیفایەتی لە دوای من(سی) ساڵ دەخایەنێت پاش ئەوە دەبێت بە پادشایەتی. بەڕاستی ئەم فەرموودەیە لە بەڵگەکانی ڕاستی پێغەمبەرایەتی(محمد)ە (ﷺ) کە لەسەر زەمینی واقعدا هاتەدی چونکە ئەبوبەکر(رەزای خوای لیٚ بیٚ) لە مانگی(ربیع الاول)ی ساڵی(١١)ی کۆچی دا بوو بە خەلیفە، ئیمامی حەسەنیش لە مانگی(ربیع الاول)ی ساڵی(٤١)ی کۆچی دا دەستی لە خەلافەت هەڵگرت بۆ معاویە کە ئەم ماوەش(٣٠) ساڵی رێك دەکات.

جا فەرموودەکەی پێغەمبەری ئەکرەم(ﷺ) هاتە دی و خوای گەورە لەسەر دەستی ئیمام حسن دا کۆتایی بەو فیتنە خوێناویە هێناو ئاگری شەڕی پیٚ کوژاندەوە هەزاران رەحمەتی خوا لە خۆی و باوکی و هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بێت[2].

---

(1) رواه الترمذي وابوداود و احمد وابن حبان واطبراني وقال الترمذی هذا حدیث حسن صحیح وصححه الالبانی.

(2) نیشانەکانی رۆژی دوایی و رووداوەکانی پێش هاتنی.

# باسی وەسوەسە

١-عن عبدالله(رضي الله عنه) قال: سُئل النبيُّ(صلى الله عليه وسلم) عن الوسوسةِ قال: تلك مَحْضُ الإيمان. رواه مسلم(١٣٣).

واتە: پرسیار لە پێغەمبەر کرا(صلى الله عليه وسلم) دەربارەی وەسوەسە فەرمووی: وەسوەسە نیشانەی ئیمانی پاك و بێ گەردە.

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قالَ جاءَ ناسٌ مِنْ أصحاب النبيِّ(صلى الله عليه وسلم) فَسألوهُ: إناَّ نَجِدُ في أنفسنا ما يتعاظَمُ أحدُنا أنْ يتكلَّمَ بهِ قال(وقد وجَدتُموهُ) قالوا: نعم قالَ: ذلك صَريحُ الايمانِ. رواه مسلم(١٣٢).

(يتعاظم أحدُنا أنْ يتكلَّمَ بهِ): اي يجد التكلم به أمراً عظيماً لأنهُ لا يليق بالله عزّ وجلَّ.

(صريح الايمان) أي إن الوسوسة علامة الايمان الصريح الخالص.

مانای فەرموودەکە: ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر هاتن پرسیاریان لێ کرد ووتیان ئێمە شتێك دێتە ناو دڵمان لامان گەورەیە ئەگەر بە قسە بیڵێین(چونکە لە خوا ناوەشێتەوە) فەرمووی: ئەوە نیشانەی ئیمانی پاك و بێ گەردە.

٣-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(صلى الله عليه وسلم) يأتي الشَّيطانُ أحَدَكُمْ فَيقولُ: مَنْ خَلَقَ كذا وكذا؟ حتَّى يقولَ لَهُ: مَنْ خَلَقَ ربَّكَ؟ فإذا بَلَغَ ذلكَ فَلْيَسْتَعِذْ باللهِ وَلْيَنْتَهِ. رواه مسلم(١٣٤).

واتە: شەیتان دێتە لای یەکێك لە ئێوەو دەڵێ: کێ ئەمەو ئەوەی دورست کردووە؟ تا پێی دەڵێ ئەدی کێ پەروەردگارتی دورست کردووە جا ئەگەر گەیشتە ئەمە با خۆی بپارێزی بە خواو واز بێنێ.

٤- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(صلى الله عليه وسلم) لايَزالُ الناسُ

يَتَساءَلونَ حَتَّى يُقالَ: هذا خَلَقَ اللهُ الخَلْقَ فَمَنْ خَلَقَ اللهَ؟ فمن وجَدَ مِن ذلك شيئاً فَلْيَقُلْ: آمَنْتُ باللهِ. رواه مسلم(١٣٤).

واتە: بەردەوام خەڵك پرسیار دەكەن تا دەگوترێ: ئەوە خودا ئەو دورست كراوانەی دورست كردووە ئەی كێ خوای دورست كردووە؟ جا هەر یەكێك شتێكی لەمەی بینی با بڵێ(آمَنْتُ باللهِ).

**سوود**:

﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُوا۟ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِى ٱلْغَىِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ﴾ (الاعراف:٢٠٠-٢٠٢)

واتە: وە ئەگەر وەسوەسەیەكت لە وەسوەسەی شەیتان هاتە دڵ خۆت بپارێزە بە خوا چونكە ئەو یەكجار بیسەرو زانایە، بێگومان ئەوانەی كە پارێزكارن هەر كاتێك وەسوەسەیەكیان لە شەیتانەوە تووش بوو یەكسەر خوایان دێتەوە یادو چاو-ی دڵ- یان دەكرێتەوەو دەبینین- ڕاستی دەدۆزنەوە- .

٥- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(صلى الله عليه وسلم) إنَّ الله عز وجل تَجاوزَ لأُمَّتي عَمّا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسها مالم تَعملْ أَو تَكلَّمْ به. رواه مسلم(١٢٧).

واتە: بێگومان خودا(عزوجل) خۆش بووە لە ئوممەتەكەم لەوەی كە بە دڵیان دا دێت مادام كاری پێ ناكەن یان بە قسە نەیڵێن.

٦-عن أبي العلاء عن عثمان بن العاص(رضي الله عنه) انَّهُ أَتَى النبيَّ(صلى الله عليه وسلم) فقال يا رسول الله إِنَّ الشّيطانَ قَدْ حالَ بيني و بينَ صلاتي و قِراءَتي يَلْبَسُها[1] عليَّ. فقالَ رسول الله(صلى الله عليه وسلم) ذاك شيطانٌ يُقالُ لَهُ خِنْزَبٌ فإذا احْسَستَهُ فَتَعَوَّذْ بالله منهُ واتْفُلْ على يَسارك قالَ فَفَعَلْتُ ذلكَ فَأَذْهَبَهُ اللهُ عَنّي. رواه مسلم(٢٢٠٣).

واته: عوسمانی کوڕی(أبی العاص)(ڕەزای خوای لیّ بیّت) چووەتە لای پیّغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) گوتوویەتی: ئەی پیّغەمبەری خوا شەیتان نویّژەکەم لیّ تیّك ئەداو قورئان خویّندنەکەم لیّ تیّکەڵ دەکا، پیّغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ئەوە شەیتانیّکە پیّ ی دەوتریّ(خِنْزَب) ئەگەر هەستت پیّی کرد خۆت بپاریّزە بە خوا لیّی دەڵیّ وام کرد خوا ئەوەی لیّ لا بردم.

٧- عن أبي زُمَيْلٍ- سماك بن الوليد- قال: سَأَلتُ ابن عباس فقُلْتُ: ما شيء أجِدُهُ في صَدري؟ قال: ماهُوَ؟ قلتُ: واللهِ ما أتكَلَّمُ بِهِ قال: فقالَ لي: أشيء مِنْ شَكّ قالَ ما نجا مِنْ ذلك احد حتى أنزل اللهُ عز وجَلَّ﴿فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾[2] الآية. قال:

---

(1) يلبسها: اي يخلطها و يشككني فيها.

(2) سورة يونس:٩٤.

فقالَ لِي: اذا وجَدْتَ في نفسِك شيئاً فَقُلْ﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْأَخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾. رواه ابو داود(٥١١٠) باسناد جيد.

واته: ئەبو زومەیل(ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: پرسیارم لە(ابن عباس) کرد(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) گوتم: ئەوە ئەو شتە چیە کە لە دڵما هەستی پیٚ دەکەم؟ گوتی: چی یە: گوتم بەخوا باسی ناکەم جا پیٚمی گوت: کەمیٚك لە شك و گومانە؟ وە دەستیشی کردە پیٚکەنین و گوتی: هیچ کەسیٚ لەو شك و گومانە رزگار نەبوو هەتا خوا عز وجلَّ ئەم ئایەتەی هەناردە خوارەوە﴿فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾ جا ووتی: ئەگەر شتیٚکت لە نەفست دا بینی بڵیٚ﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْأَخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾.

٨- عن عثمان بن عفان(رضي الله عنه) قال:تَمَنَّيتُ أنْ اكونَ سألتُ رَسولَ الله(صلى الله عليه وسلم) ماذا يُنجينا مِمَّا يُلقِي الشيطانُ مِنْ أنفُسِنا فقالَ أبوبكرٍ(رضي الله عنه) قَدْ سَألتُهُ عن ذلك فقال: يُنجيكُمْ منهُ ما أمَرتُ بِهِ عَمِّي أنْ يقولَهُ فَلَمْ يَقُلْهُ. قال المنذري: رواه أحمد و اسناده جيد حسن.

واته: عوسمانی کوڕی عەففان(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚت: خۆزگەم

خواست كه پرسيارم له پێغەمبەر(ﷺ) بكردبايە كەچى رزگارمان دەكات لەوەى شەيتان دەيخاتە دڵمان جا ابوبكر(رەزاى خواى لىٚ بێت) دەڵىٚ من پرسيارم لىٚ كرد دەربارەى ئەوە فەرمووى: رزگارتان دەكات لەوە ئەوەى كە فەرمانم بە مامم كرد بيڵىٚ نەيگوت(لا اله الا الله).

**سوود**:

**پرسيار/ ئەم پرسيارە لە(محمد مختار الشنقيطي) كراوە: إني ابتُليتُ بالوساوس اُريد مِنْ فضيلتكم انْ تَدُلّني على الطريق المخلّص لِي من ذلك؟**

**وەڵام: أما الوساوس فإنها اذا أصابت القلوب فإنَّ الله عزَّ وجل جعلها من دلائل الإيمان وشواهد العبودية للرحمن، ففي صحيح مسلم و غيره أن الصحابة(رضوان الله عليهم) جاءوا الى النبيِّ(ﷺ) فقالوا يا رسولَ الله إنَّ أحدنا يجدُ في نفسهِ ما يتعاظم أن يتكلم به فقال عليه الصلاة والسلام أوَ قد وجدتم ذلك ذاك صريح الإيمان. قال بعض العلماء قولُهُ(ذاك) اي تسلط الشيطان عليكم بالوساوس دليل على إيمانكم لأنّ الشيطان يتسلط على عدوه وأما وليُّهُ فلا يتسلط عليه، ولذلك يقول بعض العلماء إنَّ الإنسان قد بلغ بآلام الوسوسة درجة لا يبلغها بكثير صلاة ولا صيام تأتيها الوسوسة فيضيق بها صدره وسوسة في التوحيد وسوسة في أمور الصلاة وسوسة في الوضوء فتضيق بها نفسه فيدفعها بقدر ما يستطيع فلا يستطيع دفعها فيبلغهُ الله بجاهدها والصبر عليها ما لا يبلغه بكثير من الطاعات فاحْتَسِبْ اخي في الله في هذا البلاء واعلم انَّهُ بمجرد إيمانك انَّ اللهَ مبتليك.﴿الٓمٓ ۞ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ﴾ (العنكبوت:١-٢). وأما الأمر الثاني: فتعاطى الأسباب التي تعينك على**

البعد عن هذه الوساوس وأعظمها المحافظة على أذكار الصباح والمساء والإستعاذة بالله عز وجَلَّ عند الإحساس بالوسوسة قال الله عز وجَلَّ في كتابه ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ (فصلت:٣٦).

## چەند ڕوونکرنەوەیەك دەربارەی نوێژ و دەست نوێژو پاك و خاوێنی:

١-ئەگەر نوێژت تەواو کردو سەلامت دایەوە ئەگەر غوسلت تەواو کرد وە یا دەست نوێژت تەواو شووشت ئینجا لە پاشان گومانێکت لیٚ پەیدا بوو لە کەم و کوریەك تیایان دا ئەوە ئەو گومانە هیچ حیسابێکی بۆ ناکریٚ نوێژو غوسل و دەست نوێژەکەت تەواوە.

٢- (عُثیمین) دەڵیٚ: ئەگەر یەکێك لە نوێژو دەست نوێژ زۆر گومانی بۆ دورست دەبوو ئەوە وەسوەسەیە با حیسابی بۆ نەکات.

٣- ئاو کە یەکێك لە تام یا ڕەنگ یا بۆنی نەگۆڕا ئەگەر شتێکی پیسیشی بەرکەوت پیس نابێت.

٤- موسڵمان کە جەنابەتی لەسەر بوو ئەگەر دەستی تەر بوو بە شتێك کەوت ئەم شتە پیس نابێت وە هەروەها دەتوانی زیکرو دوعا بکات بەڵام لە مەزهەبی شافعی نابێت قورئان بخوێنێت مەگەر بۆ دوعا کردن وە ئاوی پیاو(منی) نوێژی لیٚ دێت بەڵام باشتر وایە لاببردریٚ.

٥- زەوی و دارو دیوارو هەموو ئەو شتانەی بە جێگیری بە زەویەوە نوساون ئەگەر پیسیەکیان بەرکەوت تەنها بە ووشك بوونەوە پاك دەبنەوە

ئەگەر شتە پیسەكەی پێوە نەمێنیٚ.

٦- ئەگەر موسڵمان دەست نوێژی هەبوو پرتە پرتێك لە كۆمی هات بەڵام دڵنیا نەبوو تەواو غازات دەرچووە یان نەء ئەوە دەست نوێژی نەشكاوە.

٧- ئەو ئاوەی كە غوسلی جەنابەتی پیٚ دەكەی ئەگەر پروشكت كەوتە ناو ئاوەكە هەر پاكەو پاككەرەوەیە بە مەرجێك تام و بۆن و رەنگی نەگۆریٚ.

٨- رستە ئەگەر جلێكی پیست هەڵخست لەسەریدا لە دوای لابردنی جلەكە بەرۆژ یا بە با ووشك بۆوە ئەوە دەتوانی جلی خاوێنی لەسەر هەڵبخەی.

٩- ئەگەر یەكێك نوێژی كرد لە دوای تەواو بوونی نوێژەكە بینی پیساییەك بە جلەكانی وەیە یا دەیزانی بەڵام لە بیری چوو بوو بیشوات ئەوە نوێژەكەی پێویست بە دووبارە كردنەوە ناكات تەنها شوێنە پیسەكە دەشوات.

١٠- میزو پاشەرۆكی ئەو تەیرو گیان لەبەرانەی گۆشتیان دەخوریٚ پیس نییە وەك كێشكەو كۆترو مریشك و مەرو بزن و چێڵ.

١١- ئەگەر دەست نوێژت نەبوو ویستت دەست نوێژ بشۆی مەرج نییە تارەتیش بكەی ئەگەر تەنگاو بووی دەچی تارەت دەكەی بەڵام ئەگەر تەنگاو نەبووی ناچی.

# ناوو سیفەتەکانی خوا[1]

١- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسولُ الله(ﷺ) (إنَّ للّه تسعةً و تسعين اسماً مائةً إلاّ واحداً من أحصاها دخَلَ الجنَّةَ، إنَّهُ وِتْر يحبُّ الوِتْر) رواه البخاري(٢٧٣٦) و مسلم(٢٦٧٧).

واتە: بێ گومان خوا نەوەدو نۆ ناوی هەیە سەد یەك کەم هەر کەسێك لەبەری بکات دەچێتە بەهەشت ئەو تاکەو تاکی خۆش دەوێ.

## سوود:

١-زاناکان دەفەرموون خودا لە نەوەدو نۆ ناو زیاتری هەن.

٢- (ترمذي) فەرموودەیەکی ریوایەت کردووە لە پێغەمبەر(ﷺ) کە نەوەدو نۆ ناوی ژماردووە بەڵام حافظ لە(الفتح:٢١٥/١١) دا دەڵێ فەرموودەکە ضعیفە، وابن تیمیە لە(مجموع الفتاوی)(٣٧٩/٦، ٣٨٢) باسی ئەوە دەکات کە ئەو زیادەیە وتەی پێغەمبەر(ﷺ) نی یە... بە هاودەنگی شارەزایان بە فەرموودەکە بەڵکو ترمذی لە هەندێ شێخی شامیەوە باسی کردووە.

٣- زانایان قاعیدەیەکیان هەیە دەڵێن(لا إثبات إلاّ بِنَصٍ ولانفيَ إلاّ بِنص) واتە: نابێ هیچ ناوو سیفەتێك بدرێتە پاڵ خودا تەنها دەبێ لە قورئان و فەرموودەی ڕاست دا هاتبێ وە نابێ هیچ ناوو سیفەتێك لە خودا نەفی بکەین تەنها بە بەڵگەی قورئان و فەرموودەی ڕاست نەبێت.

---

(1) بۆ ئەم بابەتە سوودم لە (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی)و(اسماء الحسنی) لەدانراوی (ماهر مقدم) وەرگرتووە.

٤- هەموو ناوێك سیفەتی خودایە بەڵام هەموو سیفەتێك مەرج نی یە ناو بێت بۆ خودا.

٥- خودا ناوو سیفەتی هەرە جوان و چاك و بەرزی هەن خوا دەفەرمووێ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَـٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ﴾ (الاسراء:١١٠).

واتە: ئەی محمد(ﷺ) بفەرموو: لە خوا بپارێنەوە یاخود لە(الرحمن) بپارێنەوە بەهەر كام لەم دوو ناوە لە خوا بپارێنەوە خوا ناوی هەرە بەرزو پەسندو چاكی هەن.

ئەوە دەربارەی ناوەكانی خودا هەروەك چۆن خودا بێ وێنەو هاوتایە ناوەكانیشی هەروایە. دەربارەی سیفەتەكانی خوا دەفەرمووێ﴿وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ (الروم:٢٤).

واتە: وە خوا سیفەتی هەرە بەرزی هەیە لە ئاسمانەكان و زەویدا وە ئەو باڵادەستی كار بەجێ یە.

(المثل) واتە:(صفة) و(وصف).

٦- ناوو سیفەتەكانی خوا هەرگیز وەكو ناوو سیفاتی ئینسان نین، خوا دەفەرموێ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ﴾ (شوری:١١). واتە: هیچ شتێك وەكو خوا نی یە، یانی لە زاتیداو لە سیفەتیداو لە ناوەكانی داو لە هەموو شتێكدا، هیچ شتێك وەكو خوا نی یە.

٧- بوخاری و غەیری بوخاریش دەڵێن(مَنْ احصاها) معناه: حَفِظَها، واتە: لەبەری بکات هەروەکو لە ریوایەتی تریش دا هاتووە(من حفظها).

٨- بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ناوو سیفەتەکانی خودا سەر لە باسی جۆرەکانی یەکخواناسین بدە لەم پەرتوکەدا.

## کۆمەڵێك لە ناوەکانی خودا

**١-الله**: خوا

أ-ئەم ناوە کۆکەرەوەی ناوو سیفەتەکانی خوایە، ئەگەر بەندە بەم ناوە بانگی خوای کرد ئەوە دەکا بە هەموو ناوو سیفەتەکانی بانگی کردووە.

ب- زۆربەی ئەهلی عیلم دەڵێن(الله) (الاسم الأعظم)ە الذي اذا دُعيَ بِهِ أجاب، وإذا سُئِلَ بِهِ اعطى.

ج- ئەم ناوە لە قورئان(٢٧٢٤) جار هاتووە هیچ ناوێکی تری خودا ئەوەندە نەهاتووە لە قورئان دا.

د- زۆربەی جاران بەم ناوە داوا لە خوا دەکرێ(اللهمَّ) واتە(یاالله) یانی: ئەی خودایە.

٢- **الأوَّل**: یەکەمین، پێش هەموو شت هەبووە.

٣- **الآخِر**: دوایەمین، ئاخیرەمین.

٤- **الظاهِر**: دیار، ئاشکرا.

٥- **الباطِن**: پەنهان.

خوا دەفەرمووێ:﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْءَاخِرُ وَٱلظَّـٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ (حدید:٣)، واتە: هەر ئەوە یەکەمین و دواهەمین وە دیارو نادیار وە ئەو بە هەموو شتێك ئاگایە. وە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ:(اللهم انت الأوَّلُ فليس قبلك شيءٌ، وانت الآخِرُ فليس بعدك شيءٌ، وانت الظاهِرُ فليس فوقك شيءٌ، وانت الباطنُ فليس دونك شيءٌ، إقض عنّا الدَّينَ واغننا من الفقر) رواه مسلم(٢٧١٣) عن ابي هريرة.

٦- **الرحمن**: زۆر زۆر بە بەزەیی.

٧- **الرحيم**: زۆر بەرەحم.

(الرحمن) وە(الرحيم) دوو ناوو دوو سیفەتی خوان هەردووکیان لە چاوگ (مصدر)ی (الرحمة) وەرگیراون، وە هەردووکیان سیغەی موبالەغەن، بەلاّم(الرحمن) مانای موبالەغەی زیاتری تێدایە لە(الرحيم)، (الرحمن) وا دەگەیەنیّ کە خودا خاوەنی رەحمەتی زۆرە وە(الرحيم) مانای وایە خودا خاوەنی رەحمە بەرامبەر بەندەکانی بەسەریان دا دەرژێنیّ لە دونیاو لە قیامەت وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ(رحمان النیا والآخرةِ ورَحیمَهُما).

٨- **المَلِك**: سەرۆك، پاشا.

خوا دەفەرمووێ﴿مَلِكِ ٱلنَّاسِ﴾ پادشای خەڵك. ئەم ناوە بۆ خوا لە قورئان دا پێنج جاران هاتووە.

٩- **القُدُّوس**: پاك.

ئەم ناوە لە دوو شوێن لە قورئان دا هاتووە(الحشر:٢٣) (الجمعة:١) بەڵیّ خودای گەورە پاك و بیّ گەردە لە هەموو عەیب و کەم و کوری و ناتەواویەك.

١٠- **السَّلام**: بیّ عەیب بیّ پەلە، ئەم ناوە یەك جار هاتووە بۆ خودا(الحشر:٢٣).

١١- **المؤمِن**: دڵنیاکەر، بەڕاست دانەر.

ئەم ناوە یەك جار لە قورئان دا هاتووە (الحشر:٢٣)

١٢- **المُهيمِن**: چاودێرو پارێزگار،

ئەم ناوە یەك جار لە قورئان دا هاتووە(الحشر:٢٣).

١٣- **العزيز**: زاڵ، دەستەڵاتدار

لە قورئان لە(٨٣) شوێن هاتووە كە مەبەست پێ ی سیفەتی خوا بێت.

١٤- **الجبار**: خاوەن شكۆ،

ئەم ناوە یەك جار لە قورئان دا هاتووە(الحشر:٢٣).

١٥- **المتكبِّر**: خۆبەگەورە زان،

ئەم ناوە یەك جار لە قورئان هاتووە لە ئایەتی(٢٣)ی سورەتی(الحشر) بەڕاستی بە تەنها خودایە شایانی خۆ بە گەورە زانین بێت چونكە ئەمە تەنها بۆ ئەو حەقەو بۆ هیچ كەسێكی تر رەواو هەق نییە كە خۆی بە گەورە بزانێ.

١٦-**الخالق**: دورستكەر، بنیات نەر. خودا دورست كەری هەموو شتێكە لەم بونەوەردا بە گیاندارو بێ گیانەوە، خوا دەفەرمووێ﴿وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ وَلِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ (الجاثية:٢٢)، واتە: وە خوا ئاسمانەكان و زەوی بە هەق و ڕاستی دورست كردووە بۆ ئەوە هەموو كەسێك جەزاو پاداشت بدرێتەوە بە گوێرەی ئەوەی كردوویەتی وە ئەوان ستەمیان لێ ناكرێت، وە دەفەرمووێ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ وَمَا تَعۡمَلُونَ﴾ (الصافات:٩٦)، واتە: وە خوا ئێوەی دورست كردووە وە هەرچیش ئێوە فەراهەمی ئەهێنن.

١٧- **البارئ**: بەدیهێنەر،

ئـەم نـاوە سـێ جـار لـە قورئانـدا هـاتووە دوو جـار لـە ئايـەتی(٥٤)ی سورەتی(البقرة) یەك جاریش لە ئایەتی(٢٤)ی سورەتی(الحشر).

**١٨- المُصَوِّر**: وێنەکێش،

خودا وێنە کێشەری هەموو دورست کراوەکانیتی خوای گەورە وێنەو شێوەو روخساری هەموو بەدی هێنراوەکانی دەکێشی بەو شێوەی کە دەیەوێ لە کورتی و درێژی و پانی و بەرینی و گەورەو گچکەیی و رەنگ و روخسار خوا لە باسی وێنە کێشانی ئادەمیزاد دەفەرموێت﴿فِیٓ أَیِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ﴾ (الانفطار:٨). واتە: لە هەر وێنەیەکدا کە خۆی ویستبێتی یەکی خستوویت.

**١٩- الغَفّار**: زۆر لێبوردە

ئـەم نـاوە پێـنج جـار لـە قورئـان دا هـاتووە، خـوا لـە سـورەتی(زمـر) ئايـەتی(٥) دەفـەرموێ﴿أَلَا هُوَ ٱلۡعَزِیزُ ٱلۡغَفَّـٰرُ﴾ واتـە: بێـدار بـە هـەر ئەو(خوا) زاڵی لێبوردووە.

**٢٠- القهار**[1] زۆر گەردن کەچکەر،

(قهّار) صیغە موبالەغەی(قاهر)ە (قهرهُ) واتە(جَبَرهُ) (اخضعَهُ)ملی پێ کەچ کرد، خوا دەفەرمووێ﴿فَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخۡلِفَ وَعۡدِهِۦ رُسُلَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِیزٞ ذُو ٱنتِقَامٖ یَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَیۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَـٰوَ ٰتُۖ

---

(1) القهار: صیغة مبالغة من القاهر فهو ابلغ منه.

﴿وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ﴾ (ابراهيم:٤٧- ٤٨)، واته: جا وا گومان مەبە خوا ئەو بەڵێنەی داویەتی بە پێغەمبەرانی بەدی ناهێنی بەڕاستی خوا خاوەن دەسەڵاتی تۆڵەسێنە لە ڕۆژێکدا کە ئەم زەوی یە دەگۆڕێ بە زەوی یەکی ترو ئاسمانەکانیش(دەگۆڕێن بە ئاسمانی تر) ئەوسا هەموو(لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە) دەردەکەون بۆ خوای تەنیای زۆر مل کەچکەر.

٢١- **الوَهّاب**[1]: زۆر بەخشەر،

خوا دەفەرموێ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ﴾ (ال عمران:٨)، واته: ئەی پەروەردگارمان دڵەکانمان لامەدە(لەرێ ی ڕاست) دوای ئەوەی کە ڕێنموونیت کردین وە پێمان ببەخشە بەزەیی یەك لە لای خۆتەوە بە ڕاستی هەر تۆی بەخشندە.

٢٢- **الرَّزّاق**[2]: ڕۆزی دەر،

خودا دەفەرموێ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ﴾ (الذاريات:٥٨)، واته: بەڕاستی تەنها خوا خۆی ڕۆزی دەرە کە خاوەن دەسەڵاتی زۆر بە هێزە.

٢٣- **الفتاح**: دەرووکەرەوە

(الفتاح): واتە بەردەوام کردنەوەی گرێکان و یەکالا کردنیان(کاری

---

(1) الهبة: العطيّة الخالية عن الاعواض و الاغراض فإذا كثرت تسمى صاحبها وهّاباً وهو من ابنية المبالغة.

(2) المعنى اللغوي: الرزاق في اللغة من صيغ المبالغة.

خـوداى بالادەسـتە)، خـوا دەفـەرموێ﴿قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَهُوَ الْفَتَّاحُ الْعَلِيمُ﴾ (سـبأ:٢٦)، واتـه: بلّـى پەروەردگارمان ئێمەو ئێوە كۆدەكاتەوە لە پاشان بڕيار دەدات لە نێوانمان دا بە هەق و ڕاستى وە هەر ئەوە دادوەرى زانا.

**٢٤- العليم**[1]: زۆر زانا

خودا زانايە بە هەموو دورست كراوەكان و نهێنييەكانيان بە گەورەو بچووكى و ديارو نادياری.

**٢٥- القـابض**: لێگـرەوە، وێكهێنـەر،(القـابض) وە(الباسـط) لـەو فەرموودەيـەى پێغەمبـەردا هـاتووە كـە دەفـەرمووێ:(إنَّ الله هـو الْمُـسَعِّرُ القـابضُ الباسـطُ الـرَّزاق....) حـديث صـحيح رواه الترمـذي(١٣١٤) وابـن ماجه(٢٢٠٠)، خـوا دەفەرمووێ﴿وَاللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُطُ﴾ (البقرة:٢٤٥)، واتە: وە خوا(ڕۆزى خۆى) ئەگرێتەوە وە فراوانى دەكات.

**٢٦- الباسط**: فراوانكەر،

خـوا دەفـەرمووێ﴿اللَّهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ﴾ (العنكبوت:٦٢)، واتـه: خـوا ڕۆزى فـراوان دەكـات بـۆ هـەر كەس لە بەندەكانى كە بيەوێ يا لێى كەم دەكات.

**٢٧- العليّ**: بەرز،

---

(1) العليم: من ابنية المبالغة.

ئەم ناوە(١١) جار لە قورئان دا هاتووە خوا دەفەرمووێ﴿لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ﴾ (الشورى:٤)، واتە: هەر بۆ خوایە هەرچی لە ئاسمانەکان وە هەرچی لە زەوی دایە وە ئەو(خوا) بەرزو گەورەیە.

٢٨- **الأعلى**: هەرە بەرز

خوا دەفەرمووێ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ (الأعلى-١)، واتە: بە پاکی یادی پەروەردگاری هەرە بڵندت بکە.

٢٩- **المتعال**: زۆر بەرز خۆ بە بەرز گر،

خوا دەفەرمویێ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلۡكَبِيرُ ٱلۡمُتَعَالِ﴾ (الرعد:٩)، واتە:(خوا) زانایە بە هەموو ديارو نادیارێك گەورەو بەرزە.

٣٠- **العظيم**: مەزن

٣١- **المجيد**[1]: پایە بەرز، خاوەن شکۆ،

ئەم ناوە دوو جار وەکو سیفەت لە قورئان دا بۆ خوا هاتووە، خوا دەفەرمووێ﴿إِنَّهُۥ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ﴾ (هود:٧٣)، واتە: بەڕاستی خوا سوپاس کراوی بەرزو بڵندە.

٣٢- **الكبير**: گەورە،

ئەم ناوە(٦) جار لە قورئان دا هاتووە کە مەبەست سیفەتی خوای گەورە بێت.

---

(1) المجيد في اللغة: من صيغ المبالغة على وزن(فعيل).

**٣٣- القادر**:تواناداار

خوا دەفەرموێ﴿قُلۡ هُوَ ٱلۡقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبۡعَثَ عَلَيۡكُمۡ عَذَابٗا مِّن فَوۡقِكُمۡ أَوۡ مِن تَحۡتِ أَرۡجُلِكُمۡ أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا وَيُذِيقَ بَعۡضَكُم بَأۡسَ بَعۡضٍۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَفۡقَهُونَ﴾ (الانعام:٦٥)، واتە: بڵێ هەر ئەو خوایە بە تواناو دەسەڵاتدارە کە سزایەکتان بۆ بنێرێت لەسەروتانەوە یان لە ژێر پێتانەوە یان سەرتان لێ بشێوێنێ و بتان کات بە چەند دەستەو تاقمێکەوە جا هەندێکتان بە هەندێکی ترتان سزاو ئازار بدات.

**٣٤- المقتدر**: خاوەن سەرچاوەی توانا،

خوا دەفەرمووێ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ ﴿٥٤﴾ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ﴿٥٥﴾﴾ (القمر:٥٤-٥٥)، واتە: بێ گومان پاریزکاران وان لە باخات و ڕووبارەکانی(بەهەشتدا) لە نیشتگەیەکی پەسندان لای پاشایەکی بە دەسەلاتی توانا.

**٣٥- القدير**: بە توانا

خوا دەفەرموێ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوّٗا قَدِيرًا﴾ (النساء:١٤٩)، واتە: بێ گومان خوا هەمیشە لێبوردەی بە توانایە وە دەفەرمووێ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ (الملك:١)، واتە: گەورەیە ئەو زاتەی کە هەرچی دەسەڵات و پاشایی هەیە بە دەست ئەوە وە

ئەو توانای هەیە بەسەر هەموو شتێکدا.

٣٦- **القويّ**: بە توانا

خــــوا دەفـــــەرموێ﴿ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ﴾ (الشورى:١٩)، واتـە: خـوا دڵسۆزە بە بەندەکانی هەر کەسی بوێ رسق و رۆزی دەدات وە هەر ئەو بەهێزو بە دەسەڵاتە.

٣٧- **المتين**[1]: بەهێز ، قایم

خـــــوا دەفـــــــەرموێ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ﴾ (الـذاريات:٥٨)، واتـە: بەڕاسـتی تـەنها خـوا خـۆی رۆزی دەرە کـە خـاوەن دەسەلاتی زۆر بەهێزە.

٣٨- **السّميع**: بیسەر

خــــوا دەفـــــەرموێ﴿قُلۡ إِن ضَلَلۡتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفۡسِيۖ وَإِنِ ٱهۡتَدَيۡتُ فَبِمَا يُوحِيٓ إِلَيَّ رَبِّيٓۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٞ قَرِيبٞ﴾ (ســـــبأ:٥٠)، واتـە: بڵـێ ئەگـەر مـن گـومرا بم ئـەوە زیانەکـەی تـەنیا بـۆ خۆمـە وە ئەگـەر رێنمونبم ئەوە بە هۆی ئەو(قورئانە)وەیە کە پـەروەردگارم بۆی نـاردووم بـە ڕاستی خوا بیسەرو نزیکە.

٣٩- **البصير**: بینەر

خــوا دەفــەرموێ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾

(1) المـتين في اللغـة: هـو الـشيء الثابـت في قوّتـهِ الـشديد في عزمـه وتماسـكه وصلابته.

(الشورى:١١)، واتە: هیچ شتێك وەك ئەو(خودا) نی یە وە ئەو بیسەرو بینایە.

خودا نە لە زاتی نە لە سیفەتەكانی وەك هیچ كام لە دورست كراوەكانی ناچێ وە خودا هیچ شتێك نی یە نەیبستێ و نەیبینێ.

٤٠- **الحيُّ**: زیندوو

خودا زیندووە بەبێ سەرەتاو دوایی هاتن واتە نەبوونی نەبووەو نەمانیشی بۆ نی یە كەواتە زیندوویەكەی لە خۆیەتی لە غەیری خۆی دەست كەوتی نەبووە.

٤١- **القيّوم**: تەدبیركەرو راگر(ی بوونەوەر)

خوا دەفەرموێ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَىُّ ٱلۡقَيُّومُ﴾ (ال عمران:٢)، واتە: خوا ئەو خوایەیە كە هیچ پەرستراوێكی بەڕاستی نییە بێجگە لەو زیندووی سەرپەرشتیكەرە.

خوا تەدبیركەرو راگری بونەوەرە بە گیاندارو بێ گیانەوە.

٤٢- **الغني**: دەوڵەمەند

خوا دەفەرموێ﴿وَرَبُّكَ ٱلۡغَنِيُّ ذُو ٱلرَّحۡمَةِۚ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفۡ مِنۢ بَعۡدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوۡمٍ ءَاخَرِينَ ١٣٣ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَأٰتٍۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ﴾ (الانعام:١٣٣- ١٣٤)، واتە: هەر پەروەردگاری تۆ بێ نیازەو خاوەنی میهرەبانییە ئەگەر بیەوێ لەناوتان دەبات وەكێ ی بوێت

دوای ئێوه دەیکاته جێنشین(ی ئێوه) وەك چۆن ئێوەی لەنەوەی کۆمەڵێکی تر بەدی هێنا(١٣٣) بێگومان هەر بەڵێنێکتان پێ دەدرێ هەر دێت وە ئێوه هەرگیز لە دەس خوا دەرناچن(١٣٤) خودای گەورە دەوڵەمەندە پێویستی بە هیچ کەسێك نی یە، بەڵام هەموو شتێك لەم بونەوەرە پێویستیان بە ئەو هەیە لە هەموو چرکەو هەنگاوو خەتەرەو حەرەکەیەکیان دا وە خوا دەفەرموێ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ (فاطر:١٥)، واتە: ئەی خەڵکینە هەر ئێوە هەژاری لای خوان وە تەنیا خوایە بێ نیازی ستایش کراوە.

٤٣- **الحق**: ڕاست، هەق

خوا دەفەرموێ﴿فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَـٰلُ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ﴾ (یونس:٣٢)، واتە: هەر ئەو خوایە پەروەردگاری ڕاستی ئێوەیە دەی لە پاش ڕاستی هیچ هەیە جگە لە گومرایی دەی چۆن لە ڕێگەی ڕاست لادەدرێن.

٤٤- **المبين**: ڕۆشن کەرەوە،

خوا دەفەرموێ﴿وَيَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ٱلْمُبِينُ﴾ (نور:٢٥)

واتە: وە ئەو کاتە دەزانن بەڕاستی هەر خوا هەقی ئاشکراو دیارە.

٤٥- **الوكيل**: کارپێ سپێرراوە، پشت و پەنا

خوا دەفەرموێ﴿ٱللَّهُ خَـٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ

﴿وَكِيلٌ﴾ (الزمر:٦٢) واته: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە وە هەر ئەویش پارێزەری هەموو شتێکە، وە دەفەرموێ﴿وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ﴾ (ال عمران:١٧٣)، واته: وە گوتیان هەر خوامان بەسە چەند پشت پێ بەستراوێکی چاکە.

٤٦- **المقيت**: دەسەڵاتدار، بژیوکەیێن

خوا دەفەرموێ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ مُّقِيتًا﴾[1] (النساء:٨٥)، واته: وە خوا هەمیشە بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە(چاودێرە).

٤٧- **النصير**:سەرخەر

خوا دەفەرموێ﴿فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَىٰكُمۡۚ نِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ﴾ (الانفال:٤٠)، واته: ئەوە بزانن بەڕاستی خوا پشتیوان و یارمەتی دەرتانە ئەو(خوا) باشترین پشتیوانە وە باشترین یاریدەدەرو سەرخەرتانە، وە خوا دەفەرموێ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ﴾ (غافر:٥١)، واته: بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانمان و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە سەرکەوتوو دەکەین لە ژیانی دونیادا وە لەو ڕۆژەی(قیامەت) کە شایەتەکان هەڵدەسنەوە.

---

(1) مقيتاً: مقتدراً

**٤٨- الرقيب**[1]: چاودێر

خوا دەفەرموێ﴿لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا﴾ (الاحزاب:٥٢) واتە: دوای ئەمانە(کە هاوسەرتن) هیچ ئافرەتێکت بۆ حەڵاڵ نی یە وە ناشتوانی بیان گۆڕی بە هاوسەرانی تر مەگەر وەك کەنیزەك ببیتە خاوەنی وە خوا بەسەر هەموو شتێکدا چاودێرە.

**٤٩- الوارث**: میراتگر

خوا دەفەرموێ﴿وَإِنَّا لَنَحۡنُ نُحۡيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحۡنُ ٱلۡوَٰرِثُونَ﴾ (الحجر:٢٣) واتە: بێ گومان هەر ئێمە دەژێنین و دەمرێنین هەر ئێمەش میراتگری هەموانین، وە دەفەرموێ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَرِثُ ٱلۡأَرۡضَ وَمَنۡ عَلَيۡهَا وَإِلَيۡنَا يُرۡجَعُونَ﴾ (مریم:٤٠)، واتە: بەڕاستی هەر ئێمە دەبینە میراتگری زەوی و ئەوەی لەسەریەتی وە هەر بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوە.

**٥٠- الحسيب**: لێپرسەرەوە

خوا دەفەرمووێ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٖ فَحَيُّواْ بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ أَوۡ

---

(1) الرقيب: هو الموصوف بالمراقبة، والرقابة تأتي بمعني الحفظ والحراسة، والانتظار مع الحذر والترقب، فالرقيب هو: الحارس الحافظ، الموكل بحفظ الشيء، المترصد له، المتحرز عن الغفلة منه.

رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا﴾ (النساء:٨٦)، واتـه: هـەر كاتێك سڵاوێكتان لێ كرا ئەوە بە چاكتر لەو سڵاوە سڵاو بكەن یان وەكو خۆی بیسەننەوە بێ گومان خوا هەمیشە لێ پرسەرەوەو چاودێرە بەسەر هەموو شتێكدا.

٥١- **الواحد**: یەك

خـوا دەفـەرموێ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ﴾ (ابـراهیم:٤٨)، واتـه: لـە رۆژێـكـدا كـە ئـەم زەوی یـە دەگـۆڕێ بـە زەوی یـەكی تـرو ئاسمانـەكانیش(دەگـۆڕین بـە ئاسمانێكی تر) ئەوسا هەموو(لە گۆڕەكانیان دێنە دەرەوە) دەردەكەون بۆ خوای تەنیای زاڵ بەسەر هەموو شتێكدا.

٥٢- **الاحد**: تاك ، تەنیا

خوا دەفـەرموێ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، واتـه ئـەی پێغەمبـەر بڵـێ: ئـەو خوایەی كە ناوی(الله)یە یەكتایە لە هەموو روویەكەوە.

٥٣- **الصَّمد**: رووی تێ دەكرێ بۆ هەموو پێداویسیەكان

خـوا دەفـەرموێ﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ﴾، واتـه: خـودا(المقـصود فی الحـوائج كلها) واته: رووی تێ دەكرێ بۆ هەموو پێداویستیەكان.

٥٤- **القريب**: نزیك

خـوا دەفـەرموێ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ

٤٨- **الرقيب**[1]: چاودێر

خوا دەفەرموێ﴿لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٍ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ رَّقِيبًا﴾ (الاحزاب:٥٢) واتە: دوای ئەمانە(کە هاوسەرتن) هیچ ئافرەتێکت بۆ حەڵاڵ نی یە وە ناشتوانی بیان گۆڕی بە هاوسەرانی تر مەگەر وەك كەنیزەك ببیتە خاوەنی وە خوا بەسەر هەموو شتێکدا چاودێرە.

٤٩- **الوارث**: میراتگر

خوا دەفەرموێ﴿وَإِنَّا لَنَحۡنُ نُحۡيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحۡنُ ٱلۡوَٰرِثُونَ﴾ (الحجر:٢٣) واتە: بێ گومان هەر ئێمە دەژێنین و دەمرێنین هەر ئێمەش میراتگری هەمووانین، وە دەفەرموێ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَرِثُ ٱلۡأَرۡضَ وَمَنۡ عَلَيۡهَا وَإِلَيۡنَا يُرۡجَعُونَ﴾ (مریم:٤٠)، واتە: بەڕاستی هەر ئێمە دەبینە میراتگری زەوی و ئەوەی لەسەریەتی وە هەر بۆ لای ئێمە دەگەرێنەوە.

٥٠- **الحسيب**: لێپرسەرەوە

خوا دەفەرمووێ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ أَوۡ

---

(1) الرقيب: هو الموصوف بالمراقبة، والرقابة تأتي بمعني الحفظ والحراسة، والانتظار مع الحذر والترقب، فالرقيب هو: الحارس الحافظ، الموكل بحفظ الشيء، المترصد له، المتحرز عن الغفلة منه.

رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا﴾ (النساء:٨٦)، واتە: هەر کاتێك سڵاوێکتان لێ کرا ئەوە بە چاکتر لەو سڵاوە سڵاو بکەن یان وەکو خۆی بیسەنەنەوە بێ گومان خوا هەمیشە لێ پرسەرەوەو چاودێرە بەسەر هەموو شتێکدا.

**٥١- الواحد**: یەك

خوا دەفەرموێ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ﴾ (ابراهیم:٤٨)، واتە: لە رۆژێکدا کە ئەم زەوی یە دەگۆڕێ بە زەوی یەکی ترو ئاسمانەکانیش(دەگۆڕین بە ئاسمانێکی تر) ئەوسا هەموو(لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە) دەردەکەون بۆ خوای تەنیای زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا.

**٥٢- الاحد**: تاك ، تەنیا

خوا دەفەرموێ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، واتە ئەی پێغەمبەر بڵێ: ئەو خوایەی کە ناوی(الله)یە یەکتایە لە هەموو روویەکەوە.

**٥٣- الصَّمد**: رووی تێ دەکرێ بۆ هەموو پێداویسیەکان

خوا دەفەرموێ﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ﴾، واتە: خودا(المقصود في الحوائج کلها) واتە: رووی تێ دەکرێ بۆ هەموو پێداویستیەکان.

**٥٤- القریب**: نزیك

خوا دەفەرموێ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ

﴿دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾ (البقــرة:١٨٦)، واتــه: وه ئهگــهر بهنــدهكانم دهربارهى من پرسياريان لىٚ كردى ئهوه من نزيكم وهلاٌمى داواى دووعاكهر دهدهمهوه ههر كاتيٚك بانگم بكات. وه دهفهرمووىٚ﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ وَنَعۡلَمُ مَا تُوَسۡوِسُ بِهِۦ نَفۡسُهُۥۖ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنۡ حَبۡلِ ٱلۡوَرِيدِ﴾ (ق:١٦)، واتــه:بــىٚ گومــان ئيٚمــه ئادهميمــان دورســت كــردووه ئهزانين و ئاگامان ههيه بهو حالٚ و خهتهرانهى ديٚن به دلٚ و دهرونى دا وه ئيٚمه لهوهوه نزيك ترين(بهزانياريمان) له شادهمارى دلٚى.

**٥٥- المجيب**: ولاٌمكۆ

خوا دهفهرمووىٚ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمۡ صَٰلِحٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا فَٱسۡتَغۡفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٞ مُّجِيبٞ﴾ (هــــود:٦١)، واته: وه بۆ گهلى سهموديش ناردمان صالح پيٚغهمبهرى برايان ووتى ئهى گهلهكهم خوا دورستى كردوون له زهوى دا وهكردونى به ئاوهدان كهرهوه تيٚيدا كهواته داواى ليٚبوردنى لىٚ بكهن پاشان بگهريٚنهوه بۆ لاى بهراستى پــهروهردگارم زۆر نزيكــى دوعــا وهرگــره، وه خــوا دهفــهرمووىٚ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ

عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ (غـــافر:٦٠)، واتـــه: وه پـەروەردگارتان فەرموويـەتی لـێم بپارێنـەوە وەلامتـان دەدەمـەوە بەڕاسـتی ئەوانـەی خـۆ بـە گـەورە دەزانـن کـە بمپـەرسـتن لـەمـەو پـاش بـە سـەر شـۆڕی دەچنە دۆزەخەوە

٥٦- **المليك**: پادشا

خــوا دەفــەرموێ ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ ۝٥٤ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ﴾ (القمـر:٥٤-٥٥)، واتـه: بـێ گومـان پارێزکـاران لـه نـاو باخـات و رووبارەکـانی(بەهەشـتدان) لـه نیـشتگەیەکی پەسـندان لای پادشـایەکی بـه دەستەلاتی توانا.

٥٧- **المالك**: خاوەن.

خوا دەفـەرمووێ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ واتـه خـاوەنی رۆژی پاداشـت و سزا.

٥٨- **الغفور**: لێبوردە، گوناح پۆش

خــوا دەفــەرمووێ﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ (الزمـر:٥٣)، واتـه:(ئـەی محمـد(ﷺ)) بڵـێ: ئـەی ئـەو بەندانـەم کـە زیـادە ڕەوی یـان کـردووە لـە تـاوان کـردن داو گونـاهی زۆریـان خـستۆوەتە سـەر شـانی خۆیـان نائومێـد مـەبن لـە ڕەحـم و بـەزەیی خـوا، چونکە بێگومان خوا لە هـەموو گوناهـەکانتان خـۆش دەبێـت بەڕاسـتی هـەر ئەوە لێ بوردەی بەبەزەییە.

٥٩- **الودود**: بەندەدۆست، خۆشویستراو

خوا دەفەرمووێ﴿ وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلۡوَدُودُ ﴾ (البروج-١٤).

واتە: وە ئەو لێبووردەیەو بەندەکانی خۆی خۆش دەوێت.

٦٠- **الكريم**: بەرێز، رێزگر، بەخشندە

خـــوا دەفـــەرموێت﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ﴾ (الانفطار:٦)، واتە: ئەی ئینسان چی تـۆی خەڵەتانـدووە بە پەروەردگاری گەورەت(بەخشندەت). هەرچی بەخشش هەیە ماددی و مەعنەوی هەموو ئـی خودایـە هـەموو گیانلەبـەران لـەو لاشـەی کە هـەیتیان لـەو تەمەنـەی کە پێیـان دراوە ئـەو هـەموو پێداویـستیەی کـە پێیـان دراوە هـەمووی ئـی خودایە، خودا لە دونیادا لەگەڵ دوژمنانیشی دا زۆر بەخشندەیە.

٦١- **الحكيم**[1]: کار بەجێ، لێزان

خـوا دەفـەرمووێ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ﴾ (المائـدة:٣٨)، واتـە: پیاوو ئافرەتی دز دەستیان ببڕن لە تۆڵەی ئەو دزیەی کردوویانە ئەمە تۆڵەو تەمێ کردنێکە لە لایەن خواوە وە خوا باڵا دەستی کار دورستە.

٦٢- **الحميد**: ستایش کراو، شایستەی سوپاس

خـــوا دەفـــەرموێ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ مِنۢ بَعۡدِ مَا قَنَطُواْ وَيَنشُرُ رَحۡمَتَهُۥۚ وَهُوَ ٱلۡوَلِيُّ ٱلۡحَمِيدُ﴾ (الـشورى:٢٨)، واتـە: وە خـوا

---

(1) صيغة مبالغة، على وزن فعيل.

ئەو زاتەیە کە باران دەبارێنێ لە پاش ئەوەی کە خەڵکی نائومێد بوون وە(بـاراني) رەحمـەتی خـۆی بڵاودەکاتـەوە وە هـەر ئـەو پـشتیوان و سوپاسکراوە.

٦٣- **الوَلِيُّ**: دۆست، یاریدەدەر

خـوا دەفـەرمووێ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ مِنۢ بَعۡدِ مَا قَنَطُواْ وَيَنشُرُ رَحۡمَتَهُۥۚ وَهُوَ ٱلۡوَلِىُّ ٱلۡحَمِيدُ﴾ (الشورى:٢٨)، واتـە: وە خـوا ئەو زاتەیە کە باران دەبارێنێ لە پاش ئەوەی کە خەڵکی نائومێد بوون وە(باراني) رەحمەتی خۆی بڵاودەکاتەوە وە هەر ئەو پشتیوان و سوپاس کراوە.

٦٤- **المولى**:

خـوا دەفـەرمووێ﴿فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَىٰكُمۡۚ نِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ﴾ (الانفال:٤٠)، واتـە بـزانن بەڕاسـتی خـوا پـشتیوان و یارمـەتی دەرتانە ئەو(خوا) باشترین پشتیوانە وە باشترین یاریدەدەرو سەرخەرتانە.

٦٥- **الرؤوف**[1]: میهرەبان

خـوا دەفـەرمووێ﴿يَوۡمَ تَجِدُ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ مِنۡ خَيۡرٖ مُّحۡضَرٗا وَمَا عَمِلَتۡ مِن سُوٓءٖ تَوَدُّ لَوۡ أَنَّ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَهُۥٓ أَمَدَۢا بَعِيدٗاۗ

---

(1) الرؤوف: صيغة مبالغة من اسم الفاعل الرائف، وهو الموصوف بالرأفة، والرأفة: أشد الرحمة وأبلغها وأعلى معانيها.

﴿وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ﴾ (ال عمران:٣٠).

واته:( بترسن) لەو رۆژەی هەموو کەسێك دەبینێت هەر کارێکی باشی کردبێت ئامادەیە وە هەر کارێکی خراپی کردبێت ئاوات دەخوازێت کە لە نێوان ئەو و کارە خراپەکەیدا ماوەیەکی زۆر دوور ببوایە وە خوا دەتان ترسێنێ لە سزای خۆی وە خوا میهرەبانە بە بەندەکانی خۆی.

**٦٦- الحليم**: هێدی، ئارام

الحليم: من ابنية المبالغة على وزن فعيل لكثرة حلمه تعالى على عباده، خوا دەفەرمووێ﴿قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى ۗ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٌ﴾ (البقرة:٢٦٣)، واته: قسەیەکی خۆش وە چاو پۆشی( لە هەڵەدا) چاکترە لە خێرێك کە ئازارو دڵئێشاندنی بە دوادا بێ وە خوا بێ نیازێکی لەسەر خۆیە.

**٦٧- اللطيف**[1]: چاکەکاری پەنهان، وردبین

خـــــوا دەفــــــەرمووێ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾ (الملك:١٤)، ئایا ئەو خوایەی کە مەردوومی دورست کردووە ئاگای لە نەهێنیان نییە لە کاتێکدا کە ئەو ووردبین و ئاگادارە.

**٦٨- التواب**[2]: تەوبە وەرگر

---

(1) فهذا الاسم الكريم يتضمن: علمه بالاشياء الدقيقة وايصاله الرحمة بالطرق الخفية.

(2) التواب في اللغة: من صيغ المبالغة.

خـــوا دەفـــەرمووێ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ﴾ (الحجـرات:١٢)، واتــە: ئــەی ئــەو کەســانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان لە زۆرێك لـە گومانـەکان بپارێزن چونکە بەڕاستی هەندێك لە گومانەکان تاوانن سیخوری مەکەن(بو بەدوای ناتەواوی یـەکتردا مەگەڕێن) لە پاشملە بە خراپە باسی یەکتری مەکەن ئایا کام لە ئێوە پـێ ی خۆشە کە گۆشتی برا(ئاییـنی یەکەی) بخوات بە مردوویی بێگومـان قێزتـان لـێ ی دێتـەوەو پێتـان ناخۆشـە وە لـە خـوا بترسـن بێگومـان خـوا تەوبـە گیراکەری بە بەزەیی یە.

٦٩- **الخبير**[1]: شارەزا، هەواڵدەر

خـــــوا دەفـــــەرمووێ﴿قُل لِّلۡمُؤۡمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِمۡ وَيَحۡفَظُواْ فُرُوجَهُمۡۚ ذَٰلِكَ أَزۡكَىٰ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا يَصۡنَعُونَ﴾ (النـور:٣٠)، واتـە:(ئـەی محمـد(ﷺ)) بڵـێ بـە پیـاوانی ئیمانـدار چـاوی خۆیان(لە سەیرکردنی نامەحرەم) داخەن و بپارێزن وە عەورەتیان(لە داوێن پیسی) بپـارێزن ئـەوە چـاکترو پـاکترە بـۆ ئـەوان بێگومـان خـوا ئاگایـە بـە هەموو کردەوەیەك کە دەیکەن.

---

(1) الخبير في اللغـة: مـن مبـاني المبالغـة. فـالعلم إذا أضـيف الى الخفايـا الباطنـة، سمِّيَ خِبرة.

٧٠- **الرازق**: رۆزی دەری هەموو زیندەوەران

خـوا دەفـەرمووێ﴿وَٱرۡزُقۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ (المائـدة:١١٤)، واته:(خوا لەسەر زمانی عیسی پێغەمبەر دەفەرمووێ) وە رسق و رۆزیمان پیٚ ببەخشە چونکە تۆ باشترینی هەموو رۆزی دەرانی.

٧١- **الواسع**: فراوان

خـوا دەفـەرمووێ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (البقـرة:٢٦١)، واتـه: وێنەی(خێری) ئەوانەی کە ماڵی خۆیان بەخت دەکەن لە ریٚ ی خوادا وەك دەنکێك(تۆو) وایە(روابێت)و حەوت گوڵی گرتبێت لە هەر گوڵێکدا سەد دانەی تێدا بێت وە خوا لەمەش زیاتری دەکات بۆ هەر کەسێك خۆی بیەوێت وە خوا خاوەن بەهرە فراوانی زانایە.

٧٢- **الرَّبُّ**[1]: پەروەردگار

خوا دەفەرمووێ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾

واته: هەموو سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان.

(ربّ) لەم ئایەتەدا بە مانای دورستکەرو بەخێوکەرو بەرێوەبەری

(1) المعنى اللغوي: يطلق الربُّ في اللغة على: المالك والسيد، المدبر، المربي، القيم، المنعم، والمصلح والربُّ في الاصل من التربية وانشاء الشيء حالاً فحالاً الى التمام.

کاروبار هاتووه.

٧٣- **الجميل**: جوان له زات و سیفاتی دا

عن عبدالله بن مسعود(رضي الله عنه) عن النبيِّ(صلى الله عليه وسلم) قالَ: لا يدخلُ الجنة من كان في قلبه مثقالُ ذَرَّةٍ من كِبرْ، فقال رجُلٌ: إنَّ الرَّجُلَ يُحبُّ أن يكونَ ثوبُهُ حسناً، ونَعلُهُ حسنةً؟ قال: إنَّ الله جميل يحبُّ الجمال، الكِبْرُ بَطَرُ الحقِّ و غَمطُ الناس. رواه مسلم(٩١) وابوداود(٤٠٩١) والترمذي(٢٠٠٦)، واته: ناچێته بەهەشت ئەو کەسەی بە قەد یەك گەردیلە خۆ بە گەورە زانین لە دڵی دا هەبێت، پیاوێك گوتی: پیاوی وا هەیە حەز دەكا بەرگی جوان بێت پێڵاوی جوان بێت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بێ گومان خوا جوانەو جوانیشی خۆش دەوێت، خۆ بە گەورە زانین قەبول نەکردنی حەق و خەڵك بەکەم سەیر کردنە.

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە باسی جوانی و نورو گەورەیی خودا دەفەرمووێ(حجابُهُ النور، لو كشفَهُ لأَحرَقَتْ سُبُحاتُ وَجْهِهِ ما انتهى اليهِ بصره من خلقه) رواه مسلم(١٧٩)، واتە: پەردەی نێوان خوداو دورست کراوەکانی نوورو رۆناکیە ئەگەر لای ببات روناکی و جوانی و گەورەیی رووی خودا دەسوتێنی ئەوەندەی چاوی خوا بر بکات لە دورست کراوەکانی (چاوی خوداش هەموو دروستکراوەکانی دەبینێ کەواتە هەموو دورست کراوەکان دەسوتێن).

٧٤- **العفوّ**: چاو پۆشیکەر، لێبوردە

خوا دەفەرمووێ﴿إِن تُبْدُواْ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُواْ عَن سُوٓءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا﴾ (النساء:١٤٩)، واتە: ئەگەر خێرو چاکە

دەرخەن(بە ئاشکرا بیکەن) یان بیشارنەوە یان ببورن لە خراپەیەك ئەوە بێگومان خوا هەمیشە لێبوردەی بە توانایە.

عن عائشة قالت: قلت: يا رسول الله: أرايتَ إن عَلِمتُ أيَّ ليلةٍ ليلَةَ القدرِ ما أقولُ فيها؟ قال:(قولي: اللهمَّ إنَّك عَفوٌّ كريم تحبُّ العفوَ فاعْفُ عنّي) حديث صحيح رواه الترمذي(٣٥١٣).

### ٧٥- القاهر

خوا دەفەرمووێ﴿وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ﴾ (الانعام:١٨)، واتە: وە هەر ئەوە دەست ڕۆیشتوو بەسەر بەندەکانیدا هەر ئەویش کار دورستی ئاگادارە.

### ٧٦- البَرُّ: چاکەکار

خوا دەفەرمووێ﴿إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلُ نَدۡعُوهُۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡبَرُّ ٱلرَّحِيمُ﴾ (الطور:٢٨)، واتە(بەهەشتیەکان دەڵێن) بەراستی ئێمە لەمەو پێش خوامان دەپەرست و هاوارمان لێ دەکرد بەڕاستی ئەو چاکە کارێکی میهرەبانە.

وە دەفەرمووێ﴿وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَيۡهِ وَلَمۡ يَكُن جَبَّارًا عَصِيّٗا﴾ (مريم:١٤)، واتە(یحیی) هەڵس و کەوتی لەگەڵ دایك و باوکیدا جوان بوو، خۆ بە زل زان و سەرپێچی کەر نەبوو(لە فەرمانی خوا).

### ٧٧- الشَّهيد[1]: ئاگادار، ئامادە

---

(1) من افعال المبالغة على وزن فعّال، ويدل على كثرة خلق الله تبارك و تعالى وايجاده كمّاً وكيفاً.

خـــوا دەفـــەرمووێ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ (الحــــج:١٧)، واتـــــە: بەڕاستی کەسانێ کە بڕوایان هێناوە وە کەسانێ کە بوون بە جوولەکە وە ئەستێرە(یـا فریـشتە) پەرسـتەکان وە گاورەکـان(نەسـرانیەکان) وە ئـاگر پەرسـتەکان(زەردەشـتی یـەکان) وە ئەوانـەی هاوبەشـیان بـۆ خـوا دانـا بێگومان خوا بڕیار دەدا لە نێوانیان دا(جیایان دەکاتـەوە لـە یـەکتر کۆمـەڵێ بۆ بەهەشت کۆمـەڵێکی تریـان بـۆ دۆزەخ) لـە ڕۆژی دواییدا بەڕاستی خـوا بەسەر هەموو شتێکدا ئاگادارە.

**٧٨- الخلاّق**[1]: بەدیهێنەر

خـــوا دەفـــەرمووێ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ ۖ فَٱصْفَحِ ٱلصَّفْحَ ٱلْجَمِيلَ ﴿٨٥﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٦﴾﴾ (الحجــر٨٥- ٨٦)، واتــە: وە ئێمــە ئاسمانەکان و زەویمان دورست نەکردووە ئەوەش لە نێوانیان دایە بە هـەق و ڕاسـتی نـەبێت، وە بـێ گومـان ڕۆژی دوایـی دێـت تـۆش بـە جـوانی چاوپۆشی بکـە لێیـان(٨٥) بە ڕاستی پەروەردگارت هـەر ئەو زۆر دورست کارو داهێنەری زۆر ئاگاو زانایە.

---

(1) الشهيد في اللغة: صيغة مبالغة من اسم الفاعل الشاهد.

**٧٩- الشكور**[١]: سوپاس گوزار

خـــوا دەفـــەرمووێ﴿إِن تُقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنًا يُضَٰعِفۡهُ لَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ﴾ (التغابن:١٧)، واتـه: ئەگـەر قـەرز بدەن بە خـوا بـە قـەرزێكی چاك چەند بەرامبـەری دەكات بۆتـان وە لێتـان خۆش دەبێت وە خوا سوپاس گوزاری لەسەرخۆیە.

**٨٠- الشاكر**[٢]:

خـوا دەفـەرمووێ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرًا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ﴾ (البقـرة:١٥٨)، واتـــه: بەڕاســـتی صـــەفاو مەروە لە دورشمـەكانی(دینـی) خـوان جـا هـەر كەسـێك حـەجی مـاڵی خـوای كرد یا عومرەی كرد هیچ تاوانی ناگات كە تەوافی ئەو دووانـەش بكـات وە هـەر كەسـێك بـە ئـارەزووی خـۆی كـردی چـاكەیەك ئـەوە بـێ گومـان خـودا سوپاسگوزارێكی زانایە.

**٨١- الحفيظ**: پارێزەر

**٨٢- الأكرم**: زۆر بەخشەر

خـوا دەفـەمووێ﴿ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ﴾ (العلـق:٣)، واتـه: بخوێنـه و

---

(1) الـشكور في اللغـة: صـيغة مبالغـة مـن فعـول اي كـثير الـشكر والـشكر ابلـغ مـن شاكر.

(2) الشاكر في اللغة: اسم فاعل للموصوف بالشكر.

پەروەردگاری تۆش زۆر بەخشەرە.

(كريم) واتە: بەخشەر، (الأكرم) پلەی هەرە بەرزو باڵای(كريم)ە.

٨٣- **المُقَدِّمُ**: پێشخەر

٨٤- **المؤَخِّرُ**: دواخەر

عن علي بن ابي طالب(ﷺ) قال: من آخر ما يقول النبيُّ(ﷺ) بين التشهد والتسليم:(اللهم اغفر لي ما قدَّمتُ وما اخرتُ وما أسررتُ وما أعلنتُ وما أسرفتُ وما أنت أعلم به منّي أنت المُقَدِّمُ وانت المؤَخِّرُ لا إله إلا أنت) رواه مسلم(٧٧١)، واتە: ئیمامی عەلی(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: كۆتا شت پێغەمبەر(ﷺ) كە لە نێوانی تەحیات و سەلام دانەوە دەیگوت ئەمەبوو دەیفەرموو(ئەی خودایە لێم خۆش بە لەو گوناهەانەی كە پێش خۆم خستووەو دوای خۆم خستووە وە لەوەش كە بەنهێنی وەلەوەش كە بە ئاشكرا كردومن وە لەوەش كە زیادەرەویم تیادا كردووە وە لەوەش كە تۆ لەمن پێ ی ئاگادارتری و هیچ پەرستراوی بەڕاستی نی یە بێجگە لە تۆ).

٨٥- **المحيط**: دەورەدەر

خـــــوا دەفــــــەرمووێ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطٗا﴾(النساء:١٢٦)، واتە: تەنها بۆ خوایە هەرچی لە ئاسمانەكان و زەوی دا هەیە وە خوا هەمیشە دەوری هەموو شتێكی داوە(بەزانین و بە توانین و دەسەڵات و تەگبیرو بەرێوەبردنی هەموو كاروبارێك لە ژیان و لە پاش مردن.....).

وە خوا دەفەرمووێ﴿وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ (البقرة:١٩)، واتە: وە

خودا دەوری بێ بڕوایانی داوە.

٨٦- **الرفيق**[1]: نەرم و نیان

عن عائيشة(رضى الله عنها) قالت: قال رسول الله(ﷺ):(إنَّ اللهَ رفيقٌ يحبُّ الرِّفقَ في الأَمرِ كُلِّهِ) رواه مسلم(٢١٦٥).

واتە: بێ گومان خودا نەرم نیانە، نەرم و نیانیشی خۆش دەوێ لە هەموو کاروبارێکدا.

٨٧- **الحَيِيُّ**: بە شەرم

عن سلمان الفارسي عن النبيَّ(ﷺ) قال: إنَّ الله حَيِيٌّ كريمٌ يَستَحيى إذا رفَعَ الرَّجلُ إليهِ يَديهِ أنْ يَرُدَّهما صِفراً[2] خائِبَتَينِ[3]. حديث صحيح رواه الترمذي(٣٥٥٦)، واتە: بێ گومان خودا بەشەرم و بەخشندەیە شەرم دەکات ئەگەر یەکێك دوو دەستەکانی بەرز کردەوە بۆ لای ئەو بە بەتاڵی و نائومێدی بیگێڕێتەوە.

تێبینی: ناوی(الحَيِيُّ) جیایە لەگەڵ(الحَيُّ) ئەمە واتە زیندوو.

٨٨- **الإله**: پەرستراوی بە ڕاستی

خوا دەفەرمووێ﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ﴾ (البقرة:١٦٣)، واتە: وە پەرستراوی ئێوە پەرستراوێکی تاك و

---

(1) الرفيق في اللغة: من صيغ المبالغة والرفق ضد العنف أي لين الجانب ولطافة الفعل، والرفيق هو الذي يتولى العمل برفق ويأتي بمعنى الإرفاق: وهو العطاء كالترفق.

(2) صفراً: خاليتين من كل شيء.

(3) خائبتين: من الخيبة وهي الحرمان وعدم الحصول على المقصود.

تەنهایە هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نی یە بێجگە لەو کە بە بەزەیی بەخشندەیە.

**٨٩- المُحسن**: چاکەکار

قال رسول الله(ﷺ):(إنَّ الله عز وجَلَّ محسنٌ يُحبُّ الإحسان)، واتە: بێ گومان خودا (عز وجل) چاکەکارەو چاکەکاریشی خۆش دەوێ.

**٩٠- السِّتِّير**: داپۆشەری عەیب و گوناح

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ(إنَّ الله عز وجَلَّ حييٌّ ستِّير يحبُّ الحياء والستر فإذا اغتسلَ أحدكم فَلْيَسْتَتِر. صحيح النسائي(٣٩٣).

**٩١- السيِّد**: گەورە

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ:(السَّيد الله) صحيح أبو داود(٤٠٢١).

**٩٢- الشافي**: شیفادەر

عن عائشة(رضى الله عنها)قالت: كان رسول الله(ﷺ) إذا اشتكى منَّا إنسانٌ مسحَهُ بيمينه ثُمَّ قال: أذهب البأس ربَّ الناس واشف أنت الشَّافي لا شفاء إلاَّ شفاؤك شفاء لا يُغادر سقماً) **رواه مسلم(٢١٩١)،**

واتە: عائیشە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەگەر یەكێك لە ئێمە بیكوتبا شوێنێکم ئازاری هەیە، نەخۆشم پێغەمبەر(ﷺ) دەستی ڕاستی بەسەردا دەهێنا لە پاشان دەیفەرموو: پەروەردگاری خەڵك ئەم ئازارە لاببە شیفا بدە تۆ شیفادەری هیچ شیفایەك نی یە تەنها شیفای تۆ نەبێت شیفایەك کە هیچ نەخۆشیەك نەهێڵێ.

**٩٣- المُعطي**: بەخشەر

عن معاوية(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ):(من يُرِدِ اللهُ بِهِ خيراً

يُفَقّهْهُ في الدين واللهُ المعطي وأنا القاسم ولاتزال هذه الأمّةُ ظاهرين علــى مَــنْ خــالفهم حتــى يــأتِيَ أمــرُ اللهِ وهــم ظــاهِرون) رواه البخاري(٣١١٦).

واته: يەكێك خودا خێری بۆی بوێ شارەزای دەكات لە ئاینی خوا دەبەخشی وە من دابەشی دەكەم وە بەردەوام ئەم ئوممەتە سەركەوتوونە بەسەر ئەوانەی كە پێچەوانەیان دەكەن تا قیامەت ئەوان هەر سەركەوتوون.

**٩٤- الطيب**[1]: پاك و بێ گەرد

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ:(أيُّها النـاس إنَّ الله طيِّبٌ لا يَقبَلُ إلاّ طيِّباً) رواه مسلم(١٠١٥)، واته: ئەی خەڵكینە بێ گومان خودا پاك و بێ عەیبە شتی حەڵاڵ و بەگەرد نەبێ وەری ناگرێ.

**٩٥- المُسَعِّر**: نرخ دانەر

عن انس بن مالك قال: غلا السِّعرُ على عهد رسول الله(ﷺ) فقالوا يا رسول اللهِ سَعِّرْ لنا فقال(ﷺ)(إنَّ الله هو المسَعِّر القابض الباسط الرَّزَّاق) رواه الترمذي(١٣١٤)، واته: ئەنەس(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لە زەمانی پێغەمبەر(ﷺ) نرخی شت و مەك گران بوو گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا نرخمان بۆ دابنێ لەسەر شت و مەكەكان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بێ گومان هەر خوا نرخ دانەرو لێگرەوەو فراوانكەرو رۆزی دەرە.

**٩٦- السُبُّوح**: پاك و بێ گەرد

عن عائيشة(رضى الله عنها) أنَّ رسولَ الله(ﷺ) كان يقول في

---

(1) قال القاضي: الطيب في صفة الله تعالى بمعنى المنزه عن النقائص وهو بمعنى القدوس.

ركوعـه وسـجوده:(سُـبُوح قُـدّوس رب الملائكـةِ والـرُّوح) رواه مسلم(٤٨٧).

٩٧- **الحكم**[1]: فەرمان ڕەوا، حوکمران

پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرمووێ(إنَّ الله هـو الْحَكَـمُ واليـه الحُكـم) صحيح ابي داود(٤١٤٥)

٩٨- **الجواد**: سەخی

قـال رسـولُ الله(ﷺ):(إنَّ الله تعـالى جـواد يحـبُّ الجـود ويحـب معـالي الأخـلاق ويكـره سفاسـفها) سلـسلة الاحاديـث الصحيحة(١٦٢٧)،

واتـه: بـێ گومـان خـودا سـەخی یـەو سـەخیایەتی خـۆش دەوێـت وە ڕەوشـتەبەرزەکانی خـۆش دەوێـت وە ڕەوشـتە نـزمو خراپـەکانی پـێ ناخۆشە.

٩٩- **الوِتر**: تاك

عـن أبـي هريـرة(رضي الله عنه) قـال: قـال رسـول الله(ﷺ):(لله تـسعةٌ وتـسعونَ اسمـاً مائـةٌ إلاّ واحـداً لايحفَظها أحـدٌ إلاّ دخَـلَ الجنّـة وهـو وتـرٌ يُحِـبُّ الـوِتْرَ) رواه البخـاري (٦٤١٠) ومـسلم(٢٦٧٧). واتـه: بـۆ خـوا هەیـە(٩٩) نـاو(١٠٠) یـەك کـەم، هـەر یـەکێك لەبـەری بکـات دەچـێتە بەهەشت وە ئەو تاکەو تاکی خۆش دەوێ.

---

(1) الحكم: في اللغة: مـن صيغ المبالغة لاسم الفاعل الحاكم واصل هـذه الكلمـة مـن: المنـع وسمـى الحـاكم حاكمـاً لانـه يمنـع الخـصمين مـن التظـالم والحكـم القضاء بالعدل فالحاكم: هو الذي يحكم و يفصل و يقضي في سائر الامور.

### ١٠٠- الدَّيّان[١]:

عن جابر بن عبدالله(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(صلى الله عليه وسلم) قال:(يَحشُر الله تعالى العباد فيناديهم بصوتٍ يسمعُهُ مَنْ بَعُدَ كما يَسمع مَنْ قَرُبَ أنا الملك أنا الدَّيّان ولا ينبغي لأحدٍ من أهل النّار أن يدخُلَ النار وله عند احدٍ من اهل الجنة حق، حتى أَقصَّهُ منه ولا ينبغي لأحد من أهل الجنة أَن يدخُلَ الجنَّة ولأحدٍ من أهل النار عنده حق حتى أَقُصَّهُ منه حتّى اللطمة. **صحيح الادب المفرد(٧٤٦)**.

### ١٠١- الحَنّان[٢].

### ١٠٢- المنّان[٣].

عن انس(رضي الله عنه) قال: كنت جالساً مع رسول الله(صلى الله عليه وسلم) في المسجد ورجل يصلي فقال:(اللهم إني أسألك بأن لك الحمدُ لا اله الا انت الحنّان المنّان بديع السماوات والارض ياذا الجلال والإكرام يا حيُّ يا قيوم إني أسألك الجنة وأعوذ بك من النار قال(صلى الله عليه وسلم) أتدرون بما دعا؟ قالوا: الله ورسوله أعلم فقال(والذي نفسي بيدهِ لقد دعا الله باسمه الأعظم الذي إذا دعي به أجاب وإذا سئل به أعطى)[٤].

---

(1) الديان: صيغة مبالغة على وزن فعّال ويدل هذا الاسم الطيب على عدة معانٍ جلالٍ وكمال: على المجازي والمحاسب ويطلق على الملك المطاع والحاكم والقاضي وعلى القهار يقال: دان الناس أي قهرهم على الطاعة ويوم الدين أي يوم الجزاء والحساب.

(2) الحنان في اللغة: هو الرحمة والشفقة والعطف والمحبة.

(3) المنان في اللغة: من صيغ المبالغة على وزن فعّال.

(4) صحيح موارد الضمان(٢/٤٣٧) وصححه الارنؤط في الاحسان لإبن حبان(٣/١٧٥).

واته: ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ من لە مزگەوت دانیشتبووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) پیاوێك نوێژی دەكرد گوتی: ئەی خودایە ئەمن داوات لێ دەكەم كە هەرچی سوپاس ستایش هەیە بۆ تۆیە هیچ پەرستراوی بەڕاستی نی یە بێجگە لە تۆی(حنّان) و(منّان) بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوی ئەی خاوەنی گەورەیی و بەخشش ئەی زیندووی سەرپەرشتیكەر من داوای بەهەشتت لێ دەكەم وە خۆم دەپارێزم بەتۆ لە ئاگری دۆزەخ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا دەزانن بەچی داوای كرد؟ گوتیان: خواو پێغەمبەری خوا دەزانن فەرمووی: سوێندم بەوەی گیانی منی بە دەستە داوای لە خودا كرد بە ناوە هەرە گەورەكەی ئەو ناوەی ئەگەر بانگی پێ بكرێ خودا وەڵامی دەداتەوە وە ئەگەر داوای پێ بكرێ پێی دەدات.

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله(صلى الله عليه وسلم) قال: الا أَدُلكُم على ما يمحُو اللهُ به الخطايا و يَرفَعُ به الدَّرجاتِ؟ قالوا: بلى يا رسولَ اللهِ، قالَ: إسباغ ُ الوضوءِ على المكارةِ، وكثرةُ الخُطا الى المساجدِ، وانتظارُ الصلاةِ بعدَ الصلاةِ، فذلكم الرِّباطُ، فذلِكُم الرِّباطُ. رواه مسلم(٢٥١).

إسباغُ الوضوءِ: اتمامه واكماله، واته: دەست نوێژی جوان و تەمام.

الرِّباط: ئێشك گرتن، بریتییە لە مانەوەو ئارام گرتن لە سنوری دوژمندا بۆ پاراستنی موسڵمانان.

واتە: شتێكتان فێر بكەم كە خودا بە هۆیەوە گوناهتان پێ بسرێتەوەو پلەتان پێ بەرز بكاتەوە؟ وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: دەست نوێژی جوان گرتن لە كاتی ناخۆشیدا (وەك ئەوە ئاوەكە سارد بێت یا دونیا سارد بێت) وەزۆر هەنگاو نان بەرەو مزگەوتەكان، وە چاوەڕوانی نوێژ لە دوای نوێژ ئا ئەوەتان ئێشك گرتنە، ئا ئەوەتان ئێشك گرتنە.

٢-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله(صلى الله عليه وسلم) قال: إذا تَوضَّأَ العبدُ المسلم أَوِ المؤمنُ، فَغَسَلَ وجهَهُ خرجَ مِن وجهِهِ كُلُّ خطيئةٍ نَظَرَ اليها بِعَيْنَيهِ مَعَ الماءِ(او مَعَ آخرِ قَطْرِ الماء)، فإذا غَسَلَ يدَيْهِ خرج مِن يدَيهِ كُلُّ خطيئةٍ كان بَطَشَتْها يداهُ مع الماءِ،( او مَعَ آخرِ قَطْرِ الماء)، فأِذا غَسَلَ رِجليهِ خَرجتْ كُلُّ خطيئةٍ مَشَتْها رِجلاهُ مَعَ

الماءِ(او مَعَ آخرِ قَطْرِ الماء) حتى يَخرُجَ نَقياً من الذُنوب. رواه مسلم(٢٤٤).

واته: كاتێك بەندەی موسڵمان یان بەندەی باوەڕدار دەست نوێژ دەشوا كە دەم و چاوی شوشت ئەو گوناهانەی بە چاوەكانی كردوونی لەگەڵ چۆڕاوگەی ئاوی دەست نوێژەكەدا دەڕۆن، یا لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەكەدا دەڕۆن، كە دەستی دەشوات ئەو گوناهانەی بە دەستەكانی كردوونی لەگەڵ چۆڕاوگەی ئاوی دەست نوێژەكەدا دەڕۆن یا لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەكەدا دەڕۆن، كە هەردوو پێیەكانی دەشوات ئەو گوناهەی كە بە پێیەكانی بۆی ڕۆیشتووە لەگەڵ ئاوەكەدا دەڕۆن، یا لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەكەدا هەتا پاك دەبێتەوە لە گوناح.

٣- عن عمر بن الخطاب(رضي الله عنه) قال: قالَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) منْ توضَّأَ فأحْسَنَ الوُضوء، ثُمَّ قَالَ: أشهَدُ أن لاإله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أنَّ محمداً عبدهُ ورَسُولُه، اللهمَّ اجْعَلني مِنَ التَّوَّابين واجْعَلني مِنَ المتطهِّرين، فُتِحَتْ لَهُ ثمانيةُ أبواب الجنَّة، يَدْخُلُ من أيِّها شاء)[1]

واته: یەكێك دەست نوێژ بشوات بە جوانی لە پاشان بڵێت(اشهَدُ أن لااله الا الله وحده لا شريك له وأشهد أنَّ محمداً عبدهُ ورَسُولُه، اللهمَّ اجْعَلني مِنَ التَّوَّابين واجْعَلني مِنَ المتطهِّرين) هەشت دەرگاكانی بەهەشتی لێ دەكرێتەوە لە كامیان حەز بكات دەچێتە ژوورەوە.

(1) رواه مسلم(٢٣٤) والترمذي(٥٥) بەڵام ئەم بەشە(اللهمَّ اجْعَلني مِنَ التَّوَّابين واجْعَلني مِنَ المتطهِّرين) لە ریوایەتی مسلم دا نەهاتووە بەڵكو لە ریوایەتی(ترمذي)دا هاتووە كە(الباني) بە(صحيح)ی داناوە.

# فیقه دەربارەی دەست نوێژ

١- عن عمر بن الخطاب قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقولُ: إنما الأعمالُ بالنِّيات، وإنَّما لكلِّ إمْريءٍ مانوى،..... **رواه البخاري (١) ومسلم (١٩٠٧).**

**واتە: هەموو کردەوەیەك بەپێی نیەتە، نیەتی هەرکەس چۆن بوو، هەر ئاوای بەر دەکەوێت.**

**سوود:**

**١- نیەت هێنان بۆ دەست نوێژ شوشتن مەرجە، ئەگەر دەست نوێژ شوتن نیەتی لەگەڵدا نەبێت دانامەزرێ.**

**٢- نیەت شوێنەکەی دڵە، هەر یەکێك نیەت بێنێ بەقسە بۆ دەست نوێژو نوێژو زەکاتو حەجو خواپەرستیەکانی تر ئەمە کارێکی بیدعەو خراپو بێ شەرعیو ناجائیزی ئەنجام داوە.**

٢- عن أبي هريرة قال رسولُ الله (ﷺ): لولا أن أشُقَّ على أمتي لأمرتُهم بالسواك مع الوضوء. **صحيح : أنظر: ( صحيح الجامع ٥٣١٦).**

**واتە: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە ئوممەتەکەم سەغڵەت بکەم فەرمانم پێ دەکرن کەسیواك لەکاتی دەست نوێژشوشتن بەکار بێنن.**

**سوود**:

١- سیواك لەکاتی دەست نوێژ شوشتن پێش گوتنی (بسم الله) بەکار دێت.

٣- عن عبدالله بن زيد أنَّ رسول الله (ﷺ) مَسحَ رأسهُ بِيَدَيْه فَأقبلَ بهما وأدبرَ، بدأ بِمُقدمِ راسه حتى ذهب بهما الى قفاهُ ثم رَدَّهُما إلى المكان الذي بدأَ منه . **رواه البخاري** (١٨٥).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ)،، بەهەردوو دەستی مەسحی سەری کرد بردینە پێش‌و گێڕانیەوە دواوە، لەپێشە سەریەوە دەستی پیێ کرد ئینجا بەرەو پشتی ملی بردن، پاشان گێڕاینەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێیەوە دەستی پی ُکردبوو.

**سوود**:

مەسحی هەمووسەر فەرزە بۆ پیاوو ژن، لەمەزهەبی شافیعی مەسحی بەشێکی سەر بەسە، بەڵام ئیبن تەمیمیە مەسحی هەموو سەری بەپەسەند تر ناساندووە.

٤-عن عبدالله بن زيد قال: قال رسولُ الله (ﷺ)،: ألأذنان مِنَ الرأس. حسن: رواه ابن ماجه (٤٤٣).

واتە: دوو گوێیەکان بەشێکن لەسەر .

**سوود**:

١- لەمەزهەبی شافیعی مەسحی گوێیەکان سوننەتە .

٢- هەندێك دەڵێن مادام دوو گوێیەکان بەشێکن لەسەر کەواتە فەرزە مەسح بکرێن، ئەم فەرموودەیەش بەبەڵگە دەهێننەوە.

٣- لەفەرموودەی راستدا هاتووە کەپێغەمبەر (ﷺ)، ناوەوەو دەرەوەی گوێی مەسح کردووە.

٤- بەسەندێکی راست هاتووە کەئیبن عومەر ئاوێکی نوێی بەکارهێناوە بۆمەسحی گوێیەکانی.

٥- ئی وا هەیە لەزانایان لەدوای لێکۆڵینەوەی لەم فەرموودەی ژمارە (٤) دەڵێ زەعیفە.

٥- عن عروة بن الزبير عن عائشة: انَّ رسول الله(ﷺ) قَبَّلَ بَعضَ نسائهِ ثُمَّ خرجَ إلى الصلاةِ ولَمْ يَتوضَأْ، قلتُ ما هي إلاّ أنتِ فَضَحِكَتْ. صحيح: رواه ابوداود(١٧٩) والترمذي(٥٠٢).

واتە: عوروە دەڵێ: عائشە فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) یەکێك لە خێزانەکانی خۆی ماچ کرد لە پاشان چوو بۆ نوێژ و دەست نوێژیشی نەشوشتەوە، عوروە دەڵێ: گوتم ئەوە کەس نەبووە تەنها تۆ نەبیت، عائیشەش پێ کەنی.

## سوود:

١- دەست نوێژی پیاوو ئافرەت بەدەست لێدانو ماچو گەمەکردن ناشکێ ئەگەر بەئارەووش بێت.

٢- لەمەزهەبی شافیعی دەستنوێژ دەشکێ بەگەیشتنی پێستی پیاو بەپێستی ئافرەتی بێگانە، واتە ئەو ئافرەتەی مارەیی لەپیاوەکە بێت کە پەردە لەنێوان پێستیاندا نەبێت.

بەڵام ئیمام شافیعی رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: إذا صحَّ الحديث فهو مذهبي.

واتە: ئەگەر فەرموودەیەکی (صحیح)تان بینی ئەوە مەزهەبو رێبازی منە.

١-عن عبدالله بنِ عَمروٍ بْنِ العاص(رضي الله عنه) أنَّهُ سمع النبيَّ(صلى الله عليه وسلم) يقولُ: إذا سَمِعتُمُ المُؤَذِّنَ فقولوا مِثْلَ ما يقولُ، ثُمَّ صَلُّوا علىَّ، فإنَّه مَنْ صَلَّى علىَّ صلاةً صَلّى اللهُ عليه بِها عَشراً، ثُمَّ سَلُوا اللهَ لِيَ الوسيلةَ، فَإنَّها مَنْزِلَةٌ في الجنّةِ لا تنبغي إلاّ لِعَبدٍ مِنْ عبادِ اللهِ وأرجُو أنْ أكونَ أنا هو، فَمَنْ سألَ لي الوسيلةَ حَلَّتْ لهُ الشَّفاعَةُ. رواه مسلم(٣٨٤).

واته: هەر كات گوێتان لە بانگدەر بوو ئێوەش وەك ئەو بڵێن پاشان صەڵەواتم لەسەر بدەن چونكە هەر كەسێك یەك جار صەڵەواتم لەسەر بدات خوا بەهۆی ئەوەوە دە جار صەڵەواتی بۆ دەنێرێ لە پاشان داوای وەسیلەم بۆ لە خوا بكەن چونكە وەسیلە پلەو پایەیەكە لەبەهەشتیْ بەس بۆ یەك بەندە لە بەندەكانی خوا دەشێ وە من هیوادارم كە ئەو بەندەیە بم، جا هەر كەسێك داوای وەسیلەم بۆ لە خوا بكات شەفاعەتی بۆ شایستەو ڕەوا دەبێت.

## سوود:

١-ئەوانەی وەڵامی بانگ دەدەنەوە بانگ دەر چی دەڵێ ئەوانیش وا دەڵێن تەنها لە دوای گوتنی(حَيَّ على الصلاة) وە(حَيَّ على الفلاح) دەڵێن: (لا حول ولا قوة إلاّ بالله) هەروەك لە فەرموودەی تر هاتووە.

٢- لە دوای تەواو بوونی بانگ صەڵەوات دان لەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سوننەتە، لە باسی نوێژ بابەتێكمان نوسیوە لە ژێر ناوونیشانی(بەهێزترین صەڵەوات و ماناكەی) هەوڵ بدە ئەم صەڵەواتە لەبەر بكەی لە نوێژو لە

دوای بانگ و له شوێنی تر بیلێی زانایان دەڵێن صەڵەوات له دوای بانگ سوننەته بەلام ئەم چۆنیەتیەی که ئێستا هەندێ له بانگدەران دەیکەن به دەنگێکی بەرز له دوای بانگەکه دەیلێن بیدعەیەو جائز نییه، بەڵکو هەر ئینسانەو به شێوەیەك دەیلێ که بۆ خۆی گوێ ی لێ بێت.

٢- عن عمر بن الخطاب(رضي الله عنه) قال: قالَ رسول(صلى الله عليه وسلم) إذا قال الموذّن: الله اكبر الله اكبر، فقالَ أحدكُمْ: الله اكبر الله اكبر، ثُمَّ قالَ: أشهد أن لا اله الا الله، قال: أشهد أن لا اله الا الله، قالَ أشهد أنَّ محمداً رسول الله، قالَ: أشهد أن محمداً رسولُ الله، ثُمَّ قالَ حَيَّ على الصّلاة، قالَ: لا حول ولا قوة إلاّ بالله، ثُمَّ قالَ حَيَّ على الفلاح، قالَ: لا حول ولا قوة الا بالله ثُمَّ قالَ: الله اكبر الله اكبر قال الله اكبر الله اكبر، ثُمَّ قالَ لا اله الا الله قالَ: لا اله الا الله من قلبه دخَلَ الجنّة. رواه مسلم(٣٨٥) وابوداود(٥٢٧).

واته: عومەری کوری خەتتاب(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئەگەر بانگدەر گوتی الله اكبر الله اكبر، یەکێك له ئێوەش گوتی الله اكبر الله اكبر له پاشان گوتی اشهد ان لا اله الا الله ئەویش گوتی اشهد ان لا اله الا الله له پاشان گوتی اشهد ان محمدا رسول الله ئەویش گوتی اشهد ان محمدا رسول الله له پاشان گوتی حَيَّ على الصلاة ئەویش گوتی لا حول ولا قوة الا بالله له پاشان گوتی حَيًّ على الفلاح ئەویش گوتی لا حول ولا قوة الا بالله له پاشان گوتی الله اكبر الله اكبر ئەویش گوتی الله اكبر الله اكبر له پاشان گوتی: لا اله الا الله ئەویش گوتی لا اله الا الله له دڵیەوه دەچێته بەهەشت.

٣- عن جابر بن عبدالله: أنَّ رسول اللهِ(صلى الله عليه وسلم) قال:(من قال حين

يسمعُ النِّداءَ: اللهمَّ ربَّ هذه الدَّعوةِ التَّامَّةِ والصلاةِ القائمةِ آتِ مُحمّداً الوسيلةَ والفضيلةَ وابعَثْهُ مَقاماً محموداً الذي وعدتهُ حَلَّتْ لهُ شفاعتي يوم القيامة). **رواه البخاري(٦١٤) ومسلم(٣٨٣).**

**واته: هەر یەکێك گوێی لە بانگ بوو بڵێ:( اللهمَّ ربَّ هذه الدَّعوةِ التَّامَّةِ والصلاةِ القائمةِ آتِ مُحمّداً الوسيلةَ والفضيلةَ وابعَثْهُ مَقاماً محموداً الذي وعدتهُ) شەفاعەتی بۆ دەکەم لە قیامەت دا.**

## سوود:

**لە دوای بانگ ئەم دوعایە سوننەتە بخوێنرێ بەڵام لە دوای قامەت سوننەت نییەو هیچ دەقی شەرعی لەسەر نەهاتووە، ئەوانەش کە دەڵێن بە قیاس لەسەر بانگ لە دوای قامەتیش دەخوێنرێ زانایانی رۆچوو دەڵێن ئەم قیاسە بۆ ئەمە هەڵەیە خۆ ئەگەر گوتمان سوننەتە لە دوای قامەتیش بخوێنرێ بەڵام ئەو کاتەش نابێت بە دەنگی بەرز بخوێنرێ وەکو ئێستا زۆر لە مامۆستایان دەیکەن.**

٤- عن انس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قالَ رسول(صلى الله عليه وسلم) لا يُرَدُّ الدُّعاءُ بَينَ الأَذانِ والإقامَةِ. **صحيح رواه ابو داود(٥٢١) والترمذي(٢١٢).**

**واته: دوعاو پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت ناگێردرێتەوە(واتە قەبول دەبێت).**

# باسی نوێژ

## پلەو پایەی نوێژ

١-عن ابی هریره(رضي الله عنه) قال: سَمِعتُ رسول(صلى الله عليه وسلم) يقولُ: أرأيتم لو أنَّ نهراً بباب احدكم يغتسل منه كلَّ يومٍ خَمسَ مَرّاتٍ هلْ يبقى من دَرَنِه شىءٌ؟ قالوا لا يبقى من دَرَنِه شىءٌ، قال: فَذلك مَثَلُ الصلوات الخَمسِ، يَمْحُو اللهُ بِهِنَّ الخطايا. رواه البخارى(٥٢٨) ومسلم(٦٦٧).

أرَأيتم:(أَخبِرُونِي)، واته: پێم بڵێن، خەبەرم پێ بدەن

نَهراً: روبارێك

الدَّرَن: الوسخ، واته: چڵك

**ماناى فەرموودەكە:**

پێم بڵێن ئەگەر رووبارێك لەبەر دەرگای یەكێكتان دا بێت هەموو رۆژێ پێنج جاران خۆی لێ بشوات ئایا هیچ چڵكی پێوە دەمینێ؟ گوتیان هیچ چڵكی پێوە نامینێ، فەرمووی: دە ئەوە وێنەی پێنج نوێژەكانە كە خوا گوناحیان پێ دەسرێتەوە.

٢- عن عبدالله بن مسعود(رضي الله عنه) قال: سألتُ النبيَّ(صلى الله عليه وسلم) أيُّ العمل أحَبُّ الى الله؟ قال: الصلاةُ على وقتها، قلتُ ثُمَّ أيُّ؟ قال برُّ الوالدين قلتُ ثُمَّ أيُّ؟ قال: الجهاد في سبيل الله. رواه البخاري(٥٢٧) ومسلم(٨٥).

عبدالله كوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ لە پێغەمبەرم پرسیار كرد(صلى الله عليه وسلم) كام كردەوە خۆشەویسترە لای خوا؟ فەرمووی: نوێژ

کردن له سەرەتای کاتی خۆی، گوتم له پاش ئەوە چی تر؟ فەرمووی: چاکەکردن لەگەڵ دایك باوك، گوتم له پاش ئەوە چی تر؟ فەرمووی: جیهاد کردن له ڕێ ی خوادا.

٣- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول(صلى الله عليه وسلم): إنَّ أوَّلَ ما يُحاسَبُ بهِ العَبدُ يومَ القيامةِ من عمله صلاتُهُ فإنْ صَلحَتْ فقدْ أفلَحَ وأنجَحَ، وإنْ فسَدَتْ فقَد خابَ وخَسرَ فإن انتَقَصَ منْ فريضتهِ شيئاً قال الرَّبُّ عَزَّ وجَلَّ: انظُروا هل لعبدي من تطَوع، فيُكَمَّلُ منها ما انْتَقَصَ منَ الفَريضة، ثُمَّ يكونُ سائرُ أعمالهِ على هذا. صحيح رواه النسائي(٤٦٥).

واته: بێ گومان یەکەم شت کە بەندەی موسڵمان لە ڕۆژی قیامەت لێ ی دەپرسرێتەوە لە کردەوەی نوێژەکانیەتی، ئەگەر نوێژەکانی باش بوو ئەوە بە تەئکید ئەو کەسە سەرکەوتوو و ناجیحە، بەڵام ئەگەر نوێژەکانی خراپ بوو ئەو کەسە ڕەنجەڕۆو خەسارەت مەندە، بەڵام ئەگەر نوێژەکانی شتێکی لێ کەم کردبوو خوای پەروەردگاری زاڵ و پایەبەرز دەفەرمووێ: تەماشا بکەن ئایا ئەم بەندەیەی منە نوێژی سوننەتی هەیە؟ جا ئەو کەم و کوریەی کە لە نوێژە فەرزەکانیدا هەیە لە نوێژە سوننەتەکانی تەواو دەکرێ، لە پاشان باقی کردەوەکانی تریشی بەم شێوەیە دەبن.

٤- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) انَّ رسول الله(صلى الله عليه وسلم) كان يقولُ: الصَّلَواتُ الخَمسُ والجُمُعَةُ الى الجُمُعَةِ ورمضانُ الى رمضانَ مُكفِّرَاتٌ ما بَينَهُنَّ إذا اجْتَنَبَ الكبائرَ. رواه مسلم(٢٣٣).

واته: پێنج نوێژەکان و جومعە بۆ جومعە وە ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان دەبنە هۆی سڕینەوەو داپۆشینی گوناهی نێوانیان ئەگەر خاوەنەکەی

خۆی پاراستبێ لە گوناحە گەورەکان.

٥- عن أبي موسى(رضي الله عنه) انَّ رسول الله(ﷺ) قال: مَنْ صَلّى البَرْدَينِ دخَلَ الجنّة. رواه البخاري(٥٧٤) ومسلم(٦٣٥)

١-(البَرْدان) الصُّبحُ والعصر. واتە: نوێژی سبەینێ و عەسر.

مانای فەرموودەکە: هەر کەسێك نوێژی سبەینێ و عەسر بکات دەچێتە بەهەشت.

٦- عن ابي بكر بن عمارة بن رُؤَيْبَةَ عن أبيه قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: لَنْ يَلجَ النّارَ أحَدٌ صَلّى قَبلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وقَبْلَ غُرُبها، يعني الفجر والعصر. فقالَ لَهُ رَجُلٌ مِنْ أهلِ البَصرةِ أنتَ سمعتَ هذا مِنْ رسولِ الله(ﷺ)؟ قال: نَعم، قال الرجلُ: وأنا أَشهدُ انّي سَمعتُهُ مِنْ رسول الله(ﷺ) سَمعتُهُ اُذُناي وَوَعاهُ قَلْبي. رواه مسلم(٦٣٤) والنسائي(٤٧١).

واتە: باوکی ئەبوبەکری کوڕی عەمارە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر بوو(ﷺ) فەرمووی: ناچێتە ئاگر ئەو کەسەی کە نوێژی بەیانی و عەسر دەکات، جا پیاوێك لە خەڵکی بەسرە گوتی تۆ ئەو فەرموودەت بیستووە لە پێغەمبەری خوا؟ گوتی: بەڵێ، پیاوە بەسراییەکە گوتی: وە منیش شایەتی دەدەم کە ئەم فەرموودەیەم بە گوێیەکانی خۆم لە پێغەمبەر بیستووەو بە دڵیش تێی گەیشتوومە.

٧- عن جرير بن عبدالله قال: كُنّا جُلُوساً عند رسول الله(ﷺ) إذ نَظَر الى القمر ليلةَ البَدرِ فقال: أَمَا إنّكم سَتَرون ربَّكُم كما ترونَ هذا القمر لا تُضامُّون في رُؤْيَتهِ فإن استطعتم أن لا تُغلَبُوا على

صلاةٍ قبلَ طلوعِ الشَّمس و قبلَ غُروبها، ثم قرأ جرير﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ۖ﴾ رواه البخاري(٥٥٤) ومسلم(٦٣٣).

واته: جەریری کوڕی عبدالله(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئێمە لە لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین تەماشای مانگی چواردەی کرد فەرمووی: چۆن ئێستا ئەو مانگی چواردەیە دەبینن بێ گومان ئەوها پەروەردگارتان دەبینن لە بینینیدا توشی هیچ زەحمەتێ نابن(دەی بە ئومێدی شاد بوون بە بینینی پەروەردگارتان) تا دەتوانن ئاگاداری نوێژی بەیانی و عەسر بن و مەیان فەوتێنن، ئینجا جەریر ئەم ئایەتەی خوێندەوە﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ۖ﴾.

٨- عن عبادة بن الصامت(رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: خمسُ صلواتٍ كتَبَهُنَّ اللهُ على العباد مَن جاء بِهنَّ لم يُضَيِّع منهُنَّ شيئاً استخفافاً بحقهِنَّ كانَ له عند الله عهدٌ أن يُدخِلَهُ الجنَّة ومن لم يأتِ بِهنَّ فليس لَهُ عند الله عهدٌ إن شاءَ عَذَّبَهُ وإنْ شاءَ أدخَلَهُ الجنَّة. صحيح رواه النسائي(٤٦١) وابو داود(١٤٢٠).

واتە: خوا پێنج نوێژی لەسەر بەندەکان فەرز کردووە جا ئەوەی بیانکات و هیچیان لێ نەفەوتێنێ لەبەر بە سووك زانینیان ئەوە لە لایەن خواوە پەیمانی پێدراوە کە بیخاتە بەهەشتەوە ئەو کەسەش بەجێیان نەهێنێ ئەوە هیچ پەیمانێکی لە لایەن خواوە پێ نەدراوە ئەگەر خوا ویستی سزای دەدات وە ئەگەر ویستی دەیخاتە بەهەشتەوە.

# باسی نوێژ نەکەر

١-عن جابر(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله(صلى الله عليه وسلم) يقول: إنَّ بينَ الرَّجْلِ وبين الشِّرك والكُفر تَركُ الصَّلاة. رواه مسلم(٨٢).

واتە بێ گومان لە نێوان ئینسان و شیرك و كوفردا واز لە نوێژ هێنان هەیە.

٢- عن بريدة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(صلى الله عليه وسلم) قال: العهدُ الذي بيننا وبَينهم الصلاةُ فَمَنْ تركها فقَد كَفرَ. صحيح رواه الترمذي(٢٦٢١).

واتە: ئەو پەیمانەی لە نێوان ئێمەو ئەوان واتە: كافرەكان — دایە نوێژە جا هەر كەسێك وازی لێ بهێنێ ئەوە كافر بووە.

٣- عن عبدالله بن شقيق العُقيليِّ قال: كان أصحابُ محمد(صلى الله عليه وسلم) لا يرون شيئاً منَ الأعمالِ تركُهُ كُفرٌ غيرَ الصلاةِ. صحيح رواه الترمذي(٢٦٢٢).

واتە: هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) جگە لە نوێژ پێیان وابوو تەرك كردنی هیچ كردەوەیەك كوفر نی یە.

**سوود:**

١-لە نێوان چوار ئیمامەكە تەنها ئیمام احمد دەڵێ ئەو كەسەی ئیمانی هەبێت بە نوێژ كە واجبە بەڵام لەبەر تەمبەڵی نەیكات ئەوە كافرە.

٢- لە نێو زانایانی سەردەم(ابن باز) و(عثیمین) دەڵێن: یەكێك لەبەر تەمبەڵیش نوێژ نەكات پێ ی كافر دەبێت بەڵام شێخ(البانی) دەڵێ بە نوێژ نەكردن ئینسان كافر نابێت.

٤- عن عبادة بن الصامت(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله(صلى الله عليه وسلم) يقول: خمسُ صلواتٍ كَتَبَهُنَّ اللهُ على العبادِ مَن جاء بِهِنَّ لَمْ يُضَيِّع منهنَّ شيئاً إستخفافاً بِحَقِهِنَّ كانَ له عند اللهِ عهدٌ أنْ يُدخِلَهُ الجنّة ومن لم يأتِ بِهِنَّ فليس له عند الله عهدٌ إنْ شاء عَذَّبَهُ وأنْ شاءَ أدخَلَهُ الجنَّة. صحيح رواه النَّسائي(٤٦١) وابوداود(١٤٢٠).

واته: خوا پێنج نوێژی لەسەر بەندەکان فەرز کردووە جا ئەوەی بیانکات و هیچیان لێ نەفەوتێنێ لەبەر بە سووك زانینیان ئەوە لە لایەن خواوە پەیمانی پێدراوە کە بیخاتە بەهەشتەوە ئەو کەسەش بە جێیان نەهێنێ و ئەم پێنج نوێژە نەهێنی ئەوە هیچ پەیمانێکی لە لایەن خواوە پێ نەدراوە ئەگەر خوا ویستی سزای دەدات وە ئەگەر ویستی دەیخاتە بەهەشتەوە.

## سوود:

١-هەندێك ئەم فەرموودە بە بەڵگە دەهێننەوە لەسەر ئەوەی کە نوێژنەکەر کافر نی یە، لەبەر ئەم بەشەی فەرموودەکە(وإنْ شاءَ أدخَلَهُ الجنَّة).

٢- ئەم کاتەی تەمەنت کاتێکی زێرینە کە خودا پێی بەخشیویت نوێژیش یەکێکە لەو عیبادەتانەی کە زۆر پێی لە خوا نزیك دەبیەوە هەوڵ بدە ئەم کاتانە بەفیڕۆ نەدەی نوێژەکانت بە ڕێکی بکەیت نەك تەنها لە ماڵەوە بیکەی بەڵکو بە جەماعەت بیانکەی بە نوێژی سبەینانیشەوە.

## ئەوەی گوێی لەبانگ دەبێتو ناچێت بۆ مزگەوت

١-عن ابن عباس(رضي الله عنه) أن النبيَّ(صلى الله عليه وسلم) قال: منْ سمعَ النداء فلَمْ يُجبْ فلا صَلاة لَهُ إلاّ منْ عُذر[1].

**واتە: هەر کەسێك گوێی لە بانگ بوو وەڵامی نەداوەو نەچوو بۆ نوێژ ئەوە نوێژی نی یە مەگەر(عذر)ی هەبێت.**

**سوود**:

**ئەوانەی کە گوێیان لە بانگ دەبێت بەڵام ناچنە مزگەوت نوێژەکە بە جەماعەت بکەن بەڵکو نوێژەکە لە ماڵەوە دەکەن ئەوانە نوێژەکەیان قەبوولە بەڵام گوناحی ئەوەشیان بۆ دەنووسرێ کە بە جەماعەت نەیان کردووە لە مزگەوت.**

## گەورەیی نوێژی جەماعەت

١-عن ابن عمر(رضي الله عنه) أن رسول الله(صلى الله عليه وسلم) قال: صلاةُ الجَمَاعَة أَفْضَلُ مِنْ صَلاةِ الفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشرينَ دَرَجَةً. **رواه البخاري(٦٤٥) ومسلم(٦٥٠).**

---

**(1) الحديث اخرجه ابوداود و ابن ماجه (٩٣٧) والدار قطني والحاكم والبغوي والبيهقي وصححه من العلماء: الذهبي والنووي وابن حجر العسقلانى وابن تيميه وابن القيم والالباني.**

(١)الفذّ: الواحد، واته تاك.

**واته: نوێژی به کۆمەڵ(جماعة) باشتره له نوێژی به تەنیایی به بیست و حەوت پله.**

٢- عن عثمان بن عفان(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: مَنْ صَلّى العشاءَ في جَماعَةٍ فكأنَّما قام نصْفَ اللّيلِ ومنْ صَلّى الصُّبْحَ في جَماعَةٍ فكأنَّما صَلّى الليلَ كُلَّهُ. رواه مسلم(٦٥٦).

**واته: هەر کەسێ نوێژی خەوتنان(عشاء) به کۆمەڵ(جماعة) بکات ئەوه وەکو تا نیوه شەو شەونوێژ بکا وایه وه هەر یەکێکیش نوێژی بەیانیش به جەماعەت بکات ئەوه وەکو ئەوه وایه که ئەو شەوه هەتا بەیانی هەر شەو نوێژ بکات.**

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قالَ:أتى النبيَّ(ﷺ) رجلٌ أعمى فقالَ: يا رسول الله إنَّهُ ليسَ لي قائدٌ يَقودُني الى المسجدِ فسألَ رسول الله(ﷺ) أنْ يُرَخِّصَ لَهُ فيُصَلّي في بيته فرخص لهُ فلما ولّى دعاهُ فقالَ: هَلْ تسمَعُ النِّداءَ بالصلاة؟ فقال: نَعمْ، قال: فأجب. رواه مسلم(٦٥٣).

**واته: پیاوێکی کوێر هاته لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەسم نی یه دەستم بگرێ بۆ مزگەوتم ببات جا داوای له پێغەمبەری خوا کرد که مۆڵەتی بدات له ماڵی خۆی نوێژ بکات ئەویش مۆڵەتی دا بەڵام که رۆیشت بانگی کرد فەرمووی ئایا گوێت له بانگ دەبێت بۆ نوێژ؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: مادام وایه وەڵام بدەرەوه.**

**سوود**:

ئەم فەرموودەیەی لای سەرەوە(مسلم) رەحمەتی خوای لەسەر بێت لە صحیحەکەی دا لە ژێر ناوونیشانی(باب یجب اتیان المسجد علی من سمع النداء)دێنێ واتە: پێویستە هاتن بۆ مزگەوت لەسەر ئەو کەسەی کە گوێ ی لە بانگ دەبێت.

٣- عن بريدة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(صلى الله عليه وسلم) قال: بَشِّرِ المشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ الى المساجِدِ بالنُّور التَّامِّ يَومَ القيامةِ. صحيح أبوداود(٥٦١) والترمذي(٢٢٣).

ظُلَم: کۆیە، تاکەکەی(الظُّلْمَةُ)یە واتە: تاریکی. وە(ظُلَم) تاریکیەکان.

واتە: مژدە بدە بەوانەی کە لە تاریکاییەکاندا دەچن بۆ مزگەوتەکان(واتە بۆ نوێژی عیشاو بەیانی) بە رۆناکیەکی تەواو لە رۆژی قیامەت دا.

**سوود**:

هەر یەکێك خودا لە رۆژی قیامەت رۆناکیەکی تەواوی پێ بدات زۆر بە ئاسانی لەسەر پردی سیرات دەربازی دەبێت و دەچێتە بەهەشت.

٤- عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول(صلى الله عليه وسلم): من صَلَّى لِلهِ أَربعين يوماً فِي جماعةٍ يُدركُ التكبيرةَ الأُولى كُتبَ لَهُ براءَتان: براءةٌ مِنَ النَّارِ وبراءةٌ مِنَ النِّفاق. حسن رواه الترمذي(٢٤١).

واتە: هەر کەسێك چل رۆژان نوێژ بکات بۆ خودا بە جەماعەت بە(الله اکبر)ی یەکەم رابگات ئەوە دوو رزگار بوونی بۆ دەنوسرێ رزگار بوون لە ئاگری جەهەننەم وە رزگار بوون لە دووڕوویی.

# گەورەیی رۆیشتن بۆ نوێژی جەماعەت

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول(صلى الله عليه وسلم): مَنْ تَطَهَّرَ في بَيتِه ثُمَّ مَشى الى بيتٍ مِنْ بيوتِ الله تعالى لِيقضيَ فريضةً مِنْ فرائضِ اللهِ كانت خَطوَتاهُ احداهُما تحط خطيئةً والأخرى تَرْفَعُ دَرَجةً. رواه مسلم(٦٦٦).

١- مَنْ تَطَهَّرَ في بَيتِهِ: اي توضأ، واتە: هەر یەکێك دەست نوێژ بشوا لە ماڵەوە.

٢- خَطوَتاهُ: دوو هەنگاوەکانی، (خَطوَتا) لە بنەرەت دا(خَطوتان) بووە بەڵام ئەگەر(مثنى) یا(جمع مذکر سالم) اضافه کران نونەکانیان لادەبرێن، جا(خطوتان)(مثنى)یە اضافه کرایە بۆ(ه)یەکە تاکەکەشی(خطوة)یە واتە: هەنگاو، شەقاو.

مانای فەرموودەکە: هەر کەسێك لە ماڵەوە دەست نوێژ بشوات لە پاشان بڕوا بۆ ماڵێك لە ماڵەکانی خوای بەرز بۆ ئەوەی فەرزێك لە فەرزەکانی خوا جێ بەجێ بکات دوو هەنگاوەکانی یەکێکیان گوناهێك لادەبات وە ئەوەی تریان پلەیەکی پێ بەرز دەکاتەوە.

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أن رسول الله(صلى الله عليه وسلم) قال: ألا أَدُلُّكم على ما يَمحُو الله بِهِ الخطايا ويرفعُ بِهِ الدَّرجات؟ قالوا: بلى يا رسول الله، قال: إسباغُ الوضوءِ على المكاره، وكثرة الخُطا الى المساجد وانتظارُ الصلاةِ بعدَ الصلاة فَذلكُمُ الرِّباطُ. رواه مسلم(٢٥١).

١- دَلَّ: نیشانی دا، (يَدُلُّ) نیشان دەدا (أَدُلُّكُم) نیشانتان دەدەم.

٢- الخطايا: کۆیە تاکەکەی(خطيئة)یە واتە: گوناح.

٣-الرِّباط: واتە: ئێشك گرتن چاو لە سنوور بوون سەنگەرنشینی کە بریتی یە لەمانەوەو ئارام گرتن لە سنووری دوژمندا بۆ پاراستنی موسڵمانان.

واتە: ئایا پێتان بڵێم بەو شتەی کە خوا بە هۆیەوە گوناهانی پێ دەبات و پلانی پێ بەرز دەکاتەوە؟ گوتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: دەست نوێژ شوشتن بە تەواوی لە کاتی ناخۆشیدا زۆر شەقاو هاوێشتن بۆ مزگەوتەکان چاوەڕوان کردنی نوێژ لە دوای نوێژ ئا ئەمانەن سەنگەر نشینی یە بۆتان.

٣- عن أُبيِّ بن كَعبٍ(رضي الله عنه) قال: كانَ رجُلٌ لا أَعْلَمُ أَبْعَدَ مِنَ المسجد مِنهُ و كان لا تُخطِئُهُ صلاةٌ قال: فَقيل لَهُ أو قلت لهُ لَو اشْتَريتُ حِماراً تَرْكَبُهُ في الظَّلْماءِ وفي الرَّمْضَاءِ قال: مايَسُرُّني أنَّ مَنْزِلي الى جَنْبِ المسجدِ إني أُريدُ أنْ يُكْتَبَ لي مَمْشاي الى المسجدِ ورجُوعي اذا رَجَعْتُ الى أهلي، فقال رسول الله(صلى الله عليه وسلم): قدْ جمعَ اللهُ لكَ ذلك كُلَّه. رواه مسلم(٦٦٣).

واتە: (أُبيِّ) کوڕی کەعب(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پیاوێك نازانم هیچ پیاوێك لە ئەو ماڵی دوورتر بێت لە مزگەوت هیچ نوێژێکی بە بێ جەماعەت نەدەچوو پێی گوترا یا پێم گوت ئەگەر گوێدرێژێکت بکریبایە سواری ببای لە شەوی تاریك و وە لە کاتی گەرمای بەتین؟ پیاوە ئەنصاریەکە گوتی: پێم خۆش نییە ماڵم لە تەنیشت مزگەوت بێت من دەمەوێ کە بۆم بنوسرێ کاتێك لەم سەرەوە دەچم بۆ مزگەوت، وە لەو سەرەوەش کە دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: خودا ئەوانەی هەموو بۆ کۆکردویتەوە.

## یادی خوا له كاتی چوونه ناو مزگەوت و دەرهاتن لێی

١-عن عبدالله بن عمرو بن عاص(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) أنَّهُ اذا دخَلَ المسجِدَ قالَ: (أعوذ باللهِ العظيم وبوَجهه الكريم وسُلْطانه القديم من الشيطان الرجيم)، فإذا قال ذلك، قال الشيطان: حفظ مني سائر اليوم. صحيح: رواه أبو داود (٤٦٦).

**واته: (عبدالله) كوڕی عەمر دەڵێ: كاتێك كە پێغەمبەر(ﷺ) بچوبایە ناو مزگەوت دەیفەرموو** (أعوذ بالله العظيم وبوجههِ الكريم وسُلْطانهِ القديم من الشيطان الرجيم)، **خۆم دەپارێزم بەخوای گەورە وە بە(وجە)ی بەرێزی، وە بە دەسەلاتی دێرینی لە شەیتانی دەركراو(لە رەحمەتی خوا) جا ئەگەر ئەمەی گوت شەیتان دەڵێ: پارێزراوی لە من بەدرێژایی ئەم رۆژە.**

٢- عن فاطمة بنت رسول الله(ﷺ) قالت: كان رسول(ﷺ) إذا دخلَ المسجد يقولُ: بسم الله والسلام على رسول الله. اللهمَّ اغفر لي ذنوبي وافتح لي أبواب رحمتك، واذا خرج قال: بسم الله والسلام على رسول الله اللهمَّ اغفر لي ذنوبي وافتح لي أبوابَ فضْلِك. صحيح رواه ابن ماجه(٧٧١).

**واته: (فاطمە)ی كچی پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر بچووبا مزگەوت دەیفەرموو: بسم الله والسلام على رسول الله، اللهمَّ اغفر لي ذنوبي وافتح لي أبواب رحمتك وە ئەگەر دەربچووبا دەیفەرموو: بسم الله والسلام على رسول الله اللهمَّ اغفر لي ذنوبي وافتح لي أبوابَ فَضْلِكَ.**

## سلاوی مزگەوت(تحیه المسجد):

١-عن أبي قتادة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(صلى الله عليه وسلم): إذا دَخَلَ أحدُكُمُ المسجدَ فلا يَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ ركعتَينِ. رواه البخاري(١١٦٣) ومسلم(٧١٤).

واتە: ئەگەر یەکێتان چووە مزگەوت با دانەنیشی تا وەکو دوو رکات نوێژ دەکات.

٢- عن جابر بن عبدالله قالَ: كانَ لي على النبيِّ(صلى الله عليه وسلم) دَين فقَضاني وزادنِي وَدَخلْتُ عليه المسجدَ فقالَ لي(صَلِّ ركعَتين) رواه مسلم(٧١٥).

واتە: جابر(رەزای خوای لیّ بێت) دەڵیّ: قەردێکم لەسەر پێغەمبەر بوو(صلى الله عليه وسلم) قەردەکەی دامەوەو زیاتریشی دامیّ وە چومە لای لە مزگەوت پێی فەرمووم: دوو رکات نوێژ بکە.

## چۆنیەتی وەستانی ئیمامو مەئموم:

١- عن ابن عباس(رضي الله عنه) بعثني العباسُ الى النبيِّ(صلى الله عليه وسلم) وهو في بيت خالتي ميمونَةَ فَبِتُّ مَعَهُ تلك الليلَةَ فَقامَ يُصَلّي مِنَ الليلِ فَقُمْتُ عن يسارِهِ فَتَناولَني مِنْ خَلفِ ظهرِهِ فَجَعَلني على يَمينِهِ. رواه البخاري(٦٩٧) ومسلم(٧٦٣).

واتە: ابن عباس(رەزای خوای لیّ بێت) دەڵیّ(عباس) کە دەکا باوکی منی نارد بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە لە مالی پلکم(میمونە) بوو، ئەو شەو لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مامەوە، جا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەستا نوێژی کرد لە شەوا جا منیش چووم لە لای چەپی وەستام جا لە پشتیەوە منی گرت و هێنامیە لای ڕاستی.

**سوود**:

١-یەك پیاو ئەگەر لەگەڵ ئیمادا دا نوێژیان کرد بە جەماعەت ئەوە ڕاست لە تەنیشت ئیمام ڕادەوەستێ لە لای ڕاستی بەبێ پاش و پێش.

٢- (میمونە) ڕەزای خوای لێ بێت دایکی ئیماندارانە خێزانی پێغەمبەرە(ﷺ).

٢- عن أنس(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) صلَّى بِهِ وبأُمِّهِ أوْ خالَتِهِ قال: فَأَقامَني عن يمينِهِ وأقامَ المرأةَ خَلْفَنا. **رواه البخاري(٧٠٠) و مسلم(٦٦٠)**.

واتە: ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) پێشنوێژی بۆ من و دایکم یان پلکم کرد منی لە لای ڕاستی دانا وە ئافرەتەکەش لە پشتمان.

**سوود**:

هەندێ بابەتی فیقهی دەربارەی نوێژی جەماعەت:

(ا)نوێژی جەماعەت جێ بەجێ دەبێت بە دوو کەس یەکێکیان پێش نوێژو ئەوی تریان شوێن کەوتوو.

(ب) ئەگەر یەك نوێژ خوێن لەگەڵ ئیمام دا نوێژی کرد ئەوە لە تەنیشت ئیمامەکە ڕادەوەستێ بەبێ پاش و پێش بەڵام ئەگەر ئافرەتێك بوو نوێژی لە دوای پیاوێك دەکرد ئەوە لە پشتیەوە ڕادەوەستێ.

(ج) دورستە پیاو ئیمامەتی بۆ ژنان بکەن.

(د) دورستە ئافرەتان خۆیان یەکێکیان بکەن بە پێش نوێژ.

(ح) دورستە منداڵ یان کوێر پێش نوێژی پیاوان بکەن.

(خ) یەکێك نوێژی فەرز بکات دەتوانێت لە پشتی پێشەوایەکەوە(إمام)

نوێژ بکات کە نوێژی سوننەت بکات هەروەها بە پێچەوانەش.

(هـ) پێش نوێژی ئافرەت هەر لە ناوە ڕاستی ڕیزەکەدا رادەوەستێت.

## گەورەیی ریزەکانی پێشەوە

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله(صلى الله عليه وسلم): قال: لَو يعلمُ الناسُ ما في النِّداء والصَفِّ الأَوَّلِ ثُمَّ لم يجدوا إلاّ أنْ يستَهموا عليه لا سْتَهمُوا ولو يعلمون ما في التَّهجيرِ لاستبقوا إليه ولو يعلمون ما في العتمةِ والصُّبح لأتوهما ولو حَبواً. رواه البخاري(٢٦٨٩) و مسلم(٤٧٣).

١-يستهموا:(الاستهام) ياني(الاقتراح) واته: قورعەکردن.

٢- التهجير:( هو التبكير الى الصلاة أي صلاة كانت) واته: زوو چوون بۆ نوێژ جا هەر نوێژێك بێت.

٣- العتمة: مەبەست پێ ی نوێژی عیشایە.

٤- الحبو: أن يمشي على يَديه و ركبتيه، أو أسته. واته: لەسەر دەست و چۆکەکانی بڕوا یا بە قونە خشکی.

واتە: ئەگەر خەڵك دەیانزانی خێری بانگدان و ریزی یەکەمی نوێژی جەماعەت چەندە لە پاشان دەستیان نەکەوتبایە جگە لەوەی قورعەیان لەسەر بکەن ئەوە قورعەیان لەسەر دەکردن وە ئەگەر دەیان زانی خێری زوو چوون بۆ نوێژ چەندە ئەوە پێشبرکێیان بۆلای دەکرد وە ئەگەر دەیانزانی نوێژی عیشاو بەیانیان بە جەماعەت چەندە خێرە بۆیان دەهاتن ئەگەر بە کاگۆڵکە و قونەخشکەش بوایە.

٢- عن أبي أُمامة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(صلى الله عليه وسلم): إنَّ الله

وملائكَتَهُ يُصَلّون على الصَّفِّ الأوَّلِ، قالوا يا رسولَ الله وعلى الثاني، قال: إنَّ اللهَ وملائكَتَهُ يُصَلّون على الصَّفِّ الأوَّل، قالوا يا رسولَ اللهِ وعلى الثاني؟ قالَ وعلى الثاني. **رواه أحمد والطبراني بسند صحيح.**

**واته: بێ گومان خواو مەلائیکەتەکانی خوا صەلەوات دەدەن لەسەر ڕیزی یەکەم گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەدی ئی دووەم؟ فەرمووی خواو مەلائیکەتەکانی خوا سەڵەوات دەدەن لەسەر ڕیزی یەکەم گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەدی دووەم فەرمووی: دووەمیش.**

٣- عن البراء بن عازب(رضي الله عنه) قال: كان رسول الله(ﷺ) يتَخَلَّلُ الصَّفَّ مِن ناحيةٍ الى ناحيةٍ، يَمْسَحُ صُدرنا ومناكبنا ويقولُ: لا تَختلفوا فَتَختَلِفَ قلوبكم وكانَ يقولُ: إنَّ اللهَ وملائكتَهُ يُصلُّونَ على الصفوف الأُولِ. **صحيح رواه أبوداود(٦٦٤).**

**واته: بەڕرائی کوڕی عازب(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) دەهاتە نێوان ریزەکانەوە لە لایەك بۆ لایەکی تر دەستی بە سینگ و شانمان دادەهێنا وە دەیفەرموو: نارێك مەوەستن ئەگینا نارێکی و ناکۆکیتان تێ دەکەوێ وە دەیفەرموو: بێ گومان خواو مەلائیکەتەکانی صەڵەوات دەدەن لەسەر ریزەکانی پێشەوە.**

## ڕێکخستنی ریزەکانی نوێژ:

١-عن جابر بن سمرة(ﷺ) قال: خَرجَ علينا رسولُ الله(ﷺ) فقال: ألا تَصُفُّونَ كما تَصُفُّ الملائكةُ عند رَبِّها؟ فقُلْنا: يا رسولَ الله وكيفَ تَصفُّ الملائكةُ عند رَبِّها؟ قال: يُتِمُّونَ الصُّفوفَ الأُولَ ويتراصونَ في الصَّفِّ. رواه مسلم(٤٣٠) .

واته: جابری کوڕی سەموره(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە لامان فەرمووی: ئایا بۆ ڕێزنابن وەکو چۆن فریشتەکان ڕێز دەبەستن لای پەروەردگاریان؟ فەرمووی: ڕێزەکانی یەکەم پردەکەنەوە وە لە ڕێزدا پاڵ دەدەن بەیەکەوە.

٢- عن أنس بن مالك(ﷺ) عن رسول الله(ﷺ) قال: رُصُّوا صُفُوفَكُمْ، وقاربوا بينها، وحاذوا بالأعناق، فوالذي نفسي بيدهِ إنّي لأرى الشّيطان يدخُلُ من خَللِ الصَّفِّ كأَنَّهُ الحَذَفُ. صحيح رواه ابوداود(٦٦٧) والنسائي(٨١٤).

١-مُحاذاة: بارامبەر.

٢- الحَذَفُ: غنَمٌ سود صغار تكون باليمن، مەڕی ڕەشی گچکەن لە یەمەن(الحذف) کۆیە، تاکەکەی(حَذَفة)یە.

واته: ریزەکانتان ریك بخەن و پاڵ بدەن بە یەکتری وە نێوانی ریزەکان لەیەکەوە نزیك بکەنەوە(واتە ریزی یەکەم لەگەڵ دووەم، دووەم لەگەڵ سێ یەم، وە هەروەها) وە شان و ملتان لە راستی یەك رابگرن، جا سوێندم بەوەی کە گیانی منی بە دەستە شەیتان دەبینم لە کەلێنی ریزەکان دێتە ژوورەوە دەڵێ ی مەڕە ڕەشە گچکەکانی یەمەنن.

## شوێن کەوتنی ئیمام لە نوێژی جەماعەت دا:

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: كان رسول الله(صلى الله عليه وسلم) يُعلِّمُنا، يقولُ: لاتُبادروا الإمامَ إذا كبَّر فكَبِّروا واذا قال(ولا الضالين) فقولوا: آمين، واذا ركَعَ فاركعوا وإذا قالَ: سمعَ اللهُ لِمن حَمِدهُ فقولوا: اللهمَّ ربّنا لك الحمدُ. رواه مسلم(٤١٥).

واته: پێش ئیمام مەکەون ئەگەر گوتی(الله اکبر) ئینجا ئێوه بڵێن(الله اکبر) وه ئەگەر گوتی(ولا الضالین) ئینجا ئێوه بڵێن(آمین) وه ئەگەر رکوعی برد ئینجا ئێوەش برۆنە رکوع وه ئەگەر گوتی(سمع الله لمن حمده) ئینجا ئێوه بڵێن(اللهم ربنا لك الحمد).

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(صلى الله عليه وسلم): أمَا يَخشَى الذي يَرفَعُ رَأسَهُ قَبلَ الإمامِ أنْ يُحَوِّلَ اللهُ رَأسَهُ رَأسَ حمارٍ؟ رواه البخاري(٦٩١) ومسلم(٤٢٧).

واته: ئایا ئەو کەسەی سەری پێش ئیمام بەرز دەکاتەوه ناترسێ کە خودا سەری بگۆرێ بەسەری گوێ درێژ.

**سوود**:

١-(اتفق العلماء على أنَّ السَّبقَ في تكبيرةِ الإحرامِ أو السَّلام يَبطلُ الصَّلاة واختلوا في السبقِ في غيرهما فَعندَ احمد يبطلها، قال: ليس لمن يسبق الإمام صَلاةٌ أما المساواةُ فمكروهةٌ)[1].

واته: زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوه کە پێش کەوتنی ئیمام لە(الله اکبر)ی نوێژدابەستن و سەلام دانەوه نوێژ بەتاڵ دەکاتەوه بەڵام بێجگە لەم دووه جیاوازیان هەیه، لای ئیمام ئەحمەد پێش کەوتنی ئیمام بێجگە لەم

---

(1) فقه السنة.

دوو شوێنەش هەر نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە گوتویەتی ئەوەی پێش ئیمام دەکەوێ نوێژی بۆ نییە بەڵام بە یەکسانی لەگەڵ ئیمام دا بڕۆی ئەوە مەکروهە.

**٢- مەئموم لەگەڵ ئیمام چوار حاڵەتی هەیە:**

أ-(مسابقتهُ) واتە: پێش کەوتنی ئیمام ئەمە حەرامەو هەندێکیش دەڵێن نوێژی پێ بە تاڵ دەبێت، بەڵام ئەگەر لە(تكبيرە الاحرام)ی یەکەم و سەلام دانەوە پێشی ئیمام کەوت ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێت.

ب- (موافقتهُ) واتە: لەگەڵ ئیمام بڕۆی بێ پاش و پێش ئەمە مەکروهە.

ج- (مُتابعتهُ) واتە: دوای ئیمام بکەوی بەبێ دوا کەوتن ئەمە شەرعی یە.

د- (التخلف) واتە: ئەوەندە دوا بکەوی لە ئیمامەکەی کە لە شوێن کەوتن(متابعة) دەربچی ئەوە شەرعی نی یە[1].

٣- عن البراء(ﷺ) قال: كان رسول الله(ﷺ) إذا قال: سمعَ اللهُ لمن حمدَهُ، لم يحْنِ أحدٌ منّا ظهرهُ حتّى يقعَ النبيُّ ساجداً ثُمَّ نقعُ سُجوداً بعدَهُ. **رواه البخاري(٦٩٠).**

**واتە: (براء) ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر بیفەرمووبایە(سمع اللهُ لِمَن حَمِدَهُ) هیچ کەسێك لە ئێمە پشتی نەدەچەماندەوە تا پێغەمبەر(ﷺ) سەری لە سەجدە دانەنابا لە پاشان ئێمە سەجدەمان دەبرد.**

---

(1) الفتاوى المهمة- عثيمين

# ئەوەی دەچێ بۆ جەماعەت دەبینی نوێژکراوە

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال النبيُّ(صلى الله عليه وسلم): مَن توضَّأَ فأحسنَ وُضوءَهُ ثُمَّ راحَ فوَجَدَ الناسَ قَدْ صلَّوا أعطاهُ اللهُ جَلَّ وعَزَّ مثل أجرِ مَن صلاّها وحضرها لا ينقص ذلك منْ أجرهم شيئاً.

**صحيح رواه أبوداود(٥٦٤).**

**واته: هەر کەسێك دەست نوێژێکی جوان بشوات لە پاشان بچێ بۆ نوێژی جەماعەت بینی خەڵك نوێژیان کردووە خوا(جل وعز) پاداشتی وەکو ئەوانە پێ دەدات کە نوێژیان بە کۆمەڵ کردوەو ئامادەی بوینە ئەوە هیچ کەم ناکاتەوە لە پاداشتی ئەوان.**

# نوێژ كردن بەخشوع و ڕێك و پێكی

خوا دەفەرموویٚ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ﴾ (المؤمنون:١-٢) واتە: بەڕاستی بڕواداران سەركەوتوو و بەمراد گەیشتوون ئەوانەی كە لە نوێژەكانیان دا خشوعیان هەیە.

<u>سیٚ مانا بۆ ووشەی(خاشعون) لە تەفسیری(طبري)دا:</u>

١-عن مجاهد﴿ٱلَّذِين هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ﴾ قال: السكون فيها. واتە: مجاهد دەڵیٚ ووشەی(خاشعون) لەم ئایەتەدا واتە: جولەو حەرەكە نەكردن لە نوێژدا.

٢- عن الحسن﴿ٱلَّذِين هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ﴾ قال: خائفون، واتە: دەترسن.

٣- عن ابن عباس﴿ٱلَّذِين هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ﴾ يقول خائفون ساكنون. واتە: دەترسن و جوولەو حەرەكە ناكەن.

١-عن عمّار بن ياسر قال: سمعتُ رسولَ الله(ﷺ) يقول: إنَّ الرَّجُلَ لينصرفُ وما كُتِبَ لَهُ إلاّ عُشْرُ صلاتِه تُسْعُها ثُمنُها سُبعُها سُدُسُها خُمُسُها رُبُعُها ثُلُثُها نِصْفُها. حسن: رواه أبو داود(٧٩٦).

واتە: بێگومان پیاوی وا هەیە نوێژ تەواو دەكات بەڵام تەنها دەیەكی نوێژەكەی، نۆیەكی، هەشت یەكی، حەوتیەكی، شەشیەكی، پێنجیەكی، چواریەكی، سیٚ یەكی، نیوەی، لەو نوێژە بۆ نوسراوە.

**سوود**:

١-قال ابن عباس(رضي الله عنه) ركعتان مقتصدتان في تفكر خير من قيام ليلةٍ والقلب ساهٍ[1].

واته: ابن عباس(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ دوو ركات نویٚژی مام ناوەند كە بە ئاگایی دڵ و بیر لیٚ كردنەوە بكریٚ باشترە لە هەستانی شەویٚك كە دڵی تیٚدا بیٚ ئاگا بیٚت.

٢- ابن مفلح لە(مختصر منهاج القاصدين) دا دەڵیٚ: متى رايت قلبك لا يحضر في الصلاة، فاعلم ان سببه ضعف الايمان فاجتهد في تقويته.

واته: هەر كاتیٚك بینیت دڵت ئامادە نابیٚت لە نویٚژیٚ دا، ئەوە بزانە كە هۆیەكەی بیٚ هیٚزی ئیمانە جا هەوڵ بدە ئیمانەكەت بەهیٚز بكەی.

٢- عن عائشة(رضى الله عنها) أنَّ النبيَّ(ﷺ) صلى في خميصةٍ لها اعلام وقال: شغلتني اعلامُ هذه إذْهَبُوا بها الى أبي جهمٍ وائتوني بأنبجانيّه. رواه البخاري(٧٥٢) ومسلم(٥٦٦) .

١- أعلام: كۆی(علم)ە واته: خەت.

٢- الاَنْبجانِيَّه: كساء غليظ لا علم له. جۆرە پۆشاكیٚكی ئەستوری سادەی بیٚ خەت.

واته: عائیشە(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ پیٚغەمبەر(ﷺ) نویٚژی كرد لە كراسیٚكدا كە خەت خەتی تیا بوو فەرمووی: خەتەكانی ئەم كراسە خەریكیان كردم ئەم كراسە ببەن بۆ(أبوجهم) جلە ئەستورە سادەكەی ئەوم بۆ بیٚنن.

---

(1) احياء علوم الدين، الجلد الاول(فضيلة الخشوع).

٣- عن عائشة(رضى الله عنها) قالت: سألتُ رسولَ الله(ﷺ) عن الإلتفاتِ في الصلاة قالَ: هو اختلاسٌ يَختلِسُهُ الشيطان من صلاة الرَّجلُ.رواه البخاري(٧٥١) وأبوداود(٩١٠)والترمذي (٥٩٠).

واته: عائیشه(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: پرسیارم لە پیٚغەمبەر کرد(ﷺ) دەربارەی ئاوردانەوە لە نویٚژیٚ دا فەرمووی: ئەوە دزییەکە شەیتان لە نویٚژی بەندە دەیکات.

٤- عن عائشة(رضى الله عنها) قالت: سمعتُ رسولَ الله(ﷺ) يقولُ: لا صلاةَ بحضرةِ الطعامِ ولا هو يُدافعُهُ الأخبثان. رواه مسلم (٥٦٠) وابو داود(٨٩).

الأخبثان: البول والغائط: میزو پیسایی.

واته: نابیٚ نویٚژ بکریٚ لە دەمی ئامادەبوونی خواردن دا وە لە کاتیٚك دا کە میزو پیسایی سەغلەتی دەکەن.

**سوود:**

١-ئیمام نووی لە(رياض الصالحين) دا ئەم فەرموودەیە لە ژیٚر ناوو نیشانی(باب كراهة الصلاة بحضرة الطعام ونفسه تتوق اليه أو مع مدافعة الاخبثين هما البول والغائط) دەهیٚنیٚ، واتە مەکروهە نویٚژ بکریٚ لەو کاتەی خواردن ئامادەیەو تۆش حەزت لیٚیەتی یا تەنگاوی بە هۆی میزو پیسایی.

٢- ئەگەر موسڵمان تەنگاوی میزو پیسایی نەبوو بەڵام چووە ناو نویٚژەکە ئینجا تەنگاو بوو ئەوە هیچی بۆ نییە.

# ناوداران‌و نوێژکردن به‌ خشوع و ڕێك و پێكی

١-كان علی بن ابي طالب(ﷺ) اذا حضر وقت الصلاة يتزلزل ويتلوّن وجهه.

واته: عه‌لی كوڕی ئه‌بو تالیب(ره‌زای خوای لیّ بیّت) ئه‌گه‌ر كاتی نوێژ بهاتایه‌ ده‌له‌رزی و ره‌نگی تێك ده‌چوو.

٢- ويُروى عن علی بن الحسين انه كان إذا توضأ إصفَر لونه فيقول له اهلُهُ ما هذا الذي يَعتَريكَ عند الوضوء فيقول اتدرون بين يدي من أُريدُ ان اقوم.

واته: گێردراوه‌ته‌وه‌ له‌ عه‌لی كوڕی حوسه‌ین كاتیّ كه‌ ده‌ست نوێژی ده‌شوشت ره‌نگی زه‌رد هه‌ڵده‌گه‌ڕا كه‌س و كاری پێیان گوت ئه‌وه‌ چی یه‌ به‌سه‌رت دادێت له‌ كاتی ده‌ست نوێژ فه‌رمووی: ئایا نازانن له‌به‌ر ده‌ستی كیّ ده‌مه‌ویّ بوه‌ستم.

٣- عن الأعمش قال: كان عبدالله يعني ابن مسعود اذا صلى كأنَّهُ ثوب مُلْقَى.

واته: ئه‌عمه‌ش ده‌ڵیّ: عبدالله‌ كوڕی مه‌سعود(ره‌زای خوای لیّ بیّت) كاتیّ كه‌ نوێژی ده‌كرد ده‌تگوت جلێكی فرێدراوه‌.

# نوێژە سوننەتەکانی پاش و پێشی نوێژە فەرزەکان (سنن الرواتب):

ئەم نوێژانە دوو جۆرن(مُؤَكَّد) و(غیر مؤکد):

(مؤکد): ئەو نوێژانەن کە پێغەمبەر(ﷺ) زۆر گرنگی پێ داوەو داکۆکی لەسەر ئەنجام دانی کردوەو دەوامی لەسەر کردووە کە ئەمانەش(١٠) رکاتن: دوو رکات پێش نوێژی بەیانی، دوو پێش نوێژی نیوەرۆ، دوو دوای نیوەرۆ، دوو رکات دوای نوێژی(مغرب) دوو رکات دوای نوێژی(عیشاء).

وە(غیر مؤکد) ئەو نوێژانەن کە پێغەمبەر(ﷺ) جەخت و دەوامی لەسەر نەکردووە.

## دوو رکات پێش نوێژی بەیانی:

١-عن عائشة(رضی الله عنها) عن النبيِّ(ﷺ) قال: رکعتا الفجر خيرٌ من الدُّنيا وما فيها. رواه مسلم(٧٢٥).

واتە: دوو رکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی باشترە لە دونیاو لەوەی تیایەتی.

٢-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) قرأ في رکعتَي الفَجْر(قل یا ایها الکافرون) و(قل هو الله أحد). رواه مسلم(٧٢٦).

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) لە دوو رکات سەننەتی پێش نوێژی بەیانی سورەتی(کافرون) و(إخلاص)ی خوێند.

# سوننەتی نیوەڕۆ

١-عن ابن عمرَ(رضي الله عنه) قالَ صَلَّيتُ مَعَ رسولِ الله(ﷺ) ركعتينِ قبلَ الظُّهرِ وركعتينِ بعدها. رواه البخاري و مسلم(٧٢٩).

واتە: ابن عمر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوو ڕکات نوێژی سوننەتم پێش نیوەڕۆ کرد وە دوو ڕکاتیش لە دوای نیوەڕۆ.

٢- عن عائشة(رضى الله عنها) قالت: كان النبيُّ(ﷺ) يُصلِّي في بيتي قبلَ الظُّهرِ أربعاً ثُمَّ يَخْرُجُ فيُصَلِّي بالنَّاس، ثُمَّ يَدْخُلُ فَيُصَلِّي ركعتين، وكان يُصلِّي بالنَّاس المغربَ، ثُمَّ يَدخُلُ فيُصلِّي ركعتين ويُصَلِّي بالناس العشاءَ ويدخُلُ بيتي فَيُصَلِّي ركعتين. رواه مسلم(٧٣٠).

واتە: عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) چوار ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد لەماڵەکەم پێش نوێژی نیوەڕۆ لە پاشان دەچوو پێش نوێژی بۆ خەڵك دەکرد لە پاشان دەهاتەوە دوو ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد وە هەروەها پێش نوێژی(مغرب)ی بۆ خەڵك دەکرد لە پاشان دەهاتەوە دوو ڕکات نوێژی دەکرد، پێش نوێژی(عیشاء)ی بۆ خەڵك دەکرد وە دەهاتەوە ماڵەکەم دوو ڕکات نوێژی دەکرد.

٣- عن ام حبيبةَ(رضى الله عنها) قالت: قال رسولُ الله(ﷺ): مَنْ حافَظَ على أَرْبَعِ ركعاتٍ قَبلَ الظُّهرِ وأربعٍ بَعدَها حَرُمَ على النَّار. حديث صحيح رواه أبوداود(١٢٦٩) والترمذي(٤٢٧).

واتە: هەر یەکێك پارێزگاری چوار ڕکات پێشی نیوەڕۆو چوار ڕکات دوای نیوەڕۆ بکات دەپارێزرێ لە ئاگری دۆزەخ.

# سوننەتی(عصر)

١-عن علي بنِ أبي طالب(رضي الله عنه) قالَ: كانَ النبيُّ(صلى الله عليه وسلم) يُصلِّي قبلَ العَصرِ أَرْبَعُ ركعاتٍ يَفصِلُ بَينَهُنَّ بالتَّسليم على الملائكةِ المَقَّربينَ ومَنْ تَبِعَهُمْ مِنَ المسلمينَ والمؤمنينَ. **حسن رواه الترمذي(٤٢٩).**

**واته: ئیمام عەلی(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێش نوێژی عەسر چوار ڕکاتی دەکرد ئەم چوار ڕکاتەشی دوو دوو دەکرد جیای دەکردنەوە بەسەلام دانەوە لەسەر فریشتە نزیکەکانی بارەگاو وە هەموو ئەو موسڵمان و بڕوادارانەی کە پەیڕەوی ئاوانیان کردووە.**

٢- عن ابن عمر(رضي الله عنه) عن النبيِّ(صلى الله عليه وسلم) قالَ: رَحِمَ اللهُ امرأً صَلَّى قبلَ العصْرِ أربعاً. **حسن رواه ابوداود(١٢٧١) والترمذي(٤٣٠).**

**واته: ڕەحمەتی خوا لەو کەسە کە چوار ڕکات پێش نوێژی عەسر دەکات.**

٣- عن عبدالله بن مُغَفَّل(رضي الله عنه) قالَ: قال رسول الله(صلى الله عليه وسلم): بينَ كلِّ أذانينِ صَلاةٌ، بينَ كلِّ أذانينِ صَلاةٌ، بينَ كلِّ أذانينِ صَلاةٌ، قالَ في الثالثةِ(لِمَنْ شاءَ). **رواه البخاري(٩١/٢) و مسلم(٨٣٨).**

**واته: لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێك دا نوێژێکی سوننەت هەیە ئەمەی سێ جار دووبارە کردەوە لە دوای جاری سێیەم فەرمووی: بۆ ئەوەی کە بیەوێ. ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ دوو ڕکات نوێژی سوننەت پێش عەسر.**

## سوننەتی(مغرب)

١-عن أنس(رضي الله عنه) قالَ: كُنا بالمدينةِ فإذا أَذَّنَ المُؤَذِّنُ لِصلاةِ المَغْرِبِ ابْتَدَرُوا السَّوارِيَ فَركَعُوا ركعتينِ حتَى إنَّ الرَّجُلَ الغَرِيبَ لَيَدْخُلُ المسجدَ فيحسَبُ أَنَّ الصلاةَ قَدْ صُلِّيَتْ مِنْ كَثرةِ مَنْ يُصلِّهما. رواه مسلم(٨٣٧).

واتە: ئەنەس(رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: ئیٚمە لە مەدینە کاتیٚك کە بانگ دەر بانگی دەدا بۆ نویٚژی(مغرب) خەڵك پەلەیان دەکرد بۆ پشت کۆڵگەکانی مزگەوت و دوو رکات نویٚژیان دەکرد تاوەکو ئەگەر پیاویٚکی غەریبە بهاتبایە ناو مزگەوت وا تیٚدەگەیشت کە نویٚژ کراوە لەبەر زۆری ئەو کەسانەی کە ئەم دوو رکاتەیان دەکرد.

٢- عن ابن عمرَ(رضي الله عنه) قالَ: صَلَّيتُ مَعَ رسول الله(صلى الله عليه وسلم) ركعتينِ قبل الظهر وركعتينِ بعدها وركعتين بعد الجمعة وركعتين بعدَ المغرب وركعتين بَعدَ العِشاء. رواه البخاري(٤١/٣) ومسلم(٧٢٩).

واتە: ابن عومەر(رەزای خوایان لیٚ بیٚت) دەڵیٚ ئەم نویٚژانەم لەگەڵ پیٚغەمبەردا کردووە(صلى الله عليه وسلم): دوو رکات پیٚش نویٚژی نیوەرۆ دوو رکات لە پاش نویٚژی نیوەرۆ دوو رکات لە دوای جومعە وە دوو رکات لە دوای مغرب وە دوو رکاتیش لە دوای نویٚژی عشاء.

## سوننەتی(عشاء)

بەپیٚ ی فەرموودەی(بينَ كلِّ أَذانينِ صَلاةٌ) دوو رکات سوننەت هەیە پیٚش نویٚژی(عشاء) وە فەرموودەی پیٚشوش بەڵگەیە لەسەر بوونی دوو رکات دوای نویٚژی(عیشاء).

## سوننەتی جومعە

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قالَ: قال رسول الله(ﷺ): اذا صَلَّى احدُكُمُ الجُمُعَةَ فَلْيُصَلِّ بعدها أربعاً. رواه مسلم(٨٨١).

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی جومعەی کرد با چوار رکات سوننەت لە دوایدا بکات.

٢- عن ابن عمر(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ): كان لا يُصلِّي بَعدَ الجمعةِ حَتَّى يَنصَرِفَ فَيُصَلِّي ركعتينِ في بيتهِ. رواه مسلم(٨٨٢).

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) لە دوای نوێژی جومعە نوێژی نەدەکرد تا نەچووبایە ماڵ جا دوو رکات نوێژی لە ماڵەوە دەکرد.

## گەورەیی کردنی دوازدە رکات نوێژی سوننەت رۆژانە

١-عن ام المؤمنين أمِّ حبيبةَ رَمْلَةَ بنتِ أبي سُفيان(رضي الله عنها) قالت: سمعتُ رسولَ الله(ﷺ) يقول: ما منْ مسلمٍ يُصَلِّي لله تعالى كُلَّ يومٍ ثِنْتَيْ عَشَرَةَ ركعةً تطوعاً غيرَ الفَريضةِ إلاّ بنى اللهُ له بيتاً في الجنّة أو: إلاّ بُنيَ لَهُ بيتٌ في الجنةِ. رواه مسلم(٧٢٨).

واتە: هەر بەندەیەکی موسڵمان رۆژانە دوازدە رکات نوێژی سوننەت فەرزەکان نا بکات بۆ خوای بەرز ئیللا خوا خانوەکی لەبەهەشت بۆ دروست دەکات، یا ئیللا خانووەکی لە بەهەشت بۆ دورست دەکرێ.

# زۆر نوێژی سوننەت کردن

عن ابي فراس ربيعةَ بن كعبٍ الأسلميِّ خادم رسول الله(ﷺ) ومن اهل الصُّفَّة[1](رضي الله عنه) قال: كنت أبيتُ مَعَ رسول الله(ﷺ) فآتيه بوَضُوئِه و حاجَته فقال لي سَلْ فقلْتُ أسألُكَ مُرافقَتَكَ في الجنة، فقال: أوَ غيرَ ذلك؟ قلتُ: هوَ ذاكَ، قالَ: فأَعنِّي على نَفْسِكَ بكثرة السُّجُود. رواه مسلم.

وَضُوء: ئاوی دەست نوێژ (وضُوء) دەست نوێژ

واتە: ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمی(ڕەزای خوای لیٚ بێت) خزمەتکاری پێغەمبەر(ﷺ) وە لە خەڵکی سوففە بوو دەڵیٚ: شەوم لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەکردەوە ئاوی دەست نوێژو پێداویستیەکانم بۆ دەهێنا جارێکیان پێی فەرمووم: داوا بکە گوتم: داوای ئەوەت لیٚ دەکەم کە لە بەهەشتا ببم بە هاوڕێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەوە ناگۆڕی شتێکی ترت بویٚ؟ گوتم : نەخێر داوام هەر ئەوەیە، فەرمووی: کەواتە یاریدەم بدە بەسەر نەفست بە سەجدە زۆر بردن.

# کۆمەڵیٚ بابەتی پەیوەندی دار بە نوێژەوە

١-عن مالكٍ(رضي الله عنه) قالَ: قال رسول الله(ﷺ): صَلّوا كما رأَيتُموني أُصَلِّي. رواه البخاري(٦٣١).

واتە: نوێژ بکەن هەروەکو چۆن منتان بینی کە نوێژ دەکەم.

---

(1) الصفة: محل مسقف اخر المسجد النبوي يأوي اليه الفقراء.

**سوود**:

موسڵمان نوێژ بەم شێوەیە دەکات کە پێغەمبەر(ﷺ) کردوویەتی نەك بە کەیفی خۆی شتی لێ کەم و زیاد بکات، هەندێ شت هەیە لە ناو نوێژ ئەگەر نەشی کەی نوێژەکەت پێ بەتاڵ نابێت بەڵام لە خێرت کەم دەکات، بەڵام هەندێ شت هەیە ئەگەر نەیکەی نوێژەکەت بەتاڵ دەبێتەوە وەك(طُمأنینة) لە رکوع و(إعتدال) و سەجدەکان و دانیشتنی نێوان سەجدەکان.

(طمأنینة) واتە: ئەوەندە بمێنیەوە تا ئارام دەبیت و جەستەت لە جووڵە دەکەوێت. هەندێك دەڵێن ئەو ماوەیە بە قەد ماوەی ئەوەندەیە کە بڵێی (سبحان الله)، یەکێك لەو شتانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) نەیکردووە نیەت هێنانی بە دەنگە لە سەرەتای نوێژدا. یاخود زۆر جار خەڵکانێك هەن لە نوێژی جەماعەت کە ئیمام دەڵێ(ولا الضالین) ئەوان دەڵێن (ربّ اغفر لي ولوالديَّ) ئینجا دەڵێ آمین ئەوە بیدعەیە.

باشترین کتاب لەسەر چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەر(ﷺ) نوسرابێت (صفه صلاه النبی) کە ئەلبانی دایناوە (رەحمەتی خوای لێ بێت) هەوڵ بدە بیخوێنیەوە.

## فاتحەو ماناکەی

عن عبادة بن الصَّامتِ أَنَّ رَسولَ اللهِ(ﷺ) قال: لا صلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقرأْ بفاتحةِ الكتاب. رواه البخاري(٧٥٦) و مسلم(٣٩٤).

واتە: هەر کەسێك سورەتی فاتحە نەخوێنێ نوێژەکەی دروست نی یە.

## سوود:

١-زۆربەو جەماوەری زانایان دەڵێن دەبیٚ(مأموم) سورەتی فاتحە بخوێنیٚ ئەگەر لە نوێژە(جهريە)یەکانیش بێت واتە لەو نوێژانەی کە ئیمام بە دەنگی بەرز فاتحەو قورئان دەخوێنیٚ.

٢- چەند خەسارەتێکی گەورەیە موسڵمان چەندین ساڵ نوێژ بکات بەلام نەزانیٚ ئەوەی دەیانخوێنیٚ مانایان چییە لەم کیتابە لە باسی نوێژ مانای تەحییات و صەلەوات و زیکرێکی رکوع و سەجدە لێك دراوەتەوە وا لێرەش مانای سورەتی فاتحە بە کورتی لێك دەدینەوە انشاءالله.

# مانای سورەتی(فاتحە) بە کورتی

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

خۆم دەپارێزم بەخوا لە شەیتانی دەرکراو و دوورخراوە لە رەحمەتی خوا.

أعوذ: خۆم دەپارێزم، یا پەنا دەگرم.

الرجيم: (المطرود من رحمة الله) دەرکراو لەرەحمەتی خوا.

ئەوەی زانراویشە (استعاذة) ئاتیەتێك نییە لەسوورەتی (فاتحة).

(بسم الله الرحمن الرحيم) بەناوی خوای (الرحمن الرحيم)

(الرحمن الرحيم) دوو ناو و دوو سیفەتی خوان لەچاوگی (الرحمة) وەرگیراون وە هەردووکیان سیغەی موبالەغەن، بەلاّم (الرحمن) مانای موبالەغەی زیاتری تێدایە لە (الرحيم).

(الرحمن) وا دەگەیەنیٚ کە خودا خاوەنی رەحمەتی زۆرە وە (الرحيم) مانای وایە خودا خاوەنی رەحمە بەرامبەر بەندەکانی بەسەریاندا دەرِێژێنیٚ لەدونیاو لەقیامەت وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ (رحمان الدنيا والآخرة ورحيمَهُما).

(الحمــد لله ربّ العــالمين) هــەموو ســوپاس و ســتایش بــۆ خــوای پەروەردگاری جیهانیان.

الحمـد: ئەلیف و لامـی سـەر وشـەی (حمد) بـۆ جینـسە، واتـە هـەموو تاکێك لەتاکەکانی (حمد) بۆخودا.

ربّ: لێـرەدا بـەمانای دروسـتکەر و بەخێوکـەرو بەڕێوەبـەری کاروبـار هاتووە.

العالمین: کۆیە تاکەکەی (العالم)ە (عـالم)یش کۆمەڵە شتێکە کە لەیـەك بچن وەك عالەمی ئینسان، عالـەمی (جن) عالـەمی فریشتە، عالـەمی ئاژەڵ، عالـەمی رووەك، هتـد.. کەواتـە: وشـەی (العـالمین) لێـرەدا هـەموو بوونـەوەر دەگرێتەوە.

(الرحمن الرحیم) ئەوەمان لەمانای (بسملة) باس کرد.

(مالكِ یوم الدین) خاوەنی رۆژی پاداشت و سزا.

مالك: خاوەن.

یوم الدین: رۆژی پاداشت و سزا (یوم الجزاء).

(ایاك نَعبُدُ وإیّاك نستعین)

(خودایە) تەنها تۆ دەپەرستین وەتەنها لەتۆ داوای یارمەتی دەکەین.

إیاك: بەس تۆ، تەنها تۆ.

نَعبُدُ: دەپەرستین.

نستعین: داوای یارمەتی دەکەین.

(اهـدنا الـصراط المـستقیم) رێنموونیمـان بکـە بـۆ رێگـای راسـت، واتـە: ئاشنامان بکە پێی، دامەزراومان بکە لەسەری.

یـا بڵـێین (خوایـە رێنماییمـان بکـە بـۆ ئیـسلام و یارمـەتیمان بـدە کـە لەسەری بەردەوام بین).

(صـراط الـذین أنعمـت علـیهم): رێگـای ئەوانـەی کـە چـاکەت لەگـەڵ

کردوون.

(غیر المغضوب علیهم) نەك (ڕێی) ئەوانەی کە خەشم و غەزەبی (تۆیان) لیٚ گیراوە، (وەك جوولەکە).

(ولاالضالین) وە نەك (ڕێی) گومڕایان، (وەك دیانەکان).

(آمین) ئەم وشەیە بەشێك نییە لەسوورەتی (فاتحة) واتە: (اللهم استجب دعاءنا) خوایە پاڕانەوەکەمان گیرا بکە.

## بەهێزترین تەحییات و ماناکەی

عن عبدالله قال: كُنّا نقولُ في الصّلاة خَلفَ رسولِ الله(ﷺ) السلام على الله السلام على فلان، فقال لنا رسول اللهِ(ﷺ) ذاتَ يومٍ: إنَّ الله هو السَّلامُ فإذا قَعَدَ أحَدُكُم في الصّلاةِ فَلْيَقُلْ: التَّحيّاتُ للهِ والصَّلَواتُ والطَّيِّباتُ السلامُ عليك أَيُّها النبيُّ ورحمة الله وبركاتهُ السلام علينا وعلى عبادِ الله الصالحين(فإذا قالها أصابَت كُلَّ عبدٍ للهِ صالحٍ في السّماء والارض) أشْهَدُ أن لا إله إلا الله وأشهدُ أنّ محمداً عبدُهُ ورسُلُهُ. رواه البخاري(٨٣٠) ومسلم(٤٠٢).

واتە: عبدالله کوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لیٚ بێت) دەڵیٚ: ئێمە لەکاتی خۆی لە ناو نوێژدا لە دوای پێغەمبەر(ﷺ) دەمانگوت سەلام لە خوا سەلام لە فلان، جا پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێکیان پێی فەرمووین: بیٚ گومان خودا خۆی ناوی(سلام)ە جا کاتێك یەکێك لە ئێوە دانیشت لە ناو نوێژدا بۆ خوێندنی تەحییات با بڵیٚ(التَّحيّاتُ للهِ والصَّلَواتُ والطَّيِّباتُ السلامُ عليكَ أَيُّها النبيُّ ورحمة الله وبركاتهُ السلام علينا وعلى عبادِ الله الصالحين) جا کاتێك ئەمەی گوت واتە(السلام علينا وعلى عبادِ الله الصالحين)

سلاوەکەی بەر هەموو بەندەیەکی چاکی خودا دەکەوی لە ئاسمان و لە زەویدا، اشهد ان لا اله الا الله واشهدُ أَنَّ محمداً عبدهُ ورسوله.

## سوود:

١-ئەوەی لە فەرموودەکەدا هاتووە کە دەڵێ(السلام على فلان) ئەوە سەلام کردن بووە لە فریشتە.

٢- ئەم تەحییاتەی باس کرا بەهێزترین تەحییاتە لەرووی سەنەدەوە کە بەم شێوەیە:

التَّحيّاتُ للهِ والصَّلَواتُ والطَّيِّباتُ السلامُ عليكَ أَيُّها النبيُّ ورحمة الله وبركاتهُ السلام علينا وعلى عبادِ الله الصالحين اشهد ان لا اله الا الله واشهدُ أَنَّ محمداً عبدهُ ورسوله.

٣- مانای تەحییات

(التَّحيّاتُ للهِ والصَّلَواتُ والطَّيِّباتُ)

واتە: هەرچی هۆی قەدرو رێزە چ بە گوفتار و چ بە کردار وە هەرچی سەرچاوەی داخوازی و لالانەوەو پاڕانەوەو دوعاو نزایە وە هەرچی سەرچاوەی پاکی و خاوێنییە ئەمانە هەموویان لە ڕاستیدا هەر شایستەی خودان.

السلامُ عليكَ أَيُّها النبيُّ ورحمة الله وبركاتهُ:

واتە: سەلامت لەسەر بێت ئەی پێغەمبەر وە بەزەیی و بەرەکەتی خوات برژێتە سەر.

السلام علينا وعلى عبادِ الله الصالحين:

واتە: سەلام لەسەر ئێمەو وە لەسەر هەموو بەندە باشەکانی خودا.

اشهد أن لا اله الا الله واشهدُ أنَّ محمداً عبدهُ ورسوله:

واته: شایەدی دەدەم کە هیچ پەرستراوی بەڕاستی نییە بێجگە لە خوا وە شایەدی دەدەم کە محمد پێغەمبەری خوایە.

٤-جەماوەری زانایان کە لە نێوانیاندا حەنەفیەکان و مالیکی یەکان و شافعی یەکان هەن تەحییاتی یەکەم بە سوننەت دەزانن بەڵام(احمد) بە فەرزی دەزانێ.

## بەهێزترین(صلوات) وماناکەی

١-عن كعب بن عُجرَةَ(رضي الله عنه) قال: خَرَجَ علينا رسول الله(ﷺ) فقلنا: قَدْ عَرَفنا كيفَ نُسَلِّمُ عليك فَكَيفَ نُصَلّي عليك؟ قال: قولوا: أللهُمّ صَلِّ على محمدٍ وعلى آلِ محمد كمَا صَلَّيتَ على آل ابراهيم إنَّكَ حميدٌ مجيدٌ، أللهمَّ بارك على محمدٍ و على آلِ محمد كمَا باركتَ على آلِ ابراهيم إنَّكَ حميدٌ مجيد. رواه البخاري(٣٣٧٠) ومسلم(٤٠٦).

واته: کەعبی کوڕی عوجەرە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە لامان گوتمان ئێمە زانیمان کە چۆن سەلام لە تۆ بکەین بەڵام ئایا چۆن(صلوات)ت لەسەر بدەین؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بڵێن:

(أللهُمّ صَلِّ على محمدٍ وعلى آلِ محمد كمَا صَلَّيتَ على آل ابراهيم إنَّكَ حميدٌ مجيدٌ، أللهمَّ بارك على محمدٍ و على آلِ محمد كمَا باركتَ على آلِ ابراهيم إنَّكَ حميدٌ مجيد).

**سوود**:

١-ماناى(صلوات) بەم شێوەى پێشوو

واتە: ئەى خودایە بڕژێنە رەحمەت بۆ سەر(محمد) و كەس و كارى(محمد) هەر وەكو چۆن رەحمەتت رژاندۆتە سەر كەس و كارى ئیبراهیم بێ گومان تۆ سوپاسكراوو پایە بەرزى ئەى خودایە پیتو فەرو بەرەكەت بڕژێنە بەسەر(محمد) و كەس و كارى(محمد) هەر وەك چۆن پیت و پێزت ڕژاندۆتە سەر كەس و كارى ئیبراهیم بێگومان تۆ سوپاسكراو و پایە بەرزى.

٢- ووشەى(سيّد) لە هیچ صەلەواتێكدا نەهاتووە كە لە پێغەمبەر ریوایەت كرابێت.

٣- باسى صەڵەوات كراوە لەم كیتابە لە باسى زیكر.

## دەست بەرز كردنەوە لە نوێژ

عن عبدالله بن عمر(رضي الله عنه) قالَ: رأيت النبيَّ(صلى الله عليه وسلم) افتتحَ التكبير في الصَّلاة فَرفَع يَديهِ حينَ يُكَبِّرُ حتّى يجعَلْهُما حَذْوَ مَنْكبيه واذا كَبَّر لِلرُّكوعِ فعَلَ مِثلَهُ وإذا قالَ: ربنا ولك الحمد ولا يفعل ذلك حينَ يَسجُدُ و لا حينَ يَرفعُ رأسَهُ مِنَ السُّجود. **رواه البخاري(٧٣٨) ومسلم(٣٩٠).**

واتە: عبدالله كوڕى عومەر(رەزاى خواى لێ بێت) دەڵێ پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بینى(الله اكبر)ى نوێژ دابەستنى كرد هەردوو دەستەكانى لە كاتى(الله اكبر) كردن دا بەرز كردەوە تا ئاستى شانەكانى وە كاتێك(الله اكبر)ى بگوتبایە بۆ ركوع ئەم دەست بەرزكردنەوەى دوو بارە دەكردەوە وە

ئەگەر بیگوتبا(سمع الله لمن حمده) بە هەمان شێوە دەستەکانی بەرز دەکردەوە وە دەیفەرموو(ربنا ولك الحمد) بەڵام لە کاتی سەجدە بردن و کاتی هەستانەوە لە سەجدە دەستەکانی بەرز نەدەکردەوە.

**سوود**:

١-لە صحیحی بخاری دا هاتووە لە فەرموودەی(٧٣٩) کە عبدالله کوڕی عومەر لە کاتی هەستانەوە لە دووەم رکات دەستی بەرز کردۆتەوەو وە ئەمەشی داوەتە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ)

٢- لە صحیحی موسلیم دا هاتووە لە فەرموودەی(٣٩١) کە پێغەمبەر(ﷺ) دەستەکانی بەرز کردۆتەوە تا بەرامبەر گوێیەکانی(رفع يديه حتى يُحاذي بهما أُذُنَيهِ).

## زیکری دەست پێ کردن بە نوێژ(استفتاح)

١-عن عائشة(رضى الله عنها) قالت: كانَ رسولُ الله(ﷺ) اذا استَفتَح الصلاة قال:(سُبحانك اللهمَّ وبِحَمدك وتبارك اسمُك وتعالى جَدّكَ ولا إله غَيرُك. صحيح رواه أبوداود(٧٧٦).

واتە: عائیشە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) لە دوای نوێژ دابەستان دەیفەرموو:( سُبحانك اللهمّ وبِحَمدكَ وتباركَ اسمُكَ وتعالى جَدّكَ ولا اله غَيرُك).

واتە: ئەی خودایە بە پاکت دەگرم و سوپاست دەکەم وە ناوت بەرزو پڕ پیت و پیرۆزەو پایەت گەڵێك بڵندو بەرێزەو جگە لە تۆ هیچ پەرستراوی بەڕاستی نی یە.

٢- عن أبي هريرة(رضى الله عنها) قال: كانَ رسولُ الله(ﷺ): يَسكُتُ بين التكبير وبين القراءة اسكاتَةً، قال أَحسِبُهُ قال هُنَيَّةً. فقلت بأبي و أمي يا رسول الله اسكاتُكَ بين التكبير والقراءة ما تقول؟ قال أقولُ: (اللهُمَّ باعِدْ بيني وبينَ خطايايَ كما باعدتَ بين المشرق والمغرب، أللهم نقِّني مِن الخطايا كما يُنَقَّى الثَّوبُ الأبيضُ مِنَ الدَّنَسِ، أللهُمَّ اغْسِلْ خطايايَ بالماءِ والثَّلجِ والبَرَد).
رواه البخاري(٧٤٤) ومسلم(٥٩٨).

١-اسكاتةً: ماوەیەکی کەم.

٢- هُنَيَّةً: أي قليلا من الزمان، واتە: کاتێکی کەم.

٣- بالماء والثلج والبَرَد: بە ئاو و بەفرو تەزرە.

مانای فەرموودەکە: ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) لە نێوان(الله اکبر)ی نوێژ دابەستن و لە پێش خوێندنی(فاتحە) وەستانەکی کەمی دەکرد، جا گوتم بە باوك و دایکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە چی دەڵێ ی لەو کاتەی کە کەمێك دەوەستی لە نێوان(الله اکبر)ی نوێژ دابەستن و (فاتحە) خوێندن؟ فەرمووی دەڵێم(اللهُمَّ باعِدْ بيني وبينَ خطايايَ كما باعدت بين المشرق والمغرب، اللهم نقني من الخطايا كما يُنَقَّى الثَّوبُ الأبيضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللهُمَّ اغْسِلْ خطايايَ بالماءِ والثَّلجِ والبَرَد).

## زیكر له ركوع و له سەجدەدا

١-عن حذيفة قال: صَلَّيتُ مع النبيِّ(ﷺ) فَكانَ يقولُ في ركوعه: سبحان رَبِّيَ العظيم، وفي سجوده: سبحان رَبِّيَ الأعلى. صحيح رواه أبوداود(٨٧١) والترمذي(٢٦٢).

١- سبحان رَبِّيَ العظيم: پاك و بێ گەردە پەروەردگاری گەورەم.

٢- سبحان رَبِّيَ الأعلى: پاك و بێ گەردە پەروەردگاری هەرە بەرزم.

واتە: حذيفة(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: نوێژم لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) كرد له ركوعدا دەیفەرموو(سبحان رَبِّيَ العظيم) وە له سەجدەدا دەیفەرموو(سبحان رَبِّيَ الأعلى).

## زیكری نێوان دوو سەجدەكان

١-عن حذيفة أنَّ النبيِّ (ﷺ) كانَ يقول بينَ السَّجدتين: رَبِّ اغْفِر لي، رَبِّ اغْفر لي. صحيح رواه ابو داود(٨٧٤).

واتە: حوزەیفە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) له نێوانی دوو كڕنوشەكان دا دەیفەرموو(رَبِّ اغْفر لي، رَبِّ اغفر لي) واتە: پەروەردگارم لێم خۆش بە پەروەردگارم لێم خۆش بە.

٢- عن ابن عباس(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) كان يقول بينَ السَّجدتين: أللهمَّ اغْفِر لي وارْحَمْني، واجْبُرني، واهْدِني، وارزُقني. صحيح رواه ابوداود(٨٥٠) والترمذي(٢٨٤) وابن ماجه(٨٩٨).

واتە: ابن عباس(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) له نێوانی سەجدەكان دا دەیفەرموو:(اللهمَّ اغْفِر لي وارْحَمْني، واجْبُرني، واهْدِني، وارزُقني).

## سوترەی پێش نوێژ

١-عن أبي سعيد الخُدريِّ أنَّ رسول الله(ﷺ) قالَ: إذا صلّى أَحدُكُم فَلْيُصَلِّ الى سُترَةٍ ولْيَدْنُ مِنها. صحيح رواه أبو داود(٦٩٨).

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد با سوترەیەکی لە پێش بێت، وە با لیٚ ی نزیك بکەوێتەوە.

٢- عن موسى بن طلحة عن ابيهِ قال: قال رسولُ اللهِ(ﷺ): اذا وَضَعَ أحَدُكَمْ بينَ يَدَيْهِ مِثْلَ مُؤْخِرَةِ الرَّحْلِ فَلْيُصَلِّ ولا يُبالِ مَنْ مَرَّ وراءَ ذلك. رواه مسلم(٤٩٩).

١-مُؤْخِرَة: تەختە دارێکە ئەوەندەی هێسکی باسکی دەست درێژە.

واتە: هەر یەکێکتان شتێکی لەبەردەم نوێژەکەیدا دانا کە بە قەد تەختەداری دواوەی کورتانە ووشتریٚ بێت با نوێژ بکات وە گویٚ نەدات بەوەی کە لەو دیوی ئەو بەربەستەوە دەڕوات.

### سوود:

١-هێندێك دەڵێن(أقَلُّ ما يُجزِيء مثل مُؤْخِرَةِ الرَّحْلِ) واتە: کەمترین شت کە بشیٚ بۆ بەربەست(سُترە) ئەوەیە وەکو تەختەداری دوای کورتانی ووشتر بێت کە گوتمان درێژیەکەی ئەوەندەی هێسکی باسکی دەستە.

٢- ئەو فەرموودەیەی کە دەڵیٚ ئەگەر هیچ نەبوو با خەتێك رابکێشیٚ لە پێش خۆیدا فەرموودەیەکی(ضعیف)ە.

٣- ئەگەر ئیمام سوترەی دانا ئەمە سوترەیە بۆ مەئمومەکانیش(سُترة الإمامِ سُترةٌ لِلمأموم).

٤- سُترە دانان سوننەتە ئی وا هەن دەڵێن واجبە.

٥- پێم خۆشە ئەوەش بڵێم خەڵکانی وا هەن لە مزگەوت کە سەلام درایەوە یەکسەر هەڵدەستێتەوە لە سەر ڕیز ی خەڵك نوێژ دادەبەستیٚ، جا خەڵکی وا هەیە بە پێش نوێژەکەی دا دەڕوات خۆزیا ئەوان دەچوون لە پشت دینگەیەکی مزگەوت نوێژیان دەکرد یا لەلاچەپێك کە خەڵك بە پێشی دا نەڕۆن.

# شەو نوێژ(قيام الليل)

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ اللهِ(صلى الله عليه وسلم) قال:يَعقدُ الشيطانُ على قافيَةِ رأس أحَدِكُمْ إذا هوَ نامَ ثَلاثَ عُقَدٍ يَضْرِبُ على مكانِ كُلِّ عُقدَةٍ: عليك ليلٌ طويلٌ فارْقُد فإن اسْتَيقَظَ فذَكَرَ اللهَ انْحلَّتْ عُقدةٌ، فإنْ توَضَّأَ انحَلّتْ عقدةٌ، فإنْ صلّى انْحلَّتْ عُقدةٌ، فأصْبَحَ نَشيطاً طَيِّبَ النَّفْسِ وإلاّ أصْبَحَ خَبيثَ النَّفسِ كَسلان. رواه البخاري(١١٢٤) و مسلم(٧٧٦).

١- قافية الرأس: آخِرُهُ، واته: کۆتايی سەر.

٢-عقدة: گرێ.

مانای فەرموودەکە: کاتێ دەخەون شەيتان سێ گرێ لە ئاخيری سەرتان دەدات، لە شوێنی هەموو گرێيەك دەدات و دەڵێ: بخەوە شەوێکی درێژت لە پێش ماوە جا ئەگەر بەخەبەر هات و يادی خوای کرد گرێيەك دەبێتەوە وە ئەگەر دەستنوێژيشی گرت، ئەوە گرێيەکی تريش دەبێتەوە، وە ئەگەر نوێژيشی کرد گرێيەك دەبێتەوە جا ئەو کەسە بەيانی دەکاتەوە بە گورج و گۆڵی و دڵ خۆشيەوە ئەگەر نا بەيانی دەکاتەوە بە نەفس پيسی و تەمبەڵی.

سوود:

١-شەونوێژ کاتەکەی دەست پێ دەکات لە دوای نوێژی خەوتنان(عشاء) تا بەيانی(طلوع الفجر) دەمێنێ(واتە کاتی بانگی بەيانی).

٢- شەو نوێژ پێك دێت ئەگەر بەيەك رکاتی(وتر)يش بێت لە دوای نوێژی خەوتنان.

٢- عن عبدالله بن سلام(رضي الله عنه) قال: لما قدم رسول الله(صلى الله عليه وسلم) المدينة انجفلَ الناسُ اليه وقيل قَدم رسول الله(صلى الله عليه وسلم)، قدم رسول الله (صلى الله عليه وسلم)، قدم رسول الله (صلى الله عليه وسلم)، فَجئتُ في الناسِ لأنظر اليهِ فلما استثبت وجه رسولُ الله(صلى الله عليه وسلم) عرفتُ انَّ وَجْهَهُ ليس بوجه كذاب وكان أولُ شيءٍ تكلم به أن قال: أيَّها الناسُ أَفْشوا السلام واطعموا الطعام وَصَلّوا والناسُ نيام تَدْخُلوا الجَنَّةَ بِسلام. **صحيح** رواه الترمذي(٢٤٨٧) وابن ماجه(٣٢٥١).

واته:عبدالله كوری سەلام(رەزای خوای لیّ بیّت) دەڵیّ: كاتیّك پیّغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هاتە شاری مەدینە خەڵكان بە پەلە بەرەو رووی چوون هاوار كرا پیّغەمبەری خوا هات(صلى الله عليه وسلم)، پیّغەمبەری خوا هات پیّغەمبەری خوا هات(صلى الله عليه وسلم) جا منیش لەگەڵ خەڵكی چووم بۆ ئەوەی تەماشا بكەم كە لە رووی پیّغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) وورد بوومەوە زانیم رووی پیّغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە رووی درۆزن ناچیّ ئەوجا پیّغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) یەكەم قسەی ئەوەبوو فەرمووی: ئەی خەڵكینە سەلام بلاوبكەنەوە خواردن بدەن وە نویّژ بكەن لەو كاتەی كە خەڵكان نوستوون دەچنە بەهەشت بە سەلامەتی.

٣- عن عليّ (رضي الله عنه) أنَّ النبيّ(صلى الله عليه وسلم) طَرقَهُ وفاطِمةَ ليلةً فقالَ ألا تُصَلّيان؟ رواه البخاري(١١٢٧) ومسلم(٧٧٥).

١-طَرَقَهُ: اتاهُ ليلاً، واتە: بەشەو هاتە لای.

مانای فەرموودەكە: علی كوڕی ابوطالب(رەزای خوای لیّ بیّت) دەڵیّ: شەویّكیان پیّغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هاتە لای خۆی و فاطمە فەرمووی ئایا نویّژ دەكەن؟

٤- عن سالم بن عبدالله(رضي الله عنه) عن ابيه: أنَّ رسولَ اللهِ(ﷺ) قالَ: نِعْمَ الرَّجل عبدالله لو[1]كانَ يُصلي منَ الليلِ فقال سالم، فكان عبدالله بعدَ ذلك لا ينامُ مِنَ الليل إلاّ قليلاً. رواه البخاري(١١٢١) ومسلم(٢٤٧٩).

واته: سالمی کوڕی عبدالله کوڕی عومەر(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ باوکم گوتویەتی(واتە عبدالله) پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: عبدالله پیاوی چاکە خۆزیا شەو نوێژی دەکرد، جا سالم دەڵێ: عبدالله لە پاش ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) لە شەودا نەدەنووست تەنها کەمێکی نەبێت.

٥- عن عبدالله بن عَمرو بن العاص(رضي الله عنه) قال: قال لي رسولَ اللهِ(ﷺ) يا عبداللهِ لا تَكُن مِثلَ فلانٍ كانَ يَقومُ مِنَ اللَّيلَ فتركَ قيامَ الليل. رواه البخاري(١١٥٢) ومسلم(١١٥٩).

واته: عبدالله کوڕی عەمری کوڕی عاص(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) پێ ی فەرمووم : ئەی عبدالله وەکو فلانە کەس مەبە جاران شەو نوێژی دەکرد لە پاشان وازی لێ هێنا.

٦- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قالَ رسولَ اللهِ(ﷺ): رَحِمَ اللهُ رجلاً قامَ مِنَ الليل فَصَلّى وأَيْقَظَ امرأَتَهُ فإن أَبَتْ نَضَحَ في وَجْهِها الماءَ، رَحِمَ اللهُ امرأةً قامَتْ من الليلِ فصَلَّتْ وأَيقَظَتْ زَوْجَها فَإِنْ أَبَى نَضَحَتْ في وَجْهِه الماء. حسن صحيح رواه ابوداود(١٣٠٨).

واته: ڕەحمەتی خوا لە پیاوێك کە لە شەو هەڵدەستێ و نوێژدەکا وە خێزانەکەشی هەڵدەستێنێ جا ئەگەر هەڵنەستا ئاو بپرژێنێ بە دەم چاویا،

---

(1) لو: للتمني، لا للشرط.

رەحمەتی خوا لەو ئافرەتە بێ کە بەشەو هەڵدەستێ نوێژ دەکا وە مێردەکەشی بەخەبەر دێنێ جا ئەگەر مێردەکەی هەڵنەستا ئاو بپرژێنێ بە دەم و چاویا.

٧- عن ابن مسعود(رضي الله عنه) قال: ذُكر عندَ النَّبيِّ(ﷺ) رَجُلٌ نامَ ليلةً حتى أصبحَ قالَ: ذاك رجَلٌ بالَ الشيطانُ في أُذُنيه أو قال: في أُذُنه. رواه البخاري(٣٢٧٠) ومسلم(٧٧٤).

واتە: ابن مسعود(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لای پێغەمبەر(ﷺ) باسی پیاوێکیان کرد کە شەوێکیان نوست تا بەیانی، فەرمووی: ئەوە شەیتان میزی لە گوێیەکانی کردووە یا فەرمووی: لە گوێ ی.

٨- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قالَ رسولَ الله(ﷺ): أفْضَلُ الصِّيامِ بَعدَ رَمضانَ شَهرُ الله المُحَرَّم، وأفضَلُ الصلاةِ بَعدَ الفَريضةِ صلاةُ الليلِ. رواه مسلم(١١٦٣).

واتە: باشترین رۆژی لە دوای مانگی رەمەزان مانگی موحەڕڕەمی خودایە، وە باشترین نوێژ لە دوای نوێژی فەرز شەو نوێژە.

٩- عن عبادة بن الصَّامت(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ): قال: مَنْ تَعارَّ مِنَ الليل: فقال: لا اله الا الله وحدهُ لا شريك له، له الملكُ ولَهُ الحمد، وهوَ على كلِّ شيءٍ قدير، سبحانَ الله والحمد لله ولا اله الا الله والله اكبرُ ولا حول ولا قوة إلا بالله، ثُمَّ قال: رَبِّ اغْفِر لي، أو قالَ: ثُمِّ دعا اسْتُجيبَ لَهُ فإن عَزَمَ وتوضّأَ ثُمَّ صلى قُبلت صلاته. رواه البخاري(١١٥٤) والترمذي(٣٤١١). واللفظ له.

١- تَعارَّ: استيقظَ، بەخەبەر هات.

٢- لا اله الا الله: هیچ پەرسشتراوێکی بەڕاستی نی یە بێجگە لە خوا.

٣- سبحان الله: خوا پاك و بیٚ عەیبە.

واتە: هەر یەكیٚك لە شەودا بەخەبەر هات بلٚیٚ(لا اله الا الله وحدهُ لا شريك له، له الملكُ ولَهُ الحمد، وهوَ على كلِّ شيءٍ قدير، سبحانَ الله والحمد لله ولا اله الا الله والله اكبرُ ولا حول ولا قوة إلا بالله) لە پاشان بلٚیٚ: پەروەردگارم لە گوناهم خۆش بە یا گوتی: لە پاشان دوعای كرد وەلاٚمی دەدریٚتەوە وە ئەگەر عەزمی كرد دەست نویٚژی شوشت لە پاشان نویٚژی كرد نویٚژی قەبولٚ دەبیٚت.

١٠- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: اذا قامَ أحَدُكُم مِنَ اللّيل فَلْيَفْتَتِحْ صَلاتَهُ بِرَكعَتينِ خَفيفَتَينِ. رواه مسلم(٧٦٨).

واتە: ئەگەر یەكیٚك لە ئیٚوە هەستا لە شەودا با نویٚژەكانی دەست پیٚ بكات بە دوو ركاتی سووكەلٚە(خفيف).

١١- عن ابن عمر(رضي الله عنه) أنَّ رجلاً سألَ رسولَ الله(ﷺ) عن صَلاة الليلِ؟ فقالَ رسول الله(ﷺ): صلاةُ الليلِ مثنى مثنى فإذا خَشِيَ أحدُكُمُ الصُّبحَ صَلّى رَكْعَةً واحدةً توترُ لَهُ ما قَد صَلّى. رواه مسلم(٧٤٩).

واتە: پیاویٚك لەپیٚغەمبەری پرسیار كرد(ﷺ) دەربارەی شەو نویٚژ؟ پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: شەو نویٚژ دوو ركات دوو ركاتە جا ئەگەر یەكیٚك لە ئیٚوە ترسا لە هاتنی بەیانی با یەك ركات نویٚژ بكات دەبیٚ بە ویتری ئەو نویٚژانەی كە كردوونی.

١٢- عن ابي سَلَمَةَ(رضي الله عنه) قال : أتيتُ عائيشَةَ(رضي الله عنها) فَقُلتُ: أيْ أُمَّهْ: أخبِريني عَنْ صلاةِ رسولِ الله(ﷺ) فقالت: كانتْ صَلاتُهُ في شَهْرِ رمضانَ وغيرهِ ثلاثَ عَشْرَةَ ركعةً

بالليلِ منها رَكعَتا الفَجْرِ. رواه مسلم(٧٣٨).

واته: ئەبو سەلەمە(رەزای خوای لیّ بیّت) دەلّیّ: چوومە لای عائیشە(رەزای خوای لیّ بیّت) گوتم: ئەی دایە پیّم بلّیّ پیّغەمبەر(ﷺ) چۆن شەو نویّژ دەکات؟ فەرمووی: نویّژەکانی پیّغەمبەر(ﷺ) لە مانگی رەمەزان و لە غەیری رەمەزانیش سیزدە رکات بووینە لە شەودا بە دوو رکاتی سوننەتی پیّش نویّژی بەیانیشەوە.

**سوود**:

لە(الوجيز في فقه السنه والكتاب العزيز) دا دەربارەی ژمارەی رکاتەکانی شەو نویّژ دەلّیّ:(أَقَلُّهُ ركعةً واكثرهُ إحدى عشرة) واتە: کەمترینی یەك رکاتە وە زۆر ترینی یازدە رکاتە.

١٣- عن طارق بن على(رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول:(لا وتران في ليلة). صحيح رواه ابو ابوداود(١٤٣٩) والترمذي(٤٧٠).

واتە: دوو نویّژی ویتر لە شەویّکدا نی یە.

**سوود**:

١-هەر یەکیّك نویّژی وتری کرد لە پاشان دەتوانیّ شەو نویّژ بکات بەلام نویّژی ویتر دووبارە ناکاتەوە.

٢- سيد سابق لە(فقه السنه) دا دەلّیّ:(استحباب تعجيله لمن ظنَّ انَّهُ لا يستيقظ آخر الليل، وتأخيره لمن ظنَّ انَّهُ يستيقظ آخره) واتە: سوننەتە نویّژی ویتر زوو بکریّ بۆ ئەو کەسەی کە گومانی وایە لە کۆتایی شەودا بە

ئاگا نایێ وە دوا بخسترێ بۆ ئەو کەسەی کە گومانی وایە لە کۆتایی شەودا بە خەبەر دێت.

١٤- عن ابن عباس(رضي الله عنهما) قال: كانَ النبيُّ(ﷺ) يقرأُ في الوتر ب(سَبح اسمَ ربِّكَ الأعلى) و(قُل يا أيُّها الكافرون) و(قل هو الله أحد) في ركعة ركعة. **صحيح رواه الترمذي(٤٦٢) وصحيح سنن نَسائي للالباني(١٦٠٧).**

واتە: ابن عباس(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) لە نوێژی ویتردا سورەتی(اعلى) و(كافرون) و(إخلاص)ی دەخوێند هەر سورەتەی لە رکاتێکدا.

**سوود:**

وا دیارە پێغەمبەر(ﷺ) بە زۆری وتری بە سێ رکات کردووە.

١٥-عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: كان رسول الله(ﷺ) إذا عَمِلَ عملاً أثْبَتَهُ وكان إذا نامَ منَ الليلِ أو مَرِضَ صَلّى من النهار ثِنتي عَشْرَةَ رَكْعَةً، قالت: وما رأيتُ رسول الله(ﷺ) قامَ ليلةً حتى الصَّباحِ وما صامَ شهراً مُتتابِعاً إلاّ رَمضانَ. **رواه مسلم(٧٤٦).**

١-أَثْبَتَهُ: اي جعله ثابتاً غير متروك. واتە: جێگیری دەکردو بەبەردەوامی دەیکردو وازی لێ نەدەهێنا.

**مانای فەرموودەکە:**

عائیشە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ کە کارێکی بکردبا بە بەردەوامی دەیکرد وە ئەگەر لە شەوێ دا بنوستبایە یا نەخۆش بایە لە رۆژدا دوزادە رکات نوێژی دەکرد، وە عائیشە دەڵێ: پێغەمبەرم

نەبینیوە(ﷺ) شەوێك هەستابێتەوە تا بەیانی وە قەت هیچ مانگێکیش بە تەواوی و یەك لە دوای یەك تیایدا بەرۆژوو نەبووە تەنها رەمەزان نەبێت.

١٦- عن عمر ابن الخطاب(رضي الله عنه) يقول: قالَ رسولُ اللهِ(ﷺ) مَنْ نامَ عن حزبِهِ أو عَنْ شيءٍ منهُ فقرَأهُ فيما بينَ صلاة الفجر وصلاة الظّهرِ كُتِبَ لَهُ كَأَنَّما قرأهُ منَ الليل. رواه مسلم(٧٤٧) وأبوداود(١٣١٣).

١- حِزبِهِ: وردە، ئەوەی کە بەردەوامی دەیکا لە خوێندنی قورئان و ئەذکارو نوێژ.

مانای فەرموودەکە: هەر یەکێك خەوی لێ کەوت و ئەو شەوە ئەوەی کە هەموو شەوان لە قورئان خوێندن و ئەذکارو نوێژ کە دەیکردن یا هەندێکی نەکرد، جا لە پاشان قەزای بکاتەوە لە نێوانی نوێژی بەیانی و نوێژی نیوەرۆدا بۆی دەنوسرێ وەکو ئەوە کە لە شەودا کردبێتی.

## ئامۆژگاری و ووتەکانی ناوداران دەربارەی عیبادەتی شەو

١-یحیی کوڕی معاذ(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: دواء القلبُ خَمْسَةُ أشياء: قراءةُ القرآن بالتفكير، وخلاء البطن، وقيام الليل، والتضرح عند السحر، ومجالسة الصالحين[1].

واتە: دەرمانی دڵان پێنج شتە: قورئان خوێندن بە بیر لێ کردنەوە، برسیەتی و مەعیدە بەتاڵی، شەو نوێژ، لالانەوە لە کاتی(سحر)دا، (واتە هەندێك پێشی بەیانی) وە دانیشتن لەگەڵ پیاو چاکان دا.

---

(1) صفة الصفوة، ج٤ لاپەرە:٨٥.

٢- سوفیانی ثوری(رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ:(حرمت قيام الليل خمسة اشهر بذنب اذنبتُهُ، قيل وما ذاك الذنب قال: رأيت رجلاً يبكي فقلت في نفسي هذا مراء[1]).

واتە: شەو نویٚژم لیٚ قەدەغە کرا بۆ ماوەی پیٚنج مانگ بە هۆی یەك گوناح کە ئەنجامم دا بوو، پیٚ ی گوترا ئەم گوناهە چی بوو؟ گوتی پیاویٚکم دیت دەگریا لە دڵی خۆم دا گوتم ئەوە ریابازە.

٣- (فُضَیل)ی کوڕی(عیاض) (رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ:(اذا لم تقدر على قيام الليل وصيام النهار، فاعلم أنك محروم مُكبّل[2] كبَّلَتْك خَطيئتك[3]) واتە:ئەگەر نەتتوانی شەو نویٚژ بکەی بە رۆژ بەرۆژوو بیت بزانە قەدەغەکراوی و بەندکراوی گوناهەکانت بەندیان کردی. وە فضیل(رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت) لە سەرەتای شەوەوە نویٚژی دەکرد تاوەکو خەوی دەهات جا کەمیٚك لە سەر حەسیرەکەی دەنووست لە پاشان هەڵدەستاوە تاوەکو خەوی دەهاتەوەو دیسان دەنووستەوە لە پاشان دیسان هەڵدەستایەوە ئەمە کاری بوو تا بەیانی.

## صلاةُ الضُّحى - نویٚژی چیٚشتەنگاو

-نویٚژی چیٚشتەنگاو سوننەتە.

- ئەم نویٚژە کاتەکەی دەست پیٚ دەکات لەو کاتەی کە رۆژ بەقەد رمحەکی بەرز دەبیٚتەوە(عُثیمین) دەڵیٚ: ئەم ماوەیە دەوروبەری چارەگە سەعاتیٚك بۆ بیست دەقیقەیە لە دوای رۆژهەڵاتن.

---

(1) احياء علوم الدين ج١(باب الاسباب التي يتيسر قيام الليل).

(2) مُكبَّل: بەندکراو.

(3) صفة الصفوة ج٢ لاپەرە:١٥٩.

- كاتی ئەم نوێژە دەمێنێ تادەورووبەری(١٥) دەقیقە پێش بانگی نیوەڕۆ.

- ئەم نوێژە لایەنی کەمی دوو ڕکاتە وە لای سەرووی هەشت ڕکاتە.

- باشتر وایە ئەم نوێژە لە ئاخیر کاتەکانی بکرێ.

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: أوصاني خليلي(ﷺ) بثلاثٍ: بصيامِ ثلاثة أيّامٍ في كُلِّ شهرٍ، وركعَتَيْ الضُّحى وأنْ أُتِرَ قَبْلَ أن أنام. رواه البخاري(١١٧٨) ومسلم(٧٢١).

واته: ئەبو هریرە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئامۆژگاری کردیمە بە سێ شتان: بە بەڕۆژوو بوونی سێ ڕۆژان لە هەموو مانگێ، وە کردنی دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو، وە نوێژی ویتر بکەم پێش ئەوەی بخەوم.

## سوود:

الإيتار قبل النوم إنّما يُستحب لِمَنْ لا يثقُ بالإستيقاظِ آخر اللّيل، فَإن وَثِقَ فآخِرُ اللّيل افضل.

واته: نوێژی ویتر پێش نووستن سوننەتە بۆ کەسێك کە باوەڕی وایە بەخەبەر نایێ لە ئاخیری شەو بەڵام ئەگەر باوەڕی وابوو بەخەبەر دێت ئەوە ئاخیری شەو باشترە بۆ کردنی نوێژی ویتر.

٢- عن أبي ذَرّ(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) قالَ: يُصبِحُ على كُلِّ سُلامى من أَحَدِكُم صَدقةٌ فكُلُّ تسبيحةٍ صَدَقَةٌ، وكلُّ تحميدةٍ صدقةٌ، وكُلُّ تهليلةٍ صدقة، وكلُّ تكبيرةٍ صَدقة، وأمرٌ بالمعروف صدقة، ونهيٌ عن المنكرِ صدقةٌ، ويُجْزىء منْ ذلك

ركعتان يَرْكَعُهُما من الضُّحى.رواه مسلم(٧٢٠).

واته: هەموو رۆژێ گشت جومگەیەکی ئادەمیزاد خێرێکی دەکەوێتە سەر هەموو(سبحان الله) کردنێ خێرێکە، وە هەموو(الحمدالله) کردنێ خێرێکە، وە هەموو(الله اکبر) کردنێ خێرێکە، فەرمان کردن بە چاکەیێ خێرێکە، نەهی کردن لە خراپەیێ خێرێکە، وەکردنی دوو رکات نوێژی چێشتەنگاو شوێنی ئەم خێرانە هەمووی دەگرێتەوە.

٣- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسولُ الله(ﷺ): لا يُحافِظُ على صَلاة الضُّحى إلاّ أوَّاب. رواه الطبراني وابن خزيمة في صحيحه وصححه الالباني في صحيح الترغيب والترهيب(٦٦٤).

واته: پارێزگاری لە نوێژی چێشتەنگاو ناکات مەگەر کەسێ نەبێت کە هەمیشە بگەرێتەوە بۆ لای خوا.

## سوود:

خوای گەورە لەسورەتی(ص) لە وەسفی داود پێغەمبەر دەفەرمووێ(إنَّهُ أوّاب) واته: بێ گومان ئەو هەمیشە گەڕاوە بوو بۆ لای خوا.

## نوێژی هەینی لەسەر کێ واجبە

١-عن طارق بن شهاب(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: الجُمُعةُ حق واجبُ على كل مسلم في جماعةٍ إلاّ اربعةً: عبدٌ مملوكٌ، أو امرأةٌ، أو صبيٌ، أو مريضٌ. صحيح رواه ابوداود(١٠٦٧) وابن ماجة وغيرهما.

واتە: نوێژی هەینی حەقێکی پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك بە کۆمەڵ(جماعه) بیکات جگە لە چوار کەس: بەندەیەك موڵکی خەڵکی بێت، یا ئافرەت، یا منداڵ، یا نەخۆش.

**سوود**:

١-شەوکانی دەڵێ:(تجب على كلِّ مكلَّفٍ، إلاّ المرأة والعَبْدَ والمسافِرَ والمريض)[1].

واتە: نوێژی هەینی واجبە لەسەر هەموو پێگەیشتوویەك جگە لە: ژن و کۆیلەو ڕێبوارو نەخۆش.

کەواتە لێرەدا دەردەکەوێ کە نوێژی جومعە واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك جگە لە پێنج کەس: منداڵ، ژن، کۆیلە، ڕێبوار، نەخۆش.

٢- (صلاة الجمعة ركعتان في جماعة فمن تخلف عن الجماعة ممن لا

---

(1) الأدلة الرضية: ص:٨٥.

تجب عليه الجمعة او كان معذوراً صلى الظهر اربع ركعاتٍ [1].

واته: نوێژی جومعه دوو ركاته به كۆمەڵ دەكرێت، جا هەر یەكێك دوا كەوت لە جەماعەت لەوانەی كە جومعەیان لەسەر نییە یا عوزریان هەیە ئەوە چوار ركاتی نوێژی نیوەڕۆ دەكات.

## خێری نوێژی جومعه

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسولُ الله(ﷺ) مَنْ توضَّأَ فَأَحْسنَ الوُضوءَ ثُمَّ أتى الجُمُعَةَ فاسْتمَعَ وأنْصَت، غُفِرَ لَهُ ما بينَهُ وبينَ الجُمْعة وزيادة ثلاثة أيامٍ، ومنْ مَسَّ الحصَى فقد لغا. رواه مسلم(٨٥٧).

واته: هەر یەكێك دەست نوێژێكی جوان بشوا لە پاشان بچیٚ بۆ نوێژی جومعه جا گویٚ بگریٚ و بیٚ دەنگ بێت، خوا خۆش دەبیٚ لە گوناهی نێوانی ئەو جومعەو جومعەكەی پێشووی وە سیٚ رۆژیش زیاتر، وە هەر یەكێك دەست لە وردە بەرد بدات ئەوە(لَغو)ی كردووە.

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) كان يقولُ: الصَّلَواتُ الخَمْسُ والجُمُعَةُ الى الجمُعَةِ ورَمضانُ الى رمضانَ مُكفِّراتٌ ما بَينَهُنَّ اذا اجتَنَب الكبائِر. رواه مسلم(٢٣٣).

واته: پێنج نوێژەكان جومعه بۆ جومعه رەمەزان بۆ رەمەزان دەبنە كەفارەتی ئەو گوناهانە كە لە نێوان دا كراوە ئەگەر خۆی پاراستبیٚ لە گوناهی گەورە.

---

(1) الوجيز: عبدالعظيم، ص:١٤٥.

# زوو چوون بۆ نوێژی جومعە

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قالَ رسولُ الله(ﷺ) اذا كانَ يومُ الجُمُعَةِ كانَ على كُلِّ بابٍ مِن أبواب المسجد ملائكةٌ يكتبُونَ الأوَّلَ فالأوَّلَ، فإذا جَلَسَ الإمامُ طَوَوُا الصُّحُفَ وجاءُوا يسْتَمِعونَ الذِّكرَ، ومَثَلُ المُهَجِّرِ[1] كمَثَلِ الذي يُهْدِي البدَنَةَ ثُمَّ كالذي يُهْدِي بَقَرةً، ثُمَّ كالذي يُهدِي الكبْش. ثُمَّ كالذى يُهدى الدَّجاجة، ثُمَّ كالذى يُهدى البيضةَ. رواه مسلم(٨٥٠).

واتە: هەر كاتێك كە ڕۆژى هەينى داهات لەبەر هەر دەرگايەك لە دەرگاكانى مزگەوت مەلائيكەتەك رادەوەستىٚ يەك لەدواى يەك بەرێزە ناوى ئەوانە دەنوسن كە دێن بۆ نوێژ تا ئەو كاتەى كە ئيمام دەچێتە سەر مينبەر كە ئيمام چووە سەر مينبەر ئەوانيش پەراوەكانيان دەپێچنەوەو دەچن گوىٚ لە ووتارى ئيمام دەگرن، وە وێنەى ئەو كەسەى كە زوو بچىٚ بۆ نوێژى هەينى وەكو ئەوە وايە كە حوشترێكى بكاتە خێر، لە پاشان وەكو ئەوە وايە كە چێلێك بكاتە خێر لە پاشان وەك ئەوە وايە كە بەرانێك بكاتە خێر لە پاشان وەك ئەوە وايە كە مريشكێك بكاتە خێر لە پاشان وەك ئەوە وايە كە هێلكەيەك بكاتە خێر.

---

(1) التهجير: التبكير.

## نوێژی جومعه چواندن

١-عن أُسامة بن زيد(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: مَنْ تَرك ثلاثَ جُمُعاتٍ مِنْ غَيرِ عُذْرٍ كُتِبَ مِنَ المنافقين. **صحيح رواه الطبراني.**

**واته: هەر یەکێك سێ جومعه واز لێ بێنێ و تەرك بکات بەبێ عوزر له مونافیقان دەنوسرێ.**

٢- عن ابي الجعد الضمري(رضي الله عنه) قالَ: قال رسولُ الله(ﷺ) مَنْ تَرَك الجُمُعَةَ ثلاثَ مَراتٍ تهاوناً بها طبعَ الله على قلبه. **صحيح: رواه ابوداود(١٠٥٢) والترمذي(٥٠٠).**

١-عذر: بيانوو.

٢- تهاوناً: اي بغير عذر، وقيل: استخفافاً بشأنها.

**واته: هەر یەکێك سێ جاران نوێژی جومعه نەکات بەبێ هیچ بیانوویەکی شەرعی خودا مۆری له دڵی دەدا.**

## باشترین رۆژ رۆژی هەینی یه

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قالَ: خيرُ يَومٍ طَلَعَتْ عليهِ الشَّمسُ يومُ الجمعة: فيهِ خُلِقَ آدمُ، وفيهِ أُدْخِلَ الجنَّة وفيهِ أُخْرِجَ منها ولا تَقومُ السَّاعةُ إلاّ في يومِ الجُمُعَة. **رواه مسلم(٨٥٤).**

**واته: باشترین رۆژ که رۆژی لێ هەڵدێ رۆژی هەینییه ئادەم لەم رۆژەدا دورست کراوه، وه لەم رۆژەدا بردراوەته بەهەشت وه لەم رۆژەشدا له بەهەشت دەرهێنراوه، وه قیامەتیش دانایێ(ئیللا) له رۆژی هەینی نەبێت.**

## بێ دەنگ بوون و گوێ گرتن لە کاتی ووتاری هەینی

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله قال: إذا قُلْتَ لصاحِبِكَ يوم الجُمُعَة أَنْصِتْ والأمامُ يخطبُ فقد لَغَوتَ. رواه البخاري(٩٣٤) ومسلم(٨٥١).

واتە: ئەگەر لە رۆژی هەینیدا لەو کاتەی کە ئیمام ووتار دەخوێنێتەوە بڵێیە هاونیشینەکەت بێ دەنگ بە ئەوە(لەغوت) کردووە(خۆت بە شتێ خەریك کردووە خێری جومعەکەت نامینێ).

## خۆشوشتن لە رۆژی هەینی دا

١-عن عبدالله بن عمر(رضي الله عنه) أن رسولَ الله(ﷺ) قال: اذا جاءَ احَدُكم الجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ. رواه البخاري(٨٧٧) ومسلم(٨٤٤).

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە هات بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوا.

٢- عن سَمرَةَ بن جُندُب(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) مَنْ تَوَضَّأَ يَومَ الجُمُعَةِ فَبِها[١] ونِعْمَتْ[٢] ومَنْ اغْتَسَلَ فالغسلُ أَفْضَلُ. حديث حسن: رواه أبوداود والترمذي(٤٩٧).

واتە: هەر یەکێك لە رۆژی هەینیدا تەنها دەست نوێژی شوشت ئەوە باشە وە هەر یەکێکیش خۆی بشوا(لەگەڵ دەست نوێژ) ئەوە خۆ شوشتن

---

(1) فَبها: اي فيكتفي بها، اي بتلك الفعلة التي هي الوضوء.

(2) من توضأ يوم الجمعة فبها و نعمت: أي بالفريضة اخذ ونعمت الفريضة هي.

باشترە.

## سوود:

لەم فەرموودەیە دەردەکەوێ کە خۆشوشتن لەرۆژی هەینی سوننەتە.

٣-عن أوس بن أوس(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) منْ اغْتَسَلَ يومَ الجُمُعَةِ وغَسَّلَ وَبَكّر وابْتَكَرَ، ودَنا واستَمعَ وأنصت كانَ لَهُ بِكُلِّ خُطوةٍ يخطوها اجرُ سنةٍ صِيامُها وقيامُها. **صحيح رواه ابوداود(٣٤٥) والترمذي(٤٩٦).**

**ماناى ووشە:**

١-اغتسلَ: غَسَلَ بدَنَهُ، لەشى ششت.

٢- غَسَّلَ: اي بالغَ في غسل راسه وغسل باقي بدنه. موبالغەی کرد لە شوشتنی سەری و باقی لەشی.

٣- بَكَّرَ: قالوا بكرَ فلان اسرع، پەلەی کرد.

٤- ابتكر: أدرك الخطبة من أولها وهو من الباكورة، بە ووتار گەیشت لەسەرەتاکەیەوە.

٥- دنا: نزیك بۆوە.

٦- استمع: گوێ ی گرت.

٧- أنصَتَ: بێ دەنگ بوو.

٨- خطوة: شەقاو، هەنگاو، کۆیەکەی(خطوات)ە واتە: هەنگاوەکان.

ماناى فەرموودەکە: هەر یەکێك رۆژی هەینی خۆی بشوا، جوان خۆی بشوا، پەلە بکاو بە(خطبة) رابگات لەسەرەتاکەیەوە وە نزیك ببێتەوە لە ئیمام وە گوێ بگرێ وە بێ دەنگ بێت بە هەر شەقاوو هەنگاوێك کە دەیهاوێ خێری یەك ساڵی بۆ دەنوسێ کە ئەم ساڵە لە رۆژەکانیدا بە رۆژی

بێت و له شەوەكانیدا خوا پەرستی بكات.

## چۆنیەتی ووتاری هەینی

١-عن جابر بن سمرة(رضي الله عنه) قال: كنتُ أُصَلّي مع رسول الله(ﷺ) فكانَتْ صَلاتُهُ قصداً وخطبتهُ قَصداً. **رواه مسلم(٨٦٦) والترمذي(٥٠٧).**

**واته: جابری كوڕی سەموورە(رەزای خوای لیٚ بێت) دەڵێت: من نوێژم لەگەڵ پێغەمبەری خودادا دەكرد نوێژەكانی مام ناوەندی بوون وە خوتبەكانیشی مام ناوەندی بوون.**

٢- عن أبي وائل قال: خَطَبَنا عَمّارٌ، فَأَوجَزَ وأبلغَ فلَّما نَزَلَ قلنا: يا أبا اليَقظانِ لقد أَبلَغْتَ وأوجزتَ فلَوْ كُنتَ تَنَفَّسْتَ فقال: إني سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: إنَّ طولَ صَلاة الرَّجُلِ وقِصَرَ خُطبَتِه مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِه، فَأَطيلوا الصلاة واقْصُرُوا الخطبة وإنَّ من البيان سحراً. **رواه مسلم(٨٦٩).**

**١-اوجَزَ: كورتی كرد.**

**٢- تنفست: كەمێكی تر درێژت بكردباوە.**

**٣- مئنة: نیشانە.**

**٤- سحر: جادوو.**

**واته: ئەبو وائل دەڵیٚ: عەممار ووتارێكی كورت و پرمانای بۆ داین كاتێك لە دوانگە(منبر) دابەزی گوتمان ئەی(ابویقظان) ووتارەكەت پرماناو كورت بوو بۆ كەمێكی تر درێژت نەكردەوە، عەممار(رەزای خوای لیٚ بێت) گوتی من گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە دەیفەرموو: بیٚ گومان درێژ كردنی**

نوێژی پیاو وە کورتی ووتاری نیشانەی تێگەیشتنیتی، جا نوێژ درێژبکەنەوە وە خوتبە کورت بکەنەوە وە هەندێ پەخشان و قسەی نەستەق و ڕەوان وەك جادوو(سحر) وان(کار لە دڵی ئادەمیزاد دەکەن).

٣- عن جابر بن عبدالله قال: كانَ رسولَ الله(ﷺ) إذا خطَب احْمَرَتْ عيناهُ وعلا صوتُهُ واشْتَدَّ غضَبُهُ حتى كأنَهُ مُنذرُ جيش يقولُ صَبّحَكُم ومَسَّاكم. رواه مسلم(٨٦٧).

مُنذرُ جيشٍ: ترسێنەری سوپایەك(واتە سوپایەکی لە لایە دەیان ترسێنێ و ئاگاداریان دەکاتەوە لە هێرشی دوژمن.

واتە: جابری کوڕی عبدالله(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر خوتبەی بدابا چاوەکانی سوّر دەبوو وە دەنگی بەرز دەبوو وە تەواو توڕە دەبوو تاوەکو دەتگوت ئەو ترسێنەری سوپایەکە دەڵێ: بەیانی یا ئێوارە دەدا بەسەرتانا.

## کەسێك یەك رکات بە نوێژی هەینی رابگات

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أن النبيَّ(ﷺ) قال: مَنْ أَدرك ركعةً مِنْ صلاة الجمعة أو غيرها فقَد أدرك الصلاة. **صحيح:** رواه ابن ماجه (١١٢٣) والنسائي (٥٥٧).

واتە: هەر یەکێك بگات بە یەك رکاتی نوێژی هەینی یا غەیری هەینی ئەوە بە نوێژ ڕاگەیشتووە.

### سوود:

١-ئەگەر یەکێك گەیشت بە یەك رکاتی نوێژی جومعە ئەوە گەیشتووە

به جومعه.

٢- له(الوجيز في فقه السُنَّة و الكتاب العزيز) دا دهڵێ(صلاة الجمعة ركعتان في جماعة فمن تخلف عن الجماعة ممن لا تجب علية الجمعة او كان معذوراً صلى الظهر اربع ركعات ومن ادرك ركعة مع الامام فقد ادرك الجمعة).

واته: نوێی جومعه دوو ركاته به جهماعهت وه ههر یهكێك دوا كهوت له نوێژی جهماعهت لهوانهی نوێژی جومعهیان لهسهر واجب نی یه یا بیانوو(عذر)یان ههیه ئهوه نوێژی نیوهرۆ دهكات چوار ركات وه ههر یهكێك یهك ركات له نوێژی جومعه لهگهڵ ئیمام دا بیكات ئهوه به نوێژی جومعه راگهیشتووه.

## خوێندنی سورهتی(كهف)

١-عن ابي سعيدٍ الخُدري أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: منْ قرأ سُورة الكَهف يوم الجُمُعَة أضاء لهُ منَ النُور ما بين الجُمْعتَين. صحيح رواه النسائي(٩٥٢) والبيهقي(٢٤٤٦).

واته: ههر كهسێك له رۆژی جومعهدا سورهتی(كهف) بخوێنێ نێوانی ههردوو جومعهكهی بۆ رۆشن دهبێتهوه.

**سوود**:

١-پێغهمبهر(ﷺ) له فهرموودهیهكی تردا باس له خوێندنی سورهتی(كهف) دهكات له شهوی جومعه.

٢- شهوی جومعه(ليلة الجمعة) كاتهكهی دهست پێ دهكات له بانگی مهغریبهوه تا بانگی بهیانی رۆژهكهشی له بانگی بهیانی دهست پێ دهكات

تا بانگی ئێواره.

## صەلەوات لە رۆژی جومعەدا

١- عن أوس بن أوس(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): إنَّ منْ أفضلِ أيَّامكُمْ يومَ الجُمُعَة، فأكثروا عَليَّ منَ الصَّلاةِ فيه فإنَّ صلاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ، فقالوا: يا رسول اللهِ وكيف تُعْرَضُ صَلاتُنا عليكَ وقَدْ أرِمْتَ؟! قال: يقول بَلِيتَ، قال: إنَّ الله حَرَّمَ على الأرض أجساد الأنبياء)[1].

واتە: بێ گومان لە باشترین رۆژەکانتان رۆژی هەینییە جا لەم رۆژەدا زۆر صەڵەواتم لەسەر لێ بدەن چونکە بێ گومان صەڵەواتەکانتان نیشانم دەدرێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن صەڵەواتەکانمان نیشانت دەدرێ لە کاتێکدا کە تۆ رزیوی؟! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بێ گومان خودا جەستەی پێغەمبەرانی قەدەغە(حَرام) کردووە لە زەوی(کەبیان خوات).

(1) صحيح رواه ابوداود(١٠٤٧) و احمد(٨/٤) وصححه ابن حِبّان(٥٥٠) والحاكم ووافقه الذهبي.

# یادی خوا لە دوای نوێژە فەرزەکان

١-عن ثوبان(رضي الله عنه) قال: كانَ رسول الله(ﷺ) إذا انصرفَ منْ صلاتهِ إسْتَغفَرَ ثلاثاً، وقال: اللهمَّ أنت السّلامُ ومنك السَّلامُ تَباركتَ ذا الجلال والاكرام. **رواه مسلم(٥٩١).**

**واتە: ثوبان(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) کە سلاّوی نوێژی دەدایەوە سێ جاران دەیفەرموو(استغفرالله) وە دەیفەرموو:(اللهم انت السلام ومنك السلام تباركت ذا الجلال والإكرام) لە ریوایەتی تر هاتووە بە(یا ذا الجلال والإكرام).**

٢- عن المغيرة بن شعبة(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) كان إذا فَرَغَ مِنَ الصلاةِ وسَلَّمَ قال:

**واتە کاتێك کە پێغەمبەر(ﷺ) لە نوێژ دەبۆوە و سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو:**

(لا اله الاّ الله وحدهُ لا شريكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ ولَهُ الحَمدُ وهو على كلِّ شيءٍ قدير، اللهُمَّ لا مانعَ لما اعْطيتَ ولامُعْطِيَ لما مَنَعْتَ، ولا يَنْفَعُ ذا الجدِّ منْكَ الجَدّ). **رواه البخاري(٨٤٤) ومسلم(٥٩٣).**

٣- عن ابي الزُّبير، قال: كان ابن الزبير يقولُ في دُبُرِ كُلِّ صلاةٍ حينَ يُسَلِّمُ

**واتە: باوکی زوبەیر دەڵێ:(عبدالله) کوڕی زوبەیر(رەزای خوای لێ بێت) لە پاش هەموو نوێژێك کە سەلامی دەدایەوە دەیگوت:( لا اله الاّ الله** وحدهُ لا شريكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ ولَهُ الحَمدُ وهو على كلِّ شيءٍ قدير، لا

حول ولا قوة إلا بالله لا اله الا الله ولا نَعْبُدُ إلاّ إيّاهُ لهُ النّعْمَةُ ولَهُ الفَضْلُ ولَهُ الثناء الحَسَنُ لا اله الا اللّهُ مخلصين لَهُ الدِّين ولَو كرِهَ الكافرون) وه دهيگوت پێغهمبهر (ﷺ) واى دهگوت له دواى ههموو نوێژێك رواه مسلم(٥٩٤).

٤- عن ابي أُمامة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ قرأ آيَةَ الكرسيِّ دُبُر كُلِّ صلاةٍ لم يَمْنَعْهُ من دُخولِ الجنَّةِ إلاّ أنْ يَموت. صحيح الجامع الصغير للالباني(٦٤٦٤).

واته: ههر كهسێك(آية الكرسى) له پاش ههموو نوێژێكى فهرزدا بخوێنى ئهوه هيچ شتێك بهرگرى لىٚ ناكات له چوونه بهههشت تهنها مردن نهبێت.

**سوود:**

سوننهته(آية الكرسي) له دواى ههموو نوێژێكى فهرز بخوێنرىٚ، بهلاٚم له دواى خوێندنى(آية الكرسى) له دواى نوێژدا فوو له دهست كردن و فوو له جهسته كردن و دهست به لهش داهێنان و ئهمانه له شهرع دا نههاتوون و بيدعهن.

٥- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) عن رسول الله(ﷺ) قال: مَنْ سَبَّحَ اللهَ فِي دُبُر[1] كلِّ صلاةٍ ثلاثاً وثلاثين، وحَمِدَ الله ثلاثاً وثلاثين، وكَبَّرَ الله ثلاثاً وثلاثين فتلك تسْعَةٌ وتسعون وقال تمام المائَةِ: لا اله الاّ الله وحدهُ لا شريكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ ولَهُ الحَمدُ وهو

---

(1) (دُبُر) عقب الانتهاء من صلاة الفريضة.

على كلِّ شيءٍ قدير، غُفِرَت خطاياهُ وإنْ كانَتْ مِثْلَ زَبَدِ البَحْرِ. رواه مسلم(٥٩٧).

واته: هەر یەکێك لە دوای هەموو نوێژێکی فەرز(٣٣) جاران بڵێ(سبحان الله)، وە(٣٣) جاران بڵێ(الحمد لله)، وە(٣٣) جاران بڵێ(الله اكبر) ئەوە نۆهەت و نۆ وە لە جاری سەدەمین دا بڵێ: لا اله الاّ الله وحدهُ لا شريكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ ولَهُ الحَمدُ وهو على كلِّ شيءٍ قدير، گوناهەکانی دەپۆشرێن ئەگەر وەکو کەفی دەریاش بن.

## سوود:

گوتنی(سبحان الله) وە(الحمد لله) وە(الله اكبر) دە جار دەجاریش هاتووە لە دوای نوێژە فەرزەکان لە فەرموودەی صحیح دا.

٦- عن عُقبَةَ بن عامِرٍ(رضي الله عنه) قال: أمرَني رَسولُ الله (ﷺ) أنْ أقْرأَ بِالمُعَوِّذاتِ دُبُرَ كُلِّ صلاةٍ. **صحيح** رواه أبوداود(١٥٢٣) والنسائي(١٣٣٦).

واته: عوقبەی کوڕی عامر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێ کردم کە سورەتی(اخلاص) و(فلق) و(ناس) بخوێنم لە دوای هەموو نوێژێك.

٧- عن معاذ(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) أخَذَ بيدِه وقالَ: يا مُعاذُ واللهِ إنّي لأُحبُّكَ واللهِ إنّي لأُحِبُّكَ فقالَ: أُوصيك يا معاذ لا تَدعنَّ في دُبُرِ كُلِّ صلاةٍ تقولُ: أللهُمَّ أعنّي على ذكرِكَ وشُكرِكَ وحسنِ عبادتِكَ. **صحيح** رواه ابوداود(١٥٢٣).

واته: موعازی کوڕی جەبەل(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ:

پێغەمبەر(ﷺ) دەستی گرتم وە فەرمووی ئەی موعاز سوێند بە خوا من تۆم خۆش دەوێ سوێند بەخوا من تۆم خۆش دەوێ، جا گوتی ئامۆژگاریت دەکەم ئەی موعاز هەرگیز واز مەهێنە کە لە دوای هەموو نوێژێکی فەرز بڵێ ی:( اَللهُمَّ أَعِنّي على ذِكرِكَ وشُكرِكَ وحسنِ عبادتِكَ) واتە: ئەی خودایە یارمەتیم بدە لەسەر یادکردنت و شوکرانە بژێری بۆت و باش پەرستنت.

٨- عن عُمارةَ بن شَبيبٍ السَّبئيِّ، قال: قالَ:رسولُ الله (ﷺ)..

من قالَ: لا إله الا الله وحده لاشريك له، له الملكُ وله الحمد، يحيي ويُميت، وهو على كُلِّ شيءٍ قدير، عشر مرَّاتٍ على إثر المغرب بعث الله له مسلحةً يحفظونَهُ من الشيطانِ حتى يُصبح، وكتبَ الله لهُ بها عشر حسناتٍ موجبات، ومحى عنه عشر سيِّئاتٍ موبقات، وكانت لَهُ بِعَدلِ عشر رِقابٍ مؤمنات. **حسن:رواه الترمذي (٣٥٣٤) والنسائي (٥٧٧) في (عمل اليوم والليلة)**

**واتە: هەر یەکێك دە جاران لەدوای نوێژی مەغریب بڵێ (لا إله الا الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو على كل شيء قدير) ئەوا خوا کۆمەڵێك فریشتەی بۆ دەنێرێت دەیپارێزن لەشەیتان تابەیانی، وەخوا بەهۆیەوە دە چاکەی رزگارکەری بۆ دەنوسێت وە دە گوناهی لەناو بەری لێ دەسرێتەوە وەپاداشتی رزگار کردنی دە بەندەی بڕواداری بۆ دەنوسێت.**

## سوود

**ئەم زیکرە بەم شێوەی باس کرا دەجارانیش سوننەتە لەدوای نوێژی بەیانی بگوترێ، پاداشتی زۆرە هەوڵ بدە لەدەستی نەدەی.**

# زیكری پێش سەلام دانەوەی نوێژ

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): اذا تشهَّد أحدُكُمْ فَلْيستعذْ بالله منْ أرْبعٍ. يقول: اَللهُمَّ إنّي أعوذ بك منْ عذاب جهنَّم ومن عذاب القبرِ ومن فتنة المحيا والممات ومن شرِّ فتنةِ المسيح الدَّجالِ. **رواه البخاري(١٣٧٧) ومسلم(٥٨٨).**

**واتە: ئەگەر یەكێك لە ئێوە تەحییاتی خوێند با خۆی بپارێزێ بە خوا لە چوار شت بڵێ: اَللهُمَّ إنّي اعوذ بك مِنْ عذاب جَهَنَّمَ ومن عذابِ القَبرِ ومن فِتنَةِ المحْيا والممات ومن شَرِّ فِتنَةِ المَسيحِ الدَّجالِ) واتە: ئەی خوایە خۆم دەپارێزم بە تۆ لە عەزابی دۆزەخ وە لە عەزابی قەبر وە لەبەڵای ژیان و مردن وە لە خراپەی بەڵای مەسیحی دەججال.**

٢- عن أبي بكرٍ الصِّدّيق(رضي الله عنه) أنَّهُ قالَ لرَسول الله(ﷺ) علّمني دُعاءً أدعوا به في صلاتي قال: قل:(أللهم إنّي ظلمتُ نَفسي ظلماً كثيراً ولا يَغْفِرُ الذّنوب إلاّ أنت فاغْفِر لي مغفِرةً مِنْ عندك وارحمني إنّك أنت الغفور الرَّحيم) **رواه البخاري(٨٣٤) ومسلم(٢٧٠٥).**

**واتە: ئەبوبەكر(رەزای خوای لێ بێت) فەرمووی بە پێغەمبەر(ﷺ) پاڕانەوەیەكم فێر بكە كە لە ناو نوێژەكەم دا بیكەم پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بڵێ(اللهم إنّي ظلمتُ نَفسي ظلماً كثيراً ولا يَغْفِرُ الذّنوبَ إلاّ انت فاغْفِر لي مَغفِرةً مِنْ عندك وارحمني إنَّكَ انت الغفور الرَّحيم) واتە: ئەی خودایە من ستەم و زوڵمێكی زۆرم لە خۆم كردووە جگە لە تۆش هیچ كەس نی یە لە گوناحان خۆش بێت، جا لێم خۆش بە بە لێخۆشبونێكی تایبەت لەلایەن**

خۆتەوە وە رحمم پیّ بکە بێگومان هەر تۆی لێبوردەی بە بەزەیی.

٣- عن عليّ(رضي الله عنه) قال: كان رسول الله(ﷺ) إذا قام الى الصلاةِ يكونُ مِن آخرِ ما يقولُ بين التَّشَهُّدِ والتَّسليمِ:(اللهم اغفِرْ لي ما قَدَّمتُ وما أَخَّرْتُ وما أسْرَرتُ وما أعلنتُ وما أسرَفتُ وما أنتَ أعلمُ بِهِ مِنى أنت المقَدِّمُ وأنتَ المؤَخِّرُ لا اله الا أنت) رواه مسلم(٧٧١).

واتە: ئیمام علی(رەزای خوای لیّ بێت) دەڵیّ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر هەڵبستا با بۆ نوێژ کۆتا شت کە لە نێوانی تەحییات و سەلام دانەوە دەیگوت ئەوەبوو: اللهم اغفِرْ لي ما قَدَّمتُ وما أَخَّرْتُ وما أسْرَرتُ وما اعلنتُ وما اسرَفتُ وما انتَ اعلمُ بِهِ مِنى انت المقَدِّمُ وأنتَ المؤَخِّرُ لا اله الا أنت.

# باسی زەکات

## گەورەیی زەکات

١-عن ابن عمرَ(رضي الله عنه) انَّ رسولَ الله(ﷺ) قالَ: بُنِي الإسلامُ على خَمسٍ: شهادةِ أن لا اله الا الله وأنَّ محمداً عبدُهُ وَرَسُولُهُ وإِقامِ الصلاة وايتاءِ الزكاةِ وَحجِّ البيتِ وصوْمِ رمضان. **رواه البخاري(٨) ومسلم(١٦).**

**واتە: ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە: شایەتی دان بەوە کە هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نی یە بێجگە لە خوا وە موحەمەد ڕەوانە کراوی خوایە وە نوێژ کردن وە زەکات دان وە حەجی ماڵی خوا کردن وە ڕۆژی گرتنی مانگی رەمەزان.**

٢- عن ابي هريرة(رضى الله عنه) أنَّ أعرابياً أتى النبيَّ(ﷺ) فقال: دُلَّني على عَمَلٍ اذا عملتهُ دَخَلتُ الجنةَ؟ قال: تَعبُدُ اللهَ ولاتشركُ به شيئاً وتقيم الصلاة المكتوبة وتُؤدي الزكاة المفروضة وتصوم رمضان. قال: والذي نفسي بيده لا أزيدُ على هذا. فلمّا ولّى قالَ النبيُّ(ﷺ) مَنْ سَرَّهُ أن يَنظر إلى رَجُلٍ مِنْ أهل الجنَّةِ فَلْينظرْ إلى هذا. **رواه البخاري(١٣٩٧) ومسلم(١٤).**

**واتە: ئەبو هورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەعرابیەك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: کردەوەیەکم پێ نیشان بدە ئەگەر کردم بچمە بەهەشت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوا بپەرستەو هیچ هاوبەشەکی بۆ**

بڕیار مەدە وە نوێژە فەرزەکان بکەو زەکاتی فەرز بدەو رۆژی رەمەزان بگرە جا عارەبە دەشتەکیەکە گوتی: سوێندم بەوەی گیانی منی بە دەستە لەوە زیاتر ناکەم جا کەرۆیشت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەر یەکێك پێی خۆشە کە تەماشای پیاوێك بکات لە خەڵکی بەهەشت با تەماشای ئەوە بکات.

٣- عن طلحةَ بن عبيد الله(رضي الله عنه) قال: جاء رَجُلٌ إلى رسولِ الله(ﷺ) من اهل نجد ثائرُ الرَّأسِ يُسْمَعُ دَوِيُّ صوتِهِ ولا يُفقَهُ ما يقولُ حتى دنا فإذا هوَ يَسألُ عن الاسلام فقال رسول الله(ﷺ) خمسُ صَلواتٍ في اليومِ والليلة، فقال: هل عليَّ غيرُها؟

قال: لا، إلاّ أن تَطوّعَ.

قال رسول الله(ﷺ) وصيامُ رَمضانَ قالَ: هلْ عليَّ غيرُهُ؟

قال: لا، إلاّ أن تَطوّعَ.

قالَ وذَكر لهُ رسولُ الله(ﷺ) الزكاة، قال هلْ عليَّ غيرُها؟

قال: لا، إلاّ أن تَطوّعَ.

قالَ فأدبر الرَّجُلُ وهو يقولُ: واللهِ لا أزيدُ على هذا ولا أنقصُ.

قالَ رسولُ الله(ﷺ): أفْلَحَ إن صدَق. **رواه البخاري(٤٦) ومسلم(١١).**

١-ثائر الراسِ: اي منتشر شعر الراس، واته: پرچی سەری بڵاوبوون.

٢-الدويُّ: دەنگێکی گەورەی دووبارە بووەوەیە، تێ ی نەگەی ئەمەش لەبەر ئەوەی لە دوورەوە بانگی کردووە.

٣- افلَحَ: فاز بمطلوبه، واته: سەرکەوت بەوەی کە داوای کردووە.

واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) لە خەڵکی نەجد پرچی سەری بڵاو بوو دەنگی گەورەی دووبارە بووەوەی لە دوورەوە لێ دەبیسترا تێ نەدەگەیشترا چی دەڵێ تا نزیك بۆوە جا دەرکەوت کە دەربارەی ئیسلام پرسیار دەکات پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لەشەوو ڕۆژێکدا دەبێ پێنج نوێژ بکەی پیاوەکە گوتی جگە لەم پێنج نوێژە نوێژی ترم لەسەرە؟ فەرمووی نەء مەگەر بە ئارەزووی خۆت نوێژی سوننەت بکەی. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەبێ ڕۆژووی ڕەمەزانیش بگری، پیاوەکە گوتی باشە ڕۆژووی ترم لەسەرە، فەرمووی نەء مەگەر بە ئارەزووی خۆت ڕۆژووی تر بگری، پێغەمبەر(ﷺ) باسی زەکاتیشی بۆ کرد، پیاوەکە گوتی: لەمە زیاتر زەکاتی ترم لەسەرە؟ فەرمووی نەخێر مەگەر بە ئارەزووی خۆت خێری تر بکەی، جا پیاوەکە ڕۆیشت دەیگوت: بە خوا نە لەمە زیاتر دەکەم و نەلەمە کەمتر، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر ڕاست بکات سەرکەوتووە.

## ئەوەی زەکات نادات

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) ما منْ صاحِبِ ذَهَبٍ ولا فضَّةٍ، لا يُؤَدّي منها حَقَّها إلاَ اذا كان يومُ القيامة صُفِّحَت له صَفائحُ مِنْ نار، فأحْمي عليها في نار جهنّم فيكوى بها جنبُهُ و جبينُهُ وظهرهُ كُلَّما بَرَدتْ أُعيدَتْ لهُ في يومٍ كان مقدارهُ خَمْسينَ ألف سَنَة حَتّى يُقضى بينَ العبادِ فَيُرى سبيله إمّا الى الجَنَّة وإمّا الى النار.

قِيل: يا رسولَ اللهِ فالإبِلُ؟ قال: ولا صاحبُ إبلٍ لا يُؤدّي منها

حَقّها ومن حقها حَلَبُها يوم وردها الا اذا كان يومُ القيامة بُطِحَ لها بقاعٍ قرْقرٍ أوفرَ ما كانتْ لا يَفقدُ منها فصيلاً واحداً تَطؤُهُ بأخفافها وتَعَضُّهُ بأفواهها كُلَّما مَرَّ عليه أولاها رُدَّ عليه أُخراها في يومٍ كانَ مقدارهُ خمسين ألفَ سنة حتى يُقضَى بين العباد فيُرى سبيلَهُ إمّا الى الجنة وإمّا الى النار.

قيل يا رسولَ اللهِ فالْبَقرُ والغَنَمُ؟ قال: ولا صاحبُ بَقرٍ ولا غَنَمٍ لا يُؤَدِّي منها حَقَّها إلاّ اذا كان يومُ القيامة بُطِحَ لها بقاعٍ قَرْقرٍ لا يَفقدُ منها شيئاً ليست فيها عقصاءُ ولا جلحاءُ ولا عَضْباءُ تَنْطَحُهُ بقُرُونها وتطؤُهُ بأظلافها كُلَّما مَرَّ عليه أُولاها رُدَّ عليه أُخراها في يوم كان مقدارُهُ خمسينَ ألفَ سَنَةٍ حتى يُقضى بين العبادِ فيُرى سبيلَهُ إما الى الجنة وإمّا الى النار....... **رواه مسلم(٩٨٧).**

واته: هیچ خاوەن زێرو زیوێك نییە كەوا مافەكەی نەدات(ئیللا) كاتێك رۆژی قیامەت دێت پلێتی ئاگرینی بۆ ئامادە دەكرێت كە لە ئاگری دۆزەخ دا سوور كراوەتەوە، تەنیشتی و نێوچەوان و پشتی پێ داغ دەكرێت هەر كاتێك سارد ببێتەوە دووبارەی دەكەنەوە بۆی لە رۆژێك دا كە درێژییەكەی پەنجا هەزار ساڵە تا دادگایی لە نێوان بەندەكان دا دەكرێت جا رێگاكەی خۆی پێ نیشان دەدرێت یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ.

گوترا ئەی پێغەمبەری خوا ئەی حوشتر؟

فەرمووی: وە هیچ خاوەن حوشترێ نییە كە ماف و حەقەكەی لێ نەدات وە یەكێ لەو مافانەی كە لە حوشتردا هەیە ئەوەیە ئەو رۆژەی كە وشترەكە دەبرێ بۆ سەر ئاوو ئاو دەدرێ و دەدۆشرێ ئەو شیرە مافی تێدایە(جا ئەو خاوەن حوشترەی كە حەقەكەی لێ نادات) ئیللا كاتێك

ڕۆژی قیامەت دێت درێژی دەکەن لە دەشتێکی فرەوانا بۆ ئەو حوشترانە کە ئەو حوشترانە گەورەترن لە پێشتر یەك پارێنەشیان کەم نیە. جا حوشترەکانیش بە پێیەکانیان بەسەری دەکەون و بەدەم دەیگەزن و قەپی لێ دەگرن، گشت جارێ کە دواییەکەیان بەسەریا تێدەپەرێ دیسان بەراییەکەیان دەگێرنەوە بۆ سەری ئیتر ئەمە حاڵیەتی لە ڕۆژێکدا کە درێژیەکەی پەنجا هەزار ساڵە تا دادگایی لە نێوان بەندەکاندا دەکرێت، جا ڕێگاکەی خۆی نیشان دەدرێ یا بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ.

گوترا ئەی پێغەمبەری خوا ئەی چێل و مەڕو بزن فەرمووی: وە هیچ خاوەن چێل و مەڕو بزنێ نی یە ڕۆژی قیامەت دێت درێژی دەکەن و لە دەشتێکی فرەوانا بۆیان ئەو ئاژەڵە لەو کاتەدا نە تاقەیەکێکیان کەمە نە شاخبادراوێکیان تیادایە نەبێ شاخێ و نەشاخ شکاوێ. ئیتر بە شاخەکانیان لێی دەدەن بە سمەکانیان بەسەری دەکەون گشت جارێ کە دواییەکەیان بەسەریا تێ دەپەرێ دیسانەوە بەراییەکان دەگێڕنەوە بۆ سەری لە ڕۆژێکا کە درێژیەکەی پەنجا هەزار ساڵە تا دادگایی لە نێوان بەندەکان دا دەکرێت، جا ڕێگاکەی خۆی پێ نیشان دەدرێ یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ...

**سوود**:

خوا دەفەرمووێ﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٣٤﴾ يَوۡمَ يُحۡمَىٰ عَلَيۡهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكۡوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمۡ وَجُنُوبُهُمۡ وَظُهُورُهُمۡۖ

﴿هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾﴾ سورة التوبة.

واتە: ئەوانەی زێڕو زیو کۆدەکەنەوە وەنای بەخشنەوە لە ڕێگای خوادا(ئەی پێغەمبەر) موژدەیان پێ بدە بە سزایەکی ئازار دەر(٣٤) لە ڕۆژێکدا کە ئەو زێڕو زیوە لە دۆزەخ دا سوور دەکرێتەوە ئەمجا بەو زێڕو زیوە ناوچەوان و تەنیشت و پشتیان پێ داغ دەکرێ ئەمە ئەوە بوو کۆتان دەکردەوە بۆ خۆتان دەبچێژن سزای ئەوەی کە بۆ خۆتان کۆکردبۆوە.

٢- عن أبي هريرة(رضى الله عنه) قال: قالَ رسول الله(ﷺ) مَنْ آتاهُ اللهُ مالاً فلم يُؤَدِّ زكاتَهُ مُثِّلَ له يوم القيامةِ شجاعاً أقرع لَهُ زَبيبتان يُطوَّقُهُ يومَ القيامة ثُمَّ يأخُذُ بلهزِمَتيهِ -يعني سِدْقَيه- ثُمَّ يقولُ: أنا مالُكَ، أنا كنزُكَ ثُمَّ تلا﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۗ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۗ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ (ال عمران:١٨٠) رواه: البخاري(١٤٠٣).

واتە: هەر یەکێك خوا ماڵێکی بداتێ و زەکاتی لێ دەرنەکات لە ڕۆژی دوایی دا بۆی دەبێتە نێرە مارێکی کەچەڵ کە دوو خاڵی ڕەش لە پشت چاوەکانی یەوە هەن و ڕۆژی دوایی لەگەردنی دەئاڵێ پاشان بە قەپ هەردووك شەوێلاگەی دەگرێ و دەڵێ: من پارەو سامانەکەتم، من

خەزێنەکەتم، ئەوجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ (ال عمران:١٨٠).

## فیقه دەربارەی زەکات

هەر چەندە بنەرەت لەو کارەی من لەم کیتابە هێنانی فەرموودەو لێکدانەوەیانە بەڵام ناوە بە ناوە پێم باشە هەندێك لە کارە بنەرەتیەکەم لابدەم و هەندێ بابەت بنوسم بە بێ هێنانەوەی بەڵگەکانیان ئەمەش بۆ ئاسانیەو زیاتر شارەزا بوونە دەربارەی بابەتەکە کۆکردنەوەی زانیارییەکی زۆرە لە ماوەیەکی کەمدا.

١-زەکات ئەدرێ بەهەشت جۆر کەس:

١) هەژاران: ئەو کەسانەن کە هیچیان نییە.

٢) دەستکورت(نەداران) کەسێکە هەندێکی هەیە بەڵام بەشی ناکات.

٣) کرێکاری زەکات: ئەو کەسانەن هەڵدەستن بە کۆکردنەوەو ئیش و کاری پەیوەندیدار بە کۆکردنەوەی زەکات و دابەش کردنی.

٤) دڵ راگیراوان: ئەوانەن کە بەشێك لە زەکاتیان پێ ئەدرێت بۆ ئەوەی دڵیان دابمەزرێت لەسەر ئیمان چونکە تازە موسڵمانن.

٥) کۆیلە ژێر دەستەکان: ئەمەش بریتی یە لە کرینی کۆیلەو ئازاد

کردنی یا ئازاد کردنی ئەوانەش کە پێیان دەگوترێت(مُکاتِب) و لەسەر ئەندازەیەكماڵ لەگەڵ خاوەنەکانیان رێك کەوتوون کە پەیدای بکەن و رزگاریان ببێ ئەمانەش لە پارەو ماڵی زەکات هاوکاریان دەکرێت.

٦) قەرزداران: ئەمانیش کەسانێکن قەرزارن توانای دانەوەی قەرزەکانیان نی یە ئەمانەش بەشێك لە زەکاتیان پێ دەدرێت بە مەرجێ قەرزاریەکەی بە هۆی گوناح و ئیسراف و زیادە رەوییەوە نەبوو بێت، وە ئەگەر قەرزارییەکەی بە هۆی گوناهەوە بووبێ لە پاشان تەوبەی کردبێ ئەمەش زەکاتی پێ دەدرێ.

٧) لە رێی خوادا(في سبيل الله): ئەو کەسانەن کە بێ مووچە لە رێگای خوا جەنگ دەکەن ئەوانەش بە ئەندازەی ئەرکی خواردن و جل و بەرگی خۆیان و منداڵیان تا ئەگەڕێنەوە، هەروەها بۆ کرینی چەك و تەقەمەنی زەکاتیان دەدرێتێ هەر چەند دەوڵەمەندیش بن.

٨) رێبواران: کەسێکی رێبوار پارەی نەماوە پەکی کەوتووە ئەوە لە زەکات ئەوەندەی پێ دەدرێت کە پێ ی بگاتەوە ماڵ و شوێنی خۆی. خوا دەفەرمووێ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ (التوبة:٦٠).

**٢- زەکات لە پێنج شت دەدرێ:**

ئاژەڵ، پارەو پول، دەغڵ و دان و میوە، کەل و پەلی بازرگانی، خەزنەو کانزاکان.

٣- زەكاتی زێر:

زێر هەتا نەگاتە(٢٠) مسقال زەكاتی لێ ناكەوێ كە گەیشتە(٢٠) مسقال و ساڵێكی بەسەردا تێپەری نیو مسقال زێر زەكاتی لێ دەكەوێ كەواتە لە(٤٠) مسقال یەك مسقال زێر زەكاتی تێدایە.

٤- زەكاتی پارە:

ئەگەر پارەت هەبوو پارەكەت هەتا نەگاتە بای(٢٠) مسقال زێر زەكاتی لێ ناكەوێ كە گەیشتە بای(٢٠) مسقال زێر ساڵێكیشی بەسەردا تێپەری ئینجا لە هەر(٤٠) دینار دینارێكی زەكات لێ دەكەوێ وە لە(٤٠) هەزار یەك هەزار دیناری لێ دەكەوێ.

٥- زەكاتی زیو:

زیو تا نەگاتە دوو سەد دیرهەم زەكاتی لێ ناكەوێ كە گەیشتە دوو سەد دیرهەم ساڵێكی بەسەردا سوراوە لە هەر چل درهەمێك دیرهەمێكی زەكات لێ دەكەوێ(٢٠٠) دیرهەم دەكاتە(٥٩٥) گرام زیوی پوخت یەك دیرهەم بەپێ ی ئەمڕۆ دەكاتە(٢,٩٧٥) گرام.

٦- زەكاتی خشلی ئافرەت:

عن عبدالله بن شداد بن الهاد قالَ دخلنا على عائشة زوج النبيِّ(ﷺ) فقالت دَخَلَ عليَّ رسولُ الله(ﷺ) فرأى في يدي فَتَخاتٍ من ورقٍ فقالَ ما هذا يا عائشة فقلتُ صنعتُهنَّ أتزَيَّنُ لَك يا رسول الله فقال أَتُؤَدِّين زكاتَهُنَّ فقلْتُ لا أو ما شاء الله قال: هو حسبك من النار. صحيح : رواه أبو داود (١٥٦٥).

واتە: عائشە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە لام چەند ئەنگوستلەیەكی گەورەی زیوی لە پەنجەكانی دەستم بینی جا فەرمووی: ئەوە چی یە ئەی عائشە منیش گوتم دورستم كردوون بۆ تۆ

خۆمیان پێ دەرازێنمەوە فەرمووی ئایا زەکاتیان لێ دەدەی منیش گوتم نا یا مەگەر خوا بیەوێ ئەویش فەرمووی: ئەوەندەت بەسە بۆ ئاگری دۆزەخ.

## سوود:

١-هەندێك ئەم فەرموودەو فەرموودەی تریش بە بەڵگە دەهێننەوە کە خشڵی زێرو زیوی ئافرەت کە بۆ خۆرازاندنەوە بەکاری بهێنن زەکاتی لێ دەکەوێ، لە مەزهەبی شافعی خشڵی ئافرەتان کە بە کاری بێنن بۆ خۆرازاندنەوە زەکاتی لێ ناکەوێ بە مەرجێك زیادە ڕۆیی زۆری تێدا نەکرابێ و زۆر لە سنووری عورف و عادەتی ئەو خەڵك و کات و شوێنە دەرنەچووبێ، بەڵام ئەگەر ئافرەت زێری هەبوو بۆ خۆ پێ رازاندنەوە نەبوو بۆ هەڵگرتن و داکردنی بوو ئەوە زەکاتی لێ دەکەوێ.

٧- زەکاتی خانوو و سەیارە:

خانوو و سەیارەی خۆت یا ئەگەر خانووەکەت هەبێت جگە لە خانووی خۆت بۆ کرێ ئەمانە زەکاتیان لێ ناکەوێ بەڵام بازرگانی کردن بە خانوو و سەیارە ئەمانە زەکاتیان لێ دەکەوێ، وەك یەکێك کە خانوو دەکرێ و دەفرۆشێ یا سەیارە دەکرێ و دەفرۆشێ.

٨- ئەو پارەی بە جیا جیا زیاد دەکات چۆن زەکاتی لێ دەدەی:

ئەگەر کۆمەڵە ئاژەڵێکت هەبێت و زەکاتت لێیان دابێت، یا دوکانێکت هەبێت زەکاتت لە کەل و پەلی دوکان و ماڵەکەت دابێت، جاساڵێکی تر هاتەوە لە ماوەی ئەم ساڵەدا چەند لە ئاژەڵەکانت بەچکەیان بووە یا چەند لە دوکانەکەت زیاد بووە ئەوە لەگەڵ ماڵە ئەسلیەکەت زەکاتی لێ دەدەی.

٩- کارگەو هۆتێل و بیناياتی گەورە:

بيناياتی گەورە گەورە بۆ بە کرێ دان و تێدا حەوانەوەی چەندان

خێزان و ماڵ هۆتێلەکان کارگە بۆ بەرهەم هێنان کە بەکرێ دەدرێن، سەیارە، کێڵگەو مەزرای تێدا بەخێوکردنی مەڕو مانگاو پەروەردەکردنی پەلەوەر، ئەمانە مادام بازرگانیان پێ ناکرێ زەکاتیان لێ نادرێ بەڵام لە داهات و بەرهەمەکانیان دەدرێ.

١٠- زەکاتی مارەیی ئافرەت:

مارەیی ئافرەت زەکاتی لەسەرە جا وەرگیرابێت یان وەرنەگیرا بێت بەمەرجێك بۆ نمونە ئەگەر زێر بێت بگاتە(٢٠) مسقال و ساڵێکیشی بەسەردا بسورێتەوە بۆیە لە کوردەواری خۆمان زۆر(١٩) مسقال دادەنێن بۆ ئەوەی زەکاتی لێ نەکەوێ.

١١- مەرج نییە کە زەکات دەدەی بڵێ ی ئەمە زەکاتە:

ئەوەی زەکات دەدات لەسەری بە مەرج نەگیراوە ئەو کەسەی کە زەکاتی دەداتێ پێی بڵێ ئەوە زەکاتە.

١٢- دەگونجێ یەکێك زەکات بداو زەکاتیش وەربگرێ:

زەکات دورستە بدرێتە یەکێك کە خۆی زەکات دەدات لەبەر ئەوەی ئەوەندەی کە هەیتی بەشی ژیان و گوزەرانی ناکات.

١٣- زەکات دان بە قەرزدارو رێبوار:

ئەگەر کەسی زەکات پێ دراو قەرزار بوو بە ئەندازەی قەرزەکەی زەکاتی پێ دەدرێ وە ئەگەر رێبوار بێت بایی ئەوەندەی زەکاتی پێ دەدرێ کە پێ ی بگاتەوە شوێنی خۆی، ئینسانی رێبوار ئەگەر پارەی لێ بڕا لە شوێنی خۆی دەوڵەمەندیش بێت جائزە زەکاتی بدەیێ ئەوەندە تا پێ ی دەگاتە شوێنی خۆی.

١٤- ئەگەر زەکاتت دا یەکێك دوایی بۆت دەرکەوت پێ ی ناشێ:

ئەگەر یەکێك زەکاتیدا یەکێك وای زانی کە پێ ی دەشێ بەڵام دوایی

بـۆی دەرکـەوت کـە پێـی ناشـێ ئـەوە هەنـدێك دەڵـێن زەکاتەکـەی دورسـتە هەندێکیش دەڵێن دەبێت دووبارەی بکاتەوە.

١٥- ئەگەر ژنێك تەنها بیست مسقال مارەیی هـەبێت لـەلای مێردەکـەی لە دوای چەندین ساڵ پیّ ی بداتەوە ئـەوە ژنەکە تـەنها نیـو مـسقال زەکات دەدات چـونکە جاری یەکـەم کـە نیـو مـسقالی دەکەوێتـە سـەر نـۆزدەو نیـو مسقال دەمێنێتەوە ئەوەندەش زەکاتی لیّ ناکەویّ.

١٦- منداڵ و شێت کە زەکاتیان کەوتە سەر دەبیّ بدریّ.

١٧- هەر یەکێك مرد زەکاتی لەسەر بوو پێویستە لە میراتەکەی بدریّ.

١٨- نیەت لە زەکات دان پێویستە.

١٩- دوا خستنی زەکات حەرامە:

کاتیّ کە کـاتی زەکـات دان هـات پێویـستە یەکسەر بیـدەیت، حەرامـە دواخستنی مەگەر نەتوانی یەکسەر بیدەی ئەوە بۆت جائزە دوای بخەی تـا ئەو کاتەی کە دەتوانی بیدەی.

٢٠- زەکات پێش وەخت دان:

هەندێك دەڵێن دەبیّ ساڵی بەسەردا سورابێتەوە ئینجا بیدەی هەنـدێك دەڵێن پێش وەختیش دەتوانی بیدەی(سید سابق) لە(فقه الـسنة) دا دەڵـیّ:

وسُئل الحسن عن رجل أخرج ثلاث سِنين يُجزيه؟ قال: يُجزيه.

واتـە: لـە حەسـەنیان پرسـی دەربـارەی پیاوێك کە زەکـاتی سـیّ سـاڵی داوە ئایـا بـەری دەکـەویّ گـوتی: بـەری دەکـەویّ واتـە لەسـەر ئـەم قـسەیە دەتوانی دوو ساڵ پێشتریش زەکات بدەی.

٢١- زەکات لە ماڵی حەرام:

ماڵێك کە حەرام بێت زەکاتی لـیّ نـادریّ چوونکە لە رووی شـەرعیەوە بە مولك دانانریّ.

٢٢- زەکاتی دەغل و دان و میوە:

عن أبي هريرة عن أبي موسى ومعاذ: أنَّ رسولَ الله(ﷺ) بعَثهُما الى اليمن يُعَلِّمانِ الناسَ أمرَ دينهم فأمرهم أن لا يأخذوا الصَّدقةَ إلاّ مِن هذه الأربعة: الحنطة، والشَّعير، والتَّمر، والزبيب. رواه الحاكم والبيهقي و صححه الالباني(سلسلة الاحاديث الصحيحة(٨٧٩).

واته: ئەبو موساو موعاز(رەزای خوایان لێ بێت) دەڵێن پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانی ناردووە بۆ یەمەن بۆ ئەوەی خەڵکی فێری دین بکەن جا فەرمانی پێ کردوون زەکاتی دانەوێڵەو میوە وەرنەگرن تەنها لەم چوار جۆرە نەبێت: گەنم، جۆ، خورما، مێوژ.

**سوود:**

یەکێك لەم شتانەی زەکاتی لێ دەدرێ دانەوێڵەو میوەیە جا هەندێك لە زانایان دەڵێن زەکاتی دانەوێڵەو میوە تەنها لەم چوار شتە دەکەوێ کە لە فەرموودەکەدا هاتووە واتە: گەنم، جۆ، خورما، مێوژ.

٢٣- دەغل و دان و میوە لە چەند زەکاتی لێ دەکەوێ:

زۆربەی هەر زۆری زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە بەروبووم و بەرهەمی کشت و کاڵ و میوە مادام نەگەیشتبێتە پێنج وەسق زەکاتی لێ ناکەوێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی(ليس فيما دون خمسة أَوسق صَدقة) رواه البخاري ومسلم.

واتە: لە پێنج وەسق کەمتر زەکاتی لێ ناکەوێ. یەك وەسق(٦٠)(صاع)ە کەواتە(٥) وەسق(٣٠٠)(صاع)ە، هەر(صاع)ێکیش کێشەکەی(٢,١٧٦) گرامە، کەواتە(٣٠٠×٢,١٧٦-٦٥٢,٨) کیلۆگرام

واته(٦٥٣) کیلۆگرام(٢٠٠) گرام کەم(نصاب)ی دانەوێڵەو میوەیە.

٢٤- زەکاتی دەغل و دان و میوە بە ئاوی باران:

زەکاتی بەروبوومی کشت و کاڵ و میوەجات ئەگەر بە ئاوی باران یان رووبارو کانیاو ئاو درابێ یان زەویەکی وابێ هەر پێویستی بە ئاودان نەکردبێ لەبەر شێداری ئەوە لە دە بەش بەشێکی زەکات لێ دەکەوی بەڵام ئەگەر ئاوی بۆ هەڵهێنجرابێ و بۆی هێنرا بێ ئەوە زەکاتەکەی لە بیست بەش بەشێکە، بەڵام ئەگەر ئاودانەکە نیوە بە ئەو بوو نیوەش بەئەو ئەو کاتە زەکاتەکەی سێ لەسەر چوار(٣/٤)ی دەیيەك دەبێت.

٢٥- زەکات لە کەل و پەلی بازرگانی:

بازرگانی موسڵمان لە کاتی زەکات دانی هەرچی کەل و پەل و شمەکی بازرگانی هەیەتی لەگەڵ ئەو قەرزانە کە ئومێدی وەرگرتنەوەی هەیە هەموویان حیساب دەکات و زەکاتیان لێ دەدات لە(٤٠) دینار یەك دینار، بەڵام ئەو قەرزانەی کە هیوای پێیان نەماوە هەر کاتێك وەری گرتەوە ئەوە زانایان لە بارەی زەکات لێ دانی رای جیاوازیان هەیە، جا بازرگانی موسڵمان کاتێك کە کەل و پەل و شمەکی بازرگانی و قەرزەکانی کە هیوای وەرگرتنەوەی هەیە لەگەڵ ئەو پارەی لە لایەتی حیسابی دەکات چەند دەرچوو ئینجا ئەوەش حیساب دەکات کە چەند قەرزارە، قەرزەکەی لە پارەکەی دەردەکات ئینجا لەوەی دەمێنێتەوە زەکات دەدات.

٢٦- چۆنیەتی قرساندنی کەل و پەلی بازرگانی لە کاتی زەکات دا:

کەل و پەلی بازرگانی لە کاتی زەکات لێ دانی لە بازار چەندی دەکات بەو نرخە دەقەبڵێنرێ واتە بە نرخی رۆژ، رای جیاوازیش هەیە لەم بارەوە ئیمام(احمد) و(شافعی) لە قسەیەکیان دا دەڵێن: پێویستە زەکاتی کەل و پەلی بازرگانی لە نرخەکەیان بدرێ لەم بارەوە رای جیاواز هەیە.

٢٧- زەكات لە قەرزدان:

قەرزێك كە كێشە لە وەرگرتنەوەی نی یە ئیمام شافعی دەڵێ: لەگەڵ سوڕانەوەی ساڵ پێویستە زەكاتەكەی بدات، (ابن حزم) رای وایە هەر قەرزێكت لەسەر خەڵك بێت تا وەری نەگریەوە زەكاتی لەسەر نی یە ئینجا كە وەری گرتەوە لە دوای ساڵ بەسەردا سوڕانەوە زەكاتی ساڵێكی لێ دەدا ئەگەر چەند ساڵێكیش لەلای كابرای قەردار مابێتەوە.

٢٨- ئەوەی قەرزارە چۆن زەكات دەدات:

ئەگەر تۆ دە ملیۆن دینارت هەبوو دوو ملیۆن دیناریش قەرزار بووی ئەو كاتە زەكاتی هەشت ملیۆن دیناری دەدەی.

٢٩- قەرز بەبەر زەكات خستن:

ئەگەر تۆ قەرزت لەسەر یەكێك بێت نابێت بڵێ ی ئەوە با لە جیاتی زەكات بێت، دەبێ لێ ی وەربگریەوە ئینجا بیدەیتەوە، بەڵام هێندێك دەڵێن دەبێت، وە ئەگەر یەكێك زەكاتی دا بە یەكێك كە قەرزاریەتی بەڵام بەو مەرجە پێیدا كە قەرزەكەی بداتەوە ئەوە زەكاتەكەی بە زەكات دانانرێ.

٣٠- زەكات بۆ باوك و دایك:

زەكات نابێ بدرێ بە باوك و باپیران، دایك و داپیران، منداڵ و منداڵیشیان، كچ و منداڵی كچیشیان وە هەروەها زەكات نابێت بدرێ بە خێزان.

٣١- مەرج نی یە هەموو هێتیمێك زەكاتی پێ بچێ:

موسڵمان كە زەكات دەدات دەبێ بیداتە یەكێك كە لە رووی شەرعیەوە رێگەپێدراو بێت بیدەیتێ مەرج نییە هەموو هێتیم و بێوەژنێك زەكاتیان پێ بچێ لە پاشان نابێت زەكاتەكە بدەیتە ئینسانی كافر.

٣٢- لە كۆتایی دا دەڵێم زەكات یەكێكە لە روكنەكانی ئیسلام هەوڵ

بده ئەم رووكنە بە رێك و پێكی جیٚ بەجیٚ بكەی پاداشتی زۆری لەسەر وەردەگری ئەگەر ئەم رووكنەش جیٚ بەجیٚ نەكەیت ئەوە بزانە هەرەشەی ئەوەت لیٚ كراوە پارەو پول و زێرو زیوەكەت لە قیامەت بە ئاگری جەهەننەم سۆر دەكرێنەوەو پیٚ ی داخ دەكرێی، لەرۆژێكا كە درێژیەكەی پەنجا هەزار ساڵە جا لە پاشان یا دەچیە بەهەشت یا دۆزەخ. دڵنیابە ئەو پارەو ماڵەی كە بە زەكات دەیدەی لە ماڵەكەت كەم ناكات وە ئەگەر نەشی دەیت ئەوە دڵنیابە لە دوا رۆژیش پەشیمانی سوودی نی یە.

# پارەو ماڵ بەخشین و قەرزدان

## گەورەیی ماڵ بەخشین

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) مَنْ تَصَدَّقَ بِعَدْلِ تَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طيِّبٍ، ولا يَقْبَلُ اللهُ إلاّ الطَّيِّبَ، فإنَّ اللهَ يَقبلُها بِيَمينه، ثُمَّ يُرَبِّيها لِصاحِبها كَما يُرَبِّى أحَدُكمْ فُلُوَّهُ حَتّى تكونَ مِثْلَ الجَبَلِ. رواه البخاري(١٤١٠) ومسلم(١٠١٤).

١-(فلو) بەچكەی ئەسپ و ماینە.

واتە: هەر یەكێك هێندەی دەنكە خورمایەك لە ماڵێكی حەڵاڵ بكاتە خێر وە خواش حەڵاڵ نەبێت وەری ناگرێت، ئەوە بێ گومان خوا بە دەستی راستی وەری دەگرێ پاشان بۆ خاوەنەكەی گەشەی پێ دەكات وەك چۆن یەكێكتان جوانووەكەی بەخێو دەكات هەتا ئەوەندەی چیایەكی لێ دێت.

٢- عن ابن مسعود(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) أَيُّكم مالُ وارثِه أحَبُّ إليهِ مِن مالِهِ؟ قالوا: يا رسول الله ما مِنّا أحدُ إلاّ مالُهُ أحَبُّ اليهِ. قال: فإنّ مالَهُ ما قَدَّمَ ومالُ وارثِه ما أخَرَّ. رواه البخاري(٦٤٤٢).

(١)وارث: میراتگر

واتە: كامتان ماڵی میراتبەرەكەی لا خۆشەویسترە لە ماڵی خۆی؟ گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا هیچ كەسێك لە ئێمە نی یە كە ماڵەكەی خۆی خۆشتر نەوێ لە ماڵی ئەوانەی میراتی لێ دەگرن، جا پێغەمبەر(ﷺ)

فەرمووی: جا بێ گومان ماڵی ئادەمیزاد ئەو ماڵەیە کە پێشی دەخات(واتە: یا دەیکاتە خێر یا دەیخوا یا لەبەری دەکا) وە ماڵی میراتبەرەکانی ئەو ماڵەیە(کە دەمرێ و) بەجێ ی دەهێڵێ.

٣- عن عائشة(رضي الله عنها) أَنَّهُمْ ذَبَحوا شاةً فقال النبيُّ(ﷺ): ما بَقيَ منها؟ قالَتْ: ما بَقيَ منها إلاّ كَتِفُها، قال: بَقِي كُلُّها غَيرَ كَتِفِها. صحيح رواه الترمذي(٢٤٧٠).

واتە: عائشە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ جارێك مەرێكمان سەربڕیبوو، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی چ لە مەرەکە ماوەتەوە؟ گوتم: هیچی لێ نەماوەتەوە تەنها شانێکی نەبێت(واتە هەمووی کراوەتە خێر تەنها شانێکی ماوە) جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: مەرەکە هەمووی ماوە تەنها شانەکەی نەبێ(چونکە ئەوەی کراوەتە خێر لای خوا نوسراوە).

٤- عن جابر(رضي الله عنه) قالَ: ما سُئِل رسولُ اللهِ(ﷺ) شيئاً قَطُّ فقالَ: لا. رواه البخاري(٦٠٣٤) ومسلم(٢٣١١).

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) نەبووە کە شتێکی لێ داوا کرابێ بڵێ نەء .

٥- عن عبدالله بن عمرو بن العاص(رضي الله عنهم) أن رجلاً سأل رسولَ الله(ﷺ): أيُّ الإسلام خيرٌ؟ قالَ: (تُطْعِمُ الطَعامَ وتَقْرَأُ السَّلامَ على مَنْ عَرَفْتَ ومَنْ لَم تَعْرِف) رواه البخاري(١٢) ومسلم(٣٩).

واتە: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد(ﷺ): کام شت لە ئیسلامەتی دا خێرترە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خواردن بدەی، وە سەلام بکەی لەوانەی کە دەیانناسی، وە لەوانەش کە نایانناسی.

٦- عن عقبة بن عامر(رضي الله عنه) قال: سمعت رسولَ

اللهِ(ﷺ) يقول: كلُّ امرىءٍ في ظلِّ صَدقته حتى يُقضى بين الناس، قال يزيد: فكان أبو الخير مَرثد لا يُخطئُهُ يومٌ إلاّ تصدّق فيه بشيءٍ ولو بكعكةٍ أو بَصَلَةٍ. رواه أحمد وابن خزيمة وابن حبان في صحيحيهما والحاكم وصححه الالباني(صحيح الجامع الصغير(٤٥١٠).

واته: هەموو كەسێك(لە ڕۆژی قیامەت) لە ژێر سێبەری خێرەكەی دایە تاوەكو بریار دەدرێ لە نێوانی خەڵك دا، جا یەزید دەڵێ(ابوالخیر) مەرثەد هەموو ڕۆژێ شتێكی دەكردە خێر ئەگەر پارچە نانێك یا سەڵكە پیازێكیش بوایە.

## ماڵ کەم ناکات بە بەخشین

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أن النبيَّ(ﷺ) قال: ما مِنْ يومٍ يُصبحُ العِبادُ فيه إلاّ مَلَكان يَنْزلانِ فيقولُ أحدُهما: أللهمَّ أعْطِ مُنْفِقاً خَلفاً ويقولُ الآخَرُ: اللهمَّ أَعطِ مُمْسِكاً تلَفاً. رواه البخاري(١٤٤٢) ومسلم(١٠١٠).

واته: هیچ ڕۆژێك نی یە كە بەندەكان بەیانی تێدا بكەنەوە، ئیللا دوو فریشتە دێنە خوارەوە، یەكێكیان دەڵێت: ئەی خودایە ئەوەی كە دەبەخشێ بۆی لە جێ دابنێوە، ئەوەی تریشیان دەڵێت: ئەی خودایە ئەوەی دەست دەگرێتەوە لە ماڵ بەخشین ماڵەكەی لە نێو بەریت و بیفەوتێنیت.

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ اللهِ(ﷺ) قال: ما نَقصَتْ صَدَقةٌ مِنْ مالٍ وما زاد اللهُ عبداً بِعفوٍ إلاّ عِزاً، وما تواضَعَ

أَحَدٌ لله إلاّ رَفَعَهُ الله. رواه مسلم(٢٥٨٨).

واته: خێر کردن لە ماڵ کەم ناکاتەوە وە خوا هیچ زیاد ناکات بۆ بەندەیەك کە خەڵك عەفو بکات پلەو پایە نەبێت، وە نەبووە یەکێك لەبەر خوا خۆی بەکەم گرتبێ ئیللا خودا بەرزی کردۆتەوە.

٣- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله(ﷺ) قالَ: قالَ الله تبارك وتعالى: يابْنَ آدمَ أَنْفِقْ أُنْفِقْ عليكَ. رواه البخاري(٤٦٨٤) ومسلم(٩٩٣).

واته: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: خوا(تبارك و تعالى) دەفەرمووێ: ئەی ئادەمیزاد ببەخشە منیش پێت دەبەخشم.

## پارەو ماڵ سەرف کردن لە کەس و کار لە پێناوی خوادا

١-عن أبي مسعودٍ البدري(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: إذا أَنفقَ الرَّجُلُ على أهلِهِ نَفقَةً يَحْتَسِبُها فَهِيَ لَهُ صَدَقَةٌ. رواه البخاري(٥٣٥١) ومسلم(١٠٠٢).

واته: ئەگەر پیاو خەرجیەك خەرج بکات بۆ کەس و کارەکەی لە پێناوی خوا ئەوە بەخێر بۆی دادەنرێ.

### سوود:

١-لەم فەرموودەیەدا بۆ ئەوەی موسڵمان پاداشت وەربگرێ لەسەر ئەو مەسرەفەی کە لە کەس و کارەکەی دەکات مەرجێکی تیایە ئەویش دەبێ مەسرەفەکە لە پێناوی خوادا بێت، جا هەر کەسێك مەسرەف لە خێزان و کەس و کاری بکات مەبەستی لە مەسرەفەکە ڕەزامەندی خوا نەبوو ئەوە

بۆی بەخێر نانوسرێ.

٢- عبدالله كوڕی موبارەك(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لا يَقَعُ مَوقِعَ الكسب على العيال شيءٌ ولا الجهاد في سبيل الله عز وجل[1].

واتە: هیچ شتێك وەكو كاسبی نی یە بۆ ماڵ و منداڵ تاوەكو جیهاد كردنیش لە ڕێ ی خوادا.

٣- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): دينار أنْفَقْتَهُ في سبيل الله ودينار أنْفَقْتَهُ في رَقَبَةٍ، ودينارٌ تَصَدَّقت بِهِ على مِسكينٍ ودينارٌ أنْفَقْتَهُ على اهلك، أعْظَمُها أجراً الذي انفقتهُ على أهلكَ. رواه مسلم(٩٩٥)

واتە: دینارێكت بەخشیبێت بۆ جیهاد كردن لە ڕێ ی خوادا وە دینارێكت بەخشیبێت بۆ ئازاد كردنی بەندە وە دینارێكت بەخێردابێت بە هەژارێك وە دینارێكت خەرج كردبی بۆ كەس و كارەكەت لە هەموویان خێرتر ئەو دینارەیە كە خەرجت كردووە بۆ كەس و كارەكەت.

**سوود**:

ئەگەر موسڵمان مەسرەف بە ڕێك وپێكی لە ماڵ و منداڵەكەی بكات بەڵام هیچ نیەتێكی نەبوو ئەوە واجبەكەی لەسەر لادەچی بەڵام خێری ناگاتێ جا موسڵمان دەتوانی لە ڕێگای مەسرەف كردن لە ماڵ و منداڵ لە پێناوی خوا خێرێكی گەلێ زۆر كۆبكاتەوە.

---

(1) صفة الصفوة

# گەورەیی خێری نەهێنی

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: سَبعَةٌ يُظلُّهُم الله في ظلِّه يومَ لا ظلَّ إلاّ ظلُّهُ: إمامٌ عادلٌ، وشابٌّ نَشأَ في عبادةِ الله عز وجل، ورَجلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ بالمساجد، ورجلان تحابا في الله اجتمعا عليه وتَفرَّقا عليه، ورجُلٌ دَعَتْهُ امْرأةٌ ذاتُ مَنْصبٍ و جمالٍ فقال: إنّي اخاف الله، ورَجُلٌ تَصدَّقَ بِصَدقَةٍ فأخفاها حتى لا تعلم شمالُهُ ما تُنْفِقُ يمينُهُ[1]، ورَجُلٌ ذكرَ الله خالياً ففاضَتْ عيناهُ.

**رواه البخاري(١٤٢٣) ومسلم(١٠٣١).**

واتە: حەوت دەستە هەن خوا لە ڕۆژی قیامەت دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆی کە لەو ڕۆژەدا هیچ سێبەر نی یە تەنها سێبەری ئەو نەبێت:

-پێشەوایەکی دادپەروەر.

- وە گەنجێك لە عیبادەت و خوا پەرستیدا پێگەیشتبێ.

- وە پیاوێك دڵی بەسترابێتەوە بە مزگەوت.

- وە دوو پیاو لەبەر خوا یەکتریان خۆش ویستبی لەسەر ئەم خوشەویستیە کۆبونەتەوە وە لەسەریشی جیا بوونەتەوە.

- وە پیاوێك ئافرەتێکی خاوەنی پلەو پایەو جوان بانگی بکات(بۆ زینا کردن لەگەڵی دا) جا ئەویش بڵێ: من لە خوا دەترسم.

- وە پیاوێك خێرێك بکات و بیشارێتەوە تاوەکو دەستی چەپی نەزانێ کە دەستی ڕاستی چی بەخشیووە.

- وە پیاوێك کە تەنیایەو کەس نایبینێ یادی خوا بکات و فرمێسك بە چاوی دا بێتە خوارەوە(لەترسی خوا).

---

(1) ئەمە(کنایە)یە بۆ زۆر شاردنەوەیە.

٢- عن أبي سعيد الخدري(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): صَدَقَةُ السِّرِّ تُطْفِيءُ غضَبَ الرَّبِّ[1].

واته: خێرو سەدەقەی نهێنی تورەیی پەروەردگار نامێڵێ.

## خێر دەدەی بە کێ یەکەم جار

١-عن جابرٍ(رضي الله عنه) انّ رسولَ الله(ﷺ) قال لِرَجلٍ: إبدأْ بِنَفسِكَ فتَصَدَّقْ عليها، فَلإنْ فَضَل فلأهْلِك، فإن فَضَلَ عنْ أهلِك شيءٌ فَلِذِي قَرابَتِكَ، فإن فَضَلَ عن ذي قَرابَتِك شيءٌ فهكذا و هكذا. رواه مسلم(٩٩٧).

واته: جابر(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بە پیاوێکی فەرموو: لە خۆتەوە دەست پێ بکەو پێ ی ببەخشە، جا ئەگەر شتێك زیاد بوو ئەوە با بۆ خاوو خێزانت بێ وە ئەگەر شتێك لە خاوو خێزانیشت زیاد بوو با بۆ خزمەکانت بێ وە ئەگەر لە خزمەکانیشت شتێك ماوە ئەوە بەملاولادا بیبەخشە.

## خێری قەرزدان

١-عن ابن مسعود(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: ما مِنْ مُسلمٍ يُقْرِضُ مُسلِماً قرضاً مَرَّتينِ إلاّ كانَ كَصَدَقَتِها مَرَّةً. صحيح الجامع الصغير(٥٧٦٩).

واته: هەر موسڵمانێك دوو جار قەرز بە موسڵمانێك بدات ئەوە وەکو

---

(1) صحيح الجامع الصغير(٣٧٥٩).

ئەوە وايە كە ئەو قەرزەی جارێك كردبێتە خێر.

٢- عـن الـبراء بـن عـازب(رضـي الله عنـه) قـال: سمعـتُ رسـول الله(ﷺ) يقول: مَنْ مَنَحَ منيحـةَ لَبَنٍ أَو ورِقٍ أَوْ هَدَى زُقاقاً، كـان لَـهُ مِثلُ عِتق رَقَبةٍ. صحيح رواه الترمذي(١٩٥٧).

١-الزقاق: الطريق. واته: رێگا.

٢-عتق: ئازاد كردن.

٣- رقبة:كۆيله، عەبد.

مانای فەرموودەكە: (من منح منيحة لبن) هەر يەكێك مەرێكی شیردار یا لە جۆری ئەو بدا بە يەكێك بۆ ئەوەی سوود لە شیرەكەی وەربگری لە دوایی دا بیداتەوە، (أو ورق) یا زیوی پیٚ بدا بە قەرز(واتە قەرزی پیٚ بدا)، (أو هدى زقاقا) یا رێگايەك نیشانی كوێرێك یا سەرگەردانێك بدات، (كان له مثل عتق رقبة) ئەوە وەكو ئازاد كردنی بەندەیەكە بۆی.

## خێری مۆڵەت دان و لابردنی شتیٚ بۆ قەرزداری نەدارا

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً أَو وَضَعَ لَهُ أظَلَّهُ اللهُ يوم القيامة تحت ظلِّ عَرْشِهِ يوم لا ظلَّ إلاَّ ظلُّهُ. صحيح رواه الترمذي(١٣٠٦)

١- مَنْ انْظَرَ مُعْسِراً: كەسیٚ مۆڵەتی قەرزدارێكی نەدارا بدات.

٢- وَضَعَ له: اي ترك له شيئا مما له عليه. واتە: هەندیٚ لەو قەرزەی كە لە سەريەتی دايبشكێنیٚ و لیٚ ی خۆش بێت.

مانای فەرموودەكە:

هەر كەسێك مۆڵەتی قەرزدارێكی نەدارا بدا، یا شتێك لە قەرزەكەی دا

بشكێنیٚ بۆی خودا لە رۆژی قیامەت دایدەنیٚ لە ژێر سێبەری عەرشی خۆیدا لەو رۆژەی کە هیچ سێبەرێك نییە تەنها سێبەری ئەو نەبێت.

## دواخستنی قەرز لەگەڵ توانای دانەوە ستەمە

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ)مَطْلُ الغَنيِّ ظُلمٌ. رواه البخاري(٢٢٨٧) و مسلم(١٥٦٤).

المطل: المدّ: درێژکردنەوە.

واتە: هەر کەسێك قەرزێکی لەلابێت و بتوانێت بیداتەوە ئەگەر دوای بخات ئەوە زوڵم و ستەمە.

**سوود**:

١-پیاوی قەردار ئەگەر هەیبێت و نەیداتەوە یان دوای بخات ئەوە ستەمی کردووە.

٢- موسڵمان کاتێك قەرزی دایەوە ئەگەر زیاتریش بداتەوە جائزە بە مەرجێك ئەمە بە مەرج نەگیرابیٚ.

## خێری ئەوەی دەمریٚ و قەرزی لەسەر نی یە

١-عن ثوبان مولى رسول الله(ﷺ) عن رسول الله(ﷺ) أنَّـهُ قال: منْ فارقَ الرّوحُ الجسدَ وهوَ برِيءٌ مِنْ ثَلاثٍ دخَلَ الجنّةَ: منَ الكِبرِ والغلول والدَّينِ. صحيح رواه ابن ماجه(٢٤١٢) والترمذي(١٥٧٢).

واتە: هەر یەکێك گیانی لە لاشەی جیابێتەوە بەری بێت لە سیٚ شت دەچێتە بەهەشت: لە خۆ بە گەورە زانین و دزی کردن لە دەست کەوتی شەرو قەرزاری.

# زەکاتی سەرفترە
# (زكاةُ الفطر)

١-عن ابن عمر(رضي الله عنهما) قال: فرض رسول الله(ﷺ) زكاةَ الفطرِ صاعاً من تَمرٍ أو صاعاً من شعيرٍ على العبد والحرِّ والذَّكر والأنثى والصغير والكبير منَ المسلمينَ وأمرَ بها ان تَؤَدَّى قبلَ خروج النَّاس الى الصلاةِ. رواه البخاري(١٥٠٣) ومسلم(٩٨٤).

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) زەکاتی سەرفترەی فەرز کرد بە بڕی(صاع)ێك لە خورما یان(صاع)ێك لە جۆ لەسەر بەندەو ئازادو نێرینەو مێینەو بچووك و گەورەی موسڵمان وە ئەمری کرد ئەم زەکاتە بدرێ پێش ئەوەی خەڵك بچن بۆ نوێژی جەژن.

**سوود:**

١-زەکاتی سەرفیترە واجبە لەسەر هەموو بچووك و گەورەو نێرینەو مێینەو ئازادو بەندەیەك لە موسڵمانان بە مەرجێك بژێوی شەوو ڕۆژی جەژنی خۆی و ئەوانەی نان و نەفەقەیان لەسەری پێویستە هەبێ.

٢- ئەندازەی ئەم زەکاتە(صاع)ێکە لە جۆ یا لە خورما یا مێوژ یا کەشك یا هەر شتێك کە شوێنی ئەمانە بگرنەوە وەك برنج و گەنمە شامی و لە جۆری ئەمانە کە بە بژێو(قوت) دابنرێت، وە ئەگەر گەنم بوو ئەوە نیو(صاع) دەدرێت.

٣- یەك(صاع)(٢,١٧٦) دوو کیلۆو سەدو حەفتاوشەش گرامە.

٤- زۆربەی زانایان دەڵێن نابێت پارە بدرێ لە زەکاتی سەرفیترە.

٥- باشترین کاتی ئەم زەکاتە ئەوەیە کە پێش نوێژی جەژنی ڕەمەزان بدرێ وە دورستیشە ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ پێش جەژن بدرێ.

٢- عن ابن عباس(رضي الله عنه) قال: فرض رسولُ الله(ﷺ) زكاةَ الفِطر طُهرةً للصائِم منَ اللَّغوِ والرَّفَثِ وطُعمةً للمساكينِ مَنْ أدّاها قبلَ الصّلاة فهيَ زكاةٌ مقبولةٌ ومَنْ أدّاها بعدَ الصلاةِ فهيَ صدقَةٌ مِنَ الصَّدقاتِ. حسن رواه ابو داود(١٦٠٩) وابن ماجة(١٨٢٧).

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) زەکاتی سەرفیترەی فەرز کرد بۆ پاککردنەوەی ڕۆژووگر لە ڕەفتاری پووچ و قسەی ناشیرین وە خواردنێکیش بێت بۆ هەژاران هەر یەکێك ئەم زەکاتە پێش نوێژ بدات ئەوە زەکاتێکی وەرگیراوە وە هەر یەکێکیش لە دوای نوێژ بیدات ئەوە خێرێکە لە خێرەکان.

**سوود**:

١-ئەم زەکاتە دەدرێ بەو کەسانەی کە شایستەین کە ئەمانیش هەژارەکانن.

٢- کۆتا کاتی ئەم زەکاتەپێش جەژنە ئەوەی کە لە دوای جەژن ئەم زەکاتە دەدات ئەمە خێرێکە و بەسەر فیترە بۆی حیساب ناکرێ.

# پلەو پایەی رۆژووگرتن

١-عن أبي سعيد الخدري(رضي الله عنه) قال: سمعت النبيَّ(ﷺ) يقول: مَنْ صام يوماً في سبيل الله بَعَّدَ اللهُ وجهَهُ عن النار سبعينَ خريفاً. رواه البخاری (٢٨٤٠) ومسلم (١١٥٣)

١-خريفا: السنه، واته: سالْ.

مانای فەرموودەکە: هەر یەکێك لە رێ ی خوادا یەك رۆژ بەرۆژوو بێت خودا حەفتا سالْ رووی لە ئاگری دۆزەخ دووردەخاتەوە.

**سوود**:

(صَوم) لە زمانی عەرەبی دا بە مانای خۆگرتن دێت جا هەر خۆگرتنەوەیەك بێت وەك: خۆگرتن لەقسە كردن یا لە رۆیشتن،....

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) قال الله عَزَّ وجَلَّ: كُلُّ عَمَلِ ابنِ آدمَ لَهُ إلاّ الصِّيام فإنَّهُ لي وأنا أجزي به والصِّيام جُنَّةٌ فإذا كان يومُ صَومِ أَحَدكُم فلا يَرفُثْ يومَئذٍ ولا يَسْخَبْ فَإنْ سابَّهُ أحَدٌ أَوْ قاتَلَهُ فَلْيَقُلْ: إنّي امْرُؤٌ صائمٌ، والذي نَفَسُ محمد بيدهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائم أطيبُ عند الله يوم القيامةِ من ريحِ المِسكِ وللصَّائِمِ فَرحتانِ يَفْرَحُمُما: اذا أفْطَرَ فَرِحَ بِفِطْرِهِ واذا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بصَومه. رواه مسلم(١١٥١)

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموويەتی: خوا(عزَّ وَجلَّ) فەرموويەتی: هەموو

کردەوەکانی ئادەمیزاد بۆ خۆیەتی بێجگە لە ڕۆژووگرتن ئەو تەنیا بۆ منەو خۆشم پاداشتی دەدەمەوە وە ڕۆژووگرتن قەڵغانە(پارێزەرە لە ئاگری دۆزەخ) جا ئەگەر ڕۆژی بەڕۆژوو بوونی یەکێکتان بوو با ئەو ڕۆژە قسەی ناشیرین و قڕەو گاڵە نەکات، وە ئەگەر یەکێکیش جنێوی پێ دا یا شەڕی پێ فرۆشت بابڵێ من کەسێکی بەڕۆژووم، سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە(ﷺ) بۆنی گۆڕاوی دەمی ڕۆژووەوان لە لای خوا لە ڕۆژی قیامەت دا لە بۆنی میسك خۆشترە، وە بۆ ڕۆژووگر هەیە دوو کەیف خۆشی پێ ی کەیف خۆش دەبێت کاتێك ڕۆژووی شکاند کەیف خۆش دەبێت بەڕۆژوو شکاندنەکەی وە کاتێکیش بە پەروەردگاری دەگا کەیف خۆش دەبێت بە ڕۆژووەکەی.

٣- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: مَنْ صامَ رَمضانَ إيماناً واحْتِساباً غُفِرَ لَهُ ما تقدم مِنْ ذنبِه. رواه البخاري(١٩٠١) ومسلم(٧٦٠).

واتە: هەر کەسێك مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت بە ئیمان و بۆ بەدەست هێنانی پاداشت لە لایەن خواوە خوا لەگوناهی ڕابردووی خۆش دەبێت.

٤- عن سَهل بن سعد(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: إنَّ في الجنَّةِ باباً يُقالُ لَهُ الرَّيان يَدخُلُ منهُ الصَّائمون يومَ القيامة لا يَدخُلُ منهُ احَدٌ غيرهم، يقالُ: أين الصائمون؟ فيَقومون لا يدخُلُ منه أحدٌ غيرُهم فإذا دَخَلوا أُغلِقَ فلَمْ يدخُلْ منهُ أحد. رواه البخاري(١٨٩٦) ومسلم(١١٥٢).

واتە: بێ گومان لە بەهەشت دا دەرگایەك هەیە پێ ی دەگوترێت: ڕەییان، لە ڕۆژی قیامەت دا ڕۆژووگران لێیەوە دەچنە ژوورەوە بێجگە

لەوان کەسی دیکە پێیدا ناچێتە ژوورەوە دەگوترێ: کوان ڕۆژووگران؟ جا ئەوان هەڵدەستن و جگە لەوان کەسی دیکە لێیەوە ناچێتە ژورێ جا کاتێك ئەوان چوونە ژوورێ دادەخرێ و هیچ کەسی دیکە لێیەوە ناچێتە ژوورەوە.

٥- عن سهل بن سعد(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: في الجنّةِ ثمانيةُ ابواب فيها بابٌ يُسَمَى الرَّيّان لا يدخُلُهُ إلاّ الصّائمون. رواه البخاري(٣٢٥٧).

واتە: لە بەهەشت دا هەشت دەرگا هەیە دەرگایەکی تێدایە ناوی(رَیان)ە بێجگە لە ڕۆژووگران کەسی دیکە پێیدا ناچێتە ژوورەوە.

٦- عن عثمان بن ابي العاص(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسولَ الله(ﷺ) يقولُ: الصِّيام جُنَّةٌ كَجُنَّة أحدكم من القتال. صحيح رواه النَّسائي(٢٢٣٠).

واتە: ڕۆژوو پارێزەرە(لە ئاگری دۆزەخ) وەکو قەلغانی یەکێك لە ئێوە لە کاتی شەڕدا.

٧- عن عبدالله بن عمر(رضي الله عنهما) انَّ رسولَ الله(ﷺ) قال: الصِّيَامُ والقرآنُ يَشْفَعانِ للعْبدِ يومَ القيامةِ يقولُ الصِّيامُ: أيْ رَبِّ مَنَعْتُهُ الطَّعام والشَّهوة فَشَفِّعْني فيه: ويقولُ القرآنُ: مَنَعْتُهُ النَّوم بالليلِ فشَفِّعني فيه، قال فَيُشَفَّعان. سنده حسن رواه احمد(٦٦٢٦) والحاكم(١/٥٥٤) قال البيهقي في مجمع الزوائد(ورجال الصحيح).

١- أيْ: حرف نداء بمعنى(يا) اي: يا ربّ.

واتە: ڕۆژوو و قورئان لە ڕۆژی قیامەت دا شەفاعەت بۆ عەبد دەکەن ڕۆژوو دەڵێ: ئەی پەروەردگارم (من لە ڕۆژدا) خواردن و بەجێ هێنانی ئارەزوویم لێ قەدەغە کردبوو جا بمکە بە شەفاعەت کارو تکاکاری، وە قورئانیش دەڵێ: منیش بەشەو خەوم لێ قەدەغە کردبوو جا بمکە بە شەفاعەت کاری(جا هەردووکیان ڕێ دەدرێن ببنە تکاکار بۆی) جا تکاو شەفاعەتی بۆ دەکەن.

٨- عن ابي أُمامة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: منْ صام يوماً في سبيل الله جعل الله بينه وبين النارِ خندقاً كما بين السماء والارض. حسن صحيح رواه الترمذي(١٦٢٤).

واتە: هەر یەکێك یەك ڕۆژ لە ڕێ ی خوادا بەڕۆژوو بێت خودا چاڵێکی وەکو نێوان عارد و عاسمان دەخاتە نێوانی ئەوو نێوانی ئاگر.

## خۆپاراستنی ڕۆژیەوان لە کارو گوفتاری خراپ

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسولُ الله(ﷺ): منْ لم يَدَع قولَ الزُّور والعملَ بِهِ فلَيس لله حاجَةٌ في أنْ يدع طعامهُ وشرابَهُ. رواه البخاري(١٩٠٣).

واتە: هەر کەسێك واز نەهێنێ لەووتەو کرداری خراپ و درۆ ئەوە خوا هیچ پێویستیەکی بەوە نی یە کە ئەو واز لە خواردن و خواردنەوە بێنێ.

### سوود:

١-دوو شتی گرنگ هەن بۆ خۆپاراستن لە گوناح:

ا- کەم قسە کردن.

ب- کەم تێکەڵاوی کردن.

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قالَ: قال رسولُ الله(ﷺ): رُبَّ صَائمٍ ليسَ لَهُ من صيامِهِ إلاّ الجوعُ ورُبَّ قائمٍ ليسَ لَهُ من قيامهِ إلاّ السَّهَرُ. صحيح(صحيح جامع الصغير(٣٤٨٨).

واتە: زۆر ڕۆژووگر لە ڕۆژوو گرتنەکەی تەنها برسیەتی پێ دەبڕێ وە زۆر شەو نوێژکەریش لە شەو نوێژەکەی تەنیا شەونخوونی بۆ دەمێنێتەوە.

## سێ ڕۆژ بەڕۆژ بوون لە هەموو مانگێك داوە بەڕۆژووبوونی ڕۆژێك نا ڕۆژێك

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قالَ: أوصاني خَليلي(ﷺ) بثلاثٍ: صيام ثلاثةِ أيامٍ مِنْ كُلّ شَهرٍ ورَكعتَيْ الضُّحى وأَن أُوتِرَ قَبل أن أنام. رواه البخاري(١٩٨١) ومسلم(٧٢١).

واتە: ابوهریرە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: خۆشەویستەکەم ڕای سپاردووم بە کردنی سێ شتان:

بەڕۆژوو بوونی سێ ڕۆژان لە هەموو مانگێك، وە دوو ڕکاتی چێشتەنگاو، وە نوێژی وتر بکەم پێش ئەوەی بخەوم.

### سوود:

سوونەتە موسڵمان لە هەر مانگێك سێ ڕۆژان بە ڕۆژی بێت ئەم سونەتەش دێتە دی هەر چۆنێك بەڕۆژی بێت مادام سێ ڕۆژ بێت، بەڵام باشتر وایە کە ئەو سێ ڕۆژە بکەوێتە(أيّام البيض)ەوە واتە: ڕۆژە شەو

ڕووناکەکان کە بریتین لە ڕۆژی سێزدەو چواردەو پازدە، هێندێك دەڵێن: بریتین لە دوازدەو سێزدەو چواردە بەڵام هەروەك(نووی) دەڵێ(الصحیح المشهور) قسەی یەکەمە: واتە: سێزدەو چواردەو پازدەکە.

٢- عن عبدالله بن عمرو(رضي الله عنه) قال: أُخْبِرَ رَسولُ اللهِ(ﷺ) أنّي اقولُ: واللهِ لأَصُومنَّ النَّهارَ ولأَقومَنَّ الليلَ ما عِشتُ، فقُلتُ له: قَدْ قُلْتُهُ بأبي أنتَ وأمِّي، قال: فإنَّكَ لا تستطيعُ ذلك فصُمْ وأَفطِرْ، وقُم ونَمْ وصُمْ مِنَ الشَّهرِ ثلاثة أيام فإنَّ الحسنَةَ بعَشْرِ أمثالها وذلك مثل صيام الدهرِ. قُلْتُ: إنّي أُطيقُ أفْضَلَ منْ ذلك، قال: فَصُمْ يوماً وأَفْطِر يومين، قُلْتُ: إنّي أُطيقُ أفْضَلَ مِنْ ذلك، قال: فَصُمْ يوماً وأفطِر يوماً فذلك صيامُ دواد عليه السلام وهو أفضَلُ الصيام، قُلْتُ: إنّي أُطيقُ أفْضَلَ مِنْ ذلك، فقال النبيُّ(ﷺ) لا أفضَلَ مِنْ ذلك. رواه البخاري(١٩٧٦) ومسلم(١١٥٩).

واتە: عبدالله کوری عەمر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: خەبەر بە پێغەمبەر درا(ﷺ) کە من دەڵێم: سوێند بە خوا هەتا ماوم بە ڕۆژ بە ڕۆژی دەبم وە بە شەویش شەو نوێژ و خوا پەرستی دەکەم، عبدالله دەڵێ: جا منیش بە پێغەمبەرم گوت بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم من ئەو قسەیەم گوتووە، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی تۆ ئەوە ناتوانی بە ڕۆژی بەو بەڕۆژیش مەبە وە شەو هەندێکی لێ هەستەو هەندێکی لێ بخەوە وەلە مانگێ سێ ڕۆژان بە ڕۆژی ببە بێگومان هەر چاکەیەك بە دە چاکە هەیە وە ئەوەش(واتە سێ ڕۆژ بەڕۆژی بوون لە هەموو مانگێك) وەکو ئەوەیە کەساڵ دوازدەی مانگ بە ڕۆژی بیت، جا گوتم من لەمە باشتر توانام هەیە فەرمووی: دە یەك ڕۆژ بەڕۆژوو بەو دوو ڕۆژ پێ مەبە، گوتم من لەمە باشتر

توانام هەیە، فەرمووی: دە رۆژێك بە رۆژی بەو رۆژێك پێ مەبە كە ئەوەش بە رۆژی بوونی داود بوو(علیه السلام) ئەوەش باشترین رۆژی گرتنە، گوتم لەمەش باشتر دەتوانم پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی لەمە باشتر نی یە.

**سوود:**

(شوكانی) دەڵێ:(وافضل التطوُّع صومُ يومٍ وإفطارُ يومٍ) [1].

واتە: باشترین رۆژی گرتنی سوننەت ئەوەیە رۆژێك بە رۆژی بیت رۆژێك بەرۆژی نەبیت.

٣- عن معاذَة العَدويَّة انَّها سَألَتْ عائشة(رضي الله عنها) أكانَ رسول الله(ﷺ) يَصومُ مِنْ كُلِّ شَهرٍ ثلاثة أيّامٍ؟ قالَتْ: نعم، فقلت لها: مِن أيِّ أيّامِ الشَّهرِ كان يَصومُ؟ قالت: لَمْ يَكنْ يبالي من أيِّ أيام الشَّهرِ يصومُ. رواه مسلم(١١٦٠).

واتە: موعاذەی عەدەوی پرسیاری لە عائشە كردووە(رەزای خوای لێ بێت) ئایا پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو مانگێ سێ رۆژان بەرۆژی دەبوو؟ گوتی: بەڵێ، جا پێم گوت: لە چ رۆژێكی مانگێدا بەرۆژوو دەبوو؟ عائشە(رەزاو رەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمووی: گوێ ی بەوە نەدەدا لە چ رۆژێكی مانگدا بەرۆژوو دەبوو.

٤- عن أبي ذر(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) يا أبا ذَر، إذا صُمْتَ مِن الشَّهر ثلاثةَ أيّامٍ فصُم ثلاث عشرةَ، وأربْعَ عشرةَ، وخَمْس عَشْرَةَ. حسن صحيح رواه الترمذي(٧٦١).

---

(1) الأدلة الرضية ص١٣٩.

واته: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەبو(ذَر) ئەگەر لە مانگێکدا سێ ڕۆژان بەڕۆژی بووی ڕۆژانی سێزدەو چواردەو پازدەی مانگ بەڕۆژی بە.

**سوود**:

١-سێزدەو چواردەو پازدەی مانگ کە لەم فەرموودە هاتووە مەبەست ڕۆژانی سێزدەو چواردەو پازدەن لە مانگی قەمەری نەك لە مانگی شەمسی کە لە ناو ئێمە مەشهورە بە ئینگلیزی.

٢- ئەم سێ ڕۆژە(ایام البیض)یان پێ دەوترێ سێزدەو چواردەو پازدە، واتە: ڕۆژە سپییەکان، چونکە شەوی ئەم سێ ڕۆژە سپینەو روناکن لەبەر دەرکەوتنی مانگ بە درێژایی شەو بە پری.

## بەڕۆژوو بوونی دووشەم و پێنج شەم

١-عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: كان رسولُ الله(ﷺ) يتحَرى صَومَ الإِثنينِ والخميس. **صحيح رواه الترمذي(٧٤٥) وابن ماجه(١٧٣٩).**

واتە: عائشە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) دەگەڕا بەدوای بەڕۆژووی دووشەممەو پێنج شەممە.

**سوود**:

ڕۆژی دووشەممە و پێنج شەممە سوننەتە موسڵمان تێیدا بەڕۆژی بێت.

## شەش رۆژ بەرۆژوو بوون لە شەووال

١-عن أبي أيوب(رضي الله عنه) أن رسولَ الله(ﷺ) قال: مَنْ صامَ رَمَضانَ ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتاً مِن شَوَّالٍ، كان كصِيامِ الدَّهْرِ. رواه مسلم(١١٦٤).

واتە: هەر یەکێك مانگی رەمەزان بەرۆژی بێت لە پاشان شەش رۆژیش لە شەووالدا بەدوایدا بگریٚ ئەوە وەکو بە درێژایی ساڵ هەر بەرۆژوو بیٚ وایە.

**سوود:**

١-شەش رۆژ بەرۆژوو بوون لە مانگی شەووال سوننەتە وە مانگی شەووال یەکسەر لە دوای رەمەزان دێت. وە ئەم سوننەتەش پێك دێت مادام لەم مانگەدا شەش رۆژ بەرۆژی بیت لەسەر یەك بیت یا لەسەر یەك نەبێت.

٢- هەر چاکەیەك بەدە چاکە هەیە کە مانگی رەمەزان بەرۆژی بیت ئەمە دەکا دە مانگ، شەش رۆژیش لە شەووال بە(٦٠) رۆژ هەیە واتە: دوو مانگ کەواتە بە مانگی رەمەزان و شەش رۆژ لە شەووال دەکەنە یەك ساڵ.

## بەرۆژی بوونی رۆژی عەرەفە

١-عن أبي قتادة(رضي الله عنه) قالَ: سُئِلَ رسولُ الله(ﷺ) عن صَومِ يومِ عَرَفَةَ؟ قالَ: يُكَفِّرُ السَّنَةَ الماضِيَةَ والباقيةَ. رواه مسلم(١١٦٢).

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لیٚ کرا دەربارەی بەرۆژوو بوونی رۆژی عەرەفە؟ فەرمووی: دەبێتە هۆی سڕانەوەی گوناحەکانی ساڵی رابردوو و داهاتوو.

**سوود:**

**١-ڕۆژی عەرەفە سوننەتە بەڕۆژوو بوون تێیدا وە خێری زۆرە ڕۆژی عەرەفە دەکا ڕۆژی پێش جەژنی قوربان کە لەو ڕۆژەدا حاجیان لە کێوی عەرەفاتن.**

**٢- بەڵام بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی عەرەفە بۆ حاجیەکان کە لە حەجدان سوننەت نی یە.**

# بەڕۆژوو بوونی
# نۆیەم و دەیەمی مانگی موحەڕڕەم

**١-عن أبي قتادة(رضي الله عنه) أنَّ رَسولَ اللهِ(ﷺ) سُئِلَ عن صيامِ يَومِ عاشوراءَ؟ فقالَ: يُكَفِّرُ السَّنَةَ الماضِيةَ. رواه مسلم(١١٦٢).**

**واتە: پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لیٚ کرا دەربارەی بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی دەیەمی مانگی موحەڕڕەم(عاشوراء) فەرمووی: گوناحەکانی ساڵی ڕابردوو دەسڕێتەوە.**

**٢- عن أبي عَطفان بن طريف المُرِّيَّ يقول: سمعتُ عبدالله بْنَ عباسٍ(رضي الله عنهما) يقول: حين صامَ رسولُ اللهِ(ﷺ) يومَ عاشوراءَ وأمرَ بصيامِهِ قالوا: يا رسول الله: إنَّهُ يومُ تُعَظِّمُهُ اليَهودُ والنَّصارى، فقال رسول الله(ﷺ): فإذا كان العامُ المُقْبِلُ إنْ شاء الله صُمنا اليومَ التاسعَ، قال: فَلَمْ يأتِ العامُ المُقبِلُ حتى تُوُفِّيَ رسولُ اللهِ(ﷺ). رواه مسلم(١١٣٤).**

**واتە: عبدالله کوڕی عەبباس(ڕەزای خوای لیٚ بێت) دەڵیٚ: ئەو کاتەی**

کــه پێغەمبــەر(ﷺ) ڕۆژی دەی موحــەڕڕەم بــەڕۆژی بــوو کــە نــاوداره بـه(عاشـوراء) وه فەرمانیـدا بـه موسـڵمانانیش کـه ئـەو ڕۆژه بـەڕۆژی بـن گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا ئەم ڕۆژه جولەکەو دیانەکانیش به گەورەی دەزانن، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: جا ئەگەر ساڵی داهاتوو هاتەوه ان شاء الله نۆیەمیش بەڕۆژی دەبین، ابـن عبـاس دەڵـێ: جـا سـاڵی داهـاتوو نەهات پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد.

## سوود:

سوننەته بەڕۆژوو بوون له مانگی موحەڕڕەم به گشتی وه ڕۆژی نۆیـەم و دەیەمی موحەڕڕەم به تایبەتی.

# بابەتی پەیوەندی دار بەڕۆژوو

١-عن انس(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): تَسَحَّروا فَإنَّ في السُّحُورِ بَرَكة. رواه البخاري(١٩٢٣) ومسلم(١٠٩٥).

واته: پارشێو بکەن چونکه بێ گومان له پارشێو کردن بەرەکەت هەیه.

## سوود:

١-پارشێو کردن سوننەته جا ئەم سوننەته پێك دێت ئەگەر به خواردن و خواردنەوەی کەم بێت یا زۆر ئەگەر به قوومه ئاوێکیش بێت(عن عبدالله بن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ) تسحروا ولو بجرعة ماء) حديث صحيح رواه ابن ماجة وابن حبان. واته: پارشێو بکەن ئەگەر به قوومه ئاوێکیش بێت.

٢- وە سوننەتە درەنگ پاش شیو بخوا.

٣- پارشێو کاتەکەی لە نیوەشەوەوە دەست پێ دەکات.

٢- عن سهل بن سعد(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: لا يــزالُ النــاسُ بخــيرٍ مــا عجَّلُــوا الفطــر. **رواه البخــاري(١٩٥٧) ومسلم(١٠٩٨).**

**واتە: بەردەوام خەڵکی هەر چاکن بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە بەربانگ زوو دەکەنەوە.**

## سوود:

**سوننەتە پەلەکردن لەبەربانگ کردنەوەدا.**

٣- عن انس(رضي الله عنه) قال: كان النبيُّ(ﷺ) يُفطرُ قبل أنْ يُصلِّيَ علـى رُطَبَـاتٍ فـإن لـمْ تَكُـن رُطبـاتٌ فـتُميراتٌ فـإنْ لـمْ تكُـن تُميراتٌ حَسَا حَسَواتٍ من ماءٍ. **حسن صحيح رواه ابوداود(٢٣٥٦) والترمذي(٦٩٦).**

**١-حَسَا: شَرِبَ، واتە: خواردیەوە.**

**٢- حَسَوات(کۆی(حسوة)یە(وهي المرة مِن الشَّرب) بریتی یە لە یەك جار لە خواردنەوە.**

**مانــای فەرموودەکــە: ئەنــەس(ڕەزای خــوای لــێ بیــت) دەڵــێ: پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژووەکەی دەشکاند پێش ئەوەی نوێژ بکات بە چەند دەنکە خورمایەکی تەڕ، ئەگەر چەند دەنکە خورمایەکی تەڕ نەبوایە بە چەند دەنکە خورمایەکی ووشك ئەگەر چەند دەنکە خورمایەکی ووشك نەبوایە چەند قومە ئاوێکی دەخواردەوە.**

٤- عن ابن عمر(رضـي الله عنـه) قـال: كـان رسـول الله إذا أفطـر قـالَ(ذهَـبَ الظَمـأُ وابْتَلَّـتِ العُـروق وثبـتَ الأجـرُ إن شـاء الله). حسن رواه ابواود(٢٣٥٧).

واتـــه: پێغەمبـــەر(ﷺ) جـــاران كـــه بـــەربانگی دەكـــردەوە دەيفەرموو:( ذهَبَ الظّمأ وابْتَلَّتِ العُروق وثبتَ الأجرُ إن شاء الله) واتـــه: تێنـــوەتی رۆيـــشت رەگ و دەمارەكـــان تەڕبوونـــەوە خـــوا ويستی لەسەر بێت پاداشتيش جێگەی خۆی گرت.

٥- عن أبي هريـرة(رضـي الله عنـه) قـال: قـال رسـول الله(ﷺ): مَنْ نَسِيَ وهوَ صائمٌ فأكلَ، أو شَرِبَ فَليُتِمَّ صَومَهُ، فَإِنَّما أطعَمَـهُ اللَه وسقاهُ. رواه البخاري(١٩٣٣) ومسلم(١١٥٥).

واته: هەر يەكێك لە بيری نەبوو كە بەرۆژی يە جا شتێكی خوارد يا شتێكی خواردەوە با رۆژەكەی تەواو بكات چونكە بێ گومان خودا خواردن و خواردنەوەی داوەتێ.

**سوود**:

خواردن و خواردنەوە بە ئەنقەست رۆژی بەتاڵ دەكاتـەوە بـەلام بـەهۆی لەبير چوون ئەگەر خواردی يا خواردیەوە ئەوە رۆژووەكەی بەتاڵ نابێتەوە.

٦- عن أبي هريرة(رضـي الله عنه) أن النبيَّ(ﷺ) قال(مَنْ ذرعَـهُ القيءُ فَلَيسَ عليه قضـاء ومَنْ استقاءَ عَمْداً فَلْيَقْضِ). صـحيح رواه ابو داود(٢٣٨٠) والترمذي(٧٢٠).

واته: هەر كەسێك زۆری بۆ بێ و بڕشێتەوە قـەزای لەسـەر نـی یـە بـەلام كەسێك بە ئەنقەست خۆی رشاندەوە با(رۆژیەكەی) بگێرێتەوە؟

**سوود**:

ئینسانی رۆژیەوان ئەگر بە دەست خۆی نەبوو رشانەوە ئەمە رۆژیەکەی ناشکێ بەلاّم ئەگەر بە ئەنقەست خۆی رشاندەوە ئەوە رۆژیەکەی دەشکێ.

٧- عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: قد كانَ رسول الله(ﷺ) يُدركهُ الفَجْرُ في رَمضان وهُوَ جُنبٌ مِن غيرِ حُلُم فيَغْتسِلُ ويصوم. رواه البخاري(١٩٣٠) ومسلم(١١٠٩).

واتە: عائشە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: جار وەبوو پێغەمبەر(ﷺ) بەیانی دەكردەوە لە مانگی رەمەزان و جەنابەتیشی لەسەر بوو(بەهۆی دورست بوونی لەگەڵ خێزاەكانی و، جەنابەتەكەی) بەهۆی خەو بینینەوە نەبوو جا خۆی دەشۆشت و بەرۆژی دەبوو.

**سوود**:

١-حەلاڵە بۆ ئەو كەسەی كە بەرۆژی دەبێت جەنابەتی لەسەر بێت خۆی نەشوا پێشی بەیانی جا كە بەیانی كردەوە ئەوجا خۆی بشوات:

٢- ئافرەت ئەگەر پێشی بەیانی خوێنی حەیزی یا زەیسانی پچراو نەما ئەمە رۆژیەكەی دورستە وە پێویستیشە رۆژیەكەی تەواو بكات جا ئەگەر پێشی بەیانی خۆی شوشتبێ یا نا.

٨- عن زيد بن خالد الجُهني(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): منْ فَطَرَ صَائِماً كانَ لَهُ مثلُ اَجْرِه غَير اَنَّهُ لا ينقصُ من اجرِ الصائِم شيئاً. صحيح رواه الترمذي (٨٠٧).

واتە: هەر كەسێك بەربانگ بداتە رۆژی گرێك ئەوە وەكو پاداشتی

ڕۆژی گرەکەی بۆ هەیە وە ئەو پاداشتەی بەربانگ دەرەکە بە دەستی هێناوە هیچ لە پاداشتی ڕۆژی گرەکە کەم ناکاتەوە.

٩- عن أبي بكر بن عبدالرحمن عن بعض اصحاب النبيّ(ﷺ) قال: لقدْ رأيت رسول الله(ﷺ) بالعرْجِ يَصُبُّ على رأسه الماء وهو صائم من العطَشِ أو من الحرِّ. صحيح رواه ابوداود(٢٣٦٥).

واتە: ئەصحابەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەرم بینی(ﷺ) لە(عَرج) بەڕۆژی بوو ئاوی بەسەری خۆیدا دەکرد لەبەر تێنوێتی یان لەبەر گەرما.

## فیقە دەربارەی ڕۆژوو

١-خۆشوشتن بۆ خۆ فێنك کردنەوە بۆ ڕۆژیەوان حەڵاڵە.

٢- کل لەچاو کردن جائزە بۆ ڕۆژیەوان

٣- (قطرة) لەچاوکردن جائزە بۆ ڕۆژیەوان ئەگەر تامەکەی لە گەروشی دا ببینیٚ.

٤- وە(قطرة) لە گویٚ کردن ڕۆژی بەتاڵ ناکاتەوە.

٥- وە ڕۆژی بەتاڵ نابێتەوە ئەگەر دەرمانێك لەسەر برینێك دابنریٚ ئەگەر تامەکەی لە گەروشیدا ببینیٚ.

٦- بۆن کردنی بۆنەکان و خۆبۆن خۆشکردن ڕۆژی بەتاڵ ناکەنەوە.

٧- ئاو هاتن بە هۆی خەو بینینەوە ڕۆژی بەتاڵ ناکاتەوە.

٨- بەڵام ئاو هاتن بە هۆی ماچ کردن یا دەست لیٚ دان یا بە دەستی خۆهێنان ڕۆژی بەتاڵ دەکاتەوە.

٩- دەرزی و شرینقە لیٚ دان ڕۆژی بەتاڵ ناکاتەوە بە مەرجێك دەرزیەکە دەرزی(مغذي) نەبێت.

١٠- ددان دەرهێنان ڕۆژی بەتاڵ ناکاتەوە.

١١- ئەگەر ڕۆژیەوان ترسا بەهۆی ماچ کردن و لەم جۆرەی خێزانەکەی ئـاوی بـێ یـا بیبـات بـۆ جیمـاع کـردن لەبـەر نـەبوونی هێـزی دەسـت بەسەرداگرتنی شەهوەتی ئەو کاتە ماچ کردن و لەم جۆرە حەرامە.

١٢- ڕۆژئـاوا بـوون پێـك دێـت بـەوەی کـە(قـرص)ی ڕۆژ نـەمێنێ و بـزر بێت ئەگەر تیشکی سۆریشی دیار بێت.

# باسی شەوی قەدر (ليلە القدر)

خوا فەرمووێ ﴿لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ﴾ (القدر: ٣).

واتە: شەوی قەدر چاکترە لە هەزار مانگ

القدر: دوو مانای هەیە یان بەمانای پیتو فەڕ دێت، یان بەمانای ئەندازە گیری.

## سوود:

١- عەمری کوڕی قەیس دەڵێ: عمل فيها خير من عمل الف شهر. (تفسير ابن كثير)

واتە: کارێکی خێر کە لەمشەوەدا بیکەی چاکترە لەوەی کە هەزار مانگ هەموو شەوێ ئەم کارە بکەی.

٢- شەوی قەدر (ليلة القدر) کاتەکەی دەست پێ دەکات لەبانگی مەغریبەوە تا بانگی بەیانی.

١- عن ابي هريرة قال: قال رسول الله (ﷺ)، مَن يَقُم ليلة القدر إيمانا واحْتساباً غفر له ما تَقَدَّم من ذنبه. رواه البخاري (٣٥) ومسلم (٧٦٠).

واتە: هەر یەکێك شەوی قەدر هەستێ (بەندایەتی بکات) باوەڕی پێی هەبێتو بەتەمای پاداشتی لای خوا بێت، گوناهی رابردووی دەسڕێتەوە.

## سوود:

١- موسڵمان دەتوانێ لەشەوی قەدردا بخەوی، بەڵام ئەگەر ئەوەندەش نەخەویو خەریکی عیبادەت بێت پاداشتەکەی زیاترە.

٢- هەندێك لەكارە گرنگەكان لەم شەوەدا

١- نوێـژی مـەغریب‌و عیـشاكردن بەجەماعـەت بـەرێكی لەگـەڵ كردنـی دوو ركات سوننەتی دوای مەغریب‌و عیشاو خوێندنی زیكرەكانی دوای ئەم دوو نوێژە. سەعیدی كوڕی موسەییب دەڵێ: (من شهد العشاء من ليلة القدر فقد اخذ بحظه منها) (كتاب الموطأ).

٢- كردنی (١١) ركات شەو نوێژ.

٣- خوێندنی دوو ئایەتی ئاخیری سورەتی (بقرة).

٤- خوێندنی سورەتی (مُلك)و (سجدة) لەم شەوەدا .

٥-گوتنی ئەم دوعایە (اللهم إنَّك،عفوٌ كريم تحبّ العفو فاعْفُ عنّي).

٢- عن عائشة أنَّ رسولَ الله (ﷺ)،، قال تحرَّوْا ليلةَ القدر في الوِتر مِن العشر الأواخر مِن رمضان. رواه البخاري (٢٠١٧).

واتە: بگەڕێن بەدوای (ليلة القدر) لەشەوە تاكەكانی دە شەوی كۆتایی لە رەمەزان دا.

**سوود**:

١- موسـڵمان ئەگـەر دە شـەوی كۆتـایی رەمـەزان خـەریكی عیبـادەت بێت بێ گومان شەوێكیان شەوی قەدرە.

٢- بـا ئەوانـەی مەبەسـتیانە ئـەم شـەوانە زینـدوو بكەنـەوە هـەر لەئێوارەوە خۆ خەریك بكەن بەنوێژو قورئان خوێندن‌و گوێ دانە قورئان‌و زیكر كردن‌و ماڵ بەخشین‌و عیبادەتی تر، باخۆ خەریك نەكەن بەشتی بێ سوودو مەجلیسی بێ كەلك.

٣- شـەوی قـەدر دیـار نییـە كـام شـەوە جـاتۆش هـەوڵ بـدە هـەر دە شەوەكەی كۆتایی رەمەزان زیندوو بكەیەوەو تەركیزیش لەسەر تاكەكانی بكەی.

## پلەو پایەی حەج و عومرە

١-عن ابي هريرة(رضـي الله عنـه) أنَّ رسـول الله(ﷺ) سُئِل: أيُّ العَمَلِ أفضل؟ فقـال: إيمـانٌ بـالله وَرَسـوُله، قيـل: ثُـمَّ مـاذا؟ قـال: الجهـادُ في سـبيل الله، قيـل ثُـمَّ مـاذا؟ قـال: حَـجٌّ مـبرور. **رواه البخاري(٢٦) ومسلم(٨٣).**

**١-حَجّ: لە زمانەوانی دا واتە(قَصْد) جیّ ی مەبەست.**

**٢- مَبْرور: (نووی) لە ریاض الصالحین دا دەڵیّ: هو الذي لا يرتكبُ صاحِبُهُ فيه معصيةً. واتە:(مبرور) ئەو حەجەیە کە خاوەنەکەی هیچ گوناحیّکی تیادا ئەنجام نادات.**

**واتە: پیّغەمبەر (ﷺ)، پرسیاری لیّ کرا چ کردەوەیەك چاکترە؟ فەرمووی: بڕوا هیّنان بەخواو پیّغەمبەرەکەی، گوترا لەپاشان چی تر؟ فەرمووی: جیهاد کردن لەریّی خوادا؟ گوترا: لەپاشان چی تر؟ فەرمووی: حەجیّك کە گوناهی تیادا ناکریّت.**

٢- عـن ابـي هريـرة(رضـي الله عنـه) قـال: سمعـتُ الـنبيَّ(ﷺ) يقولُ: منْ حَجَّ للهِ فَلَمْ يَرفُثْ، ولَمْ يفْسُقْ رجعَ كيومِ ولَدَتْـهُ أُمُّـهُ. **رواه البخاري(١٥٢١) ومسلم(١٣٥٠).**

**واتە: هەر یەکیّك حەج بکات بۆ خوا جا قسەی خراپ نەڵیّت و کاری خراپ نەکات ئەوە دەگەریّتەوە وەك ئەو رۆژەی کە تیّیدا لە دایك بووە.(واتە گوناحی نامیّنن وەك منداڵ کە تازە لە دایك دەبیّ).**

٣- عن عائشة أُمِّ المؤمنين(رضي الله عنها) أنها قالت: قلتُ يا

رسُول الله نـرَى الجهـاد أفـضـل العمَـل أفـلا نجاهـد؟ قـال: لا ولكـنَّ أفضَلَ الجهادِ حَجٌّ مَبرور. رواه البخاري(١٥٢٠).

واتـه: دايكـي ئيمانـداران عائشه(ڕەزای خـوای لـێ بێـت) دەڵـێ: گـوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە جیهاد کردن بە باشترین کردەوە دەبینین جا ئایا جیهاد نەکەین؟ فەرمووی: نەء، بەڵام(بۆ ئێوەی ژنـان) حـەجێك کە گوناهی تیادا نەکرێت باشترین جیهادە.

# پلەو پایەی عومرە کردن

١-عـن ابـي هريـرة(رضـي الله عنـه) أنَّ رسـول الله(ﷺ) قـال: العُمْرةُ إلى العُمرة كفَّارةٌ لما بينهما والحجُّ المبرورُ ليس لَهُ جزاءٌ إلاّ الجنَّةُ. رواه البخاري(١٧٧٣) ومسلم(١٣٤٩).

واته: عومرە هەتا عومرەیەکی تر سڕەرەوەیە بۆ ئەو(گوناحانەی) کە لە نێوانیاندایە حەجێك کە هیچ گوناحێکی تیا ناکرێت جگە لە بەهەشت هیچ پاداشتێکی دیکەی نیە.

**سوود:**

١-(العمـرة): لـە زمـان دا واتـە سـەردان(زيـارة) بـەڵام لـە (شـەرع)دا پێناسـەی بـەم شـێوەیە:(سـەردانی مـاڵی خوایـە بـە ئیحـرام بەسـتن و سووڕانەوە بە دەوری کەعبەداو هاتن و چوون لە نێوان صەفاو مەڕواداو تاشینی سەر یان کورت کردنەوە)

٢- (جميع أيام السنة وقت العمرة إلاّ انها في رمضان أفضلُ منها في غيره)[1] واته: هەموو ڕۆژەکانی ساڵ کاتن بۆ عومرە کردن بەڵام لە مانگی

---

(1) الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز.

ڕەمەزان چاکترە.

کەواتە: عومرە کردن وەکو حەج کردن نی یە کاتێکی دیاری کراوی هەبێت.

٢-عن ابن عباس(رضي الله عنهما) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال:(.... فإِنَّ عُمرةً في رَمضان تقضِي حَجَّةً معي) رواه البخاري(١٨٦٣).

واتە: بێ گومان عومرەیەك كە لە مانگی ڕەمەزان دا بكرێ وەكو كردنی حەجێكە لەگەڵ من دا.

**سوود**:

وەك گوتمان عومرە كردن دەتوانرێ لە هەموو كات بكرێ ساڵ دوانزدەی مانگ بەڵام كردنی عومرە لە مانگی ڕەمەزان خێری زیاترە لە مانگەكانی تر.

## حوكمی حەج و عومرە

١-عن ابن عمر(رضي الله عنهما) قال: قال رسول الله(ﷺ) بُني الإسلامُ على خَمسٍ: شهادةِ أنْ لا اله الاّ الله وأنَّ محمداً رسول الله وإقامِ الصلاةِ وايتاءِ الزَّكاةِ والحجِّ وصومِ رمضان. رواه البخاري(٨) ومسلم(١٦).

واتە: ئیسلام لەسەر پێنج پایان بنیات نراوە: شایەتمان هێنان بەوە كە جگە لە خوا هیچ پەرستراوی بەراستی نی یە وە موحەمەد ڕەوانەكراوی خوایە وە نوێژ كردن و زەكات دان و حەج و ڕۆژوو گرتنی ڕەمەزان.

**سوود**:

زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە حەج یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیسلام.

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: خَطَبَنا رسول الله(ﷺ) فقال: أيُّها الناسُ قَدْ فَرضَ اللهُ عليكمُ الحجَّ فَحُجُّوا فقال رَجلٌ أكُلَّ عامٍ يا رسول الله؟ فسَكَتَ حتى قالها ثلاثاً فقالَ رسول الله(ﷺ) لَوْ قُلْتُ: نَعَمْ. لَوَجَبَتْ ولما استطعتُمْ، ثُمَّ قالَ: ذَروني ما تَرَكْتكُم[1] فإنَّما هَلكَ مَنْ كانَ قبلكُم بكثرةِ سُؤالهم واختلافهم على أنبيائهم فإذا أمَرتُكُم بشيءٍ فأْتوا منهُ ما استطعتُمْ وإذا نَهَيتُكم عن شيءٍ فدَعوه. رواه مسلم(١٣٣٧).

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ووتاری بۆ داین فەرمووی: ئەی خەڵکینە بێگومان خوا حەجی لەسەر پێویست کردوون جا حەج بکەن پیاوێك گوتی ئایا هەموو ساڵێك ئەی پێغەمبەری خوا؟ جا بێ دەنگ بوو تا سێ جاران دووبارەی کردەوە ئەوجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر گوتبام بەڵێ ئەوە هەموو ساڵێك لەسەرتان پێویست دەبوو وە نەشتان دەتوانی، لە پاشان فەرمووی: وازم لێ بێنن بە درێژی ئەو ماوەیەی کە من ئێوە واز لێ دێنم، ئەوانەی پێش ئێوە لە ناوچوون و فەوتان بە هۆی زۆری پرسیار کردنیان وە جیاوازیان لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان جا کاتێك فەرمانم پێ کردن بە شتێك ئەوەندەی لە تواناتان هەیە بیکەن وە ئەگەر نەهیشم لێ کردن لە شتێك وازی لێ بێنن.

---

(1) (ما تركتكم) اي مدة تركي اياكم بغير امر بشيء ولا نهي عن شيء.

**سوود**:

١-خـــوا دەفـــەرمووێ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلاً﴾ (ال عمران:٩٧).

واتە: بۆ خوا لەسەر خەڵكە بچنە خانوو(ی خوا) ئەوانەی کە توانایی ڕۆیشتنیان بۆ ئەوێ هەیە.

٢- (الحجُّ واجبٌ مع العمرةِ مَرَّةً في العمر على كل مسلم بالغٍ، عاقلٍ، حُرّ، مستطيع)[1]. واتە: حەج کردن واجبە لەگەڵ عومرە یەك جار لە تەمەن دا لەسەر هەموو موسڵمانێکی: بالغی، عاقلی، ئازادی، خاوەن توانا.

## پەلەکردن لە حەج کردن دا

١-عن ابن عباس(رضي الله عنهما) عن الفضل(أو أحدهما عن الآخر) قال: من أراد الحجَ فَلْيَتعَجَّلْ فإنَّهُ قدْ يمرضُ المريض وتَضِلُّ الضَّالَّةُ وتعرضُ الحاجةُ. حسن رواه ابن ماجه(٢٨٨٣).

واتە: هەر یەکێك ویستی حەج بکات با پەلە بکات چونکە ئینسان نەخۆش دەبێ و وون بوو بزر دەبێ و پێداویستی دێتە پێش.

**سوود**:

کۆمەڵێك لە زانایان رایان وایە کە ئەو کەسەی حەجی لەسەر واجب دەبێت پێویستە دەست بەجێ بیکات لەوانە(امام احمد، أبوحنيفه، مالك)

(1) الوجيز في فقه السنه والكتاب العزيز/ عبدالعظيم بن بدوي.

وه هەندێكی تر دەڵێن ئەگەر بەكاوەخۆش بێت هەردەبێ و مادام پێش مردن ئەنجامی بدات گوناهبار نابێ لەوانە(امام شافعی، ثوری و اوزاعی).

## دەتوانرێت عومرە پێش حەج بكرێت

عن ابن جريح أنَّ عِكرمة بن خالد سألَ ابن عمر(رضي الله عنهما) عن العمرة قبل الحجِّ فقال: لابأسَ، قال عكرمةُ قال ابن عمر: اعتمرَ النبيُّ(ﷺ) قبل ان يَحُجَّ. رواه البخاري(١٧٧٤).

واتە: (ابن جريح) رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: عیكریمەی كوڕی خالد(رەزای خوای لێ بێت) پرسیاری لە(ابن عمر) كردووە(رەزای خوای لێ بێت) دەربارەی عومرە كردن پێش حەج كردن ئەویش فەرموویەتی: هیچی تیا نی یە عیكریمە دەڵێ(ابن عمر فەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) عومرەی كردووە پێش ئەوەی كە حەج بكات.

## مەرجێكی زیاتر بۆ حەجی ئافرەت

١-عن ابن عباس(رضي الله عنهما) أنَّهُ سمع النبيَّ(ﷺ) يقولُ: لا يَخْلوَنَّ رجُلٌ بامرأةٍ إلاّ ومعَها ذو مَحْرَمٍ ولا تُسافرُ المرأةُ إلاّ مَع ذي مَحرمٍ فقام رَجلٌ فقال: يا رسولَ اللهِ إنَّ امْرأتي خَرَجَت حاجّةً وإنّي اكْتُتِبْتُ في غَزْوةِ كذا وكذا قال: إنطلِقْ فَحُجَّ مَعَ امرأتِك. رواه البخاري(١٨٦٢) ومسلم(١٣١٤).

لا يَخْلوَنَّ: با هەرگیز بە تەنیا لەگەڵی كۆنەبێتەوە.

اكْتُتِبْتُ: ناونووس كرام.

إنطَلِقْ: برۆ.

واته: با هەرگیز هیچ پیاوێکی(بێگانە) لەگەڵ هیچ ئافرەتێکی(بێگانە) بە تەنیا لەگەڵی کۆنەبێتەوە مەگەر ژنەکە خۆیی و مەحرەمی لەگەڵ دا بێت وە با ئافرەتیش سەفەر نەکات مەگەر لەگەڵ مەحرەم و خۆیی دا بێت، پیاوێك هەستاوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا خێزانەکەم بە تەنیا رۆیشتووە بۆ حەج وە منیش ناونوس کراوم بۆ فلان غەزاو فلانە غەزا جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: برۆ لەگەڵ خێزانەکەت حەج بکە.

**سوود**:

ئەگەر ئافرەت موسڵمان بوو بالغ بوو عاقل بوو ئازاد بوو لە توانای دا هەبوو حەج بکات ئەویش وەکو پیاو لەسەری پێویستە حەج بکات بەلام بۆ ئافرەت بە مەرج گیراوە مەرجێکی زیاتر لە پیاوان ئەویش ئەوەیە دەبێ مێردی یان یەکێکی خۆیی(مَحْرَم)ی لەگەڵ دا بێت ئەگەر ئەوە نەبوو ئەوە دەکا لە توانای دا نی یە حەج بکات.

## حەجی منداڵ و بەندە(عَبد)

١-عن ابن عباس(رضي الله عنهما) قال: رَفَعَتِ امرأةٌ صَبياً لها فقالت: يا رسول الله ألِهذا حَجٌّ؟ قالَ: نعم ولَك أجرٌ. رواه مسلم(١٣٣٦).

واتە: ابن عباس(رەزای خوایان لێبێت) دەڵێ: ئافرەتێك منداڵێکی خۆی بەرز کردەوەو(نیشانی پێغەمبەری دا(ﷺ) گوتی ئەی پێغەمبەری خوا ئایا حەج بۆ ئەم منداڵە دەبێ؟ فەرمووی: بەڵێ وە بۆ تۆش پاداشت هەیە.

**سوود**:

١-منداڵ ئەگەر چاكە بكات خێری بۆ دەنوسرێ بەلام ئەگەر كاری خراپی كرد بە گوناح بۆی نانوسرێ.

٢- حەجی منداڵ دورستە و پاداشتی لەسەر وەردەگرێ بەڵام كاتێك كە بلۆغی بوو حەجی لەسەر واجب بوو دەبێ حەجێكی تر بكاتەوە چونكە حەجی یەكەم جێگەی حەجە واجبەكەی دووەم ناگرێتەوە.

٢- عن ابن عباس(رضي الله عنهما) قال: قال النبيُّ(ﷺ) أيّما صبيّ حَجَّ ثُمَّ بَلَغَ فَعَلَيه حَجَّةٌ أُخرى وأيُما عبدٍ حجَّ ثُمَّ عُتِقَ فعليه حجَّة أخرى. حديث صحيح رواه البيهقي(٥/١٥٦).

واتە: هەر منداڵێك حەجی كرد لە پاشان بلۆغی بوو ئەوە لەسەریەتی كە حەجێكی تریش بكاتەوە وە هەر كۆیلەیەك حەجی كرد لە پاشان ئازاد كرا ئەوە لەسەریەتی حەجێكی تر بكاتەوە.

**سوود**:

١-حەج واجب نی یە لەسەر منداڵ و كۆیلە بەڵام ئەگەر حەج بكەن حەجەكەیان دورستە و بەخێر بۆیان دەنوسرێ.

٢- منداڵ و كۆیلە ئەگەر حەجیان كرد ئەوە هەر كاتێك منداڵەكە بلۆغی بوو كۆیلەكەش ئازاد بوو حەجیان لەسەر واجب بوو ئەوە دەبێ دیسان حەج بكەنەوە.

٣- حەج كردن واجب نی یە لەسەر شێت.

## فەزلی نوێژكردن لەمزگەوتی حەرامو مزگەوتی پێغەمبەر

١- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) انَّ النبيَّ(ﷺ) قال: صلاةٌ في

مسجدي هذا خيرٌ مِنْ ألف صلاةٍ فيما سِواهُ إلاّ المسجدَ الحرام. رواه البخاري(١١٩٠) ومسلم(١٣٩٤).

واته: نوێژێك لەو مزگەوتی منە باشترە لە هەزار نوێژ لە شوێنەكانی دیكە جگە لە مزگەوتی حەڕام.

٢- عن جابر(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: صلاةٌ في مسجدي أَفْضَلُ مِنْ ألفِ صَلاةٍ فيما سِواهُ إلاّ المسجِدَ الحرام وصلاةٌ في المسجد الحرامِ أفْضَلُ مِنْ مِئَةِ أَلْفِ صلاةٍ فيما سواهُ. قال المنذري في الترغيب والترهيب: رواه احمد وابن ماجه باسنادين صحيحين.

واته: نوێژێك لە مزگەوتی من باشترە لە هەزار نوێژ لە جگە لەو تەنها مزگەوتی حەرام نەبێت وە نوێژێك لە مزگەوتی حەرام باشترە لە سەت هەزار(١٠٠٠٠٠) نوێژ لە شوێنەكانی دیكە.

# سەفەرکردن بۆ(مسجد الحرام) و
# مزگەوتی پێغەمبەرو نوێژ کردن تیایان دا

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) يَبْلُغُ به النبيَّ(ﷺ) لا تُشَدُّ الرِّحالُ[1][2] إلاَّ إلى ثلاثةِ مساجِدَ: مَسجدي هذا ومَسجِدِ الحَرامِ ومسجِدِ الأقصى. رواه البخاري(١١٨٩) ومسلم(١٣٩٧).

واتە: سەفەر ناكرێ(بۆ هیچ مزگەوتێك بۆ نوێژ تیاكردنی) جگە لە سێ مزگەوت: ئەو مزگەوتەی منە(واتە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە) وە مزگەوتی حەرام وە مزگەوتی ئەقصا(لە قدس).

**سوود**:

١-يجوز للمسلم ان يسافر الى المدينة المنورة للصلاة في المسجد النبوي بل يستحب لأنَّ الصلاة فيه خيرٌ من الف صلاةٍ فيما سواه إلا المسجد الحرام فإنَّ الصلاة فيه بمائةِ ألف صلاةٍ فيما سواه ولا يجوز له ان يسافر الى المدينة من أجل زيارة قبر النبي(ﷺ) او قبور أخرى[3].

واتە: جائزە بۆ موسڵمان كە سەفەر بكات بۆ مەدینە بۆ نوێژكردن لە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵكو سوننەتیشە لەبەر ئەوەی نوێژكردن تێیدا باشترە لە(١٠٠٠) نوێژ لە شوێنەكانی دیكە جگە لە مزگەوتی حەرام نوێژكردن لە مزگەوتی حەرام بە سەت هەزار(١٠٠٠٠٠) نوێژ هەیە كە لە شوێنی دیكەدا بكرێ. وە جائز نی یە موسڵمان سەفەر بكات بۆ مەدینە بۆ سەردانی قەبری پێغەمبەر(ﷺ) یا قەبرەكانی تر.

---

(1) الرحال: جمع رَحل وهو ما يوضع على البعير تحت الراكب.

(2) لا تُشَدُّ الرحال: ئەمە كنایەیە بۆ سەفەر نەكرن.

(3) فتاوى تتعلق بأحكام الحج والعمرة والزيارة من أجابة سماحة الشيخ(ابن باز) واللجنة الدائمة للبحوث العلمية والأفتاء.

## ١) النِّيَّة: مەبەست

زانایان مەبەست(نیە) بۆ دوو شت بەکار دێنن:

یەکەم: جیاکردنەوەی عیبادات، وەك جیاکردنەوەی نوێژی نیوەرۆ لە نیوێژی عەسر یا جیاکردنەوەی عیبادات لە عادات وەك خۆشوشتن بۆ لادانی جەنابەت لە خۆشوشتن بۆ پاکی و خۆ فێنك کردنەوە.

دووەم: جیا کردنەوەی مەبەست لە کردنی کردەوە ئایا کردەوەکە تەنها بۆ خوایە یا مەبەستێکی ترە.

١-عن عمر بن الخطاب(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقولُ: إنَّما الأعمال بالنِّيَّات، وإنَّما لِكُلِّ امرىءٍ ما نَوى. فَمَنْ كانتْ هِجْرَتُه الى دُنيا يُصيبُها، أو إلى امرأةٍ يَنْكحُها، فهِجْرَتُهُ إلى ما هاجَرَ إليه. رواه البخاري(١) ومسلم(١٩٠٧).

١-الأعمال: كۆی(العمل)ە واتە: کردەوە.

٢- النيات: كۆی(النية)ە واتە: مەبەست.

٣- الهجرة: لە زمانەوانی دا واتە: التَّرك، یانی: وازهێنان.

مانای فەرموودەکە: کردەوەو کردنی کردەوە بەو نیازەیە کە لە دڵایە هەموو مرۆڤێ ئەوەی بۆ دەبێت کە مەبەستی بووە جا هەر یەکێك کۆچکردنەکەی بۆ شتێکی دونیایی بێت کە دەستی بکەوێت یا بۆ ئافرەتێك بێت کە مارەی بکات ئەوە کۆچەکەی بۆ ئەو شتەیە کە کۆچی بۆ کردووە.

**سوود**:

١-صەحیحی ئیمام بوخاری(ڕەحمەتی خوای لێ بێت(٧٥٦٣) فەرموودەی تیایە بە دوو بارەوە جا ئەم فەرموودەیە بەم شێوەیەی کە نوسراوە یەکەم فەرموودەیە لە صەحیحی بوخاری دا وە زانایان زۆر بە گرنگ باسی ئەم فەرموودەیان کردووە ئیمام(نووی)یش(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە(ریاض الصالحین) و(اربعین نووی) لە یەکەم فەرموودەدا هێناویەتی.

٢- مەبەستی چاك گوناح لە شوێنی خۆی ناگۆڕێ، گوناح بەهۆی نیەتەوە نابێ بە(طاعة). ئەگەر یەکێك مزگەوتێکی دورست کرد بە ماڵی حەرام مەبەستی پێ خێر بوو ئەمەی بۆ بە خێر نانوسرێ نیەت کاریگەری لەسەر ئەمە نی یە.

٣- ئەو کارانەی کە عیبادەتن ئەگەر بەبێ هیچ نیەت و مەبەستێك کران ئەوە وەکو عادەتیان لێ دێت(العبادة اذا خلت من النية اصبحت عادة) خاوەنەکەی پاداشتی لەسەر وەرناگرێ بەلام ئەگەر عیبادەت بە نیەت و مەبەستێکی خراپ کران وەك رووپامایی(ریاء) ئەوە خاوەنەکەی گوناهبار دەبێت.

٤- ئەو شتانەی کە حەرامن ئەگەر موسڵمان نەیکردن بە بێ هیچ نیەت و مەبەستێك ئەوە پاداشتی لەسەر وەرناگرێ بەلام ئەگەر نەیکرد لەبەر ڕەزامەندی خوا ئەوە پاداشتی لەسەر وەردەگرێ.

٥- (مباح) یان(حلال) یان(جائز) واتە: ڕێگەدراو، ئەوەیە کردن و نەکردنی یەکسان بێ، جا(مباح) وەك: خواردن و نوستن ... هتد، ئەگەر بەبێ هیچ نیەت کران پاداشتی لەسەر وەرناگیرێ بەلام ئەگەر بە مەبەستی

چاك كران پاداشتى لەسەر وەردەگیرى. (المباح بالنية الصالحة يرتفع الى قربة وبالنية الفاسدة يُصبح معصية) واتە: موباح بە هۆى نيەت و مەبەستى باش بەرز دەبێتەوە بۆ نزيك بونەوە لە خوا وە بە هۆى نيەتى خراپ دەبىٚ بە گوناح.

٢- عن ابي مسعودٍ البدريِّ(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قالَ: إنَّ المُسْلِمَ إذا أنْفَقَ على أهله نَفَقَةً وَهُوَ يحتَسبُها كانتْ لَهُ صَدَقَةً. رواه البخاري(٥٣٥١) ومسلم(١٠٠٢).

واتە: بىٚ گومان ئەگەر موسڵمان خەرجيەك خەرج بكات بۆ كەس و كارەكەى مەبەستى پىٚ ى وەدەست هێنانى پاداشت بێت لەلايەن خواوە ئەوە بۆى دەبێت بە مايەى وەرگرتنى ئەجرو پاداشت.

## سوود:

١- لەم فەرموودەيەدا بە روونى دەورى نيەت و مەبەست دەبينين لەو خەرجيەى كە موسڵمان دەيكات لە كەس و كارەكەى ئەگەر موسڵمان پارەو ماڵێكى زۆريش سەرف بكات بۆ ماڵو منداڵەكانى بەلاّم مەبەستى پىٚ رەزامەندى و پاداشتى خودا نەبوو بۆى بەخێر نانوسرىٚ.

بۆيە يەحياى كوڕى كثير(رەحمەتى خواى لىٚ بێت) دەڵىٚ: تعَلَّمُوا النِّيَّةَ فإنَّها أبْلَغُ مِنَ العَمَل. واتە: فێرى نيەت و مەبەست بن، نيەت و مەبەست گرنگترە لە كردەوە.

٢- عبدالله كوڕى موبارەك(رەحمەتى خواى لىٚ بێت) دەڵىٚ: (لا يَقَعُ مَوقِعَ الكسب على العيال شيءٌ ولا الجهاد في سبيل الله عز وجَلَّ).

واتە: هيچ شتێك خێرى وەكو كاسبى نى يە بۆ كەس و كار تاوەكو جيهاد كردنيش لە رێگاى خواى(عزَّ وجلَّ).

٣- كاتێك موسڵمان مەسرەف لە كەس و كارەكەی دەكات ئەگەر بە مەبەستی رەزامەندی خوا سەرفی نەكات خێری ناگاتێ نیەتیش ئەوە نییە بە زمان بڵێی ئەوە ئەو شتە بۆ كەس و كارەكەم لە پێناوی خوا، بەڵكو نیەت لە ناخی دڵ و دەروونەوە هەڵدەقوڵێ.

٣- عن أنس(رضـي الله عنـه) رجَـعَ مـنْ غَـزوَة تَبـوك فَـدنا مـن المدينة فقال: إنَّ بالمدينة أقواماً ما سِرْتُمْ مَسيراً ولا قَطعتُمْ وادياً إلاّ كـانوا مَعَكُـمْ قـالوا: يـا رسـول الله وهـم بالمدينـة؟ قـال: وهـم بالمدينة حَبَسَهمُ العُذرُ. رواه البخاري(٤٤٢٣).

دَنا: نزيك بۆوە.

ماناى فەرموودەكە: ئەنەسی كوری مالیك(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبـەر(ﷺ) گەرایـەوە لـە غـەزای تـەبوك نزیـك بـۆوە لـە شـاری مەدینـە فەرمووی: بێ گومان كەسانێك لە مەدینە هەن هـەر رۆیـشتنێك رۆیـشتبن وە هەر دۆڵێكتان بریبێ ئەوانیشتان لەگەڵ دا بوونە(لە پاداشـت) گوتیـان ئـەی پێغەمبەری خوا ئەوان لە مەدینە بوینە؟ فەرمووی: ئەوان لە مەدینە بووینـە بەڵام عوزر حەپسی كردوون(كە دەرنەچووینە لەگەڵمان).

**سوود**:

لەم فەرموودە چاكەی نیەت دەبینرێ بۆ خێر ئەم ئەصحابانە نیەتیان وا بووە كە بەشدار بن لەم غەزایە بەلام عوزر رێ ی گرتوون خوای گەورە بە هۆی نیەتەكەیانەوە پاداشتی وەكو ئەوان بۆ نوسیون كە بەشدار بووینـە لەم غەزایە.

٤- عن ابن عباس(رضي الله عنهما) عن رسول الله(ﷺ) فيما يَروي عن رَبِّه تبارك وتعالى قال: قال: إن الله كتبَ الحسَناتِ والسَّيِّئاتِ، ثُمَّ بَيَّنَ ذلكَ فَمَنْ هَمَّ بِحَسنَةٍ فَلَمْ يَعمَلْها كتبها الله تبارك وتعالى عندهُ حَسَنَةً كامِلَةً وإنْ هَمَّ بِها فَعمِلَها كَتَبَها اللهُ عزَّ وجَلَّ لَهُ عِندهُ عَشْرَ حَسَناتٍ الى سَبْعِ مائَةِ ضِعْفٍ الى أضعافٍ كثيرة وإنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعملها كتَبها اللهُ عندهُ حَسَنةً كاملةً وإن هَمَّ بِها فَعمِلَها كتبَها الله سيِّئَةً واحدة. رواه البخاري(٦٤٩١) ومسلم(١٣١).

واته: ابن عباس(رەزای خوای لێ بێت) له پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە لەو فەرموودە قودسیانەی پێغەمبەر(ﷺ) له پەروەردگاری(تبارك وتعالى) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: بێ گومان خودا هەموو چاکەو خراپەیەکی نوسیووە لە پاشان روونی کردۆتەوە جا هەر یەکێك ویستی چاکەیەك بکات جا نەیکرد خودا(تبارك وتعالى) لای خۆی بە چاکەیەکی تەواو بۆی دەنوسێ وە ئەگەر ویستی کارە چاکەکە بکات وە کردیشی ئەوە خودا(عز وجَلَّ) لای خۆی بەدە چاکە تا حەوسەد چاکە تا ئەوەندەی خودا خۆی بیەوێ چاکەی بۆ دەنوسێ وە ئەگەر ویستی خراپەیەك بکات بەلاَم لە ترسی خوا نەیکرد خودا لای خۆی چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنوسێ وە ئەگەر ویستی خراپەیەك بکات و وە کردیشی ئەوە خودا یەك خراپەی لەسەر دەنوسێ.

**سوود:**

١-(عُثیمین) له شەرحی(ریاض الصالحین) دا دەڵێ: (اذا نوي الانسان الشَرَّ وعَمِلَ العملَ الذي يوصِلُ الى الشَرِّ ولكنه عجزَ عنه فإنَّهُ يكتب عليه

إثم الفاعل).

واتـه: ئەگـەر ئينسان نيـەتی هێنا خراپەيـەك بكات وە ئـەو كارانەشـی كرد كە دەيگەيەننـە ئـەو خراپەيـە بـەڵام نـەيتوانی ئـەم خراپەيە بكات ئـەوە گوناهی كردنی ئەم كارەی لەسەر دەنوسرێ.

٥- عن أبي هريرة(رضـي الله عنـه) أنَّ رسـول الله(ﷺ) قـال: مَـنِ اتَّبَعَ جَنازَةَ مُسْلِمٍ إيمانـاً واحْتِسـاباً وكـانَ مَعَـهُ حتـى يُـصَلَّى عَلَيهـا ويُفرَغَ مِن دَفْنِها فإِنَّهُ يَرْجِعُ بقيراطٍ. رواه البخاري(٤٧).

واتـە: هـەر كەسـێك شـوێنی تـەرمی موسـڵمانێك بكـەوێ بـە ئيمـان و بـاوەڕەوە وە بـۆ وەدەسـت هێنـانی پاداشـت لـە خـودا وە لـە گـەڵيا بێـت تـا نوێژی لەسەر دەكرێ و لە ناشتنی دەبنـەوە ئـەوە بـە دوو قيراط پاداشـتەوە دەگەڕێتەوە هـەر قيراطـەك بە قـەد چيای ئوحـود دەبێـت وە هـەر يـەكێك كە نوێـژی لەسـەر كرد لـە پاشـان گـەراوە پـێش ئـەوەی بشاردرێتەوە ئـەوە بـە يەك(قيراط) دەگەڕێتەوە.

## سوود:

لـە پێشەوە گوتمـان هـەر كـارێكی خێـر ئەگـەر كـرا بـەبێ هـيچ نيـەتێك ئـەوە وەكـو عـادەتی لـێ دێـت، خاوەنەكـەی پاداشـتی لەسـەر وەرنـاگرێ لێرەش دا ئەگەر ئينسانی موسڵمان كاتێك كە شوێنی تـەرمی موسـڵمانيك دەكەوێ بۆ ئەوەی پاداشتی لەسەر بدرێتەوە دەبێ لەم كـارەی دا مەبەسـتی ڕەزامەندی خوا بێت.

٦- عن أبي بكرة(رضـي الله عنـه) قـال: سمعـتُ رسـول الله(ﷺ) يقـول: إذا الْتَقَـى المُـسلِمانِ بِـسَيفَيهِما فَالْقاتِـلُ والمَقْتُـولُ في النـارِ. فقُلـتُ: يـا رسـول الله هـذا القاتِـلُ فمـا بـالُ المقتـولِ؟ قـالَ: إنَّـهُ كـان

حريصاً على قَتلِ صاحبه. رواه البخاري(٣١) ومسلم(٢٨٨٨).

واتـه: ئەگـەر دوو موسـڵمان بەيـەك گەيـشتن بـە شـيرەكانيانەوە ئـەوە كوژەرو كوژراو هەردووكيان جێگـەيان دۆزەخە گوتم ئەی پێغەمبـەری خـوا ئەوە بكوژە ئەی كوژراوەكە گوناحی چی يە؟ فەرمووی: ئەويش سوور بوو لەسەر كوشتنی براكەی.

٧- عـن ابـي هريـرة(رضـي الله عنـه) قـال: قـال الـنبيُّ(ﷺ) مَـنْ توضَّأَ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ ثُمَّ راحَ فوجَد الناسَ قد صَلُّوا أعطاهُ الله عَـزَّ وجَلَّ مثل أجرِ مَنْ صلاها وَحَضَرَها لا ينقصُ من أجرهم شيئاً. صحيح رواه ابوداود(٥٦٤).

واتـه: هـەر يـەكێك دەست نوێـژێكی جـوان بشوات لـە پاشـان بـچێ(بۆ نوێژی جەماعەت) بينـی خـەڵك نوێـژيان كردووە، خـوا(عز وجل) پاداشـتی وەكو ئەوانە پێ دەدات كە نوێژيان بە كۆمەڵ كردووەو ئامادەی بوينە ئەوە هيچ پاداشتێكيش لە پاداشتی ئەوان كەم ناكات.

٨- عن أبـي الـدَّرداء(رضـي الله عنـه) يبلُغ بـه الـنبيَّ(ﷺ) قـال: مَنْ أَتى فراشَهُ وهو ينـوى أن يقـوم يُصَلِّي مـن الليـلِ فَغَلَبَتْـهُ عينـاهُ حتى أَصبحَ كُتبَ لَهُ ما نوى وكان نومُهُ صدَقَةً علية من رَبِّهِ[1].

واته: هـەر يـەكێك چووە سەر جێگا نيـەتی هێنا كە هەڵبستێ و نوێژ بكـات لـە شـەودا بـەڵام تـا بـەيانی بەخەبـەر نـەهات ئـەوەی كـە نيـەتی بـۆ هێنـابوو بـۆی دەنوسـرێ وە نوستنەكەشـی بـۆ بـەخێر دەنوسـرێ لـە لايـەن پەروەردگاری يەوە.

---

(1) قال المنذري في الترغيب والترهيب: رواه النسائي وابن ماجة باسناد جيد ورواه ابن حبان في صحيحه من حديث ابي ذر وأبي الدرداء على شك.

## ٢) الاخلاص: نیازپاكی

پێناسەی (إخلاص):

الإخلاص: تصْفِيَةُ العَمَلِ من كُلِّ شَوْبٍ(١).

واتە: إخلاص: بریتی یە لە پاك كردنەوەی كردەوە لە هەموو خڵتەیەك.

وقيل: الاخلاص: هو افراد الله عزّ وجلّ بالقصد في الطاعات.

واتە: وە گوتراوە: نیازپاكی(اخلاص) بریتی یە لە تەنها خوا مەبەست بوون لە طاعات و عبادات.

١-عن أبي أُمامة(رضي الله عنه) قال: جاءَ رجلٌ فقال يا رسول الله أرأيت رجلاً غزا يَلتَمسُ الأجرَ والذكر مالهُ؟ قال(ﷺ) لاشيء لَهُ فأعادها ثلاثاً كُلُّ ذلك يقول: لاشيءَ لَهُ، ثم قال رسول الله(ﷺ) إنَّ الله لا يقبلُ مِن العمل إلاّ ما كان لَهُ خالصاً وابْتُغِي بِهِ وَجْهُهُ. رواه ابو داود والنسائي بإسناد جيد.

أرايت: اخبرني، خەبەرم پیٚ بدە.

واتە: ئەبو ئومامە(رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: پیاویٚك هات گوتی: ئەی پیٚغەمبەری خوا پیٚم بڵیٚ: ئەگەر پیاویٚك غەزای كرد مەبەستی پاداشت و ناووبانگ بوو چی بۆ هەیە؟ پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هیچی بۆ نی یە پیاوەكە سیٚ جار ئەمەی دووبارە كردەوە، پیٚغەمبەر(ﷺ) هەموو جاریٚ دەیفەرموو: هیچی بۆ نی یە، لە پاشان پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بیٚ گومان خوا هیچ

---

(1) مدارج السالكين ج٢ ص٩٣، ئەم پیٚناسەیە ئی خاوەنی(منازل السائرين) كە(ابن قيم) لە(مدارج السالكين) شەرحی كردووە.

کردەوەیەك وەرناگریٚ تەنها ئەوانە نەبن پاك بۆ خوان و مەبەست بە کردنی ڕەزامەندی خوا بووە[1].

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) قال الله تبارك وتعالى: أنا أغنى الشركاء عن الشِّرك من عَمِلَ عملاً أشرك فيهِ مَعي غَيري تركتُهُ وشِرْكهُ. رواه مسلم(٢٩٨٥).

١-انا اغنى الشركاء عن الشرك: من لە هەموو کەسیٚ زیاتر بیٚ نیازم بە شەریك و هاوبەش.

واتە: پیٚغەمبەر(ﷺ) دەفەرموویٚت: خوا(تبارك وتعالى) دەفەرمویٚ: من لە هەموو کەسیٚ زیاتر بیٚ نیازم بەشەریك و هاوبەش جا هەر کەسیٚك کاریٚك بکات و کەسیٚکی تر بکات بە هاوبەش تیٚیدا لەگەڵمدا ئەوا خۆی و هاوبەش دانانەکەی واز لیٚ دەهیٚنم.

**سوود**:

١-قال الجنيد: إنَّ لِلهِ عِباداً عَقَلَوا فَلَمَّا عَقَلَوا عَمِلوا، فلما عَمِلُوا اخلصوا، فاسْتَدعاهُمُ الإخلاصُ إلى ابواب البِرِّ أَجمع[2].

واتە: شیٚخ جونەیدی بەغدادی دەڵیٚ: کۆمەڵیٚك لە بەندەکانی خوا تیٚگەیشتن، کاتیٚك تیٚگەیشتن کاریان کرد کاتیٚك کە کردەوەیان کرد بە اخلاصەوە کردیان، جا(اخلاص) بانگی کردن بۆ هەموو دەرگاکانی چاکە.

---

(1) بۆ زیاتر شارەزا بوون لەم فەرموودە تەماشای(سوود) بکە لە دوای ئەم فەرموودەیە لە بەشی(جیهاد)دا لە ژیٚر ناونیشانی(إخلاص لە جیهاد کردن دا).

(2) وقاية الانسان من الجن والشيطان. وحيد عبدالسلام.

٢- سأل الأمامَ الغزاليَّ بَعضُ أَصحابهِ قُبيل مَوتهِ: أَوصني، فقال: عليكَ بالأخلاصِ ولَم يَزَلْ يُكَرِّرُها حتّى ماتَ.

واتە: یەكێك لە هاورێكانی ئیمام غەزالی پێش مردنی غەزالی پیّ ی گوت ئامۆژگاریم بكە غەزالیش گوتی: اخلاصت هەبی لە كارەكانت غەزالی هەر ئەوەی دووبارە دەكردەوە تا وەفاتی كرد(رەحمەتی خوای لیّ بێت).

٣- قال ایوب: تَخْلیصُ النِّیاتِ علی العمَّال اشَدُّ علیهم مِن جَمیعِ الأعمالِ[1].

واتە: (أیوب) دەڵیّ: پاك كردنی مەبەستەكان لەسەر كاركەران ناخۆش ترە لەسەریان لە هەموو كارەكان.

## ٣) ریاء: رووپامایی

### پێناسەی(ریاء و سُمْعة)

١-(ابن حَجَر العَسقلاني) لە(فتح الباری) لە(باب الریاء والسمعة)دا دەڵیّ: (الرِّیاء: وهو مشتق من الرؤیة، والمراد به اظهار العبادة لقصد رؤیة الناس لها فیحمدوا صاحبها، والسُّمْعَة: من سمع والمراد بها نحو ما في الریاء لكنها تتعلق بحاسة السمع والریاء بحاسة البصر).

واتە: ریاء لە بینین(الرؤیة) وەرگیراوە، مەبەست پیّ ی ئاشكراكردنی عیبادەتە بە مەبەستی ئەوەی ببینن و باسی خاوەنەكەی بكەن بە باشە بەلاّم(سُمْعَة) لە(سمع) وەرگیراوە مەبەست پیّ ی وەكو ریایە بەلاّم سمعە بەستراوە بە هەستی بیستن وە ریاء بە هەستی بینین.

٢- (ابن حجر) هەر لەم بابەدا دەڵیّ: (قال الغزالی: المعنی طلب المنزلة في قلوب الناس بأن یریهم الخصالَ المحمودة، والمراد هو العامل).

---

(1) البحر الرائق في الزهد والرقائق

واته: ریاء بریتی یه لەوەی کە ریاکەرەکە کاری چاکی نیشانی خەڵکان بدات بۆ ئەوەی پلەو پایە لە دڵیان دا دورست بکات.

١-عن شداد بن أوس(رضي الله عنه) قال: كُنّا نَعُدُّ الرِّياء على عهد رسول الله(ﷺ) الشّرك الأَصغر[1].

واتە: شیدادی کوڕی ئەوس(رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: ئیٚمە لە زەمانی پیٚغەمبەر دا(ﷺ) ریامان بە هاوبەش دانانی گچکە دادەنا.

**سوود**:

قال العلماء: الشِّركُ اكبرُ من الكبائِر ولو كان أَصغرَ.

واتە: هاوبەش دانان(شرك) گەورەترە لە گوناهە گەورەكان ئەگەر شیركی گچكەش بیٚت.

٢- عن محمود بن لبيد(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: إنَّ أخوَف ما أخافُ عليكم الشِّركُ الأصغرُ قالوا وما الشّرك الأصغرُ يا رسول الله؟ قال: الرِّياءُ، يقول الله عَزَّ وجلَّ اذا جَزَى الناسَ بأعمالهم: اذهبوا الى الذين كنتم تَراءُ ونَ في الدنيا فانظروا هل تجدون عندهم جزاءً. قال المنذري: رواه أحمد بسناد جيد وصححه الالباني.

واتە: ئەوەی لە هەموو شتیٚك زیاتر لیٚ ی دەترسم تووشی بیٚن شیركی گچكەیە، گوتیان شیركی گچكە چی یە ئەی پیٚغەمبەری خوا؟ فەرمووی:

---

(1) رواه ابن أبي الدنيا في كتاب الاخلاص وابن جرير في التهذيب والطبراني والحاكم وصححه، قال الهيثمي في(المجمع) ٢٢٢/١٠ رجاله رجال الصحيح غير يعلي بن شداد وهو ثقة.

رووپامایی(ریاء) خوا عز وجلَّ دەفەرمووێ لەو کاتەی کە تۆڵەو پاداشتی خەڵکی داوە لەسەر کردەوەکانیان، بڕۆنە لای ئەوانەی ریاتان بۆ کردونە تەماشا بکەن ئایا هیچ پاداشتێکتان لای ئەوان دەست دەکەوێ.

٣-عن أبيَ هريرة (رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسولَ الله (صلى الله عليه وسلم) يقول: (إنَّ أوَّلَ الناس يُقضى يوم القيامة عليه رجل استشهدَ، فَأُتِيَ بهِ، فَعَرَّفَهُ نعمته، فعرفها، قال: فما عملت فيها؟ قال: قاتلت فيك حتى استُشهدتُ، قال كذبت، ولكنكَ قاتلت لأَن يُقال جريٌ! فقد قِيلَ، ثمَّ امر به، فَسُحِبَ على وجهه حتى أُلقي في النار.

ورجلٌ تعلمَ العلم وعملَهُ، وقرأ القرآن، فَأُتِيَ بِهِ، فعرَّفَهُ نِعمه فعرفها، قال: فما عملت فيها؟ قال: تعلمت العلم وعلمتهُ، وقرأتُ فيك القرآن، قال: كذبتَ، ولكنك تعلمت ليقال: عالم، وقرأت القرآن ليقال هو قاريءٌ! فقد قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بهِ، فسحب على وجهه حتى أُلقي في النار.

ورجل وسَّعَ الله عليه، وأعطاهُ من أصناف المال، فأُتِيَ بِهِ فعرفَهُ نِعَمَهُ، فعرفها، فال: فما عملت فيها؟ قال: ماتركت من سبيل تحبُّ أن يُنفَقَ فيها إلاّ أنفقتُ فيها لك، قال: كذبت، ولكنّك فعلت ليقال: هو جوادٌ! فقد قِيلَ، ثُمَّ أُمر بِهِ فَسُحبَ على وجهه ثمَّ أُلقِيَ في النار. رواه مسلم.

فَأُتِيَ به: (جاءت به الملائكة يوم القيامة) فریشتە دەیهێنن لەقیامەت.

جريء: ئازا.

جواد: سەخی.

واتـە: یەکـەم کـەس کـە لـەرۆژی قیامەتـدا مەحکەمـە دەکـرێ و حـوکم دەدرێ پیاوێکە شەهیدکراوە، دەیهێنن، خودا چاکەکانی خۆی یەکە یەکە بیردەخاتەوە ئەویش یەك بەیەك دەیانناسێتەوە.

جـا خـوا دەفـەرموێ: لـەجیاتی ئـەو چاکانە تـۆ چـی کـارێکی باشـت کردووە؟

دەڵێـت: لـەپێناوی تـۆدا جـەنگاوم هـەتا شـەهید کـراوم، دەفـەرموێت: درۆت کرد، بەڵکو بۆئەوە جەنگاویت کە بڵێن ئازایە، وە ئەمەش گوترا.

پاشـان فـەرمان دەکرێـت لەسـەر روو رادەکێشرێت هـەتا فڕێ دەدرێتـە ئاگری دۆزەخەوە.

وە پیاوێــك فێــری زانیــاری بــووەو خــەڵکی فێــر کــردووەو قورئــانی خوێنــدووە دەیهێــنن، خــودا چــاکەکانی دەخاتــەوە بــیری ئــەویش دەیانناسێتەوە.

دەفەرمووێت: تۆ لەجیاتی ئەمانە چی کارێکی باشت کردووە!

دەڵێـت: زانـست فێربـووم و خەڵکیـشم فێرکـردو لەبـەر ڕەزامەنـدی تـۆ قورئانم خوێند.

خوا دەفەرمووێ: درۆت کرد، بەڵکو تۆ بۆیە فێری زانین بووی تا بڵێن زانایـە، وە بۆیـە قورئانیـشت خوێنـدووە تـا بڵـێن قورئـان خوێنـە، وە ئـەم قسەش گوترا.

پاشــان فــەرمان دەکرێــت و لەســەر رووی رادەکێـشرێت هــەتا فــڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

وە پیاوێـك کـە خـودا لـەدونیادا داراو دەوڵەمەنـدی کـردووەو لەهـەموو

چەشنەماڵێکی پێ داوە، دەیهێنن، خودا چاکەکانی خۆی وەبیر دەخاتەوە ئەویش دەیانناسێتەوە.

خودا دەفەرمووێت: چیت پێ کردن.

دەڵێت: هیچ ڕێگەیەکم نەهێشتەوە کەتۆ پێت خۆش بێت تیایدا ببەخشرێتەوە، ئیللا بەخشیمەتەوە تیایدا لەبەر تۆ، خودا دەفەرمووێت: درۆت کرد، بەڵکو بۆیە وات کرد تا بڵێن سەخییە، وە ئەم قسەیەش گوترا.

پاشان فەرمان دەدرێت و لەسەر رووی رادەکێشرێت و فڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە

٤- عن أبي موسى الأشعري (رضي الله عنه) قال: سُئِلَ رسول الله(ﷺ) عن الرَّجلِ يُقاتلُ شجاعةً ويُقاتلُ حَمِيَّةً ويُقاتلُ رياءً أيُّ ذلك في سبيل الله؟ فقال رسول الله(ﷺ) مَنْ قاتَلَ لِتكونَ كلمةُ الله هيَ العُليا فهو في سبيل الله. رواه البخاري(٧٤٥٨) ومسلم(١٩٠٤).

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێ کرا دەربارەی پیاوێك شەر دەکات بۆ ئەوەی خەڵك پێ ی بڵێن ئازایە وە شەر دەکات بۆ پاراستنی تیرەکەی وە شەر دەکات بۆ رووپامایی(ریاء) ئایا ئەمانە کامیان لە رێ ی خوایە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەر یەکێك شەر بکات بۆ بەرز کردنەوەی ووشەی(الله) ئەوە لە رێ ی خوایە.

# چەند روونكردنەوەیەك دەربارەی ریا

(عثيمين) لە شەرحی كتاب التوحيد لە باسی(باب ما جاء في الرياء) دا دەڵێ:

١-ئەگەر یەكێك هەر لە بنەرەت دا لە كردنی كارەكەی مەبەستی ریا بوو مەبەستی رەزامەندی خوا نەبوو ئەوە شیركەو عیبادەتەكەی لێ وەرناگیرێ.

٢- ئەگەر كارێكی كرد لە سەرتادا مەبەستی رەزامەندی خوا بوو بەڵام لە درێژەی كارەكەی لە ناوەوەی كارەكەی دا تووشی ریا بوو ئەوە ئەگەر كۆتایی كارەكەی نەبەسترابێتەوە بە سەرتاكەی ئەو كاتە ئەوەی سەرتاكەی كە بەبێ ریا كردوویەتی راستە بەڵام كۆتاییەكەی ناڕەوا(باطل)ە بۆ نمونە یەكێك(١٠٠٠) دیناری داناوە بۆ خێرو بەخشین(٥٠٠) دیناری بەخشی لەبەر رەزامەندی خوا بەڵام پاشان(٥٠٠) دینارەكەی تری بە ریا بەخشی ئەو(٥٠٠) دینارەی یەكەمی راستە بەڵام ئی دووەمی ناڕەوایە.

بەڵام ئەگەر یەكێك دوو ركات نوێژی كرد لەسەرتاكەی مەبەستی رەزامەندی خوا بوو بەڵام لە كۆتاییەكەی مەبەستی ریا بوو لە نوێژەكەیدا ئەوە هەموو نوێژەكەی بەتاڵە چونكە نوێژەكە بەش بەش نابێت و هەندێكی پەیوەندی بە هەندێكی ترەوە هەیە.

٣- ئەگەر یەكێك عیبادەتەكی كرد رووبەروو بۆوە لەگەڵ ریادا ئەگەر پێ ی ناخۆش بوو نەی هێشت ریایەكە جێگیر بێت لە دڵ و دەروونی دا پاڵی پێوەنا ئەوە عیبادەكەی راستە.

٤- (ما يطرأ بعد انتهاء العبادة فإنَّهُ لا يؤثر عليها شيئاً اللهم أن يكون فيه عدوان كالمنّ والأذى بالصدَقة).

واتە: ئەوەی لە دوای تەواو كردنی عیبادەكە دێتە پێش ئەوە هیچ

کاریگەریەکی نی یە لەسەر عیبادەکە مەگەر یەکێك ستەم بکات وەك ئەوە یەکێك کە خێری کردووە منەت لەسەر بەرامبەرەکەی بکات یا ئازاری بدات ئەوە خێرەکەی پووچەڵ دەبێتەوە.

٥- وليس من الرياء أن يفرح الإنسان بعلم الناس بعبادته لأنَّ هذا إنَّما طرأ بعد الفراغ من العبادة.

واتە: ئەمە ناچێتە بابی ریاو رووپامایی ئەگەر موسڵمان دڵی خۆش بوو لە دوای تەواو کردنی عیبادەکەی بەوەی کە خەڵك پێیان زانیوە.

٦- وە ئەمەش ناچێتە بابی رووپامایییەوە ئەگەر ئینسان دڵ خۆش بێت بە کردنی کاری خێرو چاکە چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ(من سَرَّتهُ حَسَنَتهُ وساءَتْهُ سيِّئتهُ فذلك المؤمن)[1].

واتە: هەر یەکێك چاکەکانی دڵخۆشی دەکرد وە خراپەکانی نارەحەتی دەکرد ئەوە ئیماندارە.

## چارەسەری بۆ خۆپاراستن لە ریاء

١-یەکێك لەو دەرمانە بەسودانەی بۆ خۆپاراستن لە(ریاء) شاردنەوەی عیبادەتەکانە، هیچ دەرمانێك نی یە بۆ خۆپاراستن لە(ریاء) وەکو شاردنەوەی عیبادەتەکان جا ئەمە لەسەرەتاوە هەندێك زەحمەتە بەلاّم ئەگەر ئارامی لەسەر گرت ئاسان دەبێت.

٢- إنسان کاتێك ریا دەکات بۆ ئەوەیە کە پلەو پایەی لە دڵی خەڵکان دورست بکات بەلاّم ئەوەی ئاشکرایە موسڵمان بە هۆی گوناح و خراپەوە لە پلەو پایەی دادەبەزێ جا موسڵمان لەمە بەهەڵەدا چووە ئەگەر واتێ

---

(1) رواه الترمذي(٢١٦٥) وصححه الالباني.

گەیشتبێ کە بە هۆی ریابازیەوە بەرز دەبێتەوە.

(ابن عباس) رەزای خوای لێ بێت دەڵێ: إنَّ لِلحَسَنَةِ: ضياءً في الوجه، ونوراً في القلب وقوةً في البدن، وسعة في الرزق، ومَحَبَّةً في قلوب الخلق، وإنَّ لِلسَّيئةِ: سواداً في الوجه، وظلمة في القلب، وَوَهْناً في البدن، ونقصاً في الرزق، وبغضة في قلوب الخلق)[1].

واتە: چاکە کردن دەبێتە هۆی: رووناکیەك بۆ روو و نورێك بۆ دڵ و هێزێك بۆ جەستەو فراوانیەت بۆ رۆزی و خۆشەویستیەك لە دڵی دورست کراوان. وە خراپە کردن دەبێتە هۆی: رەشاتیەك بۆ روو و تاریکاییەك بۆ دڵ و بێهێزییەك بۆ جەستەو کەم بونێك لە رۆزی و توورەیی یەك لە دڵی دورست کراوەکان.

٣- شارەزا بوون لە بابەتی ریاو رووپامایی شارەزا بوون لە گوناح و سزای ئەو کەسانەی کە ریا دەکەن چییە ئومید وایە کە کاریگەری هەبێت بۆ خۆپاراستن لە ریاکاری.

---

(1) الجواب الكافي لمن سأل عن الدَّواء الشافي- ابن القيم

# شادمانی خوا به تەوبەی بەندەی و مەرجەکانی تەوبە

١-عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) اللّه أفرحُ بتوبَةِ عبْدِهِ منْ أحَدِكُم سَقطَ على بعيره وقدْ أضلَّهُ في أرضٍ فلاةٍ. رواه البخاري(٦٣٠٩) ومسلم(٢٧٤٧).

واتە: خودا شادمان ترە بە تۆبەی بەندەی خۆی لە یەکێکتان کە لە بیابانێکدا حوشترەکەی بزر کردووە لەناکاو دەیدۆزێتەوە.

## سوود:

١-إمام نووی لە سەرەتای(باب التوبة) لە(ریاض الصالحین) دا دەڵێ:

قال العلماء: التوبة واجبة من كل ذنبٍ، فإن كانت المعصية بين العبد وبين الله تعالى لا تتعلق بِحَقِّ آدميٍّ فلها ثلاثة شروط:

أحَدُها: أنْ يُقْلِعَ عَنْ المعصية.

والثاني: أن يَنْدَمَ على فِعْلِها.

والثالث: أن يَعْزِمَ أنْ لا يَعُودَ إليها أبداً.

فإنْ فُقِدَ أحَدُ الثلاثةِ لَمْ تَصِحَّ تَوْبَتُهُ، وإن كانت المَعْصيةُ تَتَعلَّقُ بآدَمِيٍّ فَشُرُوطُها اربعة: هذهِ الثلاثة وأنْ يَبرَأَ مِنْ حَقِّ صَاحِبِها، ويجبُ أنْ يَتُوبَ مِن جميع الذنوب فإن تابَ مِنْ بعضها صَحَّتْ توبتُهُ عند أهل الحق من ذلك الذنب وبقِيَ عليه الباقي.

واتە: زانایان دەڵێن: تۆبە واجب و پێویستە لە هەموو گوناحێك،

ئەگەر گوناحەکە لە نێوانی بەندەو لە نێوانی خوای بەرزدا بوو پەوەندی نەبوو بە مافی ئادەمیزادەوە ئەو کاتە تەوبەکە سێ مەرجی هەیە:

یەکەم: دەست بەجێ واز لە گوناحەکان بێنێ.

دووەم: لە کردنی گوناحەکان پەشیمان بێتەوە.

سێ یەم: بڕیار بدا کە ئیتر هەتا هەتایە نەیانکاتەوە.

جا ئەگەر یەکێك لەم سێ مەرجە نەبوو ئەوە تۆبەکەی دورست نی یەو دانامەزرێ، بەڵام ئەگەر گوناحەکە پەیوەندی بە ئادەمیزادیشەوە هەبوو ئەوە مەرجەکانی تەوبەکە دەبێ بە چوار مەرج، ئەو سێیەی باس کرا، چوارەمیشیان ئەوەیە خۆی پاك بکاتەوە لە مافی خاوەنەکەشی، وە واجب و پێویستە کە تۆبە بکرێت لە هەموو گوناهەکان بەگچکەو گەورەکانیەوە جا ئەگەر تۆبەی کرد لە هەندێ لەو گوناهانەی کە کردوونی ئەوە تەوبەکەی دورستە لای ئەهلی حەق لەو گوناهانە وە ئەو گوناهانەشی لەسەر دەمێنن کە تۆبەی لێ نەکردوون.

(ابن تیمیە) رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: (وتصح التوبة من ذنبٍ مع إصراره على آخر عند السَّلف والخلف) واتە: تەوبە دورستە لە گوناهێك لەگەڵ بەردەوام بوونی لەسەر گوناهی تر لە لای زانایانی پێشین و پاشین.

٢- لەم فەرموودە باسی شادمانی(فرح) کراوە بۆ خودا، لەگەڵ ئەوەش دا نەفەرمانبەری گوێڕایەڵان سوودی پێ دەگەیەنێ نە سەرپێچی سەر پێچیکارانیش زیانی پێ دەگەیەنێ کەواتە ئێمەش دەڵێن شادمانی(الفرح) سیفەتێکی خودایە بەو شێوەی کە لە زاتی ئەو دەوەشێتەوە.

٣- موسڵمان دەگونجێ داوای لێخۆشبوون (إستغفار) بکات لەخوا لەگەڵ ئەوەی گوناهیشی هەن‌و تەوبەی لێ نەکردوون.

# تەوبە گوناهەکان دەسرێتەوە

١-عن ابي عبيدة بن عبدالله عن ابيه قال: قال رسولُ الله(ﷺ): التَّائِبُ مِن الذَّنب كمنْ لا ذنب لهُ. حسن رواه ابن ماجه(٤٢٥٠).

واتە:ئەو کەسەی تەوبە دەکات لەگوناح وەکو کەسێکە کە گوناهی نیە.

**سوود**:

خوا دەفەرموێ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٍ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ (التحريم:٨).

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە بگەرێنەوە بۆ لای خوا بە گەرانەوەیەکی یەکجاری تا پەروەردگارتان لە گوناهەکانتان خۆش ببێ وە بتان خاتە ناو باخاتێکەوە کە جۆگەی ئاوی زۆر بە ژێریان دا دەڕوات.

*سُئلَ عمر عن التوبةِ النَّصوح فقال: ان يتوبَ الرَّجُلُ من العمل السَّيِيء ثم لا يعود.

واتە: لە ئیمامی عومەریان پرسی دەربارەی(التوبة النَّصوح) فەرمووی: ئەوەیە کە پیاو تەوبە لە گوناح بکات و نەگەرێتەوە سەری جارێکی تر.

٢-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: لو أخطأْتُم حتّى تَبلُغَ خطاياكم السَّماء ثُمَّ تُبْتُم لَتابَ عليكم. حسن صحيح رواه ابن ماجه(٤٢٤٨).

واتە: ئەگەر گوناهتان کرد تاوەکو گوناهەکانتان گەیشتە ئاسمان لە

پاشان تەوبەتان کرد تەوبەتان لێ وەردەگرێ.

**سوود**:

خوا دەفەرمووێ﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ (الزمر:٥٣).

واتە: بڵێ خوا دەفەرموێ: ئەی بەندەیانی ئەو تۆم کە زیادە ڕەوییان کردووە لە تاوان کردن داو گوناهی زۆریان خستووەتە سەرشانی خۆیان هیچ نائومێد نەبن لە ڕەحم و بەزەیی خوا چونکە خوا لە هەموو گوناهەکان خۆش ئەبێ، بێگومان ئەو خاوەنی ڕەحم و بەزیی زۆرەو زۆر لێ بوردەیە.

## تەوبەو(إستغفار)ی پێغەمبەر(ﷺ) واجبێتی تەوبە

١-عن ابن عمر(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) يا أيَّها الناسَ توبوا الى الله فَإنّي أتوبُ في اليومِ إليهِ مائَةَ مَرَّة. رواه مسلم(٤٢).

التوبة: لە زمانەوانی دا واتە(الرُّجوع) یانی گەڕانەوە.

استغفار: داوای لێ خۆش بوون کردن.

واتە: ئەی خەڵکینە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا چونکە بێگومان من لە ڕۆژێکدا سەد جاران تەوبە دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای ئەو.

**سوود:**

**١-لوقمان به كوڕەكەی گوتووە:(يا بُنَيَّ لا تُؤَخِّرُ التَّوبةَ فَإنَّ الموتَ يأتي بَغْتَةً)[1].**

**واتە: ئەی ڕۆڵەم تەوبە دوا مەخە چونكە جار وەیە مردن لە ناكاوێك دێت.**

**٢-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: سمِعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: واللهِ إنّي لأَسْتَغْفِرُ الله وَأتوبُ إليه في اليومِ أكثر مِنْ سَبعِينَ مَرَّةً. رواه البخاري (٦٣٠٧).**

**واتە: ئەبو هورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لە پێغەمبەرم بیستووە(ﷺ) دەیفەرموو: سوێند بە خوا لە ڕۆژێكدا زیاتر لە حەفتا جار داوای لێخۆش بوون و تۆبە دەكەم.**

**٣-عن ابن عمر(رضي الله عنهما) قال: كُنّا نَعُدُّ لرسول الله(ﷺ) في المجلس الواحِدِ مائةَ مَرَّةٍ: ربِّ اغْفِرْ لي وتُبْ عليَّ إنَّك أنت التَّوّابُ الرَّحيم. صحيح رواه ابوداود(١٥١٦) والترمذي وقال حديث حسن صحيح.**

**واتە: عبدالله كوڕی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئێمە لە یەك كۆڕدا سەد جارمان دەژمارد لە پێغەمبەری خوا كە دەیفەرموو:( ربِّ اغْفِرْ لي وتُبْ عليَّ إنَّكَ أنت التَّوّابُ الرَّحيم) واتە: پەروەردگارم لێم ببوورەو تۆبەم لێ قبول بكە بێگومان بەس تۆی زۆر تۆبە وەرگری میهرەبان.**

---

(1) موسوعة الاخلاق الإسلامية

**سوود**:

١-واجبه تەوبه بكرێت له هەموو گوناهێكی گەورەو گچكه.

٢- (ابن القيم) رەحمەتی خوای لیٚ بێت دەڵیٚ: إنَّ المبادرةَ الى التوبة من الذنب فرضٌ على الفَور لا يجوز تَأْخِيرها فمتى اَخَّرها عصى بِالتَّأخير) واته: پەله كردن له تەوبه كردن له گوناهان پێويسته يەكسەر بێت دورست نيه دوا بخریٚ جا هەر كات دوای خست به دواخستنی گوناهبار دەبێت.

٣- زانايان لەسەر ئەوه يەكدەنگن كه پێويسته تۆبه بەردەوام و بیٚ پسانەوه بێت.

٤- ابن تيميه(رەحمەتی خوای لیٚ بێت) دەڵیٚ(فليس لأحدٍ انْ يظنَّ استغناءَهُ من التوبة الى الله والإستغفار من الذّنوب بل كُلُّ احدٍ محتاجٌ الى ذلك دائماً).

واته: هیچ كەسێك بۆی نی يه وا گومان ببات بیٚ پێويسته له تۆبەو گەڕانەوه لای خواو داوای لێبوردن كردن لیٚ ی له گوناهان بەڵكو هەموو كەسێك بەردەوام پێويستی پیٚ ی هەيه.

## تەوبه تاكەی قەبولّ دەبێت

١-عن عبدالله بن عمر(رضي الله عنهما) عن النبيِّ(ﷺ) قال: إنَّ الله يَقْبَلُ توبَة العبْد ما لم يُغرغر[1]. **حسن: رواه الترمذی (٣٥٣٧) وابن ماجه (٤٢٥٣).**

---

(1) ما لم يغرغر: اي ما لم تبلغ روحه حلقومه. فيكون بمنزلة الشيء الذي يتغرغر به المريض، والغرغرة: اي يجعل المشروب في الفم ويردد الى اصل الحلق و لايبلع.

**سوود**:

١-واجبه تەوبه بكرێت له هەموو گوناهێكی گەورەو گچكه.

٢- (ابن القيم) رەحمەتی خوای لیْ بێت دەڵیْ: إنَّ المبادرةَ الى التوبة من الذنب فرضٌ على الفَور لا يجوز تَأْخِيرها فمتى أَخَّرها عصى بِالتَّأخير) واته: پەله كردن له تەوبه كردن له گوناهان پێویسته یەكسەر بێت دورست نیه دوا بخریْ جا هەر كات دوای خست به دواخستنی گوناهبار دەبێت.

٣- زانایان لەسەر ئەوه یەكدەنگن كه پێویسته تۆبه بەردەوام و بیْ پسانەوه بێت.

٤- ابن تيميه(رەحمەتی خوای لیْ بێت) دەڵیْ(فليس لأَحدٍ انْ يظنَّ استغناءَهُ من التوبة الى الله والإستغفار من الذّنوب بل كُلُّ احدِ محتاجٌ الى ذلك دائماً).

واته: هیچ كەسێك بۆی نی يه وا گومان ببات بیْ پێویسته له تۆبەو گەڕانەوه لای خواو داوای لێبوردن كردن لیْ ی له گوناهان بەڵكو هەموو كەسێك بەردەوام پێویستی پیْ ی هەيه.

## تەوبه تاكەی قەبوڵ دەبێت

١-عن عبدالله بن عمر(رضي الله عنهما) عن النبيِّ(ﷺ) قال: إنَّ الله يَقْبَلُ توبةَ العبْد ما لم يُغرغر[1]. **حسن: رواه الترمذي (٣٥٣٧) وابن ماجه (٤٢٥٣).**

---

(1) ما لم يغرغر: اي ما لم تبلغ روحه حلقومه. فيكون بمنزلة الشيء الذي يتغرغر به المريض، والغرغرة: اي يجعل المشروب في الفم ويردد الى اصل الحلق و لايبلع.

واتە: بێ گومان خودا تەوبەی بەندە قەبول دەکات بەمەرجێ نەکەوتبێتە حاڵی گیانەڵاوە.

٢- عن أبي موسى الأشعري(رضي الله عنه) عن النبيَّ) قال: إنَّ الله عَزَّ وَجَلَّ يَبْسُطُ يَدَهُ بالليل لِيتوب مُسِيءُ النَّهار ويبسط يَدَهُ بالنهار ليتوبَ مسيءُ الليل حتى تطلع الشَّمْسُ مِن مَغْرِبِها. رواه البخاري ومسلم(٢٧٥٩).

واتە: بێگومان خوای زاڵ و پایەبەرز لە شەودا دەستی خۆی واڵا دەکات بۆ ئەوەی ئەوانەی لە رۆژدا خراپەیان کردووە تۆبە بکەن، وە دەستی خۆی واڵا دەکات بەرۆژ بۆ ئەوەی ئەوانەی لە شەودا خراپەیان کردووە تۆبە بکەن تا رۆژ لە رۆژئاواوە هەڵدێ.

٣- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ تاب قبل أنْ تَطْلُعَ الشّمسُ مِنْ مَغْرِبِها تاب الله عليه. رواه مسلم.

واتە: هەر یەکێك تۆبە بکات پێش ئەوەی رۆژ لە رۆژئاواوە هەڵبێت خوا تۆبەی لێ قەبول دەکات.

**سوود**:

لە نزیك کۆتایی هاتنی تەمەنی زەوی پێش رۆژی قیامەت رۆژ لە رۆژئاواوە هەڵدێ وە ئەم دیاردەیە هەڵهاتنی رۆژ لە رۆژئاواوە تەنها یەك جار دەبێت دواتر وەك رۆژانی ئاسایی لێ دێتەوە، جا لەگەڵ هەڵهاتنی رۆژ لە رۆژئاواوە ئیتر دەرگای تەوبەکردن دادەخرێت و هەر کەسێك لە پێش ئەو رووداوەدا باوەڕی نەهێنابێت و تۆبەی نەکردبێت ئیتر لە دوای ئەو رووداوە نە باوەڕهێنان قبوڵ دەکرێت و نەتەوبەکردنیش.

## گوناح دڵ ڕەش دەكات و تەوبە لای دەبات

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن رسول الله(ﷺ) قال: إنَّ العبدَ إذا أخطأ خطيئةً نُكِتَتْ في قلبه نكتةً سوداء فإذا هو نزع واسْتَغفَرَ وتابَ سُقِلَ قلبُهُ وإنْ عادَ زيدَ فيها حتى تعلوَ قلبه وهو الرَّان الذي ذكرَ اللهُ:﴿كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ (المطففين:١٤). حسن رواه الترمذي(٣٣٣٤).

واتە: بێگومان ئەگەر بەندە گوناهێكی كرد خاڵێكی ڕەش لە دڵی دا دورست دەكرێ جا ئەگەر دەستی هەڵگرت و داوای لێخۆشبوونی كردو تۆبەی كرد دڵی سپی و ساف دەبێتەوە بەڵام ئەگەر گەڕایەوە خاڵە ڕەشەكان لە دڵیدا زیاد دەكرێ تاوەكو دڵی دادەپۆشێ ئەوە ئەو(ران)ەیە كە خوا باسی كردووە كە دەفەرمووێ﴿كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ (المطففين:١٤) واتە: نەء وانی یە: بەڵكو ئەوەی كە دەیانكرد(لە خراپە) پەردەی هێناوە بەسەر دڵیاندا.

## گوناهكاری تەوبەكار

١- عن انس قال: قال رسول رسولُ اللهُ(ﷺ) كُلُّ بَني آدم خطَّاء وخَيرُ الخطَّائينَ التَّوابون. حسن رواه ابن ماجه(٤٢٥١) والترمذي(٢٤٩٩).

واته: هەموو ئادەمیزادێك گوناح دەكات وە باشترین گوناهباریش ئەوانەن كە تەوبە دەكەن.

## تەوبەو(استغفار)ێكی گەورە

١- عن عبدالله بن مسعود(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) مَنْ قال: أَستغفر الله الذي لا إله إلاّ هو الحيُّ القّيوم وأتوبُ إليهِ، غُفِرَتْ ذنوبُهُ وإنْ كان قَدْ فَرَّ منَ الزَّحفِ. صحيح رواه أبو داواد(١٥١٧) والترمذي(٣٥٧٧).

واته: هەر یەكێك بڵێ(أَستغفر الله الذي لا إله إلاّ هو الحيُّ القّيوم وأتوبُ إليهِ) خوا لە گوناهەكانی خۆش دەبێت ئەگەر لە شەر لە كاتی بەیەك گەیشتنی لەگەڵ كافرانیش دا رای كردبێت.

**سوود**:

مانای تەوبەو(استغفار)ەكە بەم شێوەیە: داوای لێخۆشبوون دەكەم لەو خوایەی كە جگە لەو هیچ پەرستراوی بە ڕاستی نیەو زیندوو و سەرپەرشتیكەرەو تەوبە دەكەم و دەگەرێمەوە لای ئەو.

## داوای لێخۆشبوون كردن
## لە سێیەكی كۆتایی شەوو كاتی سەحەر

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: يَنزِلُ رَبُّنا الى السّماء الدُّنيا حينَ يَبقى ثُلثُ الليلِ الآخرُ فيقول: مَن

يَدعونى فَأَسْتَجيبَ لَهُ، ومَنْ يَسأَلُني فَأُعطيه ومن يَستَغْفِرني فَأَغفر لَه. رواه البخاري(١١٤٥) ومسلم(٧٥٨).

واته: پەروەردگارمان(تبارك وتعالى) هەموو شەویٚ دادەبەزی بۆ ئاسمانی دونیا كاتێك كە سێیەكی كۆتایی شەو دەمێنیٚ دەفەرمووێ: كیٚ بانگم دەكات تا وەلاٌمی بدەمەوە وە كیٚ داوام لیٚ دەكات تا پیٚ ی ببەخشم وە كیٚ داوای لێخۆشبوونم لیٚ دەكات تاوەكو لێی خۆش بم.

## سوود:

١-شەو كاتەكەی دەست پیٚ دەكات لە رۆژئاوابوونەوە تا بانگی بەیانی سێیەكی شەوی كۆتایی ئەوەیە شەو بكەیتە سیٚ بەش بەشی ئاخیریەتی.

٢- سەحەر(ابن يزيد) دەلٌیٚ: السَّحَر: هو السُّدُس الأَخير مِن الليل[1].

واته: سەحەر بریتی یە لە یەك لەسەر شەشی كۆتایی شەو. خوا دەفەرمویٚ﴿وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ (الذاريات:١٨).

واته:وەلەبەرەبەیانانداا داوای لێخۆشبوونیان دەكرد. وەدەفەرمویٚ ﴿وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ﴾ (آل عمران:١٧).

واته: وە ئەوانەی كە داوای لیٚ خۆشبوون دەكەن لە پێش بەیانیان دا.

---

(1) تفسير الطبري

# داوای لێخۆشبوون کردن بۆ ئیمانداران

١- عن عبادة بن الصَّامت(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسولَ اللهِ(ﷺ) يقول: مَنْ استغفرَ لِلمؤمنينَ والمؤْمنات كتبَ اللهُ لَهُ بَكُلِّ مُؤْمنٍ ومُؤْمنةٍ حسنة. رواه الطبراني وحسنه الالباني برقم(٥٩٠٢) في صحيح الجامع.

واته: هەر یەکێك داوای لێبوردن بکات بۆ بڕواادارانی پیاو و ئافرەت خودا بە هەموو ئیماندارێکی پیاو و ئافرەت خێرێکی بۆ دەنوسێ.

**سوود:**

١-ئەم داوای لێخۆشبوونە ئەگەر بەم شێوە بیکەی شتێکی باشە(رَبِّ اغْفر لِي ولِوالديَّ ولِلمؤمنينَ والمؤمِنات).

٢- بیربکەوە کاتێك ئەگەر یەك جار ئەم داوای لێخۆشبوونە بکەی هەر لە ئادەم پێغەمبەرەوە تا وەکو ئێستا چەند ئیماندار دەگرێتەوە کەواتە پاداشتەکەی زۆر گەورەیە.

# دووبارەکردنەوەی گوناح و تەوبە

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) فيما يَحكي عن ربِّه عَزَّ وجلَّ قال:

أذنبَ عبدٌ ذنباً فقال: أللهمَّ اغفر لي ذنبي، فقالَ الله تبارك وتعالى: أذنب عبدي ذنباً، فَعلمَ أنَّ لَهُ ربّاً يَغفرُ الذَّنب و يأخذُ بالذَّنب ثُمَّ عادَ فأذنب فقال:أي ربّ اغفر لي ذنبي فقال تبارك وتعالى: اذنب عبدي ذنباً، فَعلم أنَّ لَهُ ربّاً يَغفِرُ الذَّنبَ ويأخذ بالذَّنب واعملْ ما شئت فقد غفرت لك. قال عبد الأعلى لا أدري أقالَ في الثالثة أو الرابعة(واعمل ما شئت). **رواه البخاري(٧٥٠٧) ومسلم(٢٧٥٨).**

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ لەو فەرموودانەی کە لە پەروەردگاری(عزّ وَجلَّ) دەگێرێتەوە کە فەرموویەتی: بەندەیەك گوناحێکی کرد، جا گوتی: ئەی خودایە لە گوناهم خۆش بە خوا(تبارك وتعالى) فەرمووی: بەندەم گوناهێکی کردو زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناح دەبوورێ و لەسەر گوناهیش سزای دەدات، پاشان دووبارە گەڕایەوە گوناهی کردەوە و گوتی: ئەی پەروەردگارم لە گوناهم خۆشبە خودا(تبارك وتعالى) فەرمووی: بەندەم گوناهێکی کرد زانی کە بێگومان پەروەردگارێکی هەیە لە گوناح خۆش دەبێت و لەسەر گوناهیش سزای هەیە، لە پاشان دیسان گەڕایەوەو گوناهیی کردەوەو گوتی: ئەی پەروەردگارم لە گوناهم خۆش بە، خودا(تبارك وتعالى) فەرمووی: بەندەم گوناهێکی کردو زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناح خۆش دەبێت و لەسەر گوناهیش سزای دەدات چیت دەوێ بیکە بێگومان لە گوناهت خۆش بووم(واتە مادام

وادەکەی گوناح دەکەی و تەوبە دەکەی لە گوناهت خۆش دەبم).

(عبدالأعلی) دەڵێ: نازانم نە لە جاری سێ یەم نە لە جاری چوارەم فەرمووی(واعمل ما شئت).

**سوود**:

١-ئیمام(مسلم) رەحمەتی خوای لێ بێت لە(صحیح)ەکەی ئەم فەرموودەیە لە ژێر ناونیشانی(باب قبول التوبة من الذّنوب وإن تكرَّرت الذُّنوب والتوبة) دەهێنێ واتە: قەبول بوونی تەوبە لە گوناهان هەر چەند ئەگەر گوناهەکان و تەوبە دووبارە بوونەوە.

٢- خوای گەورە داوای(التوبه النّصوح)ی لە ئیمانداران کردووە، گوتمان(التوبة النصوح) ئەوەیە کە ئیماندار تەوبە لە گوناح بکات و جارێکی تر نەگەڕێتەوە سەری. بەڵام ئەگەر تەوبەیەکی ڕاستی کرد لە گوناهێك لە پاشان گەڕایەوە سەر گوناهەکە ئەوە تەوبەی یەکەمی راست و تەواوە، کە جاری دووەم گوناهەکە دەکاتەوە ئەوە وەکو یەکێکە کە گوناهێکی نوێ ی کردبێت پێویستە تەوبەیەکی نوێ لە گوناهەکە بکاتەوە.

## پرسیارو وەڵام دەربارەی تەوبە

١-تەوبە دەکەم دەگەڕێمەوە سەر گوناهەکە:

موسڵمان کە تەوبە دەکات یەکێك لە مەرجەکانی تەوبە ئەوەیە کە عەزمی وابێت کە هیچی تر ئەم گوناهە نەکاتەوە جا ئەگەر موسڵمان تەوبەیەکی راستی کرد گەڕایەوە سەر گوناهەکە ئەوە تەوبەی یەکەمی ڕاستە ئەو کاتە تەوبەیەکی نویٚ بۆ گوناهەکە دەکاتەوە.

٢- دەبێت تەوبە لە هەندیٚ لە گوناهەکانم بکەم:

بەڵیٚ دەبیٚ تەوبە لە هەندێك لە گوناهەکانت بکەی لە هەندێکی تر نەکەیت، بەڵام گوناهی ئەوانی ترت لەسەر دەمێنیٚ وە گوناهی دواخستنەکەش چونکە تەوبە یەکسەر واجبە بۆ گوناهەکان.

٣- ئەوەی نوێژی چواندووە:

ا-کافر کە موسڵمان بوو نوێژ ناگێڕێتەوە.

ب- منداڵ تا بالغ نەبێت نوێژی لەسەر واجب نی یە بەڵام ئەگەر بیکات خێری بۆ دەنوسریٚ.

ج- کەسیٚ خەوی لیٚ کەوت یا لەبیری چوو نوێژی نەکرد ئەوە کەی لە خەو هەستا یا کەی بیری کەوتەوە ئەوە کاتی نوێژەکەیەتی بە حازر بیکات.

د- ئەگەر یەکێك بە ئەنقەست نوێژی نەکرد تا کاتەکەی بەسەر چوو جەماوەری زانایان دەڵێن دەبێت نوێژەکەی بگێڕێتەوەو گوناهباریش بووە، بەڵام هێندێك لە زانایان لەوانە ئیبن تیمیەو ئیبن حەزم و شەوکانی دەڵێن ناتوانیٚ بیگێڕێتەوە دەڵێن با تەوبە بکات و نوێژی سوننەت و کردەوەی چاك بکات.

٤- چی دەکەی لەو ماڵەی بە کاسبی حەرام پەیدا کراوە:

ئەگەر یەکێك ماڵێکی بە کاسبی حەرام پەیدا کردبیّ وەك فرۆشتنی جگارە یا فرۆشتنی کاسێتی حەرام ویستی تەوبە بکات:

ا-ئەگەر لە کاتی پەیداکردنی کافر بووبێت لە کاتی تەوبەکردنی پێویست ناکات دەری کات و پارەکە لای دەمێنێتەوە.

ب- بەڵام ئەگەر لە کاتی وەدەست هێنانی موسڵمان بووبێت و دەیزانی کە کاسبیەکە حەرامە ئەوە ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە چی لە حەرام کۆکردیتەوە سەرفی دەکا لە کاری خێر نەك بە خێر بیدات چونکە خودا حەرام قەبول ناکات.

٥- بە ماڵی زەوت کراوی یەتیم بازرگانی کردن:

زانایان چەند قسەیەکیان هەیە دەربارەی ئەوە یەکێك لەم قسانە ئەوەیە: پارەکەی خۆیان هەموو دەدەیەوە قازانجەکەشی دەکەی بە نیوە لە گەڵیان دا ئەمە قسەی ئیمام ئەحمەدو ئیبن تیمیەیە.

٦- ئەوانەی ئەزیەتی دایك و باوکیان داوەو ئەوانیش مردوون:

ئەوانەی کە ئەزیەتی دایك و باوکیان داوە ئەوانیش مردوونە با ئەو کەسە تەوبەیەکی ڕاست بکات وە زۆر ئەم دوعاو(استغفار)ە بکات بۆ ئەوان(ربِّ اغفر لي ولِوالديَّ وارحمهما كما ربّياني صغيراً) واتە: پەروەردگارم لە خۆم و دایك و باوکم خۆش بە وە ڕەحمیان پیّ بکەی هەروەکو ئەوان منیان پەروەردەکردووە بە گچکەیی.

ئەم دوعاو داوای لێخۆشبوونە چاکەیەکی گەورەیە بۆ بکەرەکەی جا دایك و باوکی زیندوو بن یا مردوو ئەو ئینسانەی دەیکات چاکەکار بێت لەگەڵ دایك و باوکی یا خراپەکار.

٧- زەکات:

ئەوەی زەکاتی نەدابێ دەبێت هەموو زەکاتەکە بدات ئەگەر سالانێکی زۆریش زەکاتی نەدابێ زەکات حەقی فەقیرانیشی تێدایە.

٨- رۆژوو:

ئەوەی کە رۆژووی رەمەزانی خواردووە لەو کاتەش موسڵمان بووە دەبێ هەمووی بگرێتەوە وە ئەگەر پێش ئەوەی بچێتە ناو رەمەزانێکی تر رۆژووەکەی نەگرتبێتەوە بەبێ عوزر دەبێ لەگەڵ هەر رۆژێکیش خواردنی هەژارێك بدا ئەگەر چەند رەمەزانیش بەسەر رۆژوو نەگرتنەکەی تێپەریبێ ئەو تەنها لەگەڵ هەر رۆژوو گرتنەوەك خواردنی هەژارێك دەدات.

٩- سەیارەیەکم هەیە خانووەکم هەیە هەندێکی حەرامە هەندێکی حەلاڵە چی بکەم:

هەر یەکێك سەیارەیەکی یا خانووەکی یا شتێکی لەم جۆرەی بە ماڵی حەلاڵ و حەرام کریبوو ئەوە بای حەرامەکە لەو ماڵەی کە هەیتی دەردێنێ و ئەگەر خاوەنەکەی دەناسیەوە ئەوە پێ ی دەداتەوە وە ئەگەر مردبوو دەیداتەوە بە میراتگرەکانی ئەگەر نەشی دەناسیەوە لە دوای هەوڵی جددی بۆ دۆزینەوەیان ئەوە پارەکە بەنیەتی ئەوان دەکاتە خێر.

١٠- تەوبە لە نێربازی:

ئەم تاوانە تاوانێکی گەورەو قێزەونە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ:(مَنْ وجدتموهُ يَعمل عمل قومِ لوطٍ فاقتلوا الفاعل والمفعول به)[1].

واتە: هەر یەکێکتان بینی کردەوەی قەومی لوتی دەکرد(واتە نێربازی) ئەوە ئەوەی کە کردوویەتی و ئەوەش کە لە گەڵی دا کراوە هەردووکیان بکوژن.

کەواتە حەددی نێربازی کوشتنە.

---

(1) رواه أبوداود و الترمذي وابن ماجه وصححه الالباني(إرواء الخليل(٢٣٥٠)

جا ئەوانەی ئەگەر ئەم کارەیان کردووە کەس پێ ی نەزانیوەو ئیسپات نەبووە لەسەریان پێویستە تەوبەیەکی ڕێك وڕاست بکەن.

١١- تەوبەی قاتل:

١-ئەگەر یەکێك موسڵمانێك بە ئەنقەست بکوژێ سێ هەقی دەکەوێتە سەر:

١- حەقی خودا کە ئەمە بە تەوبە لادەچێ.

٢- حەقی میراتگرەکانی: کە ئەمەش دەبێ خۆی تەسلیمیان بکات جا یا دەکوژرێتەوە یا عەفووی دەکەن یا پارەو ماڵی لێ وەردەگرن.

٣- حەقی کوژراوەکە: ئەوەش ناتوانرێ لەدونیادا بدرێ، ئەهلی عیلم دەڵێن ئەگەر بکوژەکە تەوبەیەکی جوان بکات، ئەوە خوا مافی کوژراوەکەی لەسەر هەڵدەگرێ، لەلایەن خۆیەوە خوا لەرۆژی قیامەت تۆڵە بۆ کوژراوەکە دەکاتەوە.

١٢- دز چۆن تەوبە دەکات:

ئەگەر ماڵە دزیاریەکەی لەلا ماوە ئەوە بۆیان دەگێڕێتەوە بەڵام ئەگەر فەوتاوە یا نرخی کەمی کردووە بە بەکارهێنان یا بەسەردا چوونی کات دەبێ بۆیان تەعویز بکاتەوە مەگەر عەفووی بکەن وە ئەگەر نەیتوانی ڕووبەڕوو بیانداتەوە با هەوڵ بدات ڕێگایەك بدۆزێتەوە بۆیان بنێرێتەوە.

١٣- دزیەك کە خاوەنەکەی ناناسێتەوە:

ئەگەر ئەو ماڵەی دزیوتە خاوەنەکەی ناناسیەوە یا دەیناسیەوە بەڵام مردووە ئەگەر خاوەنەکەی مردبی ئەوە ماڵەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ میراتگرانی بەڵام ئەگەر لە دوای هەوڵ دانی جددی خاوەنەکەی نەدۆزیەوە ئەوە ماڵەکە دەکەیە خێر لە بری ئەوان بۆ ئەوان.

١٤- تەوبە لە زینا:

زینا له گوناهه گەورەکانه موسڵمان دەبێ زۆر به توندی خۆی لەم کاره بپارێزی بەڵام ئەگەر ئەم گوناهه گەورەی ئەنجام داو هەر له نێوان و خۆی و خودا بوو ئەوه حەددی لەسەر پێویست نی یه به تۆبەیەکی ڕاست پاك دەبێتەوە. بەڵام پاش ئاشکرا بوون و ئیسپات بوونی تاوانەکه سزاو حەددی لەسەر لاناچێ، واته ئەگەر گەیشته لای ئیمام یا نایبی ئیمام و لەسەری ئیسپات بوو.

بەڵام ئەگەر به تۆبزی زینای لەگەڵ ئافرەتێك کرد ئەو رازی نەبوو ئەوه لەگەڵ تەوبەکه مارەییەکی وەکو خۆشی پێ دەدات ئەمه ئەگەر نەگەیشتبووه لای ئیمام وه ئەو کەسەی تۆبه له زینا دەکات و لێ ی کەشف نەبووه باشتر وایه ئاشکرای نەکات و تەوبەیەکی رێك و پێکی لێ بکات له نێوان و خۆیی و خوای گەورەدا.

## ڕوونکردنەوەیەك:

ئەو کەسەی مافی یەکێکی لەلایه که مافەکەی دەداتەوە، دەبی تەوبەش بکات چونکه حەقی خواشی تیایه.

## گەورەیی زانست و زانایان

خوا دەفەرموێ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُواْ فِى ٱلْمَجَـٰلِسِ فَٱفْسَحُواْ يَفْسَحِ ٱللَّهُ لَكُمْ ۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَـٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ (المجادلة:١١).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە کاتێك پێتان ووترا جێگە بکەن و شوێن فراوان کەن لە جێگا دانیشتنەکەتان دا ئێوەش فراوانی بکەن خواش گوشادی بە ئێوە دەدات وە کاتێك پێتان ووترا هەستن ئێوەش هەستن خواش پایەی ئەو کەسانە بەرز دەکاتەوە لە ئێوە کە بڕوایان هێناوە وە ئەوانەی کە زانستیان پێ بەخشراوە بە چەند پلەیەك وە خوا شارەزایە بەوەی دەیکەن.

وە خوا دەفەرموێ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَـٰٓؤُاْ﴾ (فاطر:٢٨).

واتە: بەڕاستی لەناو بەندەکانی خودا تەنها زانایان(وەك پێویست) لە خوا دەترسن.

١-عن أبي أُمامة الباهليِّ قال: ذُكرَ لِرَسول الله(ﷺ) رَجُلانِ

أَحَدُهُما عابِدٌ والآخرُ عالمٌ، فقال رسول الله(ﷺ): فَضْلُ العالِمِ على العابِدِ كَفَضْلي على أَدْناكُمْ، ثُمَّ قال: (ﷺ) إنَّ الله وملائكتَهُ وأَهلَ السَّماوات والارضِ حتَّى النَّملةُ في جُحْرِها وحتَّى الحُوتُ لَيُصلُّون على مُعَلِّمِ الناسِ الخَيرَ. صحيح رواه الترمذي(٢٦٨٥).

واته: باسی دوو پیاویان کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) یەکێکیان خوا پەرست(عابد) ئەوی تریان زانا(عالم) بوو. جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ڕێزو گەورەیی زانا لە چاو خواپەرست(عابد) وەك ڕێزو گەورەیی من وایە لە چاو نزمترینتان دا. لە پاشان فەرمووی: خوداو فریشتەکانی و خەڵکی ئاسمانەکان و زەوی هەتا مێروستان(مێرووله) لە ناو شارەکەی داو وە هەتا ماسی صەڵەوات دەدەن لەوانەی کە خەڵکی فێری خێر دەکەن.

٢- عن معاوية(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ يُرِدِ اللّهُ بِهِ خَيراً يُفَقِّهْهُ في الدّينِ. رواه البخاري(٧١) ومسلم(١٠٣٧).

واته: هەر کەسێك خوا خێری بۆی بوێ لە ئایین دا شارەزای دەکات.

٣- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) مَن سَلك طريقاً يَلتَمسُ فيه علماً سَهَّلَ اللّهُ لَهُ طريقاً الى الجنَّة. صحيح رواه الترمذي(٢٦٤٦) وابن ماجه(٢٢٥).

واته: هەر یەکێك ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆ ئەوەی زانستێکی تیادا بەدەست بێنی خودا ڕێگایەکی بۆ ئاسان دەکات بۆ بەهەشت.

## زانستێك كە لە دوای خۆت سوودی لێ وەردەگیرێ:

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) اذا مات ابْنُ ادم انقطع عَمَلُهُ إلاّ مِنْ ثلاثٍ: صدقَةٍ جَاريَةٍ أو علمٍ يُنْتَفَعُ بهِ، أو ولدٍ صالحٍ يَدعو لهُ. رواه مسلم(١٦٣١).

واتە: كاتێ ئادەمیزاد دەمرێ هەموو كردەوەیەكی كۆتایی دێ ئەم سێ شتە نەبێت: خێرێكی نەبڕاوە(وەك مزگەوت و شتی وەقف)، یا زانستێك سوودی لێ وەربگیرێ یا منداڵێكی چاك دوعای بۆ بكات.

## ئەوەی لە زانستێك پرسیار لێ دەكرێ و دەیشارێتەوە:

١-عن انس بن مالك(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: مَن سُئِلَ عَنْ علمٍ فَكَتَمَهُ أُلْجمَ يومَ القيامةِ بِلجامٍ[1] من نار. صحيح رواه ابو داود(٣٦٥٨) والترمذي(٢٦٥١) وابن ماجه(٢٦٤).

واتە: هەر یەكێك پرسیاری لێ بكرێ لە زانستێك جا ئەویش بیشارێتەوە لە رۆژی دوایی دا لغاو دەكرێ بە لغاوی ئاگر.

(1) اللجام: لغاو.

# زانستی شەرعی فێربوون
# بۆ وەدەست هێنانی شتی دونیەوی:

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) مَن تَعَلَّمَ علماً مِمّا يُبتغي بِهِ وجْهُ الله عَزَّ وجَلَّ لا يَتَعَلَّمُهُ إلاّ لِيُصيبَ بِهِ عَرَضاً منَ الدُّنيا لَمْ يَجِدْ عَرْفَ الجنَّةِ يوم القيامة. صحيح رواه ابوداود(٣٦٦٤) وابن ماجة(٢٥٢).

١-علم: زانست، زانیاری، زانین.

٢- يبتغي: داوا دەکرێ.

٣- الله عز وجل: خوای زاڵ و پایەبەرز.

٤- عرف الجنة: بۆنی بەهەشت.

واتە: هەر کەسێك زانستێك فێر بیت لەو زانستانەی داوا دەکرێ بەهۆی ئەوەوە رەزامەندی خوای زاڵ و پایەبەرز، بەڵام ئەو فێری نەبێت تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە شتێکی دونیەوی پێ وەدەست بێنی ئەو کەسە لە رۆژی قیامەت دا بۆنی بەهەشت ناکات.

## ووتەی ناوداران دەربارەی عیلم و زانست:

١-عن الزُّهريِّ قالَ:

(ما عُبِدَ اللهُ بِشَيءٍ أفْضَلُ مِنَ العِلْمِ)[١].

واتە: زوهری دەڵێ: خوا نەپەرستراوە بە هیچ شتێك باشتر بێت لە زانست و زانیاری.

٢- قال عبدالله ابن مبارك:

---

(1) صفة الصفوة.

(لا أَعلمُ بَعْدَ النُّبُوَّةِ أَفْضَلُ مِنْ بَثِّ العلْمِ)[1].

نازانم له دوای پێغەمبەرایەتی شتێك باشتر هەبێت له بڵاوكردنەوەی عیلم و زانست و زانیاری[2].

٣- قال سفيان بن عُيَيْنة: (أَرفَعُ النّاسِ مَنْزِلَةً عِنْدَ الله مَنْ كانَ بينَ اللهِ وبينَ عِبادِهِ وَهُم الأَنبياءُ والعلماءُ)[3].

واته: ئەو كەسەی له هەموو خەڵك پلەو پایەی بەرزتره لای خوا ئەوانەن كه له نێوانی خواو بەندەكانی خوان ئەوانەش پێغەمبەرەكان و زاناكانن.

٤- قال احمد المقدسی فی(مختصر منهاج القاصدين):

(فإنَّ التَّعلُّم افضلُ من التَّشاغلِ بالأذكار والنوافل).

واته: فێربوونی زانست و زانیاری باشتره له خۆ خەریك كردن به زیكرو سوننەتكان.

٥- عن يزيد بن مذكور قال:

(رأيت ابو عمرو الأوزاعيٍّ في منامي فقلت يا ابا عمرو دُلَّني على أمرٍ أتقربُ بهِ الى الله تعالى، فقال لي ما رايت هناك درجةً أرفعُ من درجة العلمِ، فقلت ثُمَ من بعدها؟ قال: درجةُ المحزونين).

واته: یەزیدی كوڕی مەزكور دەڵێ: ئەبو عەمری ئەوزاعیم له خەوندا بینی گوتم ئەی ئەبو عەمر كارێكم پێ نیشان بده به هۆیەوه نزیك ببمەوه له خوای گەوره ئەبو عەمر پێ ی گوتم: نازانم لێره پلەیەك بەرزتر هەبێت له پلەی عیلم و زانست، گوتم له پاش ئەوه چی، فەرمووی پلەی غەمباران.

---

(1) صفة الصفوة.

(2) نفس المصدر.

(3)نفس المصدر.

## بانگەواز کردن بۆ لای
## خواو کاری چاك نیشانی خەڵك دان:

**١-عن سهل بن سعد(رضي الله عنه) أنّ رسول الله(ﷺ) قال: يوم خيبر: لأُعْطِيَنَّ الرَّايةَ غداً رجلاً يحبُّ اللهَ ورسولهُ ويُحبُّهُ الله ورسولُهُ يَفتَحُ الله على يَديهِ، فباتَ الناسُ يَدوكونَ ليلتهم أيُّهم يُعْطاها، فلمَّا أصبحوا غَدَوا على رسول الله(ﷺ) كلهم يرجوا أن يُعطاها، فقال: اين عليٌّ بن أبي طالب؟ فقيل: هو يشتكي عينيه. فأرسلوا اليه فأُتِيَ بِهِ، فَبَصَقَ في عينيه ودعا له فبرىء،كأن لَم يكن به وجَعٌ فأعطاهُ الرَّاية، فقال: أُنْفُذْ على رِسْلِك حتى تنزلَ بِساحَتِهِم ثُمَّ ادْعُهُم الى الاسلام وأخبرهم بما يجبُ عليهم مِن حَقِّ الله تعالى فيه، فَوَاللهِ لَنْ يَهديَ الله بِكَ رجلاً واحداً خيرٌ لكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ) رواه البخاري(٢٩٤٢) ومسلم(٢٤٠٦).**

**١- يوم خيبر: رۆژی خەیبەر. غەزای خەیبەر لە پاش صولحی حودەیبیە رووی دا لە سەرەتای ساڵی حەوتەمی کۆچی(خەیبەر) شارێکی جولەکەنشینی گەورە بوو خاوەنی هەشت قەڵا(حصن)ی قایم بوو، وە شوێنی زراعەت بوو دەکەوێتە باکوری مەدینە(٦٠ تا ٨٠) میل لە مەدینە دوور بوو، موسڵمانان بۆی دەچوون بە سوپایەکی(١٤٠٠) کەسی بە سەرکردایەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە دوای شەرێکی توندو هەوڵ و تەقەڵایەکی زۆر توانیان بە پشتیوانی خوا بیگرن(٩٣) جولەکەی تیا کوژرا وە(١٦ تا ٢٣) موسڵمانیشی تیادا شەهید بوو.**

٢- لأُعْطِيَنَّ: ئەم رستە(جملە)یە بە سێ شت(تأكید) كراوە: سوێندێكی تەقدیر كراو(القسم المقدر) لامی(تأكید)، نونی(تأكید) تقدیرەكەی بەم شێوەیە(والله لأُعْطِيَنَّ).

٣- الرَّاية: العَلَمُ: واتە: ئالاّ. بۆیە پێی دەوترێ (رایە) چونكە دەبینرێ.

٤- غداً: بەیانی.

٥- یفتح الله علی یدیه: خەیبەر لەسەر دەستی ئەو رزگار دەكات، ئەمەش نیشانەیەكە لە نیشانەكانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ).

٦- أُنْفُذْ: واتە: امض واذْهَب، یانی: برۆ.

٧- علی رِسلِكَ: علی مهلك من غیر عجلة، لەسەرەخۆ بێ پەلەكردن.

٨- ساحتهم: ما قرب منهم، واتە: نزیكیان.

٩- (حُمر النَّعم) واتە: حوشترە سۆرەكان كە باشترین جۆری حوشتر بووە لای عەرەبەكان.

مانای فەرموودەكە: سەهلی كوڕی سەعد(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی خەیبەر فەرمووی: سوێند بە خوا سبەینێ ئالاّكە دەدەمە دەست پیاوێك خواو پێغەمبەری خوای خۆش دەوێ وە خواو پێغەمبەری خواش ئەویان خۆش دەوێ خوا لەسەر دەستی ئەو خەیبەر رزگار دەكات ئەوجا خەڵك شەوەكەیان بەسەر برد بەو باسە كە ئایا كامیان ئالاّكەی دەدرێتێ، جا كاتێ بەیانیان كردەوە چونە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەموویان تكایان وابوو كە ئالاّكەیان بدرێتێ، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: كوانێ عەلی كوڕی ئەبوطالب ووتیان: عەلی چاوەكانی دێشێ جا ناردیان بە دوای ئیمام عەلی(رەزای خوای لێ بێت) هێنایان ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) تفی لە چاوەكانی كردو دوعای بۆ كرد یەكسەر چابۆوە،

دەتگوت هەر ئێشیشی تێدا نەبووە جا ئالآکەی پێداو پێ ی فەرموو: لەسەرەخۆ برۆ تا دەگەیە نزیکیان لە پاشان بانگیان بکە بۆ ئیسلام وە ئاگاداریان بکەوە لەوەی کە پێویستە لەسەریان لە مافی خوای گەورە لە ئیسلام. جا سوێند بە خوا ئەگەر خوا بە هۆی تۆوە یەك کەس هیدایەت بدات باشترە بۆ تۆ لە حوشترە سوورەکان.

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) قال: مَنْ دَعا الى هُدى كانَ لَهُ مِنَ الأجرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ لا يَنقُصُ ذلك مَنْ أُجورهِم شَيئاً، ومَنْ دعا الى ضَلالةٍ كانَ عليهِ مِنَ الإثمِ مِثْلَ آثام مَنْ تَبِعَهُ لا يَنقُصُ ذلك مِنْ آثامِهِمْ شَيئاً. رواه مسلم(٢٦٧٤) وابوداود(٤٦٠٩).

١-هدى: چاکەوکردەوەی ڕاست، مەبەست لێرەدا گوفتارو کردارێکە کە ئیسلام هێناویەتی.

٢- ضلالة: خراپەو کردەوەی ناڕاست: مەبەست لێردا گوفتارو کردارێکە کە پێچەوانەی ئیسلام بێت.

**سوود**:

خوا دەفەرمووێ﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ (فصلت:٣٣).

واتە: کێ ووتەی چاکترو بەجێ ترە لەو کەسەی(خەڵك) بۆ لای خوا بانگ دەکات و وە کاری چاکە دەکات و دەڵێ بێگومان من لە پێڕی موسڵمانانم.

٣- عن أبي مسعود الأنصاريٍّ قال: جاءَ رجُلٌ الى النبيِّ(ﷺ) فقال: إنّي أُبْدِعَ بي فاحمِلني فقال: ما عندي فقال رجلٌ: يا رسول الله انا أَدُلُّهُ على من يَحْمِلُهُ فقال رسول الله(ﷺ): مَنْ دلَّ على خيرٍ فَلَهُ مِثلُ أجرِ فاعلِه. رواه مسلم(١٨٩٣).

واته: ئەبو مسعودی ئەنساری دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: من وولاخەکەم ماندوو و شەکەت بووە، وولاخێکم پێ بدە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نیمە، پیاوێك گوتی ئەی پێغەمبەری خوا من یەکێکی پێ نیشان دەدەم کە وولاخی سواری پێ بدات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەر یەکێك خێرێك نیشانی کەسێك بدات ئەمەندەی ئەو کەسەی کە ئەو چاکەیە دەکات ئەمیش خێری دەست دەکەوێت.

## فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگەگرتن لە خراپە
## (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر)

١-عن أبي سعيد الخدريِّ(رضي الله عنه) قالَ: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: مَنْ رأى منكم منكراً فَلْيُغَيِّرهُ بيده، فإنْ لم يستطع فبلسانه، فإن لم يستطع فبقلبهِ وذلك أضعفُ الإيمان. رواه مسلم(٤٩) وابوداود(١١٤٠).

واتە: هەر یەکێك لە ئێوە خراپەیەکی دیت با بە دەست بیگۆڕێ، ئەگەر پێ نەکرا(بەدەست بیگۆڕێ) با بە زمان(بیگۆڕی) ئەگەر پێ ی نەکرا(بەزمان بیگۆڕێ) با بەدڵ پێی ناخۆش بێت وە ئەمەش کزترینی باوەڕە.

**سوود**:

١-(وجوب الأمر والنهي يَعُمُّ كلَّ مكلفً من حُرٍ وقَنّ وذكر وانثى، لكنه وجوب على الكفاية.

واتە: ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە فەرزی کیفایەیە لەسەر هەموو کەسێك جا ئازاد بێت یا کۆیلە بێت یا نێرینە بێت یا مێ.

فەرزی کیفایە: ئەوەیە ئەگەر یەکێك یا کۆمەڵێك بە کارەکە هەڵبستن ئەوە خێرەکە بە ئەوان دەبرێ و گوناح لەسەر ئەوانی تر نانوسرێ.

٢- خوا دەفەرمووێ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ (آل عمران:١٠٤).

واتە: ئەبێ لە ناو ئێوەدا کۆمەڵێك ببێت بانگەواز بکەن بۆ چاکە فەرمان بدەن بە هەموو چاکەیەك وە بەرگری بکەن لە هەموو خراپەیەك ئەوانە خۆیانن سەرکەوتوو.

٢- عن البراء بن عازب(رضي الله عنه) جاء أعرابي الى رسول الله(ﷺ) فقال: دُلّني على عمل يُدخلني الجنة؟ قال: أطعم الطعام واسْق الظمآن وأمرُ بالمعروف وانهَ عن المنكر فإن لم تُطِق فَكُفَّ لِسانك إلا من خير. اخرجه ابن ابي الدنيا بإسناد جيد.

واتە: عارەبەکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: کردەوەیەکم نیشان بدە بە هۆی کردنیەوە بچمە بەهەشت؟ فەرمووی: خواردن بدە، تێنو ئاو بدە، فەرمان بە چاکە بکەو جلەوگیری لە خراپە بکە ئەگەر پێت نەکرا، زمانت بگرە تەنها لە خێر نەبێت.

**سوود**:

١-خوا دەفەرمووێ﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (التوبة:٧١).

واتە: پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار هەندێکیان یارمەتی دەرو خۆشەویستی هەندێکی تریانن فەرمان دەدەن بە چاکەو جڵەوگیری دەکەن لە خراپە وە بەرێك و پێکی نوێژ جێ بەجێ دەکەن ئەوانە لە داهاتوودا خوا

رەحمیان پێ دەکات بە ڕاستی خوا بە دەسەڵاتی کار دورستە.

وە خوا لەسەر زمانی لوقمان دەفەرمووێ﴿يَـٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ﴾ (لقمان:١٧).

واتە: ئەی کوڕە شیرینەکەم نوێژ بەجێ بێنە وە فەرمان بکە بە چاکەو بەرگری بکە لە خراپە وە ئارام بگرە لەسەر هەر بەڵاو ناخۆشییەك کە تووشت دێت بێگومان ئەوە لەو کارە گەورانەیە کە خوا پێویستی کردووە.

٣- عن رَجُلٍ مِنْ خَثْعَم قال: أتيتُ النبيَّ(ﷺ) وهو في نَفَرٍ من أصحابهِ، فقلتُ: أنت الذي تَزعم أنَّكَ رسول الله؟ قال: نعم، قال: قلت يا رسول الله أيُّ الأعمال أحَبُّ الى الله؟ قال: الإيمان بالله، قال: قلتُ يا رسول الله ثُمَّ مَهْ؟ قال: ثُمَّ صِلَةُ الرَّحمِ، قال قلت يا رسول الله ثُمَّ مَهْ؟ قال ثُمَّ الأمرُ بالمعروف والنَّهي عن المنكر، قال: قلت يا رسول الله ايُّ الأعمال أبغضُ الى الله؟ قال: الإشراك بالله، قال: قلتُ يا رسول الله ثُمَّ مَهْ؟ قال: ثُمَّ قطيعة الرحم، قال: قلتُ يا رسول الله ثُمَّ مَهْ؟ قالَ: ثُمَّ الأمر بالمنكر والنَّهي عن المعروف. قال المنذري في الترغيب والترهيب: رواه ابو يعلي بإسناد جيد.

واتە: پیاوێك لە(خَثْعم) دەڵێ: چوومە لای پێغەمبەر(ﷺ) لە ناو چەند ئەصحابەیەکیدا بوو، گوتم: ئەتۆی کە دەڵێ ی پێغەمبەری خوام؟ گوتی: بەڵێ، گوتم ئەی پێغەمبەری خوا کام کردەوە خۆشەویسترە لای خوا؟ فەرمووی: باوەڕهێنان بە خوا، گوتم ئەی پێغەمبەری خوا لە پاشان چی؟

فەرمووی: لە پاشان سیلەی رەحم جیٚ بەجیٚ کردن، گوتم ئەی پیٚغەمبەری خوا لە پاشان چ کردەوەیەك فەرمووی لە پاشان: فەرمان کردن بە چاکەو نەهی لە خراپە. گوتم ئەی پیٚغەمبەری خوا کام کردەوە خودا زیاتر رقی لیٚ دەبیٚتەوە؟ فەرمووی: هاوبەش پەیدا کردن بۆ خوا گوتم ئەی پیٚغەمبەری خوا لە پاشان چ کردەوەیەك ؟ فەرمووی: لە پاشان پچراندنی سیلەی رەحم، گوتم ئەی پیٚغەمبەری خوا لە پاشان چی؟ فەرمووی فەرمان کردن بە خراپەو نەهی کردن لە چاکە.

٤- عن ابي بَكرٍ الصدِّيق(رضي الله عنه) قال: يا أيها الناسُ إنَّكُم لَتَقرؤون هذهِ الآيةَ و تَضَعونها على غيرِ مَوْضِعها﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ﴾ (المائدة:١٠٥). وإني سمعت رسول الله(ﷺ) يقول(إنَّ الناسَ إذا رأوا الظالمَ فلَمْ يأخذوا على يَديهِ أوشك أنْ يَعُمَّهُمُ اللهُ بعقابٍ منه. صحيح ابوداود(٤٣٣٨) والترمذي(٣٠٥٧) وابن ماجه(٤٠٠٥).

واتە: ئەبوبەکر(رەزای خوای لیٚ بیٚت) فەرموویەتی: ئەی خەڵکینە ئیٚوە ئەم ئایەتە دەخویٚننەوە دایدەنیٚن لە غەیری شویٚنی خۆی﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ﴾ (المائدة:١٠٥). وە من گویٚم لە پیٚغەمبەر(ﷺ) بووە دەفەرمویٚ ئەگەر خەڵك ستەمکاریان بینی و دەستیان نەگرت ئەو کاتە نزیك دەبیٚ کە خودا

سزایەکی گشتیان بۆ بنێرێ لە لایەن خۆیەوە.

٥- عن حذيفة(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) قال: والذي نفسي بيدهِ لتأمُرُنَّ بالمعروف ولتنهونَّ عن المنكرِ أَو لَيُوشِكَنَّ الله أن يبعث عليكم عِقاباً منه ثم تدعونه فلا يستجاب لكم. صحيح رواه الترمذي(٢١٦٩).

واتە: سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەستە یا ئەوەتە فەرمان دەکەن بە چاکە و جلەوگیری دەکەن لە خراپە یا ئەو کاتە نزیك دەبێ کە خودا سزاو تۆڵەیەکتان بۆ بنێرێ لە لایەن خۆیەوە لە پاشان داوای لێ بکەن وەڵامتان نەدرێتەوە.

## سوود:

خوا دەفەرمویٚ﴿لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ۝٧٨ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ﴾ (المائدة:٧٨- ٧٩).

واتە: نەفرین کرا لەوانەی بێ بڕوا بوون لەبەرەو نەوەی ئیسرائیل لەسەر زمانی داودو عیسای کوڕی مەریەم ئەو نەفرینەش لەبەر ئەوە بوو سەرپێچیان کردو هەمیشە دەست درێژیان دەکرد(٧٨) ئەوانە جڵەوگیری یەکترییان نەدەکرد لە هەر کارێکی بێزراوی بێ شەرعی کە دەیانکرد بێ گومان زۆر بەد بوو ئەوەی کە دەیان کرد.

٦- عن النعمان بن بشير(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: مَثَلُ القائم في حدود الله أو الواقع فيها كَمَثَلِ قَومٍ اسْتهموا على سفينةٍ فصارَ بَعْضُهُم أعلاها وبعضهم أَسْفَلَها إذا استقوا منَ الماءِ مَرّوا على مَنْ فوْقهم، فقالوا: لو أنّا خرقنا في نصيبنا خَرْقاً ولم نُؤذِ مَنْ فوقَنا فإن تَرَكُوهم وما أرادوا هَلكوا جميعاً، وإنْ أخذُوا على ايديهم نَجوا ونَجَوْا جميعاً. رواه البخاري(٢٤٩٣((٢٦٨٦) والترمذي(٢١٧٣).

واته: وێنەی ئەوەی کە فەرمان بە چاکە دەکاو نەهی لە خراپە دەکات لەگەڵ ئەوەی کە گوناح دەکات وەکو کۆمەڵێك وایە قورعەو تیروپشك بکەن لەناو کەشتیەکی دوو قاتدا بۆ دیاری کردنی جێگەی هەر یەکێکیان لە ناو کەشتیەکە جا هەندێکیان قاتی سەرەوەیان بەر بکەوێ و هەندێکیان قاتی خوارەوە وە ئەوانەی کە لە ژێرەوە بوون بۆ ئاو بەسەر ئەوانەی سەرەوەدا دەرۆیشتن، جا ئەوانەی خوارەوە گوتیان: ئەگەر ئێمە لەبەشی خۆمان(لە قاتی خوارەوە) کونێکی لێ بکەین ئیتر ئازاری ئەوانە نادەین کە لە سەرەوەمانن جا ئەگەر ئەوانەی لە سەرەوەن وازیان لێ بێنن لەوەی کە دەیانەوێ( کە کون کردنی کەشتیەکەیە) ئەوە هەموو لە ناو دەچن(چونکە کەشتیەکە پڕ دەبێ لە ئاوو نوقم دەبێ) بەڵام ئەگەر دەستیان بگرن و نەمێڵن ئەوە خۆشیان و ئەوانەی خوارەوەش هەردوو رزگار دەبن.

## سزای ئەوانەی فەرمان دەکەن بە چاکەو نەهی دەکەن لە خراپە خۆشیان بە پێچەوانەی دەکەن:

١-عن أسامة بن زيد بن حارثة(رضي الله عنه) قالَ: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: يُؤتى بالرَّجُل يومَ القيامةِ فَيُلْقى في النار فتَندَلِقُ أقتابُ بَطنِهِ فيَدور بها كما يَدورُ الحمارُ بالرَّحا فيَجتَمعْ إليهِ اهلُ النار فيقولون: يا فلانُ مالكَ؟ ألَمْ تكنْ تأمُرُ بالمعروف وتنهى عن المنكرِ فيقولُ بلى قَد كنتُ آمرُ بالمعروفِ ولا آتيه وأنهى عن المنكر وآتيهِ. **رواه البخاري(٣٢٦٧) ومسلم(٢٩٨٩).**

**تَندلقُ: تخرجُ: دەردێ.**

**اقتاب: کۆیە، تاکەکەی(قِتبْ)ە واتە: ریخەڵۆك.**

**الرَّحا: حجر الطاعون: بەردی هارین.**

**واتە:پیاوێك دەهێنن لە ڕۆژی قیامەت جا فرێ دەدرێتە ناو ئاگر ریخەڵۆکەکانی زگی دەردێن جا ئەویش چۆن کەر بە دەوری بەردی هارین دەسورێتەوە ئەویش بەم شێوەیە بە دەوری خۆیا دەخولێتەوەو ریخەڵۆکەکانی خۆی گێرە دەکات جا خەڵکی ئاگر لە دەوری کۆدەبنەوە دەڵێن ئەی فلانە کەس ئەوە چیتە؟ ئەی تۆ فەرمانت نەدەکرد بە چاکە وە جلەوگیریشت نەدەکرد لە خراپە؟ دەڵێ: بەڵێ: فەرمانم دەکرد بە چاکە بەڵام خۆم نەم دەکرد وە نەهیم دەکرد لە خراپە وە خۆشم دەمکرد.**

**سوود**:

خوا دەفەرمویﵟيَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَﵞ (الصف:٢-٣).

**واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە بۆچی ئەوی دەیڵێن ئەنجامی نادەن(٢) زۆر مایەی ڕق و تورەیی یە لای خوا کە قسەیەك بڵێن کردەوەی پێ نەکەن(٣).**

وە خوای دەفەرمویﵟأَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَﵞ (البقرة:٤٤).

**واتە: ئایا فەرمان بەسەر خەڵکیدا دەدەن بە چاکە وە خۆتان فەرامۆش دەکەن(لەگەڵ ئەمەشدا) کە ئێوە دەوری پەراوەکە(تەورات) دەکەنەوە دەی ئایا ژیر نابن و تێ ناگەن.**

٢- عن أسامة بن زيد بن حارثة(رضي الله عنه) قالَ: قال رسول الله(ﷺ): مَررتُ لَيلةَ أُسريَ بي بأقوامٍ تُقرضُ شفاهُهُمْ بِمقاريضَ مِنْ نارٍ قلتُ مَن هؤلاءِ يا جبريل؟ قال: خُطباءُ أُمَّتِكِ الذين يقولون ما لا يفعلون. **صحيح رواه احمد(٣/١٢٠).**

**واتە: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ئەو شەوەی کە شەوڕۆیم پێ کرا تێپەڕیم بەلای خەڵکانێکدا لێویان بە مقەسی لە ئاگر دەبڕدرا گوتم ئەوانە کێن ئەی جبریل؟ فەرمووی: ووتار بێژی ئوممەتەکەتن ئەوانەی ئەوەی کە دەیانگوت کاریان پێ نەدەکرد.**

٣- عن جندب بن عبدالله(رضي الله عنه) قالَ: قال رسول الله(ﷺ): مَثَلُ الذي يُعَلِّمُ الناس الخير ويَنسى نفسَهُ كَمثَلِ السِّراج يُضيءُ للناسِ ويَحرقُ نَفسَهُ. صحيح رواه الطبراني في الكبير.

واته: وێنەی ئەو کەسەی کە خەڵك فێری چاکە دەکات و خۆشی لەبیر دەکات وەکو چرا وایە رووناکی دەدات بە خەڵك و خۆیشی دەسوتێنێ.

## روون کردنەوەی زیاتر
## لەسەر فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە:

١-لە قورئان و سوننەت زۆر گرنگی بەم بابەتە دراوە دەتوانم بڵێم زۆر لە موسڵمانان ئەم بابەتە وەکو خۆی تێینەگەیشتون ئەگەر فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە رابگیرێ نەفامی و گومرایی و سەر لێشێواوی و بەدرەوشتی و زوڵم زۆرداری بڵاو دەبێتەوە لەسەر زەوی موسڵمانانیش ئەگەر هەرچی گوناهی گەورەو گچکە هەیە ببینێ و خۆی لێ بێدەنگ بکات تووشی گوناهە گەورەکان دەبێت بەم بێدەنگیەی.

٢- ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە یاساو رێسای خۆی هەیە ئەگەر موسڵمان نەیان زانی لەوانەیە تووشی کاری نەویستراو بێت کاری وا بکات زیانی زیاتر بێت لە قازانجەکەی.

٣- ئەگەر ویستمان مونکرێك بگۆرێن چی دەکەین: یەکەم: پێناسەی مونکەرەکە دەکەین بۆ کەسەکە پێی دەڵێ ئەم کارەی تۆ شەرعی نی یە جائیز نی یە خوا وا دەفەرموێ پێغەمبەر وا دەفەرموێ چونکە خەڵکانێکی زۆر هەن کە گوناهێك دەکەن نازانن کە گوناهە یا خەڵکی وا هەیە دەشزانی کە گوناهە کە تۆ پێناسەی گوناهەکەی بۆ دەکەی لەوانەیە وازی لێ بێنێ.

یا کەسی وا هەیە گوناهێك دەكات نازانێ ئەم گوناهە گەورەیە ئەگەر تۆ بە شێوەیەكی جوان بۆی روون بكەیتەوە ئەمەش لەوانەیە تەنها بەمەندە واز لە گوناهەكە بێنێ.

دووەم: ئەگەر مەرحەلەی یەكەم سوودی نەبوو ئەوە دێیە سەر مەحەلەی دووەم ئامۆژگاری دەكەین خوای بە بیر دەهێنینەوە.

سێ یەم: ئەگەر مەرحەلەی دووەم سوودی نەبوو دێینە سەر مەرحەلەی سێ یەم كە بە توندی قسەی لەگەڵ دەكرێ و خۆی لێ توورە دەكرێ بە مەرجێك لە سنووری ئەدەب نەچێتە دەر.

چوارەم: ئەگەر مەرحەلەی سێیەم سوودی نەبوو دێینە سەر مەرحەلەی چوارەم كە گۆرینی مونكەرەكەیە بە دەست، ئەم خاڵی چوارەمەش ووردەكاری خۆی هەیە.

٤- ئەگەر زانیمان گوناهێك كە دەمانەوێت لای بدەین خراپەیەكی گەورەتر بەدوای دا دێت ئەوە جائیز نی یەو حەرامە ئەم كارە بكەیت.

٥- پێویستە كە موسڵمان فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپە دەكات بە مەبەستی خودا بیكات نەك مەبەستێكی تر وەك ئەوە پێ ی بڵێن ئازایە.

٦- نەرم و نیانی زۆر گرنگە لە كاتی خۆی لە فەرمان كردن بە چاكە و نەهی لە خراپە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ:(ما كان الرِّفقُ في شىءٍ إلاّ زانه).

واتە: نەرم نیانی لە هەر شتێك دا هەبێت ئیللا جوانی دەكات، خودا كاتێك موساو هارونی نارد بۆ لای فیرعەون پێ فەرموون﴿ٱذۡهَبَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ﴾ (طه:٤٣- ٤٤).

واتە: هەردووكتان برۆن بۆ لای فیرعەون چونكە بە ڕاستی لە سنوور

دەرچووەو یاخی بووە(٤٣) جا قسەی لەگەڵ بکەن بە نەرم و نیانی بەڵکو بیربکاتەوە یا بترسیٚ(لە سزای خوا).

٧- ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە لەسەر کەسیٚ واجب دەبێت کە منداڵ نەبیٚ و بالغ بێت و شێتیش نەبێت کافر نەبیٚ و موسڵمان بێت وە توانای هەبێت.(أن يكون المنكِرُ مُكلَّفاً مسلماً قادراً).

٨- وە ئەگەر زانی ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپەی سوودی نی یە بەڵام نەدەترسا ئەگەر بیکات تووشی نارەحەتی بێت ئەوە لەسەری واجب نابێت لەبەر ئەوەی سوودی نی یە بەڵام سوننەتیشە بیکات.

٩- وە ئەگەر زانی لەگەڵ ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپەکەی تووشی نارەحەتی دەبێت بەڵام خراپەکە لادەچیٚ وەك ئەوەی بتلە عارەقەکە برژیٚ و بزانیٚ لە دوای ئەوە لیٚ ی دەدریٚ ئەو کاتە لەسەری واجب نابیٚ بەڵام لەم حالەتەش سوننەتە ئەگەر پیٚ ی هەڵبستێت.

١٠- موسڵمان ئەگەر زانی مونکەرەکە بە قسەی ئەو بە فیعلی ئەو لادەچیٚ بەبیٚ ئەوەی تووشی نارەحەتی بێت ئەوە واجبە لەسەری هەوڵ بدات لای ببات. بەڵام ئەگەر زانی قسەکەی سوودی نی یە وە ئەگەر قسە بکات لیٚ ی دەدریٚ ئەو کاتە واجبەکەی لەسەر لا دەکەویٚ.

١١- منداڵ ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپەی لەسەر واجب نی یە بەلام ئەگەر بیکات پاداشتی لەسەر وەردەگری.

١٢- قال بلال بن سعد(إنَّ المعصية اذا أُخفيت لم تَضُرَّ إلاّ صاحبها فإذا أُعلنت ولم تُغير أَضرّت بالعامّة) .

واتە: ئەگەر گوناح ئەگەر بە شاراوەیی کرا تەنها زیان بە خاوەنەکەی دەگات بەڵام ئەگەر بە ئاشکرا کراو نەگۆڕرا ئەو کاتە زیانەکەی گشت گیر دەبێت. موسڵمان ئەگەر گوناهێك بە ئاشکرا بکرێت ئەوجا ئەمر بە چاکە

نەهی لە خراپەی لەسەرە نەك گوناهێك بە شاراوەیی بكرێت بچی تجسسی لەسەر بكەیت ئەمە جائیز نی یە.

١٣- یاساو رێسای ئەمر بەچاكەو نەهی لە خراپە لەگەڵ دایك و باوك دا جیاوازە لەگەڵ كەسانی تر، لێدان و قسەی توندو تیژ بۆ دایك و باوك نەهاتووە بەڵكو ئەگەر بۆ كەسانی تریش گەیشتە مەرحەلەی لێدان ئەوە پێویستی بە ئیمام هەیە چونكە لەوانەیە سەر بكێشێ بۆ فیتنە. جا لەگەڵ دایك و باوك یەكەم جار پێناسەی خەراپەكەی بۆ دەكەی ئەگەر وازی نەهێنا ئامۆژگاری دەكەی بە نەرمی ئەگەر وازی نەهێنا دەتوانی بتلەعەرەقەكەی لێ برژێنی و لەم شێوانە وە بشزانە ئەزیەت دانی دایك و باوك كەم بێت یا زۆر لە گوناهە گەورەكانە.

١٤- العلم قبل القول والعمل:

یەكێك لەو سیفەتانەی كە پێویستە كەسی فەرمان كار بە چاكەو نەهی لە خراپە هەیبێ ئەوەیە بزانێ چاكە چییەو خراپە چییە وەهەروەها بزانێ لە چ كاتێك فەرمان بە چاكە دەكات و لە چ كاتێك رێگا لە خراپە دەگرێ وە ئەو هەنگاوانەی چیە دەیهاوێ.

عومەری كوڕی عبدالعزیز(رەحمەتی حوای لێ بێت) دەفەرمووێ(من عبدَالله بغيرِ علم كان ما يفسدُ اكثرُ مما يُصلح).

واتە: هەر یەكێك خوا بپەرستێ بەبێ عیلم ئەوەی خراپی دەكات زیاتر دەبێت لەوەی كە چاكی دەكات.

# اَلصَّبْرُ: ئارام گرتن

١-الصبر: له زمانەوانی دا واته: الحبس یانی: گرتن.

٢- الصبر ثلاثة انواع: صبر علی الطاعة، وصبر عن المعصیة وصبر علی البلاء.

واته: ئارام گرتن سێ جۆره: ئارام گرتن لەسەر فەرمانبەریی (الطاعة). وەئارام گرتن لەسەر نەکردنی گوناه، وەئارام گرتن لەسەر ناخۆشیو نەخۆشیو نارەحەتیەکان.

٣- پێچەوانەی(صبر) (جَزَع)ە واته: ئارام نەگرتن.

بەم شێوەی کە سەبر دابەش دەبێت بۆ پێنج بەش بەم جۆرەیە:

١-سەبری واجب: سەبر گرتن لەسەر نەکردنی شتە حەرام کراوەکان واجبە، سەبرگرتن لەسەر کردنی شتە واجبەکان واجبە، سەبرگرتن لەسەر بەلاو موسیبەتەکان واجبە.

٢- سەبری قەدەغە کراو(محذور): ئەوەیە وەك ئەوە سەبر بگری لەسەر خواردنی گۆشتی بەرازو مردارەوە بوو.

٣- سەبری مەندوب: واتە ئەگەر بیکەی چاکەو خێرت بۆ دەنوسرێ ئەو شتانەی سوننەتە بیکەی ئەوە سوننەتە سەبر لەسەر کردنیان بگری. وە ئەو شتانەی مەکروهە سوننەتە سەبر لەسەر نەکردنیان بگری، وە کەسێك کە خراپەت لەگەڵ دا دەکات سوننەتە سەبر لەسەر رەدنەدانەوەی بگری.

٤- سەبری(مەکروه): سەبرگرتن لەسەر کارێك کە مەکروهە بیکەی ئەوە سەبری مەکروهە سەبرگرتن لەسەر نەکردنی سوننەتەکان ئەوە سەبری مەکروهە.

٥- سەبری حەڵاڵ(مباح): ئەمەش سەبرگرتنە لەسەر کردنی شتێك یا نەکردنی کە ئەگەر بیکەی یا نەیکەی نە خێرت بگاتێ نە گوناح.

خوا دەفەرموێ﴿قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۗ وَأَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ ۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ (الزمر:١٠).

واتە: ئەی موحەمەد بڵێ خوا دەفەرموێ ئەی بەندە ئیماندارەکانم لە(سزای) پەروەردگارتان خۆ بپارێزن کەسانێ لەم دونیایەدا چاکەیان کردووە پاداشتی چاکیان بۆ هەیە وە زەوی خوا فراوانە بە ڕاستی تەنها ئارام گران بێ ژمار پاداشتیان دەدرێتەوە.

وە دەفەرموێ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓا۟ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ﴾ (البقرة:١٥٥-١٥٧).

واتە: سوێند بە خوا تاقیتان دەکەینەوە بە هەندێك لە ترس و برسێتی و کەم بوونی ماڵ و دارایی و خەڵکی( کەس و کارتان)و بەروو بووم جا مژدە بدە بە خۆڕاگران(١٥٥) ئەوانەی کە لەگەڵ دووچاری موسیبەتێك بوون دەڵێن:(إنا لله وإنا إليه راجعون) ئێمە هەر هی خواین و هەر بۆ لای

ئەو دەگەڕێینەوە(١٥٦) ئا ئەوانە درووودوو بەزەیی بەسەر ئەواندا دەبارێ لە لایەن پەروەردگاریانەوە وە ئەوانە ئەو کەسانەن هیدایەتیان وەرگرتووە(١٥٧).

١-عن سعيد بن ابي وقاص(رضي الله عنه) قال: قُلتُ يا رسول الله أيُّ الناسِ أشدُّ بلاءً؟

قالَ: الأنبياءُ، ثُمَّ الأمثلُ فالأمثلُ فيُبتَلى الرَّجُلُ على حسب دينه: فإن كانَ دينُهُ صُلْباً اشتَدَّ بلاؤه، وإنْ كان في دينه رِقَّةٌ ابتُلي على حَسبِ دينه، فما يبرحُ البلاءُ بالعبد حتى يتركهُ يمشي على الارض ما عليه خطيئة. **حسن صحيح رواه الترمذي(٢٣٩٨) وابن ماجة(٤٠٢٣).**

**واتە: سەعدی کوڕی باوکی وەققاص(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کام لە خەڵکان تووشی تاقی کردنەوەی توندتر دێن بە موسیبەت و نارەحەتی، فەرمووی: پێغەمبەران ، لە پاشان ئەوانەی زیاتر بەوان دەچن، ئەوجا ئەوانەی زیاتر بەوان دەچن، پیاو بە گوێرەی دینەکەی تاقی دەکرێتەوە ئەگەر ئیمانەکەی بەهێز بێت بەڵاو موسیبەتەکەی توندتر دەبێت، بەڵام ئەگەر ئیمانەکەی بێ هێز بێت بە گوێرەی ئایینەکەی تاقی دەکرێتەوە، جا بەردەوام بەڵاو موسیبەت تووشی بەندە دەبێ تاوای لێ دەکات لەسەر زەوی دەڕوات هیچ گوناحێکی لەسەر نی یە.**

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ):(مَنْ يُردِ اللهُ به خيراً يُصبْ منه) **رواه البخاري(٥٦٤٥).**

**واتە: ئەگەر خوا خێری بۆ یەکێك بوێ تاقی دەکاتەوە بە موسیبەت و**

نارەحەتی.

٣- عن جابر(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): يودّ أهل العافية يومَ القيامة حين يُعطى أهل البلاءِ الثواب لو أنّ جلودهم كانت قُرِضَتْ في الدنيا بالمقاريض. حسن رواه الترمذي(٢٤٠٢).

١-اهل العافية: ئەوانەی سەلامەت بووینە لە دونیا.

٢- كانت قرضت: ببڕدرابا.

٣- المقاريض: كۆیە تاكەكەی(مقراض)ە ئەوەیە كە بەرگی پێ دەبردرێت.

مانای فەرموودەكە: لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانەی كە لە دونیادا سەلامەت و دوور لە نارەحەتی بوینە كە دەبینن ئەوانەی كە لە دونیادا تووشی نارەحەتی هاتوون چەند پاداشت وەردەگرن حەز دەكەن لە دونیادا پێستیان بە مەقەس ببڕدرابا.

٤- عن أنس(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): إذا أراد الله بعبدهِ الخير عَجَّل لهُ العقوبةَ في الدنيا، وإذا أرادَ اللهُ بعبدهِ الشَرَّ أمسك عنهُ بذَنبهِ حتّى يُوافِيَ بهِ يومَ القيامة. حسن صحيح رواه الترمذي(٢٣٩٦).

واتە: ئەگەر خوا خێری بوێ بۆ بەندەی خۆی ئەوە زوو لە دونیادا تۆڵەی لێ دەستێنێ وە ئەگەر خوا بیەوێ بەندەی خۆی سزا بدات دەیهێڵێتەوە بە گوناهەكانیەوە تا لە ڕۆژی دوایی دا تۆڵەی لێ دەسێنێتەوە.

٥- عن عطاءِ بن أبي رباح قالَ: قالَ لي ابنُ عباس(رضي الله

عنهما: ألا أُريك امرأةً من أَهلِ الجنة؟ فقلت: بلى

قال: هذه المرأةُ السَّوداءُ أتَتِ النَّبيَّ(ﷺ) فقالَتْ: إنّي أُصْرَعُ. وإنّي أَتَكَشَّفُ فادعُ الله تعالى لِي قال:(إنْ شِئْتِ صَبَرْتِ ولَكِ الجنَّةُ وإنْ شئتِ دَعَوتُ الله تعالى أنْ يُعافيَكِ) فقالت: أصْبِرُ، فقالت:إنّي أتَكَشَّفُ فادْعُ اللهَ أنْ لا أتكشَّفُ، فدَعا لَها. رواه البخاري(٥٦٥٢) ومسلم(٢٥٧٨).

واتە: عەطائى كوڕى ئەبى ڕەباح(ڕەزاى خواى لىٚ بيٚت) دەڵىٚ: عبدالله كوڕى عەبباس(ڕەزاى خواى لىٚ بيٚت) پىٚ ى گوتم ئايا ئافرەتيٚكى بەهەشتيت نيشان بدەم؟ گوتم بەڵىٚ، ابن عباس گوتى: ئەم ئافرەتە ڕەشە هاتە لاى پيٚغەمبەر(ﷺ) گوتى: من پەركەم و فىٚ دەگرم و جەستەم بەدەردەكەوىٚ لە خواى گەورە بپاريٚوە بۆم(كە چاكم بكاتەوە) پيٚغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: ئەگەر حەز دەكەى ئارام بگرى و بەهەشتت بۆ ببىٚ وە ئەگەر حەز دەكەى لە خواى گەورە دەپاريٚمەوە كە چاكت بكاتەوە، ئافرەتەكە گوتى ئارام دەگرم بەڵام لە كاتى پەركەمەكەم لەشم بەدەر دەكەوىٚ دوعام بۆ لە خوا بكە كە لەشم بەدەرنەكەوىٚ جا پيٚغەمبەر(ﷺ) بۆى پارايەوە.

٦- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): ما يزالُ البلاءُ بالمؤمنِ والمُؤْمِنَةِ في نَفْسِهِ وَولدِهِ ومالِهِ حتى يَلقى الله وما عليه خطيئةٌ. حسن صحيح رواه الترمذي(٢٣٩٩).

واتە: بەردەوام بەڵاو موسيبەت تووشى پياوى بڕوادارو ئافرەتى بڕوادار دەبيٚت لەنەفسى خۆى وماڵ و منداڵى تاوەكو بەخوا دەگات هيچ گوناهيٚكى لەسەر نى يە.

٧- عن أنس عن رسول الله(ﷺ) قال: إنَّ عِظَمَ الجزاءِ مع عِظَمِ البلاءِ، وإِنَّ اللهَ إذا أَحَبَّ قوماً ابتلاهُم، فَمَنْ رَضيَ فلهُ الرِّضا ومَنْ سَخطَ فَلَهُ السَّخَطُ. حسن رواه الترمذي(٢٣٩٦) وابن ماجه(٤٠٣١).

عِظَم الجزاء: واته:(عظمة الثواب) گەورەیی پاداشت.

واته: بێ گومان گەورەیی پاداشت لەگەڵ گەورەیی بەلاّو موسیبەتە وە بێ گومان ئەگەر خوا قەومێکی خۆش بۆی تاقیان دەکاتەوە جا هەر یەکێك رازی بێت ئەوە رەزامەندی بۆ هەیە وە هەر یەکێکیش نارازی بێت ئەوە ناڕازی بۆ هەیە(لەلایەن خواوە).

## سوود:

بۆ ئەوەی موسڵمان لەسەر موسیبەتەکەی پاداشت وەربگرێ دەبێ ئەمانە بکات:

١-بە دڵ گلەیی و گازاندە لە خوا نەکات.

٢- بە زمان شتێك نەڵێت کە پێچەوانەی سەبر بێت وەك ئەوە بە دەنگی بەرز بگریێ بۆ مردوو.

٣- بە دەست و ئەندامەکانی شتێك نەکات پێچەوانەی سەبر بێت وەك لە روومەت دان یەخە دادرین پرچ دەرهێنان.

٤- لە یەکەم کاتی موسیبەتەکەش سەبری هەبێت پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویٚ(إنّما الصبر عند الصدمة الأُولى).

٥- هەموو ئەوانەش کە دەکات دەبێ لەبەر خوا بیکات.

٨- عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): اذا ابتلى اللهُ المسلمَ ببلاء في جسدهِ قال الله لِلْمَلَك اكْتُبْ لَهُ صالح عَمَله الذي كان يعمل وإنْ شفاهُ غَسَلَهُ وطهَّرَهُ وإنْ قبضَهُ غفر لَهُ

وَرَحِمَهُ. حسن رواه أحمد(صحيح الجامع- ٢٥٨).

واتە: ئەگەر خودا موسڵمانێك تاقی بكاتەوە بە بەڵاو موسیبەتێك لە جەستەی دا خودا بە فریشتە دەفەرموێ: هەموو ئەو كردەوە چاكانەی كە پێشتر دەیكرد(ئێستا ناتوانێ بیكات) بۆی بنوسە، وە ئەگەر شیفای بدات ئەوە دەیشواو پاكی دەكاتەوە(لە گوناح) وە ئەگەر بیمرێنێ ئەوە لێ ی خۆش دەبێت و رەحمی پێ دەكات.

## سوود:

هەروەكو لە فەرموودەی(صحیح)ی پێغەمبەردا هاتووە هەر یەكێك نەخۆش كەوت یا سەفەر بكات ئەو كارە چاكانەی كە پێشتر كردوونی لەم دوو كاتەدا بۆی ناكرێ خودا هەمووی بۆ دەنووسێ.

٩- عن أبي سعيد الخدري وأبي هريرة(رضي الله عنهما) عن النبي(ﷺ) قال: ما يُصيبُ المُسْلِمَ من نَصَبٍ ولا وَصَبٍ ولا هَمّ ولا حَزَنٍ ولا أذىً ولا غَمّ حتى الشَّوكَةُ يُشاكها إلاّ كَفَّرَ اللهُ بِها مِن خطاياهُ. رواه البخاري(٥٦٤١) ومسلم(٢٥٧٣).

١-النَّصبُ: واتە: التَّعب یانی: ماندوو بوون.

٢- الوَصَبُ: واتە: المرضُ، یانی: نەخۆشی.

٣- هَمّ: قيل: ان الهم ينشأ عن الفكر فيما يتوقع حصوله مما يتاذى به، واتە: گوتراوە: (هم) خەمێكە پەیدا دەبێت لە بیركردنەوە لە ئازارێك كە تەوقوع دەكەی دووچارت بێت.

٤- الحزن: قيل: يحدث لفقد ما يشق على المرء فقده، واتە: گوتراوە: خەمێكە پەیدا دەبێت بە هۆی لە دەست دانی شتێك كە زەحمەتە لەسەر

ئینسان.

٥- اذى: قيل: هو خاص بما يلحق الشخص من تحدى غيره عليه، واته: گوتراوه ئەوه تایبەته بەو ئازارەی کە ئینسانێك بە هۆی دەست درێژی غەیری خۆیەوە پێ ی دەگات.

٦- الغم: قيل: كرب يحدث للقلب بسبب ما حصل، واته: گوتراوه دڵتەنگیەکە پەیدا دەبێت بەهۆی ئەوەی رووی داوه.

مانای فەرموودەکە: هەر شتێك تووشی موسڵمان بێت لە ماندوو بوون و نەخۆشی و خەم و خەفەت و ئازارو دڵتەنگی تەنانەت چقل(درك)ێك کە تێبرا دەچێ ئەوە خوا بەهۆی ئەوانەوە لە تاوانەکانی دەسڕێتەوه.

١٠- عن أُسامة بن زيد قال: كنا عند النبي(ﷺ) إذ جاءَهُ رسول احدى بناته تدعوه الى ابنها في الموت، فقال النبيُّ(ﷺ) إرجع فأَخْبِرها انَّ لله ما أَخَذَ ولَهُ ما أعطى، وكل شيءٍ عندهُ بأجلٍ مسمّىً فَمُرْها فَلْتَصْبِر وَلْتَحتَسِبْ، فأعادت الرَّسُول أنها قد أقسمت ليأتِينَّها، فقام النبي(ﷺ) وقام معه سعد بن عبادة، ومعاذ بن جبل فَدُفِعَ الصَّبي إليه ونفسُهُ تَقَعْقَعُ كأنّها في شَّن، ففاضَت عيناهُ، فقال له سعد: يا رسول الله ما هذا؟ قال: هذه رَحْمَةٌ جعلها اللهُ في قلوب عباده وإنّما يَرحَمُ اللهُ من عبادِهِ الرحماء. رواه البخاري(٧٣٧٧) ومسلم(٩٢٣).

واته: ئوسامەی کوڕی زەید(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئێمە لای پێغەمبەر بووین(ﷺ) نێرراوی یەکێك لە کچەکانی هاتە لای کە کوڕەکەی لە حالەتی گیان سپاردن دایە پێغەمبەر(ﷺ) بچێ بۆ لایان، جا پێغەمبەر(ﷺ) بە نێرراوەکەی فەرموو: بگەرێوه وه خەبەر بە کچەکەم بدە کە بێگومان

ئەوەی خوا دەیبا ئی خۆیەتی وە ئەوەش کە دەیدا هی خۆیەتی وە هەموو شتێکیش لای خوا ماوەیەکی دیاری کراوی هەیە، جا فەرمان بە کچەکەم بکە با سەبرو ئارام بگرێ وە سەبرو ئارام گرتنەکەشی بە مەبەستی وە دەست هێنانی پاداشت بێت لە لایەن خواوە جا کچەکەی نێرراوەکەی ناردەوە کە سوێندی خواردووە(واتە کچەکەی) دەبێ پێغەمبەر(ﷺ) هەر بچێتە لای جا پێغەمبەر(ﷺ) هەستا وە سەعدی کوڕی عوبادەو موعازی کوڕی جەبەلیش لەگەڵی هەستان(چوون بۆ لای کچەکەی) جا منداڵەکەیاندا بە پێغەمبەر (ﷺ)، منداڵەکە گیانی دەداو دەنگی دەهات وەکو دەنگی ئاو کە لە کوندەیەکی کۆن دەکرێ جا پێغەمبەر(ﷺ) فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە سەعد پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە چی یە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە رەحمەتێکە خودا دایناوە لە دڵی بەندەکانی وە خودا تەنیا لە ناو بەندەکانی رەحم بەوانەیان دەکات کە بەرەحمن.

**سوود**:

پێغەمبەر(ﷺ) کە نێردراوەکەی ناردووە پێ ی فەرموو کە بە کچەکەی بڵێ ئارام بگرێ و ئارام گرتنەکەی بە مەبەستی وەدەست هێنانی پاداشت بێت، کەواتە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە دوو شت پێ کرد لە بەرامبەر موسیبەتەکە، یەکەم ئارام گرتن کە بە دڵ بە زمان بە ئەندامەکانی شتێکی وا نەکات کە پێچەوانەی(صبر) بێت، دووەم: ئەو سەبر و ئارام گرتنەشی بە مەبەستی وەدەست هێنانی پاداشت بێت لە لایەن خواوە، جا ئەگەر یەکێك سەبر بگرێ بەڵام بە مەبەستی پاداشت نەبێت لە لایەن خوداوە خێری بۆ نانوسرێ.

## له سزاکانی گوناح و سەرپێچی له دونیادا:

خوا دەفەرموی﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ﴾ (الشوری:٣٠).

واته: وه هەر ناخۆشی و موسیبەتەکتان تووش بووبێ ئەوه به هۆی کردەوەی(خراپی) خۆتانەوەیه، وه له زۆرێکیش(له کردەوه خراپەکانتان) دەبورێ(نه له دونیا نه له قیامەت تۆڵەتان لێ ناکاتەوه).

وه خوا دەفەرموێ﴿مَّآ أَصَابَكَ مِنۡ حَسَنَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٖ فَمِن نَّفۡسِكَۚ وَأَرۡسَلۡنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولٗاۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا﴾ (النساء:٧٩).

واته: هەر چاکەیەکت تووش بوو ئەوه له خواوەیه وه هەر خراپەیەکت تووش بوو ئەوه له خۆتەوەیه(واته به هۆی ئەو گوناهانەیه که کردووته) وه ئێمه تۆمان ناردووه به فروستاده بۆ خەڵکی وه خوا بەسه شایەدی ئەوه بدات.

وه خوا دەفەرمووێ﴿ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعۡضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾ (الروم:٤١).

واته: خراپه بەسەرهاتی خراپ و زیان و دەردو بێ ئارامی دەرکەوت به هۆی ئەو خراپانەی خەڵکی کردوویانه بۆ ئەوەی پێیان بچەژێ هەندێ

له تۆڵەو سزای ئەو تاوان و خراپەی کردیان بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە له خراپەکاری.

وه خوا دەفەرموێ﴿وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ﴾ (طه:١٢٤).

واته: هەر کەسێك ڕوو لە بەرنامەی من وەربگێڕێ ئەوە بێگومان گوزارانێکی تەنگ و تاڵی دەبێت(له دونیادا) وه له ڕۆژی دواییشدا حەشری دەکەین بە کوێرەیی.

## نەخۆش کەوتن

١-عن البراء بن عازب(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): ما اخْتَلجَ عرقٌ ولا عَينٌ إلاّ بذنبٍ وما يَدْفَعُ الله عنه اكثر. **رواه الطبراني في الاوسط والضياء المقدسي بسند صحيح.**

**واته: هیچ دەمار وەرگەڕانێك و چاو سوڕانێك(و نەخۆشیەك تووشی مرۆڤ نایەن) بە هۆی گوناحەوە نەبێت وه ئەوەش خوا لێ ی لادەدا زیاترە.**

**سوود:**

**١-سولەیمانی دارانی دەڵێ: إنّي لأمرضُ فأَعرفُ الذَّنبَ الذي أمرضُ بهِ[1].**

**واته: من نەخۆش دەکەوم دەزانم ئەو گوناهە چی یە کە پیّ ی نەخۆش دەکەوم.**

---

(1) صفة الصفوة.

٢- ئیمام عەلی(رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ(ما نَزلَ بلاء إلاّ بذنبٍ ولا يُرفَعُ إلاّ بتوبةٍ)[١].

واتە: هیچ ناخۆشی و نارەحتیەك نایەتە سەر ئادەمیزاد بە هۆی گوناهەوە نەبیٚت وەلاش ناچیٚت بە گەرانەوەو تۆبە نەبیٚت.

## کاریگەری گوناح لەسەر رسق و رۆزی:

١- عن ثوبان قال: قال رسول الله(ﷺ): لا يزيدُ في العُمرِ إلاّ البرُّ ولا يَرُدُّ القَدَرَ إلاّ الدعاءُ وإنَّ الرَّجُل لَيُحْرَمُ الرِّزقَ بِخَطيئةٍ يَعْمَلُها[٢].

واتە: تەنها چاکەکاری تەمەن زیاد دەکات وە بەس پارانەوە قەدەر دەگیٚریٚتەوە وە جاری وایە کابرا رۆزیەکی لیٚ دەگیریٚتەوە بەهۆی گوناهیٚکەوە کە دەیکات.

## ناوو بانگ زرانو رق لیٚبوونەوەی

١- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): إنَّ الله اذا أحبَّ عبداً دعا جبريل فقال: إنِّي أُحبُّ فُلاناً فأَحِبَّهُ، قال: فَيُحِبُّهُ جبريلُ ثُمَّ يُنادي في السماءِ فيقول: إنَّ الله يُحبُّ فُلاناً فأحِبُّوهُ فَيُحِبُّهُ أهلُ السماءِ قال: ثُمَّ يوضَعُ لَهُ القبولُ في الأرض وإذا أبغض

---

(1) الجواب الكافي/ ابن القيم.

(2) رواه ابن ماجه(٩٠) وسنده حسن كما في الزوائد وحسنه الشيخ الالباني دون (وإن الرجل ليُحرم الرزق بخطيئةٍ يعملُها.

عبداً دعا جبريلَ فيقول: إني أُبغضُ فلاناً فَأَبْغِضْهُ قال: فَيُبْغِضُهُ جبريلُ، ثُمَّ يُنادي في أهلِ السماء: إن الله يُبْغِضُ فلاناً فَأَبْغِضُوهُ فَيُبْغِضونَهُ، ثُمَّ تُوضَعُ لَهُ البغضاءُ في الأرضِ. رواه البخاري(٣٢٠٩) ومسلم(٢٦٣٧).

واته: بێگومان خوا ئەگەر بەندەیەکی خۆش بوێت بانگی جبریل دەکات دەفەرموێ: من فلانە کەسم خۆش دەوێت تۆش خۆشت بوێ. فەرمووی: جبریل ئەو کەسەی خۆش دەویٚ لە پاشان جبریل بانگ دەکات لە ناو خەڵکی ئاسمان دەفەرموێ: بێ گومان خوا فلانە کەسی خۆش دەوێت ئێوەش خۆشتان بوێت خەڵکی ئاسمانیش خۆشیان دەوێت فەرمووی: لە پاشان ئەو کەسە وەردەگیری لە دڵی خەڵکی زەوی داو خۆشەویست دەبێت، وە ئەگەر خوا رقی لە بەندەیەك بێتەوە بانگی جبریل دەکات دەفەرموێ: من رقم لە فلانە کەس دەبێتەوە تۆش رقت لێی بێتەوە. فەرمووی: جبریل رقی لێی دەبێتەوە لە پاشان بانگ دەکات لەناو فریشتەکانی ئاسمان خوا رقی لە فلانە کەس دەبێتەوە جا ئێوەش رقتان لێی بێتەوە ئەوانیش رقیان لێ ی دەبێتەوە لە پاشان رق لێ بوونەوە لەو کەسە لە دڵی خەڵکی سەر زەوی دادەنرێت.

**سوود:**

خوا دەفەرموێ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا ﴾ (مريم:٩٦).

واتە: بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیشیان کردووە خوای میهرەبان خۆشەویستیان دەکات(لە دڵی باوەڕداران دا).

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): ما من عبدٍ إلاّ ولَهُ صيتٌ في السماء، فإن كانَ صيتهُ حسناً وُضِعَ في الارض وإنْ كانَ صيتهُ في السماء سيِّئاً وُضِعَ في الأرض. رواه البزار بسند صحيح.

واته: هيچ بەندەيەك نى يە ئيللا ناوبانگى هەيە لە ئاسمان دا جا ئەگەر ناوبانگى لە ئاسمان باش بێت ئەوە لە زەويشدا ناوبانگى باشى بۆ دادەنرێ وە ئەگەر ناوبانگى لە ئاسمان دا خراپ بێت ئەوە لە زەويشدا ناوبانگى خراپى بۆ دادەنرێ.

## ناكۆكىو نەمانى خۆشەويستى:

١- عن أنس(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): ما توادَّ اثنان في الله فَيفرّق بَينهما إلاّ بذنبٍ يُحدثُهُ أحدهما. رواه البخاري في الادب المفرد بسند صحيح.

واته: هيچ دوو موسڵمانێ لەبەر خوا يەكتريان خۆش نەويستووە لە پاشان جياوازى كەوتبێتە نێوانيانەوە ئيللا بە هۆى گوناهێكە كە يەكێكيان ئەنجامى داوە.

٢-عن نعمان بن بشير(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: لَتُسَوُّنَ صُفُوفَكُمْ أو لَيُخالِفَنَّ الله بينَ وجُوهِكُمْ. رواه البخاري(٧١٧) و مسلم(٤٣٦).

واته: سوێند بە خوا يا ريزەكانتان(لە نوێژدا) رێك دەخەن يا خودا دژايەتى و ناكۆكى و دووبەرەكى دەخاتە ناوتانەوە.

**سوود**:

پێویستە لەسەر ئەو کەسانەی نوێژی بە کۆمەڵ دەکەن کەوا ریزەکانیان رێك و پڕبکەنەوەو بۆشایی لە نێوانیان دا نەهێڵن.

## سووك و ریسوا بوون:

٧- عن ابن عمر(رضي الله عنه) قال: صَعدَ رسول الله (ﷺ) المنبرَ فَنادى بِصوتٍ رَفِيع فقال: يا مَعْشَرَ مَنْ أسلم بلسانهِ ولَمْ يُفْضِ الإيمانُ إلى قلبهِ لا تُؤذوا المسلمين ولا تُعَيِّروهُم ولا تتبعوا عوراتهم فإنَّهُ مَن تَتَبَّعَ عورةَ أخيه المسلم تَتَبَّعَ اللهُ عورته ومَنْ تتبَّع الله عورَتَهُ يَفضَحُه ولو في جوفِ رحلهِ. **حسن** رواه الترمذي(٢٠٣٢).

١-لم يفض: لم يصل، نەگەیشتوە.

٢- لا تعيروهم: لا تعيبوهم، عەیبیان لێ مەگرن.

٣- يفضحه: ئابرووی دەبا.

٤- جوف رحله: وسط منزله، لە ناو ماڵی خۆی.

واتە: ابن عمر(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) سەرکەوتە سەر مینبەر بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد:

ئەی ئەوانەی کە بە زمان موسڵمان بوینەو باوەڕی(تەواو) نەچۆتە ناو دڵی ئەزیەتی موسڵمانان مەدەن، عەیبیان مەدەنە پاڵ، شوێنی عەیب و کەم و کوریان مەکەون، بێگومان هەر کەسێك شوێنی عەیب و عاری برای موسڵمانی بکەوێ خودا شوێنی عەیب و عاری دەکەوێ وە هەر کەسێکیش خودا شوێنی عەیب و عاری بکەوێ ئابرووی دەبا ئەگەر لە ناو ماڵی خۆشی دابێت.

## تووش بوون بە تۆڵەو سزای خودا:

٨- عن حذيفة بن اليمان(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ): والذي نفسي بيدهِ لتأمُرُنَّ بالمعروف وَ لَتَنهَوُنَّ عن المنكر، أو لَيُوشِكَنَّ اللهُ أنْ يبعث عليكم عقاباً منهُ ثُمَّ تَدعونَهُ فلا يُستجابُ لَكُم. حسن رواه الترمذي(٢١٧٦).

عقاب: تۆڵە، تۆڵەو سزا.

واتە: سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەستە یا ئەوەتە فەرمان بە چاکە دەکەن و جلەوگیری دەکەن لە خراپە، یا ئەو کاتە نزیکە کە خودا تۆڵەو سزایەکتان بۆ بنێرێ لە لایەن خۆیەوە لە پاشان داوای لێ بکەن(کە لە سەرتان لابات) وەڵامتان نەدرێتەوە.

## دوعا قەبول نەبوون:

٩- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): أَيُّها الناسُ إِنَّ الله طَيِّبٌ لا يَقْبَلُ إلاّ طَيِّباً وإِنَّ الله أَمَرَ المؤمنينَ بما أمَرَ بهِ المرسلين فقال﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ﴾ (المؤمنون:٥١)، وقال﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ﴾ (البقرة:١٧٢). ثُمَّ ذكَرَ الرَّجُلَ يُطيلُ السَّفَرَ أشْعَثَ أغْبَرَ

يَمُدُّ يَدَيهِ الى السَّماء يا ربِّ يا رَبِّ ومَطْعَمُهُ حرامٌ ومَشْرَبَهُ حرامٌ ومَلْبَسُهُ حرامٌ وغُذِيَ بالحرامِ فَأَنّى يُسْتَجابُ لِذلكَ؟رواه مسلم(١٠١٥).

طيب: أى طاهر منزهٌ عن النقائص والطيب من اسماء الله الحسنى، واته: پاك و دوور لەكەم و كورى وە(طيب) يەكێكە لە ناوەكانى خودا.

واته: ئەی خەڵكینە بێگومان خودا پاك و بێ عەیبە ئەوەی پاك و حەلاڵ و خاوێن نەبێ وەری ناگری وە خوا بەوەی كە فەرمانی پێ بە پێغەمبەران كردووە فەرمانیشی پێ بە بڕواداران كردووە خودا فەرموویەتی(ئەی پێغەمبەران بخۆن لە خواردەمەنی حەلاڵ و پاك كردەوەی باش بكەن بێگومان من بەوەی دەیكەن زانام) وە فەرموویەتی(ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لەو رۆزیە پاك و چاكانە بخۆن كە پێمان بەخشیون)، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) باسی پیاوێكی كرد كە سەفەری درێژ دەكات(بۆ حەج و سەردانی خزمان و خوا پەرستی تر) سەرو ریش ئاڵۆزو تەپ و تۆزاوی. هەردوو دەستی بەرەو ئاسمانێ بەرز دەكاتەوەو دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ئەی پەروەردگارم! بەلام خواردنەكەی حەرامەو خواردنەوەكەی حەرامەو پۆشاكەكەی حەرامە وە هەر بە حەرامیش بەخێوكراوە چۆن ئەم جۆرە كەسە دوعای قەبول دەبێ؟

**سوود:**

١- قيل لِسعد بن أبي وقاص: تُستجابُ دَعْوَتُكَ من بين اصحاب رسول الله(ﷺ) فقال: ما رفعتُ إلى فمي لقمةً إلاّ وأنا عالمٌ من أينَ

مجيئها ومن أين خرجت[1].

واته: به سەعدی کوڕی أبو وقاص گوترا بۆ تۆ لە نێوان ئەصحابەکانی پێغەمبەر دوعات قەبول دەبێت فەرمووی: هیچ لوقمەیەکم بۆ دەمم بەرز نەکردۆتەوە ئیللا زانیومە لە کوێ هاتوەو لە کوێ دەرچووە.

٢- عن یوسف بن أسباط قال: بَلَغَنا أن دعاء العبد یُحبَسُ عن السماوات بسوء المطعم[2].

واته:یوسفی کوڕی ئەسباط دەڵێ: پێمان گەیشتووە دوعاو پارانەوەی عەبد حەپس دەکرێ لە ئاسمانەکان بە هۆی خراپی خواردنەوە.

٣- عن وهب بن منبه قال: من سَرَّهُ أن یستجیب الله دعوتَهُ فَلْیطب طعمتَهُ[3].

واته: وەهبی کوڕی مونەبە دەڵێ: هەر یەکێك پێ ی خۆشە کە خوا دوعاکانی قەبول بکات با خواردنی حەڵاڵ بخوات.

٤- عن سهل بن عبدالله قال: من أکل الحلال أربعین صباحاً اُجیبت دعوتُهُ[4].

واته: سەهل دەڵێ: هەر یەکێك چل رۆژان خواردنی حەڵاڵ بخوات دوعای قەبول دەبێت.

---

(1) جامع العلوم والحکم.

(2) جامع العلوم والحکم.

(3) جامع العلوم والحکم.

(4) جامع العلوم والحکم.

## کاروبار بلاوبوون و چاو برسیەتی:

١٠- عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): منْ كانت الآخرةُ همَّهُ جعَلَ اللهُ غناه في قلبه وجَمع له شَمْلَهُ وأتتْهُ الدُّنيا وهيَ راغِمَة، ومَنْ كانت الدنيا همَّهُ جَعَلَ الله فَقْرَهُ بين عَينَيه وفرَّقَ عليه شَمْلَهُ ولم يأته من الدنيا إلاّ ما قُدر لهُ. **صحيح: رواه الترمذي (٢٤٦٥)**

**واته: هەر یەکێك دوا ڕۆژ واتە وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا ئامانج و مەبەستی بێت خوا دڵی دەوڵەمەند دەکات وە کاروباری بۆ ڕێك دەخات وە دنیا- نازو نیعمەتەکانی- بە ناچاری دێتە دەستی، بەڵام هەر کەسێك دونیا- و ئارەزووکانی- ئامانج و مەبەستی بن خوا هەژاری دەخاتە نێوچاوانییەوە وە کاروباری لێ بڵاو دەکات وە دونیاشی نایەتە بەردەست بێجگە لەوەی بۆی دیاری کراوە.**

## بەهیلاك چوونی گشتی:

١١- عن أُمِّ المؤمنين زينب بنت جحش(رضي الله عنها) أنَّ النبيَّ(ﷺ) دخَلَ عليها فزعاً يقول: لا اله الا الله ويلٌ للعرب منْ شَرِّ قد اقتَرَبَ فُتِح اليومَ منْ رَدمِ يأْجوجَ و مأجوج مثْلُ هذه وحلَّق بإصبَعه الإبهامَ والتي تليها، فقالت زينب بنت جحش: فقلت يا رسول الله أنَهْلك وفينا الصالحون؟ قال: نعمْ إذا كثُرَ الخَبَثُ. **رواه البخاري(٣٣٤٦) ومسلم(٢٨٨٠).**

**١-فزعا: قال عُثيمين: الفَزَعُ الخوف المفاجيء، لأنَّ الخوف المستمر لا**

يسمى فزعا. واته: عثيمين دەڵێ: الفزع: واته: ترسی له ناکاو لەبەر ئەوه ترسی بەردەوام پێ ی ناوترێ(فزع).

٢- لا اله الا الله: هیچ پەرستراوێکی بەراستی نی یه بێجگه له خودا.

٣- اقترب: نیزیك بۆوه.

٤- ردم: بەربەست(کاتی خۆی ذوالقرنین دورستی کردووه).

٥- الخبث: الفسق والفجور: واته: گوناح.

واته: دایکی ئیمانداران زەینەبی کچی جەحش(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) هاته لام و ترسێکی له ناکاوی بەسەردا هاتبوو فەرمووی: لا اله الا الله هاوار له عەرەب له شەرێك که نزیك بۆتەوه ئەمرۆ لەبەر بەستی یەئجوج و مەئجوج به قەد ئەوەنده کراوەتەوه، پێغەمبەر(ﷺ) حەڵقەیەکی به پەنجەی گەورەو شایەتمان دورست کرد، زەینەب دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ئێمه هەموومان دەفەوتێین و به هیلاك دەچین ئەگەر پیاوچاکیشمان تیادا بێت؟ فەرمووی: بەڵێ ئەگەر گوناح زۆر بوو.

## کۆمەڵێك ئازارو نارەحەتی:

١٢- عن عبدالله بن عمر(رضي الله عنهما) قال: أَقبل علينا رسول الله(ﷺ) فقال: يا مَعْشَر المهاجرين! خَمسٌ إذا ابتليتم بِهنَّ وأعوذ بالله أن تُدرِكُوهُنَّ:

-لم تظهر الفاحشة في قومٍ قطٍّ حتى يُعلنوا بها إلاّ فشا فيهم الطاعون والاوجاع التي لم تكن في اسلافهم الذين مضوا.

- ولم ينقصوا المكيال والميزان إلاّ أخذوا بالسنين وشدة المؤنة وجور السلطان عليهم.

- ولم يمنعوا زكاة اموالهم إلاّ منعوا القطر منَ السماء ولولا البهائم لم يمطروا.

- ولم ينقضوا عهد الله وعهد رسولهِ إلاّ سلط الله عليهم عدواً من غيرهم فأخذوا بعض ما في أيديهم.

-وما لم تحكم أَئمّتَهُم بكتاب الله وتَخَيَّروا مما أنزل الله إلاّ جَعَل الله بأْسَهم بينهم. حسن رواه ابن ماجه(٤٠١٩) والحاكم.

١-الفاحشة: داوێن پیسی، زینا.

٢- اسلافهم: پێشینەکانیان(الامم السابقه).

٣- الكيل: پێوان.

٤- الوزن: کێشان.

٥- جَور: زوڵم، ستەم.

واتە: عبدالله کوڕی عومەر(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕووی تێکردن و فەرمووی: ئەی کۆمەڵی کۆچکەران پێنج(گوناح) هەر کاتێك گیرۆدەیان بوون وە پەنا دەبەمە بەر خوا کە پێیان ڕابگەن:

-قەت هیچ گەڵێك داوێن پیسی لە ناویان دا بڵاونەبۆتەوە گەیشتبێتە ئەو ڕاددەی کە بە ئاشکرا بیکەن مەگەر کولێراو دەردو نەخۆشی وا کە لە پێشوەکانیان دا نەبوون بڵاو بویتەوە.

- وە هیچ کاتێك(کۆمەڵێك) پێوان و کێشانیان بە ناتەواوی کردووە ئیللا تووشی گرانی و قورسی باری ژیان و ستەم و زوڵمی فەرمان ڕەوایەکان بووینە.

- وە هیچ قەومێك کە زەکاتی ماڵ و سامانیان نەدابێ ئیللا بارانیان لێ مەنع کراوە ئەگەر لەبەر ئاژەڵ نەبوایە بارانیان بۆ نەدەباری.

- وەهیچ قەومێك پەیمانی پەیمانی خواو پەیمانی پێغەمبەرەکەیان هەڵنەوەشاندۆتەوە مەگەر خوا دوژمنێکی بیانی بەسەریان دا زاڵ کردووەو هەندێك ماڵ و سامانیانی بە تالاًن بردووە.

- وە مادام(کۆمەڵێك) حوکمرانانیان بە کیتابی خودا حوکم نەکەن و بەرژەوەندیی تەنیا لەوەدا نەبینن کە خوا ناردوویەتە خوار ئەوە بێگومان خوا بە گژ یەکتریان دا دەکات.

## لە سزاکانی گوناح و سەرپێچی لە دونیادا لە قسەی ناوداران[١]

١-قال ابن عباس: إنَّ لِلحسنةِ ضياءً في الوجه ونوراً في القلب، وقوةً في البدن، وسعةً في الرزق، ومحبة في قلوب الخلق، وإنَّ لِلسَّيِّئةِ: سواداً في الوجه، وظلمةً في القلب، ووهناً في البدن، ونقصاً في الرِّزق، وبغضةً في قلوب الخلق[٢].

واتە: ابن عباس دەفەرموێ: بێگومان بە هۆی کردنی کاری چاکە رووی موسڵمان گەش و درشاوە دەبێت، دڵ و دەروونی رووناك دەبێت، جەستەی بەهێز دەبێت، رسقی فراوان دەبێت، خۆشەویست دەبێت لە دڵی خەڵکی دا. وە بێگومان بە هۆی کردنی کاری خراپە دەمو چاو رەش دەبێت، دڵ تاریك دەبێت جەستە بێ هێز دەبێت دەبێت کەم و کورتی دەکەوێتە رسق و رۆزی وە خەڵك رقیان لیّ ی دەبێتەوە.

٢- قال بعض السلف: إنِّي لأَعصى الله فَأَرى ذلك في خلق دابتي

---

(1) باشترین نوسراو دەربارەی ئەم بابەتە کیتابەکەی(ابن القیم)ە بە ناوی(الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافي) کراوەتە کوردیش.

(2) الجواب الكافي

وامرأتي[1].

واته: یەكێك لە پێشینەكان دەڵێ: من كە گوناح دەكەم شوێنەواری خراپەكەم لە خراپ بوونی رەوشتی ووڵاخەكەم و خێزانەكەم دا دەبینم.

٣- كان من دعاء بعض السلف: اللهمَّ أَعِزَّني بطاعتك ولا تَذِلَّني بمعصيتك.

واته: ئەی خودایە پایە بەرزم بكە بە گوێرایەڵی كردنی فەرمانەكانت زەلیل و ریسوام نەكەی بە سەرپێچی كردنت.

بەهۆی گوناح پلەو پایەی موسڵمان دادەبەزی هەموو شكۆو پایە بەرزی و بڵندی و گەورەیی لە گوێ رایەڵی كردنی خودا دایە.

حەسەنی بەسرایی دەڵێ(ابي الله إلاّ أن يُذِلَّ من عصاهُ).

واته: خودا ئەوانەی كە سەرپێچی دەكەن زەلیل و سەرشۆریان دەكات.

قال ذوالنون: من خان الله في السرِّ هتكَ اللهُ سره في العلانية.

٤- ئیمام شافعی بە شیعر دەڵێ:

شكوتُ إلى وكيعَ سوءُ حِفْظي فَأَرشَدني على ترك المعاصي
وقال إعلم بأَنَّ العلم نورٌ ونورُ اللهِ لا يُهدى للعاصي

واته: لەم دوو دێرە شیعرە دیارە ئیمام شافعی لەبەر كردنی وەك پێشوو نەمابووە بۆیە چووەتە لای مامۆستاكەی كە ناوی وكیع بووە سكالای حالی خۆی لەلا كردووە ئەویش پێ ی ووتووە كە واز لە گوناح بێنی وە پێ ی ووتووە كە زانست نوورو رۆناكیە وە نوری خوداش نادرێ بە كەسی گوناهبار.

عەلی كوڕی خەشرام بە وەكیعی كوڕی جەڕراحی گوت من پیاوێكی بیر تیژ نیم هیچم لەبەر نی یە شتێكم فێر بكە بۆ شت لەبەر كردن، وەكیع

---

(1) الجواب الكافي.

گوتی(يا بُنيَّ والله ما جربت دواءً للحفظ مثل ترك المعاصي) واته: ئەی رۆلە سوێند بە خوا هیچ دەرمانێکم تاقی نەکردۆتەوە بۆ شت لەبەر کردن وەك واز هێنان لە گوناح.

٥- ئیمامی عەلی دەفەرموێ(ما نَزلَ بلاءٌ إلا بذنبٍ ولا يُرفَعُ إلاّ بتوبة).

واتە: هیچ بەلایەك دانابەزێتە سەر ئینسان بەهۆی گوناهێکەوە نەبێت وەلاش ناچێت بە تەوبە نەبێت[1].

شاعر دەڵێ:

اذا كنت في نعمة فارعها فإنَّ الذُّنوب تَزيلُ النِّعم

واتە: ئەگەر لە ناو نازو نیعمەتێك دا بووی پارێزگاری بکە چونکە گوناح نیعمەت لادەبات، گوناح نیعمەتەکان ناهێڵێ و سزا دێنێتە پێشەوە هەر نیعمەتێك لە دەستی ئینسان چوو ئەوە بە هۆی گوناهە وە هەر سزایەکیش هاتە سەری ئەویش بە هۆی گوناهە.

٦- فوزەیلی کوڕی عیاز دەڵێ: اذا لم تقدر على قيام الليل وصيام النهار فاعلم انك محروم مكبّل كبَّلَتْكَ خطيئتك[2].

واتە: ئەگەر نەتتوانی شەو هەڵبستی بۆ عیبادەت و بەرۆژ بەرۆژوو بیت ئەوە بزانە تۆ قەدەغەکراوی و بەستراویتەوە گوناهەکانت تۆیان بەستۆتەوە.

٧- سولەیمانی دارانی دەڵێ (كلما ارتفعت منزلة القلب كانت العقوبة إليه أسرع)[3]

٨- لە کۆتاییدا دەڵێم هەر وەکو لە سەرەتای ئەم بابەتەدا گوتم

---

(1) الجواب الكافي- ابن القيم.

(2) صفوة الصفوة، ج٣.

(3) نفس المصدر.

باشترین نوسراو لەسەر ئەم بابەتە لە کیتابەکەی(ابن القیم) دایە بە ناوی(الجواب الكافي لمن سال عن الدواء الشافي) وە ئاگاداریش بە هەر کارێکی خێر دەکەی واز لە هەر گوناهێك دەینی لەبەر خوا بیکە نەك لەبەر ئەوەی رسقت فراوان بیت یا تووشی ناخۆشی نەبیت یا لەبەر هەر شتێکی تر.

## بێ دەنگی و زمان پاراستن:

١–عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: مَنْ كانَ يُؤمنُ باللهِ واليومِ الآخرِ فَلْيَقُلْ خيراً أو لِيَصْمُت[1]. رواه البخاري(٦٠١٨) ومسلم(٤٧).

واتە: هەر یەکێك باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی خێر بکات یا بێ دەنگ بیت.

٢– عن عقبة بن عامر(رضي الله عنه) قال: قلت يا رسول الله ما النجاةُ؟ قال: املك عليك لِسانَكَ ولْيَسَعْكَ بَيتُكَ وابْكِ على خَطِيئَتِكَ. صحيح رواه الترمذي(٢٤٠٦).

واتە: عوقبەی کوڕی عامر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا چی دەبێت بە مایەی ڕزگاری؟ فەرمووی: زمانت بپارێزە لەوەی خێری تیادا نی یە وە لەماڵی خۆت دابنیشە وە بۆ گوناهەکانت بگری.

٣– عن انس(رضي الله عنه) قال: لَقِيَ رسول الله(ﷺ) أبا ذَرّ فقال يا أباذر الا أَدُلُّك على خَصْلَتين هما أخَفُّ على الظَّهرِ وأثقلُ على الميزان مِن غيرِهما؟ قال: بلى يا رسول الله، قال: عليكَ بِحُسنِ الخُلقِ وطُول الصمتِ فَوالذي نفسي بيدهِ ما عَمِلَ الخلائقُ

---

(1) قال النووي: وهذا الحديث صريح في أنَّهُ ينبغي ان لا يتكلم إلاّ اذا كان الكلام خيراً وهو الذي ظهرت مصلحتهُ ومتى شكَّ في ظهور المصلحة فلا يتكلم.

**بمثلهما**[1]

**١-الا ادلك: ئايا نيشانت بدەم.**

**٢- الصمت: بێ دەنگی.**

**ماناى فەرموودەكە:**

**ئەنەس(رەزاى خواى لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) گەيشتە(ابو ذر) فەرمووى ئەى(ابو ذر) ئايا دوو(خصلة)ت نيشان بدەم ئەم دوو(خصلة)ە سوكترە لەسەر پشت وە گرانترە لەسەر تەرازوو لە غەيرى خۆيان؟ گوتم بەڵێ ئەى پێغەمبەرى خوا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: رەوشت جوانى و زۆر بێ دەنگى لە خۆت بێنە دى، سوێندم بەوەى گيانى منى بەدەستە دورست كراوان كاريان نەكردووە وەكو ئەم دووە.**

٤- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّهُ سَمِعَ النبيَّ(ﷺ) **يقول**: إنَّ العبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بالكلمة ما يَتَبَيَّنُ فيها يَزِلُّ بها الى النار أبْعَدَ مِمَّا بين المَشرق والمَغرب.**رواه البخاري(٦٤٧٧)(٦٤٧٨)ومسلم (٢٩٨٨).**

**ماناى ووشە:**

**١-ما يتبين فيها: اي ما يتفكر هل هي خير او شرّ ، واتە: بيرى لێ ناكاتەوە ئايا خێرە يا شەڕە.**

**ماناى فەرموودەكە:**

**بێگومان جارى وا هەيە بەندەيەك قسەيەك دەكات بيرى لێ ناكاتەوە ئايا خێرە يان شەڕە بەهۆى كردنى ئەم قسەيە دەخزێتە ناو ئاگر دوورتر**

---

**(1) قال المنذري: رواه ابن ابي الدنيا والطبراني والبزار وابو يعلي باسناد جيد رواته ثقات، وانظر الى (صحيح الجامع-٤٠٤٨).**

له نێوانی ڕۆژهەلآت و ڕۆژئاوا.

٥- عن سهل بن سعد(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) مَنْ يَضْمَنْ[1] ما بينَ لَحْيَيه وما بينَ رِجْلَيه أَضْمَنْ لَهُ الجَنَّةَ. رواه البخاري(٦٤٧٤).

ماناى ووشه:

١-من يضمن: كێ دابین بكا.

٢- ما بين لحييه: واته: زمان، (مابين لحييه): العظمان اللذان تنبت عليها الاسنان علواً و سُفلاً والذي بين اللحيين هو اللسان، واته: اللحيان: ئەو دوو ئێسكەن كه ددانیان لەسەر شین دەبێت ئى سەرو ئى خوار، ئەوەش له نێوانی ئەم دوو ئێسكەیه زمانه.

٣- وما بين رجليه: وه ئەوەش كه له نێوانی دوو قاچەكانی دایه، واته: داوێن.

ماناى فەرموودەكه:

هەر یەكێك زمانی و داوێنیم بۆ دابین بكات له(خراپه بەكاریان نەهێنێ) منیش بەهەشتی بۆ دابین دەكەم.

٦- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ وقاهُ اللهُ شَرَّ ما بينَ لَحييه، وشَرَّ ما بينَ رجليه دخَلَ الجنَّة. حسن صحيح رواه الترمذي(٢٤٩٠).

هەر یەكێك خوا بیپارێزێ له شەڕی زمانی و له شەڕی داوێنی دەچێته بەهەشت.

٧- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ):

---

(1) ضمان: خستنه ئەستۆ.

مِن حُسنِ إسلام المَرْءِ[1] تَرْكُهُ ما لا يَعْنِيهِ[2]. صحيح رواه الترمذي(٢٣١٧) وغيره.

واته: يەكێك لە نیشانەی رێك و پێكی ئایینی مرۆۆ ئەمەیە: واز بێنێ لەو شتانەی كە پێویستی پێ ی نی یە بۆ دونیاو دوا رۆژی.

٨- عن ابي موسى(رضي الله عنه) قال: قيل يا رسول الله أيَ المسلمين أفْضَلُ؟ قال: مَنْ سَلِم المُسلِمون مِنْ لسانهِ ويَدِهِ. رواه البخاري(١١) ومسلم(٤٢).

واته: ئەبو موسى(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لە پێغەمبەر(ﷺ) پرسیار كرا كام موسڵمان باشترە؟ فەرمووی: ئەو موسڵمانەی كە موسڵمانان لە دەست و زمانی سەلامەتن.

٩- عن البراء بن عازب(رضي الله عنه) قال: جاءَ أعرابيٌّ الى رسول الله(ﷺ) فقال: دُلَّني على عَمَلٍ يدخلني الجنة؟ قال: أطعم الطعام، واسقِ الضَمآن، وأمر بالمعروفِ وانهَ عن المنكر فإن لم تطق فكفَّ لسانكَ إلا من خير. أخرجه ابن أبي الدنيا باسناد جيد.

واته: عارەبەكی دەشتەكی هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: كردەوەیەكم نیشان بدە بە هۆی كردنیەوە بچمە بەهەشت؟ گوتی: خواردن بدە، تێنو ئاو بدە، فەرمان بە چاكە بكە جلەوگیری لە خراپە، ئەگەر پێت نەكرا، زمانت بگرە تەنها لە خێر نەبێت.

---

(1) من حسن اسلام المرء: من علامة كمال اسلامه واستقامته.

(2) تركه ما لا يعنيه: اي ما لا يريده ولا يحتاج اليه ولا ضرورة اليه وذلك يشمل الأفعال الزائدة والاقوال الفاضلة.

١٠- عن ابن عمر(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ كفَّ لسانَهُ، ستَرَ الله عورتَهُ، ومَنْ مَلَك غَضَبَهُ وقاهُ الله عذابَهُ ومَنْ اعْتَذَرَ إلى اللهِ قَبِلَ الله عذرهُ. أخرجه ابن ابي الدنيا في الصمت بسند حسن.

واته: هەر یەکێك زمانی بگرێ، خوا عەیب و عاری دادەپۆشێ، وە هەریەکێك توورەیی خۆی بگرێ، خوا دەیپارێزێ لە عەزابی خۆی، وە هەر یەکێك عوزر بۆ خوا بێنێتەوە خوا عوزری لێ وەردەگرێ.

## بێ دەنگی و زمان پاراستن لە قسەو کاری ناوداران دا:

١-عن عبدالله بن مسعود(رضي الله عنه) قال: والذي لا اله غيره، وما على ظهر الارضِ من شيءٍ احوجَ الى طولِ سِجنٍ من لسان(١).

واته: عبدالله کوڕی مسعود(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: سوێند بەوەی کە هیچ پەرستراوی بەڕاستی نی یە بێجگە لەو لەسەر ڕووی زەوی هیچ شتێك نی یە وەکو زمان زیاتر پێویستی بە زۆر بەند(سجن) کردن بێت.

٢- قال بعض الصحابه: اذا رأيت قسوةً في قلبك وَوهناً في بدنِكَ وحرماناً في رزقك فاعلمْ أنك قَدْ تكلمت بما لا يعنيك(٢).

---

(1) قال المنذري في الترغيب والترهيب: رواه الطبراني موقوفا بإسناد صحيح.

(2) تنبيه الغافلين.

واتە: یەکێك لە ئەصحابەکان گوتویانە: ئەگەر رەقایەتیەکت بینی لە دڵت، وە بێ هێزی یەك لە جەستەت وە قەدەغەکردنێك لە رۆزیت، بزانە کە تۆ قسەی بێ سوودت کردووە.

٣- عن زيد بن اسلم قال: دُخِلَ على أبي دجانة وهو مَريضٌ وكانَ وجهُهُ يتهلل فقيل لَهُ: ما لِوَجهِكَ يتهَلَّلُ؟ فقال: ما مِن عَمَلي شيءٌ أَوثقُ عندي من اثنتينِ: أمّا احدهما فكنتُ لا أتكلم فيما لا يعنيني، وامّا الأخرى: فكانَ قلبي للمسلمين سَليما[١].

واتە: وەیدی کوڕیأسلم دەڵێ: خەڵکان چوونە لای(ابو دُجانە) لە کاتێك دا کە نەخۆش بوو رووی دەگەشایەوە پێ ی گوترا: ئەوە لەبەر چی یە وا رووت دەگەشێتەوە؟ گوتی: هیچ کارێکم لەلا وەکو دوو شتان نی یە. یەکێکیان: من قسەی بێ سوودم نەکردووە، دووەمیان: دڵم پاك و ساف و دوور لە کینە بووە بەرامبەر بە موسڵمانان.

٤- عن عمرو بن قيس قال: كان لقمان عبداً أسودَ غليظَ الشفتين، مُصَفَّحُ القدمين، فأتاهُ رجُلٌ وهو في مجلس أُناسٍ يُحَدِّثُهم فقال لَهُ: أَلَسْتَ الذي كنت ترعى مَعِيَ الغنم في مكان كذا و كذا؟ قال: نعم، قال: فما بَلغَ بِكَ ما أرى؟ قال: صدقُ الحديث، والصَمْت عمَا لا يعنيني[٢].

واتە: عەمری کوری قەیس دەڵێ: لوقمان عەبدێکی رەش بوو لێوەکانی ئەستوور بوون پێ پان بوو پیاوێك هاتە لای لە کاتێك دا لوقمان لە (مجلس)ی خەڵکانێك دابوو قسەی بۆ دەکردن، پیاوەکە پێ ی گوت: تۆ

(1) صفة الصفوة.

(2) تفسير الطبري.

ئەو کەسە نیت لەگەڵ من پێکەوە لە فلان شوێن و فلان شوێن مەڕمان دەلەوەڕاند، گوتی: بەڵێ، گوتی: ئەدی چی تۆی گەیاندە ئەم پلەو پایەی کە دەبینم؟ لوقمان گوتی: ڕاست گۆیی و بێ دەنگ بوونم لە شتی بێ سوود.

٥- قال مالك بن دينار: كانَ الأبرارُ يتواصَونَ بثلاثِ: بسجنِ اللسان وكثرة الأستغفار والعزلة[١].

واتە: مالیکی کوڕی دینار دەڵێ: پیاو چاکان ئامۆژگاریان دەکرد بە سێ شتان: بەبەند(سجن) کردنی زمان وە زۆر داوای لێ خۆش بوون کردن وە دوور کەوتنەوە لە خەڵکی.

٦- قال الأوزاعي: العافية عشرةُ اجزاءٍ تِسعَةٌ منها صَمتٌ وجزءٌ منها الهرب من الناس.

واتە: سەلامەتی دەبەشە، نۆ لەو دەیە بێ دەنگ بوونە وە بەشێکیش لەم دەیە هەڵاتنە لە خەڵك.

٧- صالح بن ابي الأخضر قال: قُلْتُ لأيُّوب اوصني قال: أَقِلَّ الكلام[٢].

واتە:(صالح)ی کوڕی(ابي الأخضر) دەڵێ: بە ئەییوبم گوت ئامۆژگاریم بکە گوتی: قسە کەم بکە.

٨- قال سهل بن عبدالله التُّستَري: من تَكَلَّمَ فيما لا يعنيه، حُرِمَ الصِّدق[٣].

واتە: سەهل دەڵێ: هەر یەکێك قسەی بێ سوود بکات لە(صدق) بێ بەش دەبێت.

---

(1) صفة الصفوة.

(2) صفة الصفوة.

(3) صفة الصفوة.

٩- قال ابو على: اذا سكَنَ الخوفُ في القلب لم ينطق اللسان الا بما يعنيه.[١]

واته: ئەگەر ترسی خوا جێگیر بوو لە دلان زمان قسە ناکات تەنها لەوانە نەبێت کە بە سوودن بۆ دونیاو قیامەت.

١٠- قال يحيى بن ابي كثير: ما صلَحَ مَنطقُ رجُلٍ قَطُّ إلاّ عرفتُ ذلك في سائر عمله، ولا فسد منطق رجل الا عرفت ذلك فى سائر عمله[٢].

واته:(يحيى)ی کوڕی(ابى كثير) دەڵێ: قسەو گوفتاری هیچ پیاوێك باش نەبووە ئیللا بینیومەو زانیمە کە کارەکانی تریشی باش بووە وە قسەو گوفتاری هیچ کەسێك خراپ نەبووە ئیللا زانیومە و بینیمە لە کارەکانی تریشی.

١١- مَرَّ حسان بن أبي سنان بغُرفةٍ فقال: متى بنيت هذه؟ ثُمَّ اقبَلَ على نفسِهِ فقال: تَسألينَ عمّا لا يعنيك لأعاقبنكَ بِصوم سنةٍ فَصامَها[٣].

واته: (حسان)ی کوڕی(ابى سنان) بەلای(غرفه)یەك دا تێپەری گوتی ئەم غورفەیە لە چ کاتێکەوە دورست کراوە؟ لە پاشان رووی لە خۆی کرد گوتی ئەوە لە شتێك دەپرسی کە سوودی تۆی تیادا نی یە دەبێ سزات بدەم بە بەرۆژوو بوونی ساڵێك جا یەك ساڵ بەرۆژوو بوو.

١٢- يُقالُ: الصَّمتُ زين للعالم وستر للجاهل[٤].

واته:: گوتراوە: بێ دەنگی جوانی یە بۆ زاناو پەردەیە بۆ نەزان.

١٣- قال عابد: إلْتَمِسِ الصَّمتَ بِقِلّةِ الخلطاء[١].

---

(1) صفة الصفوة.

(2) صفه الصفوه.

(3) صفة الصفوة.

(4) تنبيه الغافلين.

واته: بیٚ دەنگی بەدەست بیٚنە بەکەم تیٚکەڵ بوون.

* قال بعض الحكماء: في الصَّمتِ سبعةُ آلاف خبر وقد اجتمع ذلك في سبع كلمات في كل كلمة منها الف:

اولها: أن الصمت عبادة من غير عناء.

والثاني: زينة من غير حُليّ.

والثالث: هيبة من غير سلطان.

والرابع: حصن من غير حائط.

والخامس: الاستغناء عن الإعتذار الى احد.

والسادس: راحة الكرام الكاتبين.

والسابع: ستراً لعيبوبه[٢].

واته: یەکیٚك لە داناکان دەڵیٚ: دەربارەی بیٚ دەنگی حەوت هەزار باس هاتووە ئەم حەوت هەزارە کۆبۆتەوە لە حەوت ووشە لە هەر ووشەیەك دا هەزار هەیە:

یەکەم: بیٚ دەنگی عیبادەتیٚکە بیٚ ماندوو بوون.

دووەم: جوانی یە بیٚ خشل.

سیٚ یەم: سامو هەیبەتە بیٚ دەسەلات.

چوارەم: قەلایەکە بیٚ دیوار.

پیٚنجەم: بیٚ پیٚویستت دەکات لە عوزر هیٚنانەوە بۆ هیچ کەسیٚ.

شەشەم: مایەی حەسانەوەیە بۆ ئەو دوو فریشتەی کە کردەوەکانت دەنووسن.

حەوتەم: پەردەیەکە بۆ عەیبەکانت.

---

(1) تنبيه الغافلين.

(2) تنبيه الغافلين.

١٤- قال بعض الصحابة:

إنّ الرجل ليكلّمُني بالكلام لجوابه اشهى اليَّ من الماء البارد إلى الظمآن فأترك جوابه خِيفة أن يكون فضولاً[1].

واته: يەكێك لەئەسحابەكان دەڵێ:

بێگومان جاری واهەیە یەكێك قسەم لەگەڵ دا دەكات، وەڵام دانەوەی لە لام خۆشترە لەئاوی سارد بۆ كەسێكی تینوو، بەڵام من وەڵامی نادەمەوە لە ترسی ئەوەی نەوەك بچێتە قسەی زیادو بێ پێویستەوە.

## پێناسەی (فضول الكلام) قسەی زیادو بێ پێویست

ئەوەیە تۆ قسەیەك بكەی سوودی نەبێت بۆ دونیاو دوا رۆژت، یان كارێكت بەیەك وشە جێ بەجێ دەبێت بەڵام تۆ دوو وشە بڵێیت، وشەی دووەمیان زیادەیەو زەم كراوە هەرچەندە ئەگەر وشەی دووەم گوناح نەبێت و وشەیەكی بێ زیان بێت.

---

(1) موسوعة الأخلاق الإسلامية

١٤- قال بعض الصحابة:

إنّ الرجل ليكلِّمُني بالكلام لجوابه اشهى اليَّ من الماء البارد إلى الظمآن فأترك جوابه خِيفة أن يكون فضولاً[1].

واته: يەكێك لەئەسحابەكان دەڵێ:

بێگومان جاری  واهەیە یەكێك قسەم لەگەڵ دا دەكات، وەڵام  دانەوەی لە لام خۆشترە لەئاوی سارد بۆ كەسێكی تینوو، بەڵام من وەڵامی نادەمەوە لە ترسی ئەوەی نەوەك بچێتە قسەی زیادو بێ پێویستەوە.

## پێناسەی (فضول الكلام) قسەی زیادو بێ پێویست

ئەوەیە تۆ قسەیەك بكەی سوودی نەبێت بۆ دونیاو دوا رۆژت، یان كارێكت بەیەك وشە جێ بەجێ دەبێت بەڵام تۆ دوو وشە بڵێیت، وشەی دووەمیان زیادەیەو زەم كراوە هەرچەندە ئەگەر وشەی دووەم گوناح نەبێت و وشەیەكی بێ زیان بێت.

(1) موسوعة الأخلاق الإسلامية

# باسی غەیبەت

## غەیبەت چی یە؟

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: أتدرون ما الغيبةُ؟ قالوا: الله ورسولُهُ أعلمُ قال: ذكرك أخاك بما يكرهُ، قيل: أفرأيتَ إن كانَ في أخي ما اقولُ؟ قال: إن كانَ فيه ما تقولُ فقد اغتبتهُ، وإنْ لم يكن فيه ما تقول فقد بَهَتَّهُ. رواه مسلم(٢٥٨٩).

١-قيل: گوترا

٢- افرايت: پێم بڵێ خەبەرم پێ بدە(اخبرنی).

**مانای فەرموودەکە:**

ئەبو هوریرە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا دەزانن غەیبەت چی یە؟ ئەصحابەکان گوتیان: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: باس کردنی براکەتە بە شتێك کە پێ ناخۆش بێت، گوترا: ئەی ئەگەر ئەو شتەی من دەیڵێم لە براکەم دا هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر ئەو شتەی کە تۆ دەیڵێ ی لەودا هەبوو ئەوە غەیبەتت کردووە وە ئەگەر شتەکەی تێدا نەبوو ئەوە بوختانت پێ هەڵبەستاوە.

## سوود:

أ-ئیمام نەوەوی(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: غەیبەت ئەوەیە: باسی کەسێك بکەیت بەشتێ پێ ی ناخۆش بێت، جا ئەو شتە لە لەش و

جەستەیا بێ یا لە دینی دابێ یا لە دنیای دابێ یا لە دەروونیا یا لە رەوشتیا یا لە ماڵ و منداڵ و باوك و هاوسەرو خزمەتكارو پۆشاك و رۆیشتن و رووخوشی و رووگرژی دابێ یا لە هەر شتێكی ترا كە پەیوەندی پێوە هەبێ جا ئەو باس كردنە بە قسە بێ یا بە ئیشارەو هێمابێ.

## حوكمی غەیبەت:

غەیبەت اجماعی لەسەرە كە حەرامە خوا دەفەرموێ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ﴾ (الحجرات:١٢).

واتە: با هەندێكتان غەیبەتی هەندێكی ترتان نەكات(واتە ناوی یەكتر مەبەن لە پاش ملێ بە جۆری كە ناوبراو پێ ی ناخۆش بێت) ئایا هیچ كەس لە ئێوە پێ ی خۆشە كە گۆشتی برای خۆی بە مردوویی بخوات(واتە ناوبردنی ئیمانداران بە خراپەو لەپاش ملێ وەكو خواردنی گۆشتیان وایە بە مردوویی) جا ئەوەتان پێ ناخۆشە(كەواتە ناوبردنەكەش وەكو ئەوە وایە بێزی لێ بكەنەوە).

١-عن انس(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): لما عُرِج بي مررت بقومٍ لهم اظفار من نحاس يَخمشُون بها وجوههم وصدورهم فقلت من هؤلاء يا جبريل؟ قال هؤلاء الذين يأكلون لحوم الناسِ ويقعون في أعراضهم. صحيح رواه أبوداود(٤٨٧٨).

واته: کاتیٚ بەرز کرامەوە بۆ ئاسمانەکان رابردووم بەلای کۆمەڵێك دا نینۆکی لە مسیان هەبوو بەم نینۆکانە دەم و چاوو سینگی خۆیان پیٚ دەرنی گوتم ئەی جبریل ئەمانە کیٚن جبریل گوتی ئەمانە ئەو کەسانەن کە گۆشتی خەڵکی دەخۆن و باسی ئابروو ناموس و عەیب و عاری خەڵك دەکەن بە خراپە.

٢- عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: قلتُ للنبي(ﷺ) حسبك مِنْ صفيَّة كذا كذا، قال بعض الرواة: تعني قصيرة، فقال لقد قلت كلمةً لو مُزِجَت بماء البحر لمَزَجته، قالت وحكيت له انساناً فقال(ما أحِبُّ أني حكيت إنساناً وإنَّ لي كذا وكذا). **صحيح رواه أبو داود(٤٨٧٥) والترمذي(٢٥٠٢).**

واته: عائشە(رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: بە پیٚغەمبەرم گوت ئەوەندەت بەسە لە(صفیە) کە ئەوهاو ئەوهایە هەندیٚ لە(رواة) دەڵیٚن مانای کورتە، پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بیٚگومان قسەیەکی وات کرد ئەگەر تیٚکەڵ بە ئاوی دەریاکان بکرابایە هەمووی دەگۆری وە عائشة دەڵیٚ: لاسایی کەسیٚکم بۆ کردەوە فەرمووی: پیٚم خۆش نی یە لاسایی کەس بکەمەوە وە بیٚگومان ئەوەندەو ئەوەندە بۆ من ببیٚ.

٣- عن ابي برزة الأسلمي والبراء بن عازب قالا: قال رسول الله(ﷺ) يا معشر من آمنَ بلسانه ولم يَدخُل الإيمان قَلبَه لا تغتابوا المسلمين ولا تتبعوا عوراتهم فَإِنَّهُ مَن يَتَّبعُ عورةَ أخيه يَتبعُ اللهُ عورتَهُ حتى يفضَحَهُ في بيتهِ. **حسن صحيح رواه أبوداود(٤٨٧٩).**

واته: ئەی ئەوانەی کە بە زمان موسڵمان بوینەو باوەڕی(تەواو) نەچۆتە دڵی غەیبەتی موسڵمانان مەکەن و شویٚنی عەیب و کەم و کوریان

مەکەون، بێگومان هەر یەکێك شوێنی عەیب و عاری براکەی بکەویٚ خودا شوێنی عەیب و عاری دەکەویٚ تاوەکو لە ناو ماڵی خۆیدا ئابروی دەبات.

٤- عن البراء بن عازب(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) الرِّبا اثنانِ وسبعونَ باباً أدناها مثل إتيان الرَّجُل أُمَّهُ، وإنَّ أربى الرِّبا إستطالَةُ الرجُلِ في عِرضِ أخيهِ. السلسلة الصحيحة للألباني(١٨٧١).

واتە: سوو(ربا) حەفتاو دوو بەشە: نزم ترین و سوك ترین بەشی وەکو ئەوە وایە کە پیاو زینا لەگەڵ دایکی خۆی بکات وە گەورەترین ریباش ئەوەیە کە کەسێك دەم درێژی بکات بۆ حورمەتی براکەی.

## لە چ کات و شوێنێکا غەیبەت دورستە:

غەیبەت کردن لە شەش کات و شوێن دورستە بکریٚ جا با موسڵمان ئاگادار بێت لەم شەش کات و شوێنەدا لە سنوور دەرنەچیٚ:

١-ستەم لیٚ کراوی: ئەوەی ستەمی لیٚ بکریٚ بۆی هەیە لە دادگاو لای قازی و دەسەلاتدار بڵیٚ: فلانە کەس زولمی لیٚ کردووم بەڵگەش ئەم ئایەتەیە خوا دەفەرمووێ﴿لَا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ ۚ﴾ (النساء:١٤٨).

واتە: خوا پێی خۆش نییە هیچ کەسیٚ قسەی خراپ ئاشکرا بکات جگە لەوانەی زولم و ستەمیان لیٚ کراوە.

٢- کۆمەکی وەرگرتن بۆ لە ناوبردنی خراپەیەك کە بە ئاشکرا بکرێت: دورستە ئینسان بڕواتە لای دەسەلات دارێك کە توانای گۆڕینی خراپەی

هەبێ بڵێ فلانەکەس لە فلانە شوێناو لە فلانە کات دا لە پێش چاوی خەڵکی یەوە گوناح دەکات بەڵکو نەهێڵێت ئەو گوناهە بکات دەبی لەم حاڵەدا تەنها مەبەستی خوا بێت.

امام(نووی) لە(ریاض الصالحین) دەربارەی ئەم خاڵی دووەمە دەفەرموێ(الإستعانة على تغيير المنكر ورد العاصي الى الصواب فيقول لمن يرجو قدرته على ازالة المنكر فلان يعمل كذا فاجزجُرهُ عنه ذلك ويكون مقصوده التوصُّلُ الى ازالة المنكر فان لم يقصد ذلك كان حراماً.

واتە: داوای یارمەتی کردن لەسەر گۆڕینی خراپەو گێڕانەوەی تاوانبار بۆ راستی دەڵێتە ئەو کەسەی کە هیوای ئەوەی لێ دەکرێ کە ئەو خراپەیە نەهێڵێ پێ ی دەڵێ فلانە کەس ئەم گوناهە دەکات قەدەغەی بکە لێی، وەدەبێ مەبەستی ئەوە بێ گوناهەکە لابچێ ئەگەر مەبەستی ئەوە نەبوو ئەوە حەرامە.

٣- (الأستفتاء) داواکردنی فتوایە: لە(البيان في آفاق اللسان) دەڵێ(حكاية الحال للمفتي طلباً للفتوى كمن تخبر عن زوجها للمفتي انه بخيل فهل يحل لها ان تاخذ شيئاً من ماله مثلا).

واتە: باری خۆت بۆ موفتی یەك دەگێڕیتەوەو داوای فتوای لێ دەکەی وەکو ئەو کەسەی کە باسی مێردەکەی دەکات لای موفتی دەڵێ رەزیلە ئایا بۆم هەیە بەشی پێویست لە ماڵەکەی ببەم بەڵگەش لەسەر ئەم سێیەمە ئەمەیە(عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: قالت هند امراةُ ابي سفيان للنبي(ﷺ) إن ابا سفيان رَجُلٌ شحيح وليس يعطيني ما يكفيني وَ وَلَدي إلاّ ما أخذت منه وهو لا يعلمُ قال(خُذي ما يكفيكِ وَوَلَدَكِ بالمعروف) متفق عليه.

واتە: عائشە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: هیندی خێزانی ئەبوسوفیان

به پێغەمبەری گوت(ﷺ) ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕەزیلە ئەوەندەم ناداتێ بەشی خۆم و منداڵم بکات مەگەر ئەوەندەی لێ ببەم کە ئەو نەیزانێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ئەوەندە ببە کە بەشی خۆت و منداڵەکەت بکات بە چاکە).

ئیمام نەوەوی دەڵێ باشتر وایە ناوی کەسەکە نەبات بۆ نمونە بڵێت ئەگەر کەسێك باوکی یا برای یا هاوسەری لە گەڵیا ئاوەهاو ئەوهابێ حوکمی شەرعی چۆنە خۆ ئەگەر ناویشی ببات دورستە.

٤- ئامۆژگاری کردنی موسڵمانان و پاراستنیان لەشەرو خراپەی کەسێك یا کۆمەڵێك ئەمەش چەند جۆرێکی هەیە:

أ-وەك باسکردنی ئەوانەی جێگەی تۆمەتن و لە ریوایەتی فەرموودەدا بە خراپ لە قەڵەم دراون و بریندار کراون ئەمە نەك تەنها هەر دروست بێ بەڵکو واجب‌وپێویستیشە لەبەر پێویستی موسڵمانان.

ب- وەك ئەوە کەسێك دەیەوێ ئەمانەتێك لای کەسێك دابنێ پرس بەتۆ دەکات ئایا دەست پاکە یان نا تۆش چی لە بارەیەوە دەزانی دەبێ پێ ی بڵێیت، یا کەسێك دەیەوێ لەگەڵ کەسێکی ترا ببێت بە شەریك یا مامەڵەیەکی لە تەکا بکا یا دەیەوێت ببێتە هاوسێ ی یا لە بارەی ژن و ژن خوازییەوە پرست پێ بکات پێویستە چی لە بارەیەوە دەزانی بۆی باس بکەیت. بەڵگەش ئەم فەرموودەیە: عن فاطمة بنت قيس(رضي الله عنها) قالت أتيت النبي(ﷺ) فقلت إن ابا الجهم ومعاوية خطباني فقال رسول الله(ﷺ) أما معاوية فصُعلوك[1] لا مال له وأما ابوالجهم فلا يضع العصا عن عاتقه. متفق عليه.

وفي رواية المسلم(وأما ابوالجهم فضرّاب للنساء).

---

(1) صُعلوك: هەژار(فقير).

واته: فاطمەی کچی قەیس(رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: هاتمە خزمەت پیٚغەمبەر(ﷺ) گوتم: ئەبوجەهەمو موعاویە داوایان کردووم چیان لە بارەوە دەزانی و رات چۆنە؟ پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: موعاویە هەژارەو ماڵ و سامانی نییە بەڵام ئەبوجەهەم هەمیشە عەساکەی بەسەرشانیەوەیەو دای نانیٚ وە لە ریوایەتی(مسلم) دا دەفەرمویٚ( ئەبوجەهەم زۆر لە ژن دەدات و دارکاریان دەکات.

ج- هەروەها ئەگەر کەسیٚ چاوی لیٚ بوو کەسیٚکی تر دەچیٚ بۆ لای کەسیٚکی تری خاوەن بیدعە یا فاسق و دەیەویٚ لەلای ئەو بخویٚنیٚ یا شت فیٚر ببیٚ وە مەترسی ئەوەشی لیٚ دەکرا زیانی پیٚ بگات پیٚویستە لەسەری ئامۆژگاری بکات و باسی ئەو فاسق و خاوەن بیدعەیەی بۆ بکات بە مەرجیٚ مەبەستی تەنیا خوا بیٚت.

د- هەروەها کاربەدەستانی ناوچە ئەگەر کەسیٚ شیاوی ئەو کارە نەبوو یا فاسق بوو یا گەمژەو گەلۆر بوو یا لەم بابەتانە بوو پیٚویستە لای فەرمانرەوای گشتی باس بکریٚ بۆ ئەوەی لای ببات و کەسیٚکی چاکتر لە جیٚگای دابنیٚ.

٥- گوناهی ئاشکرا: وەك ئەوە کەسیٚك بە ئاشکرا شەراب بخواتەوە یا پەیرەوی لە بیدعەیەك بکات یا ماڵی کەسیٚ داگیر بکات و یا باج و سەرانە لە خەڵکی بسیٚنیٚ جائیزە باسی گوناحە ئاشکراکانیان بکریٚت ئیتر حەرامە باسی نهیٚنی یان بکریٚت.

٦- امام نووی دەربارەی ئەم خاڵی شەشەمە دەڵیٚ: التعریف اذا کان الانسان معروفاً بلقب کالأعمش[1] والأعرج والأصمّ والأعمى والأحول وغیرهم جاز تعریفهم بذلك ویحرم اطلاقه على جهة التنقیص ولو امکن

---

(1) اعمش: کەسیٚکە چاوی کزەو ئاو دەکات.

تعريفه بغير ذلك كان اولى).

واته: بۆ ناسین ئەگەر ئینسانێك بەنازناوێك(لەقەبێك) ناسرابوو كە بۆنی كەمێتی لیٚ دەهات وەك(أعمش) واتە: چاوی كزەو ئاو دەكات یا(أعرج) شەل و لەنگ یا(اصم) كەرِو گویٚ گران یا(أعمى) كوێر یا(أحول) خێل و... لەم بابەتانە.. ئەوە دروستە بۆ ناسین بەو ناوەوە ناو ببریٚ بەلاٚم ئەگەر بە نیازی بیٚ ریٚزی و بە چاوی كەم تەماشا كردنەوە بیٚ ئەوە دورست نییە، وە ئەگەر گونجا بەبیٚ ئەم لەقەبانە بیناسیٚنیٚ ئەوە باشترە.

## حەرامە گویٚ گرتن بۆ غەیبەت

١-عن أبي سعيد الخدري(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: مَنْ رأى منكم مُنكراً فَلْيُغيِّرهُ بيدهِ فَإن لَمْ يَستَطعْ فَبِلِسانهِ فإنْ لَمْ يَسْتَطِع فَبِقَلبهِ وذلك أضعف الايمان. رواه مسلم(٤٩).

واته: هەر یەكێك لە ئێوە خراپەیەكی دیت با بە دەست بیگۆریٚ ئەگەر نەیتوانی با بەزمان بیگۆریٚ ئەگەر پیٚ ی نەكرا بە دلٚ پیٚ ناخۆش بێت ئەمەش كزترینی باوەرِە.

## چاكەی بەرگری كردن لە رێزو قەدری موسلٚمان:

١-عن ابي الدّرداء(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قالَ: مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْضِ أخيه رَدَّ اللهُ عنْ وجْههِ النارَ يوم القيامة. حسن رواه الترمذي(١٩٣١).

واتە: هەر کەسێك لەسەر ناموسی برای موسڵمانی بکاتەوەو بەرگری لیّ بکات لە رۆژی قیامەت دا رووی لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزیّ.

٢- عن اسماء بنت يزيد(رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله(ﷺ) مَنْ ذَبَّ عَن عِرضِ أخيه بالغَيبَةِ كان حقاً على الله أنْ يُعْتِقَهُ منَ النار. صحيح رواه أحمد والطبراني(صحيح الجامع(٦٢٤٠).

واتە: هەر یەکێك بەرگری لە ناموسی براکەی بکات(کاتێك کە عەیب دار دەکرێت) ئەویش لەویّ ئامادە نی یە ئەو کاتە حەق دەبێت لەسەر خوا کە ئەو کەسە ئازاد بکات لە ئاگر(ی دۆزەخ).

## گەورەیی موسڵمان سەلامەت بوون لە دەست و زمانت:

١-عن أبي موسى الأشعريّ(رضي الله عنه) قال: سُئِلَ رسول الله(ﷺ) ايُّ المسلمين أفضَلُ؟ قال مَنْ سلمَ المسلمون مِنْ لسانهِ ويَدهِ) رواه البخاري(١١) ومسلم(٤٢).

واتە: ئەبوموسای ئەشعەری(رەزای خوای لیّ بێت) دەڵیّ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا کام موسڵمان باشترە؟ فەرمووی: ئەو موسڵمانەی کە موسڵمانان لە دەست و لە زمانی سەلامەتن.

## ووتەو هەڵس کەوتی ناوداران دەربارەی غەیبەت

١-بکری کوڕی منیر دەڵێ گوێم لە محمدی کوڕی اسماعیل بووە دەیگوت کەدەکا(امام بخاری): ارجو ان الْقى الله ولا يحاسِبَني اني اغتبتُ احداً[١]. واتە: تکام وایە بە خوا بگەم حیسابم لەگەڵ نەکات کە غەیبەتی هیچ کەسێکم کردبی.

٢- روي عن ابن مبارك(رحمه الله) أنه قال(لو كنت مغتاباً أحداً لا غتبت والديَّ لأنهما أحق بحسناتي).

واتە: عبدالله کوڕی مبارك(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەگەر غەیبەتی یەکێك بکەم ئەوە هەر غەیبەتی دایکم و باوکم دەکەم لەبەر ئەوە ئەوان لە هەموو کەسێك لە پێش ترن بە کردەوە چاکەکانم.

٣- ولما بلغ الحسن البصري أن رجلاً اغتابه ارسل إليه طبقاً من الرطب وقال: بلغني انك اهديت إليّ حساناتك(اي بغيبته له) فأردت ان اكافئك عليها فاعذرني فاني لا أقدر أن اكافئك على التمام.

واتە: کاتێك بەحەسەنی بەصری گەیشت کە پیاوێك غەیبەتی کردووە ئەویش تەبەقەیەك خورمای بۆ رەوانە کرد وە پیێ ی گوت پێم گەیشتووە کە تۆ چاکەکانت پێشکەشی من کردووە(واتە بە غەیبەت کردنی) منیش ویستم تۆڵەت بۆ بکەمەوە لەسەر ئەم چاکەیە بەڵام دەبێ بشم بوری کە من ناتوانم بە تەواوی تۆڵەت بۆ بکەمەوە.

٤- عن عمرو بن العاص: انَهُ مَرَّ على بغلٍ مَيّت فقال لبعض اصحابه لأن يأكل الرَّجلُ مِن هذا حتى يملأ بطنهُ خيرُ لَهُ من ان يأكل لحم رجلٍ مسلم[٢].

---

(1) صفة الصفوة.

(2) هذا القول ثابت عن عمرو بن العاص كما في(صحيح الترغيب والترهيب).

واته: عەمری کوڕی عاص(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) بەلای هیٚستریٚکی تۆپیدا رۆیشت فەرموویە یەکیٚك لە هاوریٚکانی ئەگەر پیاو لەو هیٚسترە تۆپیوە بخوات تاوەکو زگی خۆی پردەکات باشترە لەوەی کە گۆشتی پیاویٚکی موسلْمان بخوات واتە غەیبەتی بکات.

٥- لە(مختصر منهاج القاصدين) دا دەلْیٚ(الغيبة اشَدُّ مِنْ لبس الحرير).

واتە: غەیبەت خراترە لە لەبەر کردنی بەرگی ئاوریشم.

٦- و ذَكَرَ رجلٌ آخَرَ بسُوء امام صاحبه فقال له(هل غزوت الرُّوم قال لا قال هل غزوت الترك قال لا قال(سلم منك الرُّومُ وسلم منك الترك ولم يَسْلَم منك اخوك المسلم).

واتە: پیاویٚك بەرامبەر برادەرەکەی باسی یەکیٚکی تری کرد بە خراپە برادەرەکەی پیٚ ی ووت ئایا غەزات لەگەلْ رۆمەکان کردووە گوتی نەء پیٚ ی گوت ئەدی غەزات لەگەلْ تورکەکان کردووە گوتی نەء ، جا پیٚ ی گوت رۆمەکان و تورکەکان لە دەستی تۆ سەلامەت بووینە بەلاّم برای موسلْمانت لە دەستی تۆ سەلامەت نەبووە.

٧- يروى عن الحسن البصري(رحمه الله) ان رجلاً قال له إنّك تغتابني فقال ما بَلَغَ قَدرُك عندى ان اُحكِّمَكَ في حسناتي).

واتە: پیاویٚك گوتیە حەسەنی بەسرایی تۆ غەیبەتم دەکەی حەسەنی بصری(رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت) پیٚ ی گۆت تۆ پلەو پایەت نەگەیشتۆتە ئەوەندە لای من تا دەستت گیر بکەم لە کردەوە چاکەکانم.

٨- عن عمرو بن موسى قال سمعت معروفاً يقول وعنده رجل يذكر رجلاً فجعل يغتابه فجعل معروف يقول له: اذكر القطن اذا وضعوه على عينيك اذكر القطن اذا وضعوه على عينيك.

واته: عەمری كوری موسی دەڵێ: گوێم لە شێخ معروف كەرخی بوو پیاوێكی لابوو باسی پیاوێكی كرد دەستی كرد بە غەیبەت كردنی، جا شێخ معروف پێ ی گوت: بیر لەو لۆكەیە بكەوە كاتێك كە دەیخەنە سەرچاوت، بیر لەو لۆكەیە بكەرەوە كاتێك كە دەیخەنە سەرچاوت.

٩- عن حزم قال: كان میمون بن سیاه لا یغتاب و لا یدع أحداً یغتابُ عندهُ ینهاهُ فان انتهی وإلا قام عنه[١].

واتە: حەزم دەڵێ: مەیمون كوڕی سیاه غەیبەتی كەسی نەدەكرد وە نەشی دەهێشت هیچ كەسێك لای ئەو غەیبەت بكەن وە ئەگەر یەكێك لەلای ئەوغەیبەتی بكردبایە نەهی لێ دەكرد ئەگەر وازی نەهێنابایە هەڵدەستا دەرۆیشت.

١٠-(عبدالله بن وهب) الإمام العَلَم(شیخ الاسلام) قال عنه حَرْمَلة: سمعت ابن وهب یقول: نَذَرتُ أنّي كُلّما اغتبتُ إنساناً أن اصوم یوماً فأجهدني فكنت اغتاب و أصوم، فنویت أنّي كلّما اغتبت إنساناً أنْ أتَصدَّق بدرهم فَمِن حُبِّ الدراهم تركتُ الغیبةَ[٢].

واتە: ابن وهب دەڵێ: نەزرم كرد هەر كاتێ غەیبەتم كرد ڕۆژێك بەرۆژوو بم ئەوە ماندووی كردم غەیبەتم دەركردو بەرۆژوو دەبووم، جا نیەتم هێنا كە هەر كاتێك غەیبەتم كرد درهەمەكی زیو بكەمە خێر لە خۆشەویستی ئەم درهەمانە غەیبەتم تەرك كرد.

---

(1) صفة الصفوة.

(2) موسوعة الأخلاق الإسلامیة.

## هەندێ روون كردنەوەو بابەتی جیاجیا دەربارەی غەیبەت:

١-(عفيف طبارة) لە پەرتوكی(الخطايا في نظر الاسلام) دا دەڵێ: ولا فرق في الغيبة ان تكون في غيبة المغتاب ام بحضرته.

واتە: غەیبەت جیاوازی نی یە چ لە پاشملەی كەسەكە بیت و چ بەرەو رووی بیت. كەواتە ئەگەر غەیبەتی یەكێك بكەی كەسەكە بەرەو رووت بیت و ئامادە بیت هەر غەیبەت حیسابە.

٢- هەندێ كەس لەوانەیە واتێ بگەن ئەگەر غەیبەتی باوكیان یا دایكیان یا برایان یا كوڕیان یا كچیان یا خێزانیان یا خوشكیان بكەن ئەوە بە غەیبەت دانەنێن، بەڵێ غەیبەتی ئەوانە غەیبەتە(عبدالله كوڕی مبارك) رەزای خوای لێ بێت دەڵێ: ئەگەر غەیبەتی یەكێك بكەم هەر غەیبەتی دایك و باوكم دەكەم چونكە ئەوان لە هەموو كەسێ هەق ترن بە چاكەكانم.

٣- یا لەوانەیە ئەو كەسەی غەیبەتی دەكەی بڵێ ی ئەمە گچكەیەو غەیبەت نی یە(حسين العوايشة) لە نامیلكەی(الغيبة)دا دەڵێ: فان الأدلة في تحريم الغيبة جاءت مطلقة فتظل على اطلاقها فتشمل الكبير والصغير والذكرِ والانثى والغني والفقير.

واتە: بەڵگە لەسەر حەرام بوونی غەیبەت بە رەهایی هاتووە ئەوجا بەم شێوەیە دەمێنێتەوە گەورەو گچكە نێرو مێ دەوڵەمەند و فەقیر دەگرێتەوە.

٤- غەیبەت تەنها ئەوە نی یە بە زمان بێت بەڵكو بە هەموو ئەو شتانەیە كە غەیری خۆت تێبگەینی بە سوك كردنی موسڵمانێك جا بە قسە بێت یا نوسین بێت یا ئیشارە بێت یا بە چاو یا بە دەست یا بەسەر ئیشارەتی بۆ بكەی یا لەچاو ئەو بكەیتەوە وەكو ئەوە بەشەلە شەل بڕۆی.

٥- ئەمانەش غەیبەتن بۆ نمونە دەڵێ فلانە كەس چۆنە تۆش دەڵێ ی(خوا چاكمان بكات) یا(خوا لە گوناهمان خۆش بێ) یا(خوا چای بكات)

یا(داوای سەلامەتی لە خوا دەکەین) یا(سوپاس بۆ خوا ئێمەی پاراستووە لە درۆ) ئەم شتانە کە مانای سوك کردنی لێ دەفامرێتەوە.

## تەوبە کردن لە غەیبەت:

تەوبە کردن لە غەیبەت واجبە وە مەرجەکانی تەوبە کردن لە غەیبەت چوار شتن کە ئەمانەن:

الأول: أن يقلع المُغتاب مِنْ غيبته.

یەکەم: غەیبەت کەر دەست لە غەیبەت کردن هەڵبگری.

الثاني: أَنْ يَندَمَ على فعلها.

دووەم: پەشیمان بێتەوە لە کردنی غەیبەت.

الثالث: أن يَعْزِمَ أن لا يعودَ اليها.

سێ یەم: بریارێکی تەواو بدات لە نەفسی خۆیدا تا لە ژیان دا مابێ جارێکی تر نەگەرێتەوە بۆ غەیبەت کردن.

الرابع: چوارەم: گەردنی خۆی بە غەیبەت کراوەکە ئازاد بکات. بەلاّم ئەم خاڵی چوارەمە رەئی تریشی لەسەر هەیە هەوڵ بدە زیاتر شارەزاتر بیت لیّ ی.

مجاهد دەڵێ: كفارة اكلكَ لحم أخيك ان تُثني عليه وتدعو له بخير وكذلك إن كان قد مات[1].

واتە کەفارەتی غەیبەت ئەوەیە باسی بکەی بەچاکە وەدوعای خێری بۆ بکەی وە ئەگەر کەسەکە مردبیش هەر بەم جۆرەیە. وە ئەگەر کەسەکە غەیبەتەکەی پێ گەیشتبی ئەوە برۆ لای گەردنی خۆتی پێ ئازاد بکە پەشیمانی خۆتی بۆ دەربرە لەم کارەت بەرامبەر ئەو.

---

(1) مختصر منهاج القاصدين.

## باسی نەمیمەت:

١-عن حذيفة(رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: لا يَدْخُلُ الجنَّةَ نَمَّام) رواه البخاري(٦٠٥٦) ومسلم(١٠٥).

واتە: ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی قسە دەهێنێ و دەبا بۆ تێك دانی نێوانی خەڵك.

**سوود:**

١-قال النووي: في (رياض الصاحين) النميمة: هي نقل الكلام بين الناس على جهة الإفساد.

واتە: (نميمة) بريتی يە لە گواستنەوەی قسەی خەڵكان ئی هەندێكيان بۆ هەندێكيان بۆ تێك دانی نێوانيان.

٢- قال الحافظ المنذري(أجمعت الأمة على تحريم النميمة وأنَّها من أعظم الذنوب عند الله عزَّ و جلَّ)[1].

واتە: (حافظ منذري) دەڵێ(ئۆممەت لەسەر ئەوە كۆن كە نەميمەت حەرامە وە نەميمە يەكێكە لە گەورەترين گوناهەكان لای خوا(عز و جلَّ).

وە(هيثمی)يش لە(زواجر) لە ريزی گوناهە گەورەكان باسی دەكات.

٢- عن هَمَّام بنِ الحارث قال: كُنَّا جُلُوساً مع حذيفة في المسجد فجاءَ رَجلٌ حتَّى جَلَسَ الينا فقيل لحذيفة: أنَّ هذا يَرفَعُ الى السُّلطانِ اشياءَ فقال حذيفة: إرادَةَ انْ يُسمِعَهُ: سمعتُ رسول

---

(1) الزواجر عن اقتراف الكبائر. ج٢ ص٥٧٢.

الله(ﷺ) يقول: لا يَدخُلُ الجنَّةَ قتَّات[1]. رواه مسلم(١٠٥).

واته: هەممامی کوری حارث دەڵێ: ئێمە لای(حذيفة) دانیشتبووین لە مزگەوت پیاوێك هات لە لامان دانیشت جا بە(حذيفة) گوترا(رەزای خوای لێ بێت) ئەم پیاوە قسە نەقل دەکات بۆ(سولتان) حوزەیفەش فەرمووی بۆ ئەوەی کابرا گوێ ی لێ بێت فەرمووی گوێم لە پێغەمبەر بووە(ﷺ) دەیفەرموو: ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی قسە دەهێنێ و دەبا بۆ تێك دانی نێوانی خەڵك.

**سوود**:

١-یحی کوری ابن کثیر دەڵێ: الذي يَعمله النمام في ساعةٍ لا يعمله الساحر في شهر.

واته: ئەوەی کە نەممام لە سەعاتێك دا دەیکات جادووگەرو ساحر لە ماوەی مانگێك دا نایکات.

٣- عن ابن عباس(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله(ﷺ) مرَّ بِقَبْرَينِ فقال: إنَّهُما لَيُعَذبان وما يُعَذَّبانِ في كبير ثُمَّ قال: بلى أمَّا احَدُهُما فكان يسعى بالنميمةِ وأمَّا الآخر فكان لا يستتر مِن بولِهِ. رواه البخاري(٢٧٣) ومسلم(٢٩٢).

واته: ابن عباس(رەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بەلای دوو قەبرا تێپەری فەرمووی: خاوەنی ئەم دوو گۆڕە ئازارو سزا دەدرێن لەسەر شتێ عەزاب نادرێن کە ئەوان بە گەورەیان زانیبێ بەڵام ئەو شتە گوناهی گەورەیە یەکێکیان قسەی دەهێناو دەبر بۆ تێك دانی

---

(1) روضة العقلاء لابن حبان: ١٧٩.

نێوانی خەڵك وە ئەوی تریان خۆی نەدەپاراست لە میزەکەی(لە کاتی میزکردن دا).

**سوود**:

١-لەم فەرموودەیەدا ئیسپاتی عەزابی قەبری تیادایە.

٢- مرۆڤ ئەگەر خۆی نەپارێزێ لە میزەکەی و میزی بە جەستەو جل و بەرگی کەوت و نەیشوشت ئەوە ئەگەر نوێژ بکات بەم حاڵە نوێژەکەی بە تاڵە.

٣- عن منير قال: كنت جالساً مع وهب بن منبه فأتاهُ رجل فقال: اني مررت بفلان وهو يشتمك، فَغَضِبَ وقال: ما وجَدَ الشيطان رسولاً غيرك فما برحتُ من عندهِ حتى جاءَهُ ذلك الرجل الشاتم فسَلَّمَ على وهب فَرَدَّ عليهِ و مَدَّ يدهُ وصافحَهُ واجْلَسَهُ إلى جنبهِ[1].

واتە: مونیر دەڵێ: لای وەهبی کوڕی مونەببە دانیشتبووم پیاوێك هاتەلای گوتی: بەلای فلانە کەس دا رۆیشتم قسەی ناشیرینی پێ دەووتی وەهب توڕە بوو گوتی شەیتان جگە لە تۆ نێراوێکی تری نەدۆزیەوە؟

مونیر دەڵێ: هەر لای وەهب بووم ئەم پیاوەی قسەی ناشیرینی پێ ووتبو هاتەلای سەلامی لێ کرد سەلامەکەی وەڵام دایەوە و دەستی درێژکرد تۆقەی لەگەڵ دا کردو لە تەنیشتی خۆی داینا.

---

(1) صفة الصفوة.

# گومانی خراپ(سوء الظن)

خوا دەفەرموێ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞ﴾ (الحجرات:١٢).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان لە زۆرێك لە گومانەکان بپارێزن چونکە بە راستی هەندێك لە گومانەکان گوناهن.

## سوود:

١-مانای(الظن – شك – يقين)

ظنّ: بوونی شتێکت بەسەر نەبوونی دا زاڵ کردبێ یان بە پێچەوانەوە.

شك: هەردوو لات پێ وەك یەك بیت.

يقين: بوون یان نەبوونی شتێکت بە تەواوی و بە دڵنیاییەوە بەلایەکیان دا ساغ کردبێتەوەو حەسمت کردبێت.

٢- پێناسەی گومانی خراپ

سوء الظنّ: عقد القلب وحكمهُ على غيرك بالسوء.

واتە: گومانی خراپ: بریتی یە لە گرێ دانێ دڵ و بریاردانی لەسەر غەیری خۆت بە خراپە.

بەڵام گومانی خراپ ئەگەر خاوەنەکەی بەرگری کردو لە خۆی لاداو لە دڵ دا جێگیر نەبوو پێ ی گوناهبار نابێت.

٣- ابن حجر لە(الزاوجر) دا لە کەبیرەی(٣٢)دا گومانی خراپ بردن بە موسڵمانان لە ریزی گوناهە گەورەکان دا باس دەکات.

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله(ﷺ) قال: إياكم والظنَّ، فإنَّ الظنَّ أكذبُ الحديث. رواه البخاري(٥١٤٣) ومسلم(٢٥٦٣).

واته: خۆتان بپارێزن له گومانی خراپ، چونكه گومانی خراپ درۆترین قسه‌یه.

**سوود:**

١-سوفیانی ثه‌وری(ره‌حمه‌تی خوای لێ بێت) ده‌ڵێ: حُرِّمتُ قيام الليل خمسةَ اشهرٍ بذنبٍ اذْنَبْتُه، قيل وما ذاك الذنب؟ قال: رأيتُ رجلاً يبكي فقلتُ في نفسي هذا مُراءٍ.

واته: قه‌ده‌غه كرام له(قيام الليل) بۆ ماوه‌ی پێنج مانگ به هۆی گوناهێكه‌وه كه ئه‌نجامم دابوو، پیێ ی گوترا ئه‌م گوناهه چی بوو؟ گوتی: پیاوێكم دیت ده‌گریا منیش له دڵی خۆم دا گوتم ئه‌وه ریابازه.

٢- ئه‌گه‌ر موسڵمان گومانی خراپی هاته دڵ نه‌یتوانی لای ببات با به‌قسه باسی نه‌كات.

## گومانی باش بردن به خوا

١-عن جابر(رضي الله عنه) قال: سمعتُ النبيَّ(ﷺ) قبل وفاته بثلاثٍ يقول: لا يَمُوتَنَّ أحَدُكُم إلاّ وهُو يُحْسِنُ بالله الظنّ. رواه مسلم(٢٨٧٧).

واته: جابر(ره‌زای خوای لێ بێت) ده‌ڵێ: گوێم له پێغه‌مبه‌ر بوو(ﷺ) سێ رۆژ پێش وه‌فاتی ده‌یفه‌رموو: با هه‌رگیز هیچ كه‌سێك له ئێوه نه‌مرێ

مەگەر ئەو کەسە گومانی باش بێت بەخوا.

## سوود:

کەواتە موسڵمان بە درێژایی ژیانی سوور بێت لەسەر ئەم کارە گومانی باش بێت بە خوا ئومێدی هەبێت گومانی وابێت کە خوا رەحمی پیّ دەکات وە هەروەها ترسی هەبێت لە سزای خوا وە ئومیدی رەحمەت و لێبوردنی لەلا زیاتر بێت بە تایبەتی لەو کاتانەی کە هۆیەکانی مردن ئامادەی دەبن.

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال النبيُّ(ﷺ) يقول اللهُ عزَّ وجَلَّ: أنا عند ظنِّ عبدى بي وأنا مَعَهُ حينَ يَذكُرني، إنْ ذكرني في نفسه، ذكرتُهُ في نفسي، وإن ذكرني في مَلإٍ ذكرتهُ في ملإٍ هم خيرٌ منهم، وإن تَقَرّب مِنّي شبراً تَقَرَّبتُ إليهِ ذراعاً وإن تَقَرَّبَ إليَّ ذراعاً تَقَرَّبتُ منهُ باعاً وإنْ أتاني يَمشي أتيتُهُ هرولةً. رواه البخاري(٧٤٠٥) ومسلم(٢٦٧٥).

مَلَإٍ: جماعه – کۆمەڵێك.

باعاً: باڵێك، ئەگەر هەردوو دەستت بکەیتەوە بەلای راست و چەپدا. لەسەری پەنجەکانی لای راست تا سەری پەنجەکانی لای چەپ ئەمە باڵێکە.

ماناى فەرموودەکە:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ خودا(عزوجل) دەفەرموێ: من بە گوێرەی گومان و بۆچوونی بەندەکەمم بەرانبەرم، ومن لەگەڵی دام کاتێك یادم دەکات جا ئەگەر لە دڵی خۆی دا لەبەر خۆیەوە یادم بکات منیش لەلای خۆمەوە یادی دەکەم وە ئەگەر لەناو کۆمەڵێکدا یادم بکات منیش لەناو

کۆمەڵێکی لەوان چاکتردا یادی دەکەم وە ئەگەر بستێك لێم نزیك بێتەوە باسکێك لیّ ی نزیك دەبمەوە وە ئەگەر باسکێك لێم نزیك بکەوێتەوە من باڵێك لیّ ی نزیك دەکەومەوە، وە ئەگەر بە رۆیشتن بێت بۆ لام بە هەروەلە(راکردن) بۆ لای دەچم.

## سوود:

قال عبدالله بن مسعود: والذي لا اله غيرهُ ما أُعطِيَ عبدٌ مؤمنٌ شيئاً خيراً من حُسن الظنِّ بالله، والذي لا اله غيره، لا يُحسنُ عبدٌ بالله الظنَّ إلاَ أعطاه الله ظنَّهُ، ذلك بأنَّ الخير في يده. (حسن الظنّ بالله لإبن أبي الدنيا)[1].

واتە: سوێندم بەوەی کە هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نی یە بێجگە لەو بەندەی ئیماندار هیچ شتێکی نەدراوەتیّ باشتر لە گومانی باش بردن بە خوا وە سوێندم بەوەی کە هیچ پەرستراوێکی بەراستی نی یە جگە لەو نی یە هیچ بەندەیەك گومانی باش بێت بە خوا، ئیللا خودا وەکو گومانەکەی پیّ ی دەدات ئەوەش لەبەر ئەوە هەموو خێرێك بەدەستی ئەوە.

(1) حسن الظن بالله لإبن ابي الدنيا.

## الحِقْد (كينه):

(الحِقدُ) وه(الضِّغْنُ) وه(الضَّغينةُ) ئه‌مانه هه‌رسێكیان واته: كینه.

(الحِقد) تاكه، كۆیه‌كه‌ی(احقاد) و(حُقُود)ه.

(الحِقد) چاوگ(مصدر)ه.

(الحَقود) واته(الكثیر الحِقد) ئه‌وه‌ی كینه‌و حقدی زۆره له(مختصر منهاج القاصدین)دا ده‌ڵێ:( انَّ الغیظَ إذا كُظم لعجزٍ عن التَّشفِّي في الحال رجعَ على الباطنِ. فاحْتَقَنَ فیه فصار حِقداً).

واته: توره‌یی ئه‌گه‌ر قوت دراوه له‌به‌ر هۆیه‌ك نه‌ت توانی ده‌ری ببری له‌و كاته گه‌راوه بۆ ناوه‌وه‌و تێیدا مایه‌وه ده‌بێته(حقد) كه‌واته كینه(حقد) توره‌ییه‌كه له ناو دڵدا په‌نگی خواردۆته‌وه‌و جێگیر بووه وه كینه(حقد)یش یه‌كێكه له گوناهه گه‌وره‌كان.

خوا ده‌فه‌رموێ:﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ﴾ (الحشر:١٠).

واته: ئه‌وانه‌ش له پاش ئه‌مانه‌وه هاتوون ده‌ڵێن: ئه‌ی په‌روه‌ردگارمان لێمان خۆش به‌و له‌و برایانه‌شمان(خۆشببه) كه پێشمان كه‌وتوون له ئیمان هێناندا، وه هیچ رق و كینه‌یه‌ك مه‌خه‌ره دڵمانه‌وه ده‌رباره‌ی باوه‌ڕداران، ئه‌ی په‌روه‌ردگارمان به‌ڕاستی هه‌ر تۆی دڵسۆزی میهره‌بانی.

١-عن الزبیر بن العوام(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: دَبَّ إلیكم داءُ الأُممِ قَبلكُم: الحسد والبغضاء، هي الحالقة، لا اقولُ تحلقُ الشَّعْرَ ولكن تحلقُ الدِّین والذي نفسي بیده لا تدخلوا الجنَة حتّى تؤمنوا ولا تؤمنوا حتّى تحابوا، أفلا أُنبِّئُكُمْ بما یُثبِّتُ ذاكم لكُم؟ أفشوا السلام بینكم . حسن رواه الترمذي(٢٥١٠) والبزاز

وغيره.

واته: دەردی ئوممەتانی پێشوتان دزەی کردۆتە ناوتان حەسوودی و بوغزوکینە وە بوغزوکینە هەڵتاشەرە، ئاگاداربن ناڵێم مووان دەتاشێ بەڵکو ئایین دەتاشێ، سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەستە ناچنە بەهەشت تا بڕوا نەهێنن وە بڕوا ناهێنن تا یەکترتان خۆش نەوێت ئایا خەبەرتان بدەمێ بەو شتەی کە ئەم خۆشەویستیە بۆ ئێوە جێگیر دەکات؟ سەلام لە نێوانێ خۆتاندا بڵاوبکەنەوە.

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ النبيُّ(ﷺ) قال: إيَاكُم وسُوء ذات البَين فإنَّها الحالقةُ. حسن رواه الترمذي(٢٥٠٨).

واته: خۆتان بپارێزن لە خراپی نێوانتان(لە دوشمنایەتی و بوغزو کینە) چونکە بێ گومان خراپی نێوانتان هەڵتاشەرە(دینتان دەتاشێ).

٣- عن ابن مسعود(رضي الله عنه) قال: قال النبيُّ(ﷺ): لا يُبَلِّغني أحدٌ مِن أصحابي عن أحدٍ شيئاً فَإنّي أُحِبُّ انْ اخرج اليكم وانا سليم الصدر[1].

واته: با هیچ هاوەڵێکم شتێکم پێ نەگەیەنێ لە بارەی هیچ کەسێکەوە بێ گومان من پێم خۆشە کاتێك لە ناو ئێوە دەردەچم دڵم ساف و سەلامەت بێت.

٤- عن أبي الدرداء(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): الا أُخبِركم بافضلَ مِنْ دَرَجَةِ الصيام والصلاة والصدقة؟ قالوا: بلى، قال: صَلاحُ ذات البَينِ فإنَّ فسادَ ذاتِ البين هي الحالقة.

---

(1) رواه ابوداود(٤٨٦٠) والترمذي(٣٨٩٦) وضَعَّفَهُ الألباني وقال احمد شاكر في تحقيق المسند اسناده حسن على الأقل.

صحيح رواه ابوداود(٤٩١٩) والترمذي(٢٥١١).

واته: ئايا كردەوەيەكتان پێشان بدەم كە پلەو پايەى لە هى رۆژوگرتن و نوێژ و ماڵ بەخشين بەرزتر بىٚ؟ گوتيان بەڵىٚ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: چاككردنەوەى نێوان خەڵكى چونكە تێكچوونى نێوان‌و خراپ بوونى پەيوەندييەكان هەڵتاشەرە(واتە هەڵتاشەرى دينداری يە).

## ووتەى ناوداران دەربارەى (حقد)

١-قيل لأبي سليمان الداراني: ما بالُ العقلاء أزالوا اللوم عَمَّن اساءَهم؟ قال: إنَّهم علموا انَّ اللهَ إنّما ابتلاهم بذنوبهم.

واتە: بە سولەيمانى دارانى ووترا: ئەوە بۆ پياوە ژيرەكان لۆمەى ئەوانە ناكەن كە خراپەيان بەرامبەر دەكەن؟ فەرمووى: لەبەر ئەوەى ئەوان زانيان ئەوەى بەسەريان هاتووە بە هۆى گوناهەكانيان بووە.

٢- عن مسروق قالَ: سمعتُ عمر يقولُ: كُلُّ الناس منّى في حِلّ.

واتە: مەسروق دەڵىٚ: گوێم لە ئيمامى عومەر بوو دەيفەرموو: گەردەنى هەموو كەسێك ئازاد بێت.

٣- قال الشاعر:

لما عَفوتَ ولم أحقد على احدٍ ... أرحِتُ نفسي من هَمِّ العداواتِ

واتە: كاتێك خەڵكم عەفوو كردو رق و كينەم لە دڵى خۆم دا نەگرت بەرامبەر هيچ كەسێك نەفسى خۆم ئاسوودەو بىٚ خەم كرد لە خەمى دوشمندارى.

## ئیرەیی(الحسد):

نووی(رەحمەتی خوای لیٚ بیت) له پیٚناسەی(حسد)دا دەڵیٚ:(وهو تَمَنِّي زوال النِّعمَةِ عن صاحبها سواءٌ كانت نِعمة دين أو دنيا).

واته: حەسوودی بریتی یه له خۆزگه خواستن به نەمانی نیعمەت له خاوەنەکەی جا ئەو نیعمەته دینی بێت یا دونیایی.

بەڵام(الغِبطة) ئەوەیه تۆ حەز ناکەی نیعمەتی بەرامبەرەکەت لەناو بچێت بەڵام پێت خۆشه خوا وەکو ئەو بدا به تۆ ئەمەیان حەڵاڵه.

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): لا تحاسدوا ولا تناجشوا ولا تباغضوا ولا تدابَروا ولا يَبِعْ بَعضُكُمْ على بيع بعض وكونوا عبادَ الله إخوانا، المسلم أخو المسلم لا يظلمه ولا يخذُلُهُ ولا يحقرهُ التقوى هاهنا. ويشيرُ إلى صدرهِ ثلاث مرَات، بِحَسْبِ امرىءٍ من الشَّرِّ أنْ يحْقِرَ أخاهُ المسلم، كُلُّ المسلمِ على المسلم حرامٌ دَمهُ ومالُهُ وعرضُهُ. رواه البخاري(٥١٤٤) ومسلم(٢٥٦٤).

١-تناجش: زیاد کردنی نرخی شت و مەکه لەبەر چاوی کڕیاردا بەمەبەستی گران کردن و فرۆفێل پیٚ کردن و خەڵك پیٚ هاندانی ئەمەش حەرامه.

٢- ولا يبع بعضكم على بيع بعض:.... وەك: یەکیٚ به فرۆشیار بڵیٚ: ئەو شته مەفرۆشه به فلانه کەس بیفرۆشه بەمن پارەت زیاتر دەدەمیٚ، یان بڵێته کریار: ئەو شتەی لیٚ مەکره بیدەرەوه من هەمان شتت دەدەمیٚ به

هەرزانتر ئەم جۆرە كردەوانە حەرامن.

٣- ولا يخذلُهُ: الخذل: ترك الإعانة والنصر، ومعناه اذا استعان به في دفع ظالم ونحوه لزمه اعانته اذا امكنه ولم يكن له عذر شرعي.

ماناى فەرمودەكە:

حەسوودى بەيەكتر مەبەن، بە فێڵ نرخى شت و مەك زياد مەكەن وە پشت مەكەنە يەكتر وە هەندێك لە ئێوە كڕين و فرۆشتەنى مەكەن بەسەر كڕێن و فرۆشتەنى هەندێك دا وە ئەى بەندەكانى خوا برابن موسڵمان براى موسڵمانە زوڵمى لىٚ ناكات وە لە توانادا بۆ ئازار لىٚ دوورخستنەوەى پشتى بەرنادات و يارمەتى دەدات وە بە چاوى سووك و بىٚ نرخ تەماشاى ناكات پارێزكارى(تقوى) وا لێرەدايە، سىٚ جاران ئاماژە بۆ سينگى دەكات ئەوەندە خراپە بەسە بۆ مرۆڤێك كە بەچاوى سووك و بىٚ نرخ تەماشاى براى موسڵمانى بكات هەموو شتێكى موسڵمان لەسەر موسڵمان حەرامە خوێنى و ماڵى و ناموسى.

٢- عن الزبير بن العوام(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: دبَّ إليكم داءُ الأُمم قَبلكُم: الحسد والبغضاء، هي الحالقة، لا اقول تحلقُ الشَّعْرَ ولكن تحلقُ الدِّين والذي نفسي بيده لا تدخلوا الجنَّة حتّى تؤمنوا ولا تؤمنوا حتّى تحابوا، افلا أُنبِّئُكُمْ بما يُثَبِّتُ ذاكم لكُم؟ افشوا السلام بينكم . حسن رواه الترمذي(٢٥١٠) والبزاز وغيره

واتە: دەردى ئوممەتانى پێشوتان درزەى كردۆتە ناوتان حەسوودى و بوغزوكينە وە بوغزوكينە هەڵتاشەرە، ئاگاداربن ناڵێم مووان دەتاشىٚ بەڵكو ئايين دەتاشىٚ، سوێندم بەوەى گيانى منى بەدەستە ناچنە بەهەشت

تابڕوا نەهێنن وەبڕوا ناهێنن تایەکترتان خۆش نەوێت ئایا خەبەرتان بدەمێ بەو شتەی کەئەم خۆشەوستیە بۆ ئێوە جێگیر دەکات؟ سەلام لەنێوانی خۆتاندا بلاّوبکەنەوە.

٣- عن ضَمرَة بن ثَعْلَبةَ(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): لايزالُ الناس بخير ما لم يتحاسدوا[1].

واتە: تا وەکو خەلّك حەسوودی بە یەکتر نابەن هەر سەلامەتن.

(1) قال المنذري في الترغيب والترهيب: رواه الطبراني ورواته ثقات، وقال الهيثمي(٧٨/٨) ورجاله ثقات.

# خۆ بەگەورە زانین و خۆ بەکەم گرتن (الكِبرُ والتواضع)

١-خوا دەفەرموێ﴿سَأَصۡرِفُ عَنۡ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلۡغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ﴾ (الاعراف:١٤٦).

واتە: لا دەدەم لە نیشانەو بەڵگەکانم ئەوانەی کە خۆیان بە گەورە دادەنێن لەسەر زەوی دا بە ناهەق و ناڕەوا ئەوانە ئەگەر هەموو ئایەت و موعجیزەیەك ببینین باوەڕی پێ ناهێنن، وە ئەگەر ئاینی ڕاست و دورست ببینن نایکەن بە ڕێبازو ئاییني خۆیان وە ئەگەر ڕێگەی گومرایی و ئاییني چەوت ببینن دەیکەن بە ئاین و ڕێباز بۆ خۆیان، هەموو ئەمانە لەبەر ئەوەیە بەڵگەو نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆزانی وە ئەوان بێ ئاگا بوون لێیان.

٢- (ذهبي) لە کیتابی(کبائر) خۆبەزلزانین لە ریزی گوناهە گەورەکان باس دەکات لە کەبیرەی حەڤدەم، وە هەروەها(ابن حجر الهيثمي) لە(الزواجر)دا خۆ بەگەورەزانین لە ریزی گوناهە گەورەکان باس دەکات لە کبیرەی چوارەم.

١-عن عبدالله بن مسعود(رضي الله عنه) عن النبيّ(ﷺ) قال: لا يدخلُ الجنةَ مَنْ كانَ في قلبهِ مثقالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبرٍ، فقال رجُلٌ: إنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أن يكونَ ثوبُهُ حسناً ونعْلُهُ حسنَةً؟ قال: إنَّ اللهَ جميلٌ يُحبُّ الجمال، الكِبرُ بَطَرُ الحقِّ وغَمْطُ الناس. رواه مسلم(٩١) وأبوداود(٤٠٩١) والترمذي(٢٠٠٦).

واته: ئەو كەسەی بەقەد(ذرة)یەك خۆ بەگەورە زانینی لە دڵدا بێت ناچێتە بەهەشت، پیاوێك گوتی: پیاوی وا هەیە حەز دەكا بەرگی جوان بێت پێڵاوی جوان بێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: بێگومان خودا جوانەو جوانیشی خۆش دەوێ، خۆبەگەورەزانین قەبول نەكردنی حەق و خەڵك بە كەم سەیركردنە.

٢- عن سلمة بن الاكوع(رضي الله عنه) أنَّ رجلاً أكَلَ عند رسول الله(ﷺ) بشماله فقال: كُلْ بيمينك، قال: لا استطيعُ قال: لاستطعت، ما منعهُ إلاّ الكِبرُ، قال: فما رَفعَها إلى فيه. رواه مسلم(٢٠٢١).

واته: پیاوێك لەلای پێغەمبەر(ﷺ) خواردنی بە دەستی چەپی خوارد، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: بە دەستی راستت بخۆ، پیاوەكە گوتی: ناتوانم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەنەتوانی، پیاوەكە بەدەستی راستەی نەیخوارد لەبەر خۆبەگەورە زانین بوو(جا كە پێغەمبەر(ﷺ) دوعای لێ كرد) پیاوەكە تا لە ژیاندا مابوو هیچی تر نەیتوانی دەستی راستەی بۆ دەمی بەرز بكاتەوە.

٣- عن ابي سعيد الخدري(رضي الله عنه) عن النبيّ(ﷺ) قال:

إحتجَّتِ الجَنَّةُ والنارُ فقالت النارُ: فِيَّ الجبّارون والمتكبّرون وقالت الجَنَّةُ: فِيَّ ضُعَفاءُ الناسِ ومساكِينُهُم، فقضى الله بينهما: إنّكِ الجنَّةَ رحمتي ارحمُ بكَ مَنْ أشاءُ وإنّكِ النار عذابي أُعذبُّ بكِ مَن اشاء ولكليكما عليَّ ملؤُها. رواه مسلم(٢٨٧٤).

واته: بەهەشت و دۆزەخ بوو بە دەماقاڵیان: دۆزەخ گوتی: ستەمكاران و خۆ بەگەورەزانان لەناو من دان، بەهەشت گوتی: خەڵكی بێ هێزو هەژار(لە موسڵمانان) لە ناو من دان جا خودا ناوبژی كردن و فورمووی: ئەی بەهەشت تۆ رەحمەتی منی هەركەسێك بمەوێ رەحمی پێ دەكەم بە تۆ وە ئەی ئاگر تۆش عەزابی منی هەركەس بمەوێ بەتۆ عەزابی دەدەم وە لەسەرمە هەردوو لاتان پربكەم.

٤- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): ثلاثةٌ لا يُكلِّمُهُمُ الله يوم القيامة ولا يزكيهم ولا ينظر اليهم ولهم عذاب أليم: شيخٌ زانٍ، وملكٌ كذابٌ، وعائلٌ مُستكبِرٌ. رواه مسلم(١٠٧).

عائل: هو الفقير: واته: هەژار .

ماناى فەرموودەكە:

سێ كەس لە رۆژی قیامەت خودا قسەیان لەگەڵ دا ناكات وە پاكیان ناكاتەوە(لە چلكی گوناح) وە تەماشایان ناكات(بەچاوی مەرحەمەت) وە سزایەكی بە سوێشیان بۆ هەیە: پیرێكی داوین پیس، وە پادشایەكی درۆزن وە هەژارێكی لووت بەرز.

٥- عن عياض بن حِمار(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): إنَّ الله أوحى إليَّ أنْ تواضعُوا، حتى لا يفخر أحَدٌ على

أحدٍ ولا يبغيَ أحدٌ على أحَدٍ. رواه مسلم(٢٨٦٥).

واته: بێگومان خودا سرووش و وەحی بۆ کردووم کە خۆتان بەکەم بگرن بە جۆرێکی وا کە کەس شانازی بەسەر کەسا نەکاو کەس زۆرو ستەم و ناهەقی لەکەس نەکا.

٦- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) قال: ما نقصَتْ صَدَقَةٌ منْ مالٍ، وما زاد الله عبداً بِعَفْوٍ إلاّ عِزاً، وما تواضَعَ أحَدٌ لله إلاّ رفَعَهُ الله. رواه مسلم(٢٥٨٨) والترمذي(٢٠٣٦).

واته: هیچ خێرکردنێك لە ماڵ کەم ناکات وە خوا هیچ زیاد ناکات بۆ بەندەیەك کە خەڵك عەفو دەکا پلەوپایە نەبێت وە هەر یەکێکیش لەبەر رەزامەندی خوا خۆی بەکەم بگرێ خودا بەرزی دەکاتەوە.

**سوود**:

١-کان يقال(ثمرة القناعة الراحة، وثمرة التواضع المحبَّة).

واته: گوتراوە: بەربوومی قەناعەت لە دونیادا حەسانەوەیە، وە بەروبوومی خۆبەکەم زانینیش لە دونیادا خۆشەویست بوونە لە دڵی خەڵکی.

٢- پیرەمێردی شاعر دەڵێ:

هەرچی خەڵك لە ژوور خۆیەوە بگرێ

ئـەوەی دەیـنـاسێ لەبـەری دەمـرێ

٧- عن أسود بن يزيد قال: سَألْتُ عائشة(رضي الله عنها) ما كان النبيُّ(ﷺ) يصنع في بيته؟ قالت: كان يكونُ في مِهنَةِ أهلهِ يعني: خدمةِ أهلِهِ، فإذا حَضَرَتِ الصلاةُ خرج إلى الصلاة. رواه البخاري(٦٧٦) (٥٣٦٣) (٦٠٣٩).

واتە: ئەسوەدی کوڕی یەزید دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە کرد-ڕەزای خوای لێ بێت- کە پێغەمبەر(ﷺ) چی دەکات؟ لە ماڵەوە؟ فەرمووی: خەریکی خزمەتی خێزانەکەی بوو وە کاتێکیش کاتی نوێژ بهاتایە دەچوو بۆ نوێژ.

٨- عن حُميد عن أنس(رضي الله عنه) قال: كان للنبيِّ(ﷺ) ناقةٌ تُسَمَّى العَضباء لا تُسبَقُ، قال حُميد أولا تكادُ تُسْبَقُ فجاء اعرابيٌّ على قَعُودٍ فسَبَقَها فشَقَّ ذلك على المسلمين حتى عَرفه فقال: حَقٌّ على الله أن لا يَرْتَفِعُ شيءٌ من الدنيا إلاّ وَضَعَهُ. رواه البخاري(٢٨٧١) (٢٨٧٢) (٦٥٠١) وابوداود(٤٨٠٢).

واتە: ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ووشترێکی مێ ی هەبوو ناو(عضباء) بوو، هیچ ووشترێك پێشی نەدەکەوت یا نزیك بوو هیچ ووشترێ پێشی نەکەوێ، جارێکیان عارەبەکی دەشتەکی هات لەسەر ووشترێك بوو پێش ووشترەکەی پێغەمبەر کەوت(ﷺ) موسڵمانان ئەمەیان لەبەر دڵ گران بوو، پێغەمبەر(ﷺ) بەمەی زانی کە موسڵمانان ئەمەیان لەبەر دڵ گرانە فەرمووی: حەقە لەسەر خوا کە هەر شتێك لە دونیادا بەرز بۆوە نەوی بکاتەوە.

٩- عن أنس(رضي الله عنه) أَنَّهُ مَرَّ على صبيانٍ فَسَلَّمَ عليهم. وقالَ كانَ رسولُ اللهِ(ﷺ) يفعَلُهُ. رواه البخاري(٦٢٤٧) ومسلم(٢١٦٨).

واتە: ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێت) بەلای هەندێ منالاًندا تێپەری سەلامی لێ کردن وە فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) وای دەکرد.

# تەماشا کردنی حەرام:

خوا دەفەرموێ﴿قُل لِّلۡمُؤۡمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِمۡ وَيَحۡفَظُواْ فُرُوجَهُمۡۚ ذَٰلِكَ أَزۡكَىٰ لَهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا يَصۡنَعُونَ ۝٣٠ وَقُل لِّلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَغۡضُضۡنَ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِنَّ وَيَحۡفَظۡنَ فُرُوجَهُنَّ﴾ (النور:٣٠-٣١).

واتە: ئەی محمد بڵێ بە پیاوانی ئیماندار چاوی خۆیان(لەسەیرکردنی نامەحرەم) داخەن و بپارێزن وە عەورەتیان(لە داوین پیسی) بپارێزن ئەوە چاکترو پاکترە بۆ ئەوان بێگومان خوا ئاگایە بە هەموو کردەوەیەك کە دەیکەن(٣٠) وە بڵێ بە ئافرەتانی ئیمانداریش چاویان داخەن و بپارێزن( لەسەیر کردنی نامەحرەم) وە عەورەتیان بپارێزن(لە داوین پیسی).

وە هەروەها خوا دەفەرمووێ﴿وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا﴾ (الإسراء:٣٦).

واتە: وە شوێنی شتێ مەکەوە کە زانیاریت دەربارەی نی یە بە ڕاستی گوێ و چاو و دڵ هەموو ئەوانە(خاوەنیان) پرسیار لێ کراون.

وە خوا دەفەرموێ﴿يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ﴾ (غافر:١٩).

واتە: خوا دەزانێ بە خیانەتی چاوان و هەرچی دڵان دەیشارنەوە.

١-عن ابن بريدةَ عن ابيه قال: قال رسول الله(ﷺ) لعليّ:(يا عليُّ لا تُتْبِعِ النَّظرةَ النظرةَ، فإنَّ لك الأولى وليست لكَ الآخرة.

حسن: رواه أبو داود(٢١٤٩).

واته: پێغەمبەر(ﷺ) بە ئیمامی عەلی فەرموو: ئەی عەلی نەزەر بە دوای نەزەردا مەکە چونکە یەکەمیان بۆ تۆیەو ئیتریان بۆ تۆ نی یە.

**سوود:**

١-ئەگەر موسڵمانێك لە ناكاوێك تووشی نەزەرێك بوو ئەگەر زوو چاوی لاداو دووبارە تەماشای نەكردەوە ئەوە گوناهبار نابێت، ئەمەیە كە دەفەرمووێ یەكەمیان بۆ تۆیە واتە پیێ ی گوناهبار نابیت، بەڵام ئەگەر یەكسەر چاوی لانەداو یا یەكسەر چاوی لادا بەڵام دووبارە تەماشای كردەوە بەمە گوناهبار دەبێت خوا بمانپارێزێ.

٢- عن جرير(رضي الله عنه) قال: سألتُ رسول الله(ﷺ) عن نظر الفَجْأةِ فقال: إصرف بَصرك. رواه مسلم(٢١٥٩) وابوداود(٢١٤٨).

واتە: جەریر(رەزای خوای لیێ بێت) دەڵێ: پرسیام لە پێغەمبەر كرد(ﷺ) دەربارەی نەزەری لەناكاو فەرمووی: چاوت لابدە.

**سوود:**

ئەگەر لە ناكاو تووشی نەزەرێك بوویت بەبیێ ئەوەی مەبەستت بۆی بووبیێ یەكسەر چاوت لادا پیێ ی گوناهبار نابیت.

٣–عن عبادة بن الصَّامت(رضي الله عنه) قال: إضمَنوا لي ستّاً مِنْ أَنْفُسِكُم أضمنْ لكُمُ الجنَّة: أُصْدُقُوا إذا حَدَّثْتُم، وأوفوا إذا وعَدتمْ وأَدُّوا إذا ائْتُمِنْتُم واحْفَظوا فُروجَكُم، وغُضُّوا أبصارَكُم،، وكُفُّوا ايدِيَكُم[١].

ضَمان: دابين كردن، دهستهبهركردن.

واته: شهش شتم له خۆتان دا بۆ دابین بكهن منیش بهههشتتان بۆ دابین دهكهم: راستگۆبن ئهگهر قسهتان كرد، وه ئهگهر بهڵێنتان دا جێبهجێی بكهن، وه ئهگهر سپاردهیهكتان لادانرا بیدهنهوه به خاوهنهكهی، وه داوێنتان بپارێزن، وه چاوتان داخهن و بپارێزن(له تهماشاكردنی حهرام)، وه دهستتان بگرن له خراپه.

٤– عن انس(رضي الله عنه) مرفوعاً ثلاثةٌ لا ترى أَعيُنَهُمُ النارَ يومَ القيامةِ: عينٌ بَكَتْ من خَشيَةِ الله، وعينٌ حَرَست في سبيل الله، وعَينٌ غَضَّتْ عن مَحارمِ الله. صحيح: انظر(السلسلة الصحيحة–٢٦٧٣).

واته: سێ كهس ههن چاوهكانیان ئاگر نابینێ له رۆژی قیامهت دا: چاوێك گریابێ له ترسی خوا، وه چاوێك حهرهسیاتی گرتبێ له پێناوی خوا، وه چاوێك داخرابێ و پارێزرابێ له قهدهغه كراوهكانی خوا.

---

(1) حسن: انظر(السلسلة الصحيحة:١٤٧٠).

## دونیاو دونیا بەکەم گرتن(زهد):

خوا دەفەرمویٚ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقٌّۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ۝٥ إِنَّ ٱلشَّيۡطَـٰنَ لَكُمۡ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ۝٦ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ شَدِيدٌۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَهُم مَّغۡفِرَةٌ وَأَجۡرٌ كَبِيرٌ﴾ (فاطر:٥-٦-٧).

واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان بەڵێنی خوا راستە دەی کەواتە با ژیانی دونیا فریوتان نەدات وە با شەیتان بە(بەزەیی و لێبوردەی) خوا فریوتان نەدات(٥) بەراستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە دەی کەواتە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن بێگومان ئەو(شەیتان) تاقم و کۆمەڵەکەی بانگ دەکات بۆ ئەوەی ببنە هاوەڵانی ئاگری هەڵگیرساوی(دۆزەخ) (٦) ئەوانەی بێ باوەڕ بوون سزای بە تینیان بۆ هەیە وە ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە لێبوردن و پاداشتێکی گەورەیان بۆ هەیە(٧).

وە خوا دەفەرمویٚ﴿وَمَا هَـٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٌ وَلَعِبٌۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأَخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾ (العنكبوت:٦٤).

واتە: وە ژیانی ئەم دونیایە تەنها رابواردنێکی بێ هودەو

یاری(منداڵانه)، بەراستی ماڵی قیامەت هەر ئەوە ژیانە(بەراستی) ئەگەر ئەوان بیانزانیایە.

وە خوا دەفەرموێ﴿فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيۡءٖ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ﴾ (الشورى:٣٦).

واتە: جا هەر شتێکتان پێ بەخشراوە ئەوە تەنها خۆشی ژیانی دونیایە وە ئەوەی لای خوایە چاکترو بەردەوامترە بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن.

وە خوا دەفەرموێ﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا ﴿٤٥﴾ ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ أَمَلٗا﴾ (الكهف:٤٥-٤٦).

واتە:(ئەی موحەممەد) بێنەرەوە بۆ ئەو(بێ باوەڕ)انە نموونەی ژیانی دونیا کە وەك بارانێك وایە لە ئاسمانەوە دەیبارێنین ئەوسا جۆرەها ڕواوی زەویی(پێ دەڕوێ و) دەڕۆن بە ناو یەکدا ئینجا دەبێتە پوش و پەڵاش و با پرش و بڵاوی دەکاتەوە وە خوا هەمیشە بە تواناو دەسەڵات دارە بەسەر هەموو شتێکدا(٤٥) ماڵ و کوڕ و کاڵ جوانی و زینەتی ژیانی دونیان

کردەوە چاکەکان کە(پاداشتیان) دەمێنێتەوە پاداشتیان چاکترە لای پەروەردگارت وە زیاتر جێگەی ئومێدن(٤٦).

وە خوا دەفەرموێ﴿بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ﴿١٦﴾ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ﴿١٧﴾﴾ (الأعلى:١٦-١٧).

واتە: بەڵکو ئێوە ژیانی دونیا هەڵدەبژێرن(١٦) کەچی(ژیانی) دوا ڕۆژ باشترو بەردەوامترە(١٧).

وە خوا دەفەرموێ﴿يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِۚ وَنَحۡشُرُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ يَوۡمَئِذٖ زُرۡقٗا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَٰفَتُونَ بَيۡنَهُمۡ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا عَشۡرٗا ﴿١٠٣﴾ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذۡ يَقُولُ أَمۡثَلُهُمۡ طَرِيقَةً إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا يَوۡمٗا ﴿١٠٤﴾﴾ (طه:١٠٢-١٠٣-١٠٤).

واتە: ئەو ڕۆژەی کە فوو دەکرێ بە صوردا(بۆ جاری دووەم) ئەوسا تاوانباران کۆدەکرێنەوە لەو ڕۆژەدا لەش و چاویان شین هەڵگەڕاوە(١٠٢) بە چرپەوە لە نێوان خۆیاندا دەڵێن ئێوە تەنها دە(شەوو ڕۆژ لە دونیادا) ماونەتەوە(١٠٣) ئێمە باشتر دەزانین بەوەی ئەوان دەیڵێن کاتێ(ئەوەیان) کە ژیر تریانەو نزیك تریانە لە ڕاستییەوە دەڵێ ئێوە تەنها یەك ڕۆژ ماونەتەوە(١٠٤).

وە خوا دەفەرموێ﴿كَأَنَّهُمۡ يَوۡمَ يَرَوۡنَهَا لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوۡ ضُحَىٰهَا﴾ (النازعات:٤٦).

**واتە: بێ بڕواکان کە ئەو ڕۆژە دەبینن وا دەزانن کە نەماونەتەوە ئێوارەیەك یا چێشتەنگاوێك نەبێ لە دونیادا.**

**وە خوا دەفەرموێ**﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾﴾ **(النازعات:٣٧-٤١).**

**واتە: ئینجا ئەو کەسەی یاخی بووبێ وە ژیانی دونیای هەڵبژاردبێ(٣٨) ئەوە بێ گومان دۆزەخ جێگایەتی(٣٩) وە ئەو کەسەی کە ترسابێ لە هەڵوێستگەی بەردەم پەروەردگاری وە بەرگری نەفسی خۆی کردبێ لەئارەزووی خراپە(٤٠) ئەوە بێگومان بەهەشت جێگایەتی (٤١).**

١-عن ابي سعيد الخدري(رضي الله عنه) عن النبيّ(ﷺ) قال: إنَّ الدُّنيا حُلوةٌ خَضِرةٌ، وإنَّ الله مُستَخلِفُكُم فيها فينظرُ كيف تعملون، فاتقوا الدُّنيا واتقوا النساء، فإنَّ اوّلَ فتنة بني إسرائيل كانت في النساء. **رواه مسلم(٢٧٤٢).**

**واتە: بێگومان دونیا شیرین و کەسك(سەوزە) وە بێگومان خوا ئێوەی تیادا جێ نشین کردووە، جا تەماشا دەکات ئێوە چی دەکەن، کەواتە خۆتان بپارێزن لە دونیا، وە خۆتان لە ئافرەتان بپارێزن، چونکە بێگومان یەکەم تاقی کردنەوەی بەنی ئیسرائیل بەهۆی ئافرەتانەوە بوو.**

٢- عن عبدالله بن مسعود(رضي الله عنه) قال: نام رسول

الله(ﷺ) على حصيرٍ فقام وقد أثَّرَ في جنبهِ فَقُلنا: يا رسول الله لو اتَّخَذْنا لَك وطاءً، فقال: ما لي وللدّنيا، ما أنا في الدُّنيا إلاّ كراكب استظلّ تحت شجرةٍ ثُمَّ راحَ وتركها. صحيح رواه الترمذي(٢٣٧٧) وابن ماجه(٤١٠٩).

واته: عبدالله كوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: پیٚغەمبەر(ﷺ) لەسەر حەسیریٚك نوست جا كە هەستا حەسیرەكە چەقیبووە لاتەنیشتی و شویٚنەواری لەسەر دورست كردبوو گوتمان ئەی پیٚغەمبەری خوا بریا دۆشەكیٚكمان بۆ دورست دەكردی، جا پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: من لە كویٚ و دونیا لە كویٚ من لە دونیادا وەك سواریٚك وام لە كاتی ماندوو بوون بچیٚتە ژیٚر سیٚبەری داریٚك و لەپاش كەمیٚ بڕواو درەختەكە بەجیٚ بیٚڵیٚ.

٣- عن جابر بن عبدالله ان رسول الله(ﷺ) مَرَّ بالسوق والناسُ كَنَفَتيهِ، فَمَرَّ بِجَدْيٍ أسَكَّ ميِّتٍ فَتَناولَهُ وأخَذَ بأُذنهِ ثُمَّ قال: أيُّكم يُحبُّ أنْ يكونَ هذا لَهُ بِدرهمٍ؟ فقالوا: ما نُحبُّ أَنَّهُ لنا بشيءٍ وما نَصنعُ بِهِ؟ ثُمَّ قال: أَتُحِبّونَ أَنَّهُ لَكُم؟ فقالوا: والله لو كان حياً كان عيباً، أَنَّهُ أسَكُّ، فكيفَ وهو ميِّتٌ! فقال: فَوالله للدُّنيا أهونُ على الله من هذا عليكم. رواه مسلم(٢٩٥٧).

١-كنفتيه: جانبيه: ئەم لاو ئەو لای.

٢- بجدی: (جدی): ولد المعز: كار، كارژۆڵە، كاریلە، گیسك.

٣- اسك: الصغیر الأُذن: گویٚ گچكە.

واتە: جابر(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚت: پیٚغەمبەر(ﷺ) بە بازاردا تیٚ

پەری خەڵكیش لەم لاو ئەولای بوو، جا پێغەمبەر(ﷺ) بەلای گیسكێكی گوێ گچكەی مردارەوە بوودا رۆیشت گوێچكەی گیسكەكەی گرتو لە پاشان فەرمووی: كامتان ئەوەی دەوێ بە درهەمێك؟ گوتیان: ئەوەمان بە بەلاشیش ناوێ، جا ئێمە چی لەوە بكەین؟ لە پاشان فەرمووی: حەز دەكەن ئەوە بۆ ئێوە بێت؟ گوتیان سوێند بە خوا ئەمە ئەگەر زیندووش بێت هەر عەیبدارە چونكە گوێیەكانی گچكەیە، ئیتر بەمردارەوە بوویی چۆن دەمانەوێ جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: جا سوێند بە خوا ئەم دونیایە لە لای خوا سوكترو بێ قیمەت ترە لەم گیسكە لەلای ئێوە.

٤- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): الدُّنيا سجنُ المؤمنِ وجنّةُ الكافرِ. رواه مسلم(٢٩٥٦).

واتە: دونیا بەندینخانەی بڕوادارەو بەهەشتی كافرە.

٥- عن المُستَورد(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): والله ما الدُّنيا في الآخرة إلاّ مثلُ ما يجعلُ أحدُكُم إصْبَعَهُ -هذه وأشار يحيى بالسَّبابَةِ- في اليمِّ فلينظر بِمَ يرجع. رواه مسلم(٢٨٥٨).

١-إصبعه: پەنجەی. لە(مختار الصحاح)دا دەڵێ: (اصبع) بە پێنج جۆر هاتووە(إِصبَع، أُصبَع، إِصبِع، أُصبُع، أَصبع) وەكۆیەكانیان(أصابع)ە. واتە: پەنجەكان.

٢- اليم: واتە(البحر) یانی: دەریا.

واتە: سوێند بە خوا دونیا لەچاو دوارۆژ وەك ئەوە وایە كە یەكێكتان ئەو پەنجەی بخاتە ناو ئاوی دەریا، (یحیی) ئاماژەی بە پەنجەی شایەتمانیدا جا با تەماشا بكات بەچی دەگەڕێتەوە.

٦- عن ابن عمر(رضي الله عنه) قال: أخَذَ رسولُ الله(ﷺ) بِمَنكِبَيَّ، فقال: كُن في الدُّنيا كأنَّكَ غريبٌ او عابر سبيل. رواه البخاري(١٤١٦) والترمذي(٢٣٣٣).

١- منكب: مجمع عظم العضُدِ والكَتفِ، واته: بەيەك گەیشتنی هەردوو سەری هێسكی قۆڵ و شان.

واته: عبدالله كوری عومەر(رەزای خوای لیّ بێت) دەڵیّ: پێغەمبەر(ﷺ) هەردوو نێوانی قۆڵ و شانمی گرت فەرمووی لە دونیادا بژی وەك غەریب یا وەك رێبوار.

٧- عن عُقبة بن رافع: انَّ رسول الله(ﷺ) كان يقول: إذا احبَّ الله عبداً حماهُ الدُّنيا كما يَحمي أحَدُكُم مريضَه الماءَ لِيَشفي. قال الهيثمي في مجمع الزوائد(ج:١٠) رواه ابو يعلي وهو اسناد حسن وصححه الألباني في(صحيح الجامع:٢٨٢) عن قتادة.

واته: ئەگەر خودا بەندەیەكی خۆش بوێت دونیای لیّ دەپارێزیّ و نایداتیّ هەروەكو چۆن یەكێك لە ئێوە نەخۆشەكەی دەپارێزیّ لە ئاو بۆ ئەوەی شیفای بۆ بێت.

٨- عن كعب بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): ما ذئبانِ جائعانِ أُرسِلا في غَنَمٍ بأَفْسَدَ لها مِنْ حِرْص المرءِ على المالِ والشَّرَفِ لدِينِه. صحيح رواه الترمذي(٢٣٧٦).

١-ذئبان: دوو گورگ، تاكەكەی(ذئب)ە واته: گورگ.

٢- حرص: سووربوون.

٣- الشَّرف: پلەو پایە.

واتە: ئەگەر دوو گورگی برسی بنێردرێتە ناو مێگلەلە مەڕەکی ئەوەندە زیان بەو مێگەلە ناگەیەنن وەکو ئەو زیانەی کە بەدینی ئینسان دەگات کاتێك کە سوور دەبێت لەسەر ماڵ و پلەوپایە.

ماناکەی بە جۆرێکی تر:

دوو گورگی برسی کە بەربدرێنە ناو مێگەلە مەرێك ئەوەندە تێکی نادەن وەکو سووربوونی مرۆڤ لەسەر کۆکردنەوەی ماڵ و وەدەستهێنانی گەورەیی: ئایینەکەی لیَ تێك ئەدا.

## گەورەیی هەژاری و برسیەتی و کەفاف لەرۆژی دا:

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): يَدْخُلُ الفقراءُ الجنةَ قبلَ الاغنياءِ بِخَمْسمائة عامٍ، نِصْفِ يومٍ. حسن صحيح رواه الترمذي(٢٣٥٣).

واته: هەژارەكان دەچنە بەهەشت پێشی دەوڵەمەندەكان بە پێنج سەد ساڵ نیو رۆژی (قیامەت).

٢- عن ابن عباس وعمران بن الحُصين(رضي الله عنهم) عن النبيِّ(ﷺ) قال: اطلعت في الجنَّةِ فَرَأيت أكْثَرَ أهلِها الفقراءَ واطَّلعتُ في النار فرايتُ أكثر أهلِها النِّساء. رواه البخاري(٤٩) ومسلم(٢٧٣٧).

واته: سەرنجی ناو بەهەشتم دا زۆربەی خەڵكەكەی لە هەژارەكان بوون وە سەرنجی ناو دۆزەخیشم دا زۆربەی خەڵكەكەی ژنان بوون.

٣- عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: ما شَبِعَ آلُ محمد(ﷺ) مِنْ خُبزِ شَعيرٍ يومينِ مُتَتابِعَينِ حَتى قُبِضَ رسول الله(ﷺ). رواه مسلم(٢٩٧٠).

واته: عائیشە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: كەس و كاری پێغەمبەر(ﷺ) تێریان نەخوارد لە نانی جۆ دوو رۆژ لەسەر یەك تا پێغەمبەر(ﷺ) كۆچی دوایی كرد.

٤- عن نعمان بن بشير(رضي الله عنهما) قال ذكر عمر بن

الخطاب(رضي الله عنه) ما أصابَ الناسُ من الدنيا فقال: لقدْ رأيتُ رسول الله(ﷺ) يَظَلُّ اليوم يلتوي ما يَجِدُ مِنَ الدَّقَلِ ما يَمْلأُ بِهِ بَطنَهُ. رواه مسلم(٢٩٧٨).

الدقل: أردأ أنواع التمر: خراپترين جۆرى خورما.

واته: نوعمانى كورى بەشير(رەزاى خوايان لىٌ بێت) دەڵىٌ: ئيمامى عومەر(رەزاى خواى لىٌ بێت) باسى ئەوەى كرد كە خەڵك چيان بەدەست هێناوە لە دونيا(چۆن كەوتوونەتە خۆشى) جا گوتى: من پێغەمبەرى خوام بينيوە رۆژى بەسەر دەبرد زگى خۆى هەڵدەگوشى خراپترين جۆرى خورماى دەست نەدەكەوت زگى پىٌ پربكاتەوە.

٥- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: خرج رسول الله(ﷺ) ذاتَ يوم أو لَيلةٍ فإذا هو بأبي بكرٍ وعُمرَ(رضي الله عنهما) فقال: ما أخرجكما مِنْ بيوتِكُما هذهِ السَّاعة؟ قالا الجوع يا رسول الله!! قال: وأنا والذي نفسي بيدهِ لأَخْرَجني الذي أخرَجَكُما، قُوما، فقاما معه فأتى رجلاً من الأنصار فإذا هو ليس في بيته فَلَمّا رأتْهُ المراةُ قالت: مرحَباً واهلاً فقال لها رسول الله(ﷺ): أين فلانُ؟ قالت: ذهبَ يستعذبُ لنا من الماء، اذ جاءَ الأنصاريُّ فَنَظر الى رسول الله(ﷺ) وصاحِبَيه ثُمَّ قال: الحمدلله ما احدٌ اليوم اكرمُ أضيافاً مِنّي، فَانْطلقَ فَجاءَهُم بِعِذقٍ فيهِ بُسْرٌ وتَمْرٌ ورُطبٌ فقال: كُلُوا مِنْ هذه، وأَخَذَ المُديَةَ فقال له رسول الله(ﷺ) إيّاك والحلوب فَذَبَح لهم، فأَكَلوا مِنَ الشّاةِ ومِنْ ذلكَ العِذْقِ وشَرِبوا فَلَمّا أنْ شَبِعُوا ورَوُوا، قال رسول الله(ﷺ) لأبي بكر وعمر(رضي الله عنهما): والذي نفسي بيده لَتُسأَلُنَّ عن هذا النّعيم يوم القيامة، أخَرَجَكُمْ من

بيوتكم الجوع ثُمَّ لم ترجعوا حتى أصابكم هذا النعيم. **رواه مسلم(٢٠٣٨).**

**واتای ووشه:**

١-ذات يوم او ليلة: رۆژێك له رۆژان یا شەوێك له شەوان.

٢- ما اخرجكما: چی ئێوەی دەركرد.

٣- رجلاً من الأنصار: پیاوێك له پشتیوانان(كه ناوی ابو هیثم بووه).

٤- یستعذب لنا من الماء: ئاوی شیرنمان بۆ دێنیّ.

٥- عذق: لق(غصن).

٦- بسرٌ: خورما پێش ئەوەی ببێته خورما له بدایەت(بسر)ە دوایی دەبێته روتاب ئەوجا دەبێته خورما، كەواته لقەكە هەرسیّ جۆری پێوه بووه(بسر، رطب، تمر) كەواته(بسر) قۆناغێكه لەو قۆناغانەی خورما كه پێی تێدەپەری.

٧- المدية: السكين: چەقوو.

٨- اياك والحلوب: خۆت بپارێزه له ئاژەڵی شیردار( واته ئاژەڵی شیردار سەرنەبری) (اياك) واته: خۆت بپارێزه، یا وریابه.

٩- شبعوا: تێریان خوارد.

**مانای فەرموودەكە:**

ئەبوهوریره(رەزای خوای لیّ بێت) دەڵیّ: پێغەمبەر(ﷺ) رۆژێك له رۆژان یا شەوێك له شەوان دەرچوو له ماڵەوه، جاگەیشت به ئەبوبەكرو عمر(رەزای خوایان لیّ بێت) پێی فەرموون: ئەوه چ شتێك لەم كاتەدا ئێوەی دەركرد له ماڵەوه؟ گوتیان برسیەتی ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: وەمنیش سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەسته

ئەوە دەری کردووم ئەوەی ئێوەی دەرکردووە(واتە برسێتی). فەرمووی: هەستن جا هەردووکیان لەگەڵی هەستان چوونە ماڵی پیاوێکی ئەنصاری(کە ئەبوهەیثەم بوو) پیاوە ئەنصاریەکە لە ماڵێ نەبوو، جا کاتێ کە ئافرەتەکە پێغەمبەری بینی(ﷺ) گوتی(مرحباً واهلاً) جا پێغەمبەر(ﷺ) پێی گوت فلانە کەس لە کوێ یە؟ ئافرەتەکە گوتی: چووە ئاوی شیرنمان بۆ بێنی جا لەنکاوێك پیاوە ئەنصاریەکە هاتەوە تەماشای پێغەمبەرو دوو هاورێکەی کرد گوتی(الحمدلله) ئەمرۆ هیچ کەسێك وەکو من میوانی بەرێزی نەهاتوون جا رۆیشت چوو لقە دارخورمایەکی هێنا(بسر)و روتاب و خورمای پێوە بوو فەرمووی بخۆن جا(ئەبوهەیثەم) دەستیدا چەقوو پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: ئاژەڵی شیردار سەرنەبری جا ئاژەڵێکی بۆ سەربرین، جا کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەبوبەکر و عومەر لە کاورەکەیان خوارد وە لەبەری لقە دارخورمایەکەیان خوارد وە ئاویان خواردەوە کاتێك کە تێربوون لەخواردنو خواردنەوە فەرمووی بە ئەبوبکر و عومەر(رەزای خوایان لێ بێت) سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەستە لە رۆژی دوایی دا پرسیارتان لێ دەکرێ لە بارەی ئەو نیعمەتە، برسێتی لە ماڵەوە دەری چواندن لە پاشان نەگەڕانەوە تاوەکو ئەو نیعمەتەتان دەست کەوت.

٦- عن فضالة بن عبيد(رضي الله عنه) ان رسول الله(ﷺ) كان إذا صلى بالناسِ يخِرُّ رجالٌ منْ قامَتِهِم في الصلاة من الخصاصة -وهم أصحاب الصفة- حتى يقولوا الأعراب هؤُلاء مجانينُ فإذا صلى رسول الله(ﷺ) انصرف اليهم فقال: لو تعلمون ما لكم عند الله تعالى لأَحبَبْتُم ان تَزدادوا فاقةً وحاجة. صحيح رواه الترمذي(٢٣٦٨).

١-يخر: يسقط: دەکەوت.

٢- الخصاصة: الفاقة والجوع الشديد. واتە: هەژاری و پێداویستی و زۆر برسیەتی.

٣- الصفة: محل مسقف آخر المسجد النبوي يأوي اليه الفقراء: شوێنێکی سەرگیراو بوو لە کۆتایی مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) هەژارانی دەچوێ.

٤- الأعراب: عارەبە دەشتەکیەکان.

٥- فاقة: لە مختار الصحاح دەڵێ(الفقر والحاجة) هەژاری و پێداویستی.

ماناى فەرموودەکە:

فەزالەی کوری عوبەید(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) گەلێ جار کە پێش نوێژی بۆ خەڵك دەکرد پیاوانێك لە کاتی وەستانیان لەناو نوێژ بەردەبوونەوە لەبەر هەژاری و پێداویستی و زۆر برسیەتی، ئەوانەش پیاوانی(صفە) بوون تاوەکو ئەعرابیەکان دەیان گوت ئەمانە شێتن جا کاتێ پێغەمبەر نوێژی بکردایە دەچوو بۆ لای ئەوان دەیفەرموو: ئەگەر دەزانن چ پاداشتێکتان هەیە لەلای خوا(تعالى) حەزتان دەکرد هەژاری و پیداویستیتان زیاتر بوایە.

٧- عن عبدالله بن عمرو بن العاص(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: قدْ أفلح من أسلم، وكان رزْقهُ كفافاً وقنَّعهُ اللهُ بما آتاهُ) رواه مسلم(١٠٥٤). واتە: بێگومان ئەو کەسە سەرکەوتووە کە موسڵمان بووەو رسقەکەی بە ئەندازەی پێداویستیتی بێ زیادو کەم وە خوداش قەناعەتی داوەتێ بەوەی کە پێی بەخشیووە.

## خواردن و خواردنەوە:

١-عن جابر(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: إذا دخَلَ الرَّجُلُ بيته فذَكرَ اللهَ عند دُخُوله وعند طعامه، قال الشيطانُ لأَصحابهِ: لا مَبيتَ لَكُم ولا عَشاءَ، وإذا دَخَلَ فلم يَذكُر اللهَ عند دخوله قال الشيطان: أدركتُم المبيتَ، وإذا لم يذكر الله عند طعامه قال: أَدركتُم المبيتَ والعَشاء. رواه مسلم(٢٠١٨).

١-عشاء: جمع(أَعشية): طعام العشي: خواردنی ئێوارە.

واتە: هەر كاتێك پیاو چوو بۆ ماڵەوەو ناوی خوای هێنا لە كاتی چوونە ژوورەوەو لە كاتی نان خواردنیدا شەیتان بە هاورێكانی دەڵێ: نەشەو مانەوەو نەخواردنی ئێوارەتان بۆ هەیە، بەڵام ئەگەر چووە ماڵێ ناوی خوای نەهێنا لە كاتی چوونە ژووری دا شەیتان دەڵێ: شەومانەوەتان دەست كەوت وە ئەگەر ناوی خوای نەهێنا لە كاتی خواردنیشی دا دەڵێ: شەو مانەوەو خواردنی ئێوارەتان دەست كەوت.

**سوود**:

لە پێش دەست كردن بە نان خواردن دەڵێ ی(بسم الله).

١- عن أبي حفص عمر بن ابي سَلمة عبدالله بن عبدالأسد رَبيب رسول الله(ﷺ) قال: كُنْتُ غلاماً في حِجْرِ رسول الله(ﷺ) وكانت يَدي تطيشُ في الصَّحْفَةِ فقال لي رسول الله(ﷺ): يا غلام سَمِّ الله تعالى وكُلْ بيمينِك وكُلْ مِمّا يَليكَ، فما زالت تلك طِعمَتي

بَعدُ. رواه البخاري(٢٣٧٦) ومسلم(٢٠٢٢).

١-عومەر كوری أبوسەلەمە: كوری(ام سلمه)ی خێزانی پێغەمبەرە(ﷺ) كە دەكا زڕ كوری پێغەمبەر(ﷺ).

٢- ربيب رسول الله: واتە(ولدُ زوجتهِ) یانی منداڵی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ).

٣- غلاماً: واتە بالغ نەبووبووم، منداڵ لەو كاتەی كە لە دایك دەبیٚ تا ئەو كاتەی بالغ دەبیٚ پێی دەوتریٚ(غلام).

٤- في حِجرِ رسول الله: لە ژێر پارێزگاری و چاودێری پێغەمبەر دابووم(ﷺ).

٥- تطيش: دەڵێی(طاش السهم عن الهدف أي عدل) واتە: تیرەكە لە هەدەفەكەی لادا،(تطیش) واتە: دەستم دەگێرا بەم لاو ئەولادا تەنها لەیەك شوێن نەم دەخوارد.

٦- الصَّفحة: لەگەن.

## مانای فەرموودەكە:

عومەری كوری ئەبو سەلەمە(رەزای خوای لیٚ بێت) كە منداڵی خێزانی پێغەمبەرە(ﷺ) دەڵیٚ: من منداڵ بووم لە ژێر پارێزگاری و چاودێری پێغەمبەردا بووم(ﷺ) جا كە نانم دەخوارد دەستم دەگێرا بەناو لەگەنەكەدا جا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم: ئەی رۆڵە:(كە نانەكە دەخۆی) ناوی خوای بەرز بێنە(واتە بڵیٚ: بسم الله) وە بە(دەستی) راستەت بخۆ وە لە پێش خۆتەوە بخۆ، جا عومەر(رەزای خوای لیٚ بێت) دەڵیٚ: ئیتر لەوساوە تا ئێستا هەر بەم شێوەیە نان دەخۆم(كە پێغەمبەر فێری كردووم).

٣- عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله(ﷺ): إذا أكل أحَدُكم فَلْيذكُرِ اسْمَ الله تعالى فإنْ نَسيَ أنْ يَذكُرَ اسمَ الله تعالى في أوَّلِه فَلْيَقُلْ: بسمِ الله أوَّلَهُ وآخِرَهُ. **صحيح رواه ابوداود(٣٧٦٧) والترمذي(١٨٥٨).**

**واته: ئەگەر یەکێکتان خواردنی خوارد با ناوی خوای بەرز(لە سەرەتایەوە) بێنێ جا ئەگەر لە بیری چوو کە لە سەرەتایەوە ناوی خوای بەرز بهێنێ بابڵێ(بسم الله أوَّلَهُ وآخِرَهُ) واتە: بەناوی خوا لە سەرەتاو کۆتایی یەوە.**

٤- عن انس(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): إنَّ الله لَيرضى عن العبدِ أن يأكُلَ الأَكلَةَ فَيَحْمَدُهُ عليها، أو يشربَ الشَّربَةَ فيَحمَدُهُ عليها. **رواه مسلم(٢٧٣٤).**

**واته: بێگومان خوا لە بەندە رازی دەبێت کە خواردنێك دەخوات ستایشی خوای لەسەر دەکات یا خواردنەوەیەك دەخواتەوە ستایشی خوای لەسەر دەکات.**

٥-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: ليأكُلْ أحَدُكُم بيمينِه، ولْيَشربْ بيمينه، ولَيأخُذ بيمينه، ولْيُعْط بيمينه، فإنَّ الشَّيطانَ يأكلُ بِشمالِه، ويشربُ بشماله. ويُعطي بشمالِه ويأخُذُ بشماله. **صحيح رواه ابن ماجه(٣٢٦٦).**

**واته: با هەر یەکێك لە ئێوە بە(دەستی) راستەی بخوا، وە بە(دەستی) راستەی بخواتەوە، وە بە (دەستی) راستەی (شت) وەربگرێ وە بە راستەی (شت) بدات چونکە شەیتان بەچەپەی دەخوا وە بە چەپەی دەخواتەوە وە**

به چەپەی شت دەدات وە بە دەستی چەپەی وەردەگریٚ.

٦- عن سَلَمَة بن الأكوع(رضي الله عنه) أن رجلاً أكل عند رسول الله(ﷺ) بشماله، فقال: كُلْ بيَمينِكَ قال: لاأسْتَطيعُ، قال: لااستَطعتَ! مامَنَعَهُ إلاّ الكِبْرَ! فما رَفعَها إلى فِيهِ. رواه مسلم(٢٠٢١).

واتە: (سلمه) کوری ئەکەوەع(رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەلیٚ: پیاویٚك لای پیٚغەمبەر(ﷺ) خواردنی خوارد بە دەستی چەپی، پیٚغەمبەر(ﷺ) پیٚی فەرموو: بەراستەت بخۆ، گوتی ناتوانم، پیٚغەمبەر(ﷺ) پیٚی فەرموو(دەنەتوانی) کابرا هیچ شتیٚ قەدەغەی نەکرد(کە بە دەستی راستی بخوا) خۆبەگەروە زانین نەبیٚ، (جا دوعاکەی پیٚغەمبەری (ﷺ) لیٚ قبول بوو) ئیتر جاریٚکی تر ئەو پیاوە ئەو دەستەی بۆ نەبرا بۆ دەمی.

٧- عن معاذ بن أنس(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ أكلَ طعاماً فقال: الحمدُلله الذي أطعمني هذا ورَزَقنيه مِنْ غيرِ حولٍ منّي ولا قوةٍ غُفِرَ لَهُ ما تَقَدَّم مِنْ ذَنبِهِ. حسن: رواه ابوداود(٤٠٢٣) والترمذي(٣٤٥٨).

واتە: هەر کەسیٚك خواردنیٚك بخوات ئەوجا بلیٚ(الحمدُلله الذي اطعمني هذا ورَزَقَنيهِ مِنْ غيرِ حولٍ منّي ولا قوةٍ) خودا لە گوناهی پیٚشووی خۆش دەبیٚت.

٨- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: ما عاب رسول الله(ﷺ) طعاماً قطُّ، إن اشتهاهُ أكلهُ، وإنْ كرِهَهُ تركَهُ. رواه البخاري(٥٤٠٩) ومسلم(٢٠٦٤).

واته: قەت پێغەمبەر(ﷺ) عەیبی لە هیچ خواردنێك نەگرتووە ئەگەر حەزی لێ كردبێ خواردوویەتی وە ئەگەر حەزی لێ نەكردبایە وازی لێ هێناوە.

٩- عن ابن عباس(رضي الله عنهما) عن النبيِّ(ﷺ) قال: البَركة تَنْزِلُ وَسَطَ الطَّعام، فَكُلوا مِنْ حافتيهِ ولا تأكلوا مِنْ وَسَطِه. صحيح رواه الترمذي(١٨٠٥).

واته: پیتوفەڕ بەرەكەت دێتەخوارەوە بۆ ناوەڕاستی خۆراك جا لە لاكانوتەنیشتەكانی بخۆن و لە ناوەڕاستەكەی مەخۆن.

## سوود:

١-البركة: النماء والزيادە. گەشەكردن و زیاد بوون.

٢- من حافتيه: من جوانب القصعة: لە لاكانی لەگەنەكە.

٣- امام شافعی(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: فإن أكَلَ مِمَّا لا يليه او من راس الطعام، أثم بالفعل الذي فعلهُ إذا كان عالماً[1].

واته: ئەگەر لە پێش خۆیەوە نەی خوارد یا لەسەری خواردنەكەی خوارد گوناهبار دەبێت بەو كارەی ئەگەر زانا بێت.

١٠- عن جابر(رضي الله عنه) ان رسول الله(ﷺ) قال: إنَّ الشَّيطان يَحْضُرُ أحَدَكُمْ عند كلِّ شيءٍ منْ شأْنه حتى يَحْضُرَهُ عند طعامه فإذا سَقَطت لُقْمَةُ أحَدكُم فَلْيأخُذها فَلْيُمطْ ما كانَ بها من اذى ثُمَّ لِيأكُلْها ولا يدعْها للشَّيطانِ فإذا فَرَغ فَلْيَلْعَقْ أصابعهُ فإنَّهُ

(1) روضة المتقين.

لا يدري في أيِّ طعامِهِ البركة. رواه مسلم(٢٠٣٣).

واته: بێ گومان شەیتان ئامادەی هەموو کاروبارێکی هەر یەکێك لە ئێوە دەبێت تەنانەت ئامادە دەبێت لە لای نان خواردنیشتان جا ئەگەر یەکێکتان لوقمەیەکی لێ کەوت با هەڵی بگرێتەوە جا هەر شتێك کە بەم لوقمەوە نوسابوو لێی لادا لە پاشان با بیخوات و بەجێی نەهێڵێت بۆ شەیتان جا کە لە نان خواردن بۆوە با پەنجەکانی بلێسێتەوە چونکە بێگومان ئەو ناوزانێ بەرەکەت لە کام خواردەمەنیەکەی دایە.

١١- عن ابن عباس(رضي الله عنهما) أنّ النبيَّ(ﷺ) نهى أن يُتَنَفَّس في الإناءِ أو يُنْفَخَ فيهِ. صحيح رواه ابوداود(٣٧٢٨) والترمذي(١٨٨٨).

واته: ابن عباس(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کردووە لەوەی کە هەناسە بدرێتەوە لەناو جامی(خواردنەوە) یا فووی تیادا بکرێ.

١٢- عن انس(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) كانَ يَتَنَفَّسُ في الشرابِ ثلاثاً(يعني يتنفس خاج الإناء). رواه البخاري(٥٦٣١) ومسلم(٢٠٢٨).

واته: پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی خواردنەوەی دا سێ جاران هەناسەی داوەتەوە لە دەرەوەی جامەکەدا.

١٣- عن ابن عباس(رضي الله عنهما) قال: سقيتُ رسول الله(ﷺ) من زمزمَ فشرِبَ وهو قائمٌ. رواه البخاري(١٦٣٦( ومسلم(٢٠٢٧).

واته: ابن عباس(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لە ئاوی بیری زەمزەمم دا بە پێغەمبەر(ﷺ) جا بە پێوە خواردیەوە.

١٤- عن عمرو بن شعيب عن ابيه عن جده(رضي الله عنه) قال: رأيت رسول الله(ﷺ) يَشربُ قائماً وقاعداً. حسن: رواه الترمذي(١٨٨٣).

واته:عەمری كوری شوعەیب لە باوكیەوە ئەویش لە باپیری عەمرەوە(رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: پیٚغەمبەرم دیت(ﷺ) خواردنەوەی خواردۆتەوە بە وەستان و بەدانیشتنەوە.

١٥- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): لايَشْرَبَنْ أحدٌ منكُم قائماً فَمَنْ نَسِيَ فَلْيَسْتَقِئ. رواه مسلم(٢٠٢٦).

واته: با هەرگیز هیچ یەكیٚك لە ئیٚوە بە پیٚوە شت نەخواتەوە جا هەر یەكیٚك لە بیری كرد(بە پیٚوە خواردیەوە) با خۆی برشیٚنیتەوە.

**سوود:**

امام نووی لە(ریاض الصالحین) ناونیشانی بابەتیٚك بەم شیٚوەیە دەهیٚنیٚ(باب بيان جواز الشُرب قائماً، وبيان انَّ الأكمَلَ والأفضل الشرب قاعداً).

واته: دەرگای روونكردنەوەی ئەوەی كە جائزە خواردنەوە بە پیٚوە بخوریٚتەوە وە روونكردنەوەی ئەوەی كە تەواوترو باشتر ئەوەیە كە خواردنەوە بە دانیشتن بخوریٚتەوە.

١٦- عن أبي قتادة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: ساقي القومِ آخرُهُم. يعني: شرباً. صحيح: رواه الترمذي(١٨٩٤) وابوداود(٣٧٢٥).

واتە: ئاوگێڕ لە ناو کۆڕدا خۆی لە پاش هەموویانەوە ئاو دەخواتەوە.

**سوود**:

امام نووی لە(ریاض الصالحین) بۆ ئەم فەرموودەیە ناو و نیشانێك دەنووسێ دەڵێ(باب استحباب کون ساقي القوم آخرهم شرباً).

واتە: سوننەتە ئاوگێڕەکە خۆی لە پاش هەمووان بخواتەوە.

## باسی زۆر خواردن

١-عن المقدام بن مَعدِ يَكرب(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: ما مَلأَ آدميٌّ وعاءً شَرّاً مِن بَطن بِحسب ابن آدم أُكُلاتٌ يُقِمنَ صُلْبَهُ، فَإنْ كانَ لا محالةَ، فَثُلُثٌ لِطعامهِ وثلثٌ لشرابه وثلثٌ لِنَفسهِ. صحيح: رواه الترمذي(٢٣٨٠) وابن ماجه(٣٣٤٩).

١- وعاء: تاكە، کۆیەکەی(أَوعية)یە. واتە: جەواڵ.

٢- أُكُلات: لُقَمٌ. واتە: چەند لوقمەیەك.

واتە: ئادەمیزاد هیچ جەواڵێکی پڕ نەکردووە خراپتر بێت لە زگ. ئینسان ئەوەندەی بەسە چەند لوقمەیەك بخواو پشتی رابگرێ بەلام ئەگەر هەر چاری نەبوو(با گەدەی بکا بە سێ بەش) یەك لەسەر سێی بۆ خواردنی، وە یەك لەسەر سێی بۆ خواردنەوەی، وە سێیەکیشی بۆ هەناسەدانی.

٢- عن ابي جُحَيفَةَ(رضي الله عنه) قال: أكلتُ ثريدةً مِنْ خُبْزٍ

ولَحْمٍ ثُمَ أتيتُ النبيَّ(ﷺ) فجعلْتُ أتَجَشَّأُ، فقال: يا هذا كُفَّ عنّا منْ جُشائكَ، فإنَّ أكثرَ الناس شِبَعاً في الدنيا اكثرهمْ جوعاً يومَ القيامة[1].

واته: ئەبو جوحەیفە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ:(ثرید)ەکم خوارد کە پێك هاتبوو لە نان و گۆشت لە پاشان چوومە لای پێغەمبەر(ﷺ) هێنکە هێنکم لێوە دەهات جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەوە ئەو هێنکە هێنکەمان لێ ببڕە، بێگومان ئەو کەسەی لە دونیا لە هەموویان تێرترە لە ڕۆژی قیامەت لە هەموویان برسی ترە. لە گێڕانەوەی(ابن ابي الدنيا) و(الطبراني) و(بيهقي) ئەم زیادەی تێدایە دەڵێ(ابو جحيفة) تا لە دونیا دەرچوو تێری نەخوارد ئەگەر خواردنی بەیانی بخواردبا خواردنی ئێوارەی نەدەخوارد وە ئەگەر خواردنی ئێوارەی بخواردبایە خواردنی سبەینەی نەدەخوارد[2]. وە لە گێڕانەوەیەکی(ابن ابي الدنيا) دا دەڵێ: (ابو جحيفة) گوتویەتی: ماوەی سی ساڵە زگم پڕ نەکردووە.

٣- عن ابن عباس(رضي الله عنهما) قال: قال رسول الله(ﷺ) إنَّ أهلَ الشَّبَعِ في الدنيا هُمْ أهلُ الجوعِ غداً في الآخرة. رواه الطبراني بإسناد حسن.

---

(1) رواه الحاكم وقال صحيح الإسناد: (قال الحافظ) بل واهٍ جداً فيه فهد بن عوف وعمر بن موسى لكن رواه البزار بإسنادين رواة احدهما ثقات. ورواه ابن ابي الدنيا والطبراني في الكبير و الاوسط والبيهقي وزادوا: فَما اكل أبو جُحَيفة مِلْءَ بطنِهِ حتى فارق الدنيا كان اذا تغدّى لا يتعشى واذا تَعَشى لا يتغذى وفي رواية لابن ابي الدنيا: قال فما مَلأْتُ بَطني مُنذُ ثلاثين سنة.

(2) دیارە لە کاتی خۆی دوو جەم خواردن هەبووە سبەینێ و ئێوارە.

واتە: بێگومان خەڵکانی تێر لە دونیا ئەوان خەڵکانی برسین سبەینێ لە دوا ڕۆژدا.

## قسەی ناوداران دەربارەی تێر نەخواردن و برسیەتی

١-قال العلماء: من الإسرافِ الأكلُ بعدَ الشَّبَع.

واتە: زانایان دەڵێن: خواردن لە دوای تێر بوون ئیسراف و زیادەڕەوی یە.

٢- ئەبو جەعفەری میحوەلی دەڵێ: اذا جاعَ العبد صفا بدنَهُ ورَقَّ قلبَهُ. وهَطَلَتْ دمعتَهُ، وأَسرعت الى الطاعة أطواره وجوارحه، وعاش في الدنيا كريماً[١].

واتە: ئەگەر ئینسان برسی بوو جەستەی ساف دەبێتەوە دڵی نەرم دەبێت، چاوی بەردەوام فرمێسك دەكات، ئەندامەكانی خێرا دەبن بۆ تاعەتی خوا وە بەرێزو قەدەر دەژی لە دونیادا.

٣- مروزی دەڵێ: بە ئیمام ئەحمەدم گوت:( يجد الرَّجُلُ من قلبه رِقَّةً وهو يَشْبَع) قال: ما ارى[٢].

واتە: ئایا موسڵمان هەست بە دڵ نەرمی دەكات لە كاتێكدا تێر دەخوات؟ فەرمووی: نابینم.

٤- قەسمی عابد دەڵێ:( كان يُقالُ: ما قَلَّ طعمُ امرىءٍ قَطُّ إلاّ رَقَّ قلبُهُ و نَدِيت عيناه)[٣].

واتە: گوتراوە: قەت خواردنی هیچ كەسێك كەم نەبووە، مەگەر دڵی

---

(1) صفة الصفوة.

(2) جامع العلوم والحكم.

(3) جامع العلوم والحكم.

نەرم بووەو چاوەکانی تەڕبوونەو فرمێسکی پێدا هاتوونە.

٥- عەمری کوری قەیس دەڵێ:(إيّاكم والبَطْنة فَإِنّها تُقَسّي القلب)[١].

واتە: خۆتان بپارێزن لە زۆر گەدە پرکردن چونکە زۆر خواردن دڵ رەق دەکات.

٦- بیشری حافی دەڵێ:( الجوع يُصفي الفؤاد ويورث العلم الدقيق)[٢].

واتە: برسیەتی دڵ ساف دەکات و زانستی وورد فەراهەم دەهێنێ بۆ خاوەنەکەی.

٧- عوسمانی کوری زائدە دەڵێ: سوفیانی سەوری بۆی نوسیم(إن اردت ان يَصِحّ جسمك و يَقِلَّ نومُك فَأَقِلَّ من الأكل)[٣].

واتە: ئەگەر دەتەوەێ تەندورستیت باش بێت وە نوستنت کەم بێت خواردنت کەم بکە.

٨- ئیبن سەمماك دەڵێ: پیاوێك لەگەڵ براکەی تەنیا کەوت و پیێ ی گوت: ئەی براکەم ئێمە لەوە لەخوارترین لای خوا کە برسیمان بکات خوا هەر دۆستانی خۆی برسی دەکات[٤].

---

(1) جامع العلوم والحكم.

(2)صفة الصفوة.

(3) جامع العلوم والحكم.

(4) نفس المصدر.

# ڕەوشتە جوانەکان

١-عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: إنَّ المُؤمِنَ لَيُدرِكُ بِحُسن خُلُقه درجةَ الصائِمِ القائِمِ. **صحيح: رواه أبوداود(٤٧٩٨) وصححه ابن حبان.**

**واتە: عائشە(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: گویٚم لە پیٚغەمبەر بوو(ﷺ) دەیفەرموو: بیٚگومان بڕوادار بە هۆی ڕەوشتی جوانییەوە دەگاتە پلەی ئەوانەی بەڕۆژ بەڕۆژوونەو بەشەویش شەونویٚژ دەکەن.**

**سوود:**

**پیٚناسەی ڕەوشتە جوانەکان:**

**(أ)(شاە الکرمانی) دەڵیٚ:**

**حسن الخلق: هُوَ كَفُّ الأذى[1] واحتمالُ المؤمِن.**

**واتە: ڕەوشت جوانی بریتییە لە ئەزیەتو ئازار نەدانی خەڵکان چ بە قسەو چ بە کردەوە، وە خۆڕاگرتن و ئارام گرتن لە ژیٚر باری ئازاردا.**

**(ب) عبدالله کوری موبارك دەڵیٚ:**

**حسن الخلق:(هو بسط الوجه، وبذلُ المعروف، وكف الأذى)[2].**

**واتە: ڕەوشت جوانی بریتییە لە ڕووخۆشی، وە چاکە کردن لەگەڵ خەڵکان، وە ئەزیەت و ئازار نەدانی خەڵکان.**

**(ج) قال بعض اهل العلم:**

---

(1) **كف الذى: عن الناس من قول أو فعل.**

(2) **رواه الترمذي (٢٠٠٥) وقال الألباني صحيح الاسناد.**

(حسن الخلق كظم الغيظ لله).

واتە: ڕەوشت جوانی بریتی یە لە تووڕەیی قوت دانەوە لە پێناوی خوا.

لەم سێ پێناسەی کرا پێنج شت بەرچاو دەکەون:

١-كف الأذى. ٢- احتمال المؤمن. ٣- بسط الوجه. ٤- بذلُ المعروف. ٥- كظم الغيظ لله.

٢- عن انس(رضي الله عنه) قال: لَقِي رسول الله(ﷺ) أبا ذرّ فقال: يا أبا ذرّ الا أدُلُك على خَصْلَتينِ هما أخَفُّ على الظّهر، وأثْقَلُ على الميزانِ منْ غيرهما؟ قال بلى يا رسول الله، قال: عليك بِحُسنِ الخُلُق، وطُولُ الصَّمتِ، فَو الذي نَفسي بيدهِ ما عَمِلَ الخَلائقُ بِمثْلِهما)[١]

واتە: ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە ئەبو ذەر فەرمووی: ئەی ئەبوذەر ئایا دوو خەسلەتت پێ بڵێم کە لەسەر پشت سوکن وە گرانترن لەسەر میزان لە غەیری خۆیان؟ گوتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەست بە ڕەوشت جوانی و زۆر بێ دەنگی بگرە، سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەستە دورست کراوان کاریان نەکردووە وەکو ئەم دوو کارە.

٣- عن أسامة بن شريك(رضي الله عنه) قال: كنا جلوساً عند النبيّ(ﷺ) كأنّما على رُءُوسنا الطير، ما يتكلّمُ منّا مُتكلمٌ، إذْ جاءَهُ أناسٌ فقالوا: منْ أحَبُّ عِباد الله الى الله تعالى؟ قال: أحسنهُم خُلُقاً.

---

(1) قال المنذري: رواه ابي الدنيا والطبراني والبزار و ابويعلي باسناد جيد رواتهُ ثقات واللفظ لهُ، وانظر الى(صحيح الجامع-٤٠٤٨).

قال: المنذري: رواه الطبراني ورواته محتج بهم في الصحيح وابن حبان في صحيحه.

واته: ئوسامەی کوری شەریك(رەزای خوای لیّ بیّت) دەلّیّ: ئیّمە لای پیّغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوین دەتگوت بالّندە لەسەرمان نیشتووە کەس لە ئیّمە قسەی نەدەکرد لەنکاویّك خەلّکانیّك هاتن گوتیان : کیّ خۆشەویسترین کەسە لە بەندەکانی خودا لە لای خوا: پیّغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوەی لە هەموویان رەوشتی جوانترە.

٤- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) أكْمَلُ المُؤمنين إيماناً أحْسَنُهُمُ خُلقاً، وخياركُمْ خياركُمْ لِنِسائِهِم. صحيح: رواه الترمذي(١١٦٢).

واته: ئەو ئیماندارەی کە لەهەموویان باوەڕی تەواوترە ئەوەیانە کە لەهەموویان رەوشتی جوانترە وە باشترینتان باشترینتانە بۆ خیّزانەکانتان.

**سوود**:

١-زانایان دەلّیّن: رەوشت جوانی لەگەلّ خیّزان هەر ئەوە نییە کە ئەزیەت و ئازاری نەدەی، بەلّکو سەبرو ئارامیش بگری لەسەر نارەحتیەکانی.

٢- لەوانەیە موسلّمان کە بیەویّ رەوشتە جوانەکانی لە خۆی بهیّنیتەدی لە هەموو خەلّکی زیاتر کە پیّیانەوە ماندوو بیّت دایك و باوك و خیّزان و مندالّ و براو خوشك و میّردو خەسوو و ئەوانەی کە لەگەلّی دا دەژین بن.

٥- عن ابي امامة الباهليّ (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) أنا زَعيمٌ ببيتٍ في ربَضِ الجنّةِ لِمَنْ ترك المراءَ وإنْ كانَ مُحِقاً، وبِبَيتٍ في وَسَطِ الجنّةِ لِمَن تركَ الكذب وإن كان مازحاً وببيتٍ في أعلى الجنَّةِ لِمَنْ حَسُنَ خُلُقهُ. حسن: رواه ابوداود(٤٨٠٠).

١-زَعيم: ضامن، واته: دەستەبەرکەر(ضَمان) واته: خستنە ئەستۆ، دابین کردن.

ماناى فەرموودەکە:

من دەبمە زامنى خانووەك لە لێوارەكانى بەهەشت بۆ ئەو كەسەى واز لە موجادەلە دەينى ئەگەر ئەويش لەسەر هەق بيت، وە خانووەك لە ناوەندى بەهەشت بۆ ئەو كەسەى درۆ تەرك دەكات ئەگەر بە سوحبەتيش بيت، وە خانووەك لەبەرزترين شوێنى بەهەشت بۆ ئەو كەسەى رەوشتى جوانە.

٦- عن جابر(رضي الله عنه) انَّ رسول الله(ﷺ) قال: إنَّ مِنْ أحَبِّكُم إلـيَّ وأقرَبِكُم مِنّي مجلساً يوم القيامة أحاسِنكم أخلاقا. صحيح: رواه الترمذي(٢٠١٨).

واته: بێگومان خوشەويسترينتان لاى من وە نزيكترينتان لە كۆرى منەوە لە رۆژى قيامەتدا ئەوەتانە كە لە هەمووتان رەوشتى جوان ترە.

٧- عن ابي الدَّرداء(رضي الله عنه) انَّ النبيَّ(ﷺ) قال: ما مِنْ شئ أثقلُ في ميزان المُؤمنِ يوم القيامةِ من حسن الخلق. صحيح: رواه الترمذي(٢٠٠٢) وابوداود(٤٧٩٩) واحمد (٤٤٢/٦).

واته: نییه هیچ شتێك قورستر له تەرازووی ئیماندار له ڕۆژی قیامەت له ڕەوشت جوانی.

**سوود**:

لەم حەوت فەرموودەیەی رابرد ئەمانەمان بۆ دەردەکەوێ:

١-ئەوەی ڕەوشتی جوان بێت دەگاتە پلەی ئەوانەی کە بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبن و بەشەویش شەو نوێژ دەکەن.

٢- ئەوەی ڕەوشتی جوان بێت خانووەکی له بەرزترین شوێنی بەهەشت بۆ دورست دەکرێ.

٣- ڕەوشت جوانی لەسەر میزان له ڕۆژی قیامەت دا له هەموو شتێ قورس ترە.

٤- خۆشەویسترین کەس لای خوا ئەوەیانە کە له هەموویان ڕەوشتی جوانترە.

٥- ئەو ئیماندارەی کە له هەموو ئیمانداران بڕوای تەواوترە ئەوەیانە کە له هەموویان ڕەوشتی جوانترە.

٦- خۆشەویسترین کەس لای پێغەمبەر وە نزیکترین کەس له ڕۆژی قیامەت له کۆڕی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەیانە کە له هەموویان ڕەوشتی جوانترە.

## نموونە لەسەر ڕەوشت جوانی

١-عن انس(رضي الله عنه) قال: كنتُ أمشي مَعَ رسول الله(ﷺ) وعليه بُردٌ نجرانيٌّ غليظ الحاشيةِ، فأَدْرَكَهُ اعرابيٌّ، فَجَبَذَهُ بردائِهِ جَبْذَةً شديدةً، فَنَظرتُ الى صَفْحَةِ عاتقِ النبيِّ(ﷺ) وقد

أثّرَتْ بها حاشيةُ الرّداء مِنْ شدّةِ جَبذَتِهِ، ثُمَّ قال: يا محمد مُرْ لي مِنْ مالِ الله الذي عندك فالتفت إليهِ فَضَحِكَ ثُمَّ أمرَ لَهُ بعطاء. رواه البخاري(٣١٤٩) ومسلم(١٠٥٧).

١-الجبذة: الجذبة، واته: راكێشان.

٢- الصفحة: الجانب، واته: لا.

٣- العاتق: ما بين العنق الكتف، واته: نێوانی شان و مل.

مانای فەرموودەکە: ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ من لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەڕۆیشتم، عەبایەکی لێو ئەستوری نەجرانی لەبەردابوو، عارەبەکی دەشتەکی گەیشتێ پێغەمبەری(ﷺ) ڕاکێشا بە عەباکەی بە ڕاکێشانی توند جا تەماشای لایەکی شانی پێغەمبەرم کرد(ﷺ) لێوی عەباکەی تەئسیری لە شانی کردبوو لەبەر توند ڕاکێشانی لە پاشان عارەبە دەشتەکیەکە گوتی ئەی محمد فەرمان بکە لەو ماڵەی خوا کە لە لاتە پێم بدەن، پێغەمبەر(ﷺ) ئاوڕی لێ دایەوەو پێ کەنی لە پاشان فەرمانی کرد کە پێی بدەن.

**سوود**:

ئەم ئارام گرتنەی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئەو ناڕەحەتیەی کە لە عارەبە دەشتەکیەکە پێ ی گەیشت، ئەمە(احتمال الذی)ی پێ دەوترێ کە یەکێکە لە خاڵەکانی ڕەوشت جوانی کە لە پێشتر باسمان کرد.

٢- عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: ما ضَربَ رسول الله(ﷺ) شيئاً قَطُّ بيدهِ ولا امراةً ولا خادماً إلاّ انْ يُجاهِدَ في سبيل الله، وما نيل منه شيءٌ قَطُّ فَيَنْتَقِمُ مِن صاحِبهِ إلاّ انْ يُنتهَكَ شيءٌ مِنْ مَحارمِ

اللهِ فَينتقمُ لله(عزوجلَّ). رواه مسلم(٢٣٢٨).

واته: عائشه(رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: پیٚغەمبەر(ﷺ) قەت بە دەستەکانی لە هیچ شتیٚکی نەداوە، نە لە ژن و نە لە نۆکەر، مەگەر لەو کاتانەدا کە جیهادی کردووە لە پیٚناوی خوا، وە قەت ئەو ئیٚش و ئازارەی کە لە خەڵکانەوە پیٚی گەیشتووە تۆڵەی لەخاوەنەکەی نەکردۆتەوە مەگەر شتیٚك لە قەدەغەکراوەکانی خوا بشکاندرابایە ئەوە تۆڵەی بۆ خوا(عز وجلً) دەکردەوە.

## نەرم نیانی و لەسەرخۆیی:

خوا دەفەرموێ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ﴾ (ال عمران:١٥٩).

واتە: بە هۆی بەزەیی خواوەیە بۆ ئەوان نەرم و نیان بووی ئەگەر تۆ رەوشت خراپ و دڵ رەق بوویتایە ئەوە هەموو بڵاوەیان دەکرد لە دەورتدا کەواتە لێیان ببوورە وە داوای لێبوردنیان بۆ بکە وە راوێژیان پێ بکە لە کاروباردا جا کاتێ(دوای راوێژ کردن) بریارت دا ئەوە پشت بەخوا ببەستە بە راستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کە پشت بەخوا دەبەستن.

وە خوا دەفەرموێ﴿ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ﴾ (طه:٤٣-٤٤).

واتە: (خوا فەرمان بە موساو هارون دەکات دەفەرموێ) هەردووکتان برۆن بۆ لای فیرعەون چونکە بەراستی لە سنوور دەرچووەو یاخی بووە(٤٣) جا قسەی لەگەڵ بکەن بەنەرم و نیانی بەڵکو بیربکاتەوە یا بترسێ(لە سزای خوا).

١-عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: دَخَلَ رَهطٌ مِن اليهود على رسول رسول الله(ﷺ) فقالوا: السَّامُ عليكم. قالت عائشة: فَفَهِمتها

فقلتُ: وعليكم السَّامُ واللعنة، قالت: فقالَ رسولُ اللهِ(ﷺ): مهلاً يا عائشة، إنَّ اللهَ يُحبُّ الرِّفقَ في الأمر كُلِّهِ فقلتُ: يا رسول اللهِ أو لم تَسْمَعْ ما قالوا؟ قال رسول الله(ﷺ) قد قلتُ وعليكم. رواه البخاري(٦٠٢٤) ومسلم(٢١٦٥).

١-رهط: له سێ تاوهکو نۆیه.

٢- السَّامُ: واته: الموت، یانی مردن

٣- مهلاً: واته: أمهل، یانی لەسەرەخۆبە.

**ماناى فەرموودەكە:**

عائشه(رەزاى خواى لىٚ بيٚت) دەڵىٚ: كۆمەڵە جولەكەيەك هاتنە لاى پيٚغەمبەر(ﷺ) گوتيان(السَّام عليكم) واتە: مردنتان لەسەر، عائشه(رەزاى خواى لىٚ بيٚت) دەڵىٚ: منيش لە قسەكەيان گەيشتم گوتم: مردن و نەفرين لەسەر ئيٚوە، جا پيٚغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: ئەى عائشە لەسەرەخۆ بە. بيٚگومان خودا نەرم و نيانى خۆش دەوىٚ لەهەموو كاريٚكدا، جا گوتم ئەى پيٚغەمبەرى خوا ئەدى نەتبيست چيان گوت؟ پيٚغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: منيش گوتم لەسەر ئيٚوە بيٚت.

٢- عن عائشة(رضي الله عنه) انَّ رسول الله(ﷺ) قال لها: يا عائشةُ ارفُقِي، فَإنَّ اللهَ إذا أرادَ بأهلِ بيتٍ خيراً أدخَلَ عليهم الرِّفق[١].

واته:عائشه(رەزاى خواى لىٚ بيٚت) دەڵىٚ: پيٚغەمبەر(ﷺ)پيٚى فەرمووە:

---

(1) قال المنذري في الترغيب والترهيب: رواه احمد والبزار من حديث جابر. ورواتهما رواة الصحيح، وصححه الالباني انظر(الصحيحة:٣-٥).

ئەی عائشە: نەرم و نیان بە، چونکە بێگومان ئەگەر خودا خێری بۆ خێزانێك بوێ نەرم و نیانیان دەخاتە نێوان.

٣- عن ابن عباس(رضي الله عنهما) قال: قال رسول الله(ﷺ) لأَشَجِّ عَبْدِ القيس: إنَّ فِيك خَصلَتينِ يُحِبُّهما اللهُ الحِلْمُ والأناةُ. رواه مسلم(١٧) وابوداود(٥٢٢٥).

١-الحِلمُ: امام نووی دەڵێ واته(العقل) یانی: ژیری.

٢- الاناه:(التثبت و ترك العجلة) واته: جێگیربوون و پەلەنەکردن.

مانای فەرمودەکە: پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەشەججی هۆزی(عبدالقیس)ی فەرموو: دوو رەوشت لە تۆدا هەن خوا خۆشی دەوێن کە ژیری و پەلەنەکرنە.

٤- عن عائشة (رضي الله عنها) عن النبيِّ(ﷺ) قال: إنَّ الرِّفقَ لا يكونُ في شيءٍ إلاّ زانَهُ، ولا يُنزَعُ مِنْ شىءٍ إلاّ شانَهُ. رواه مسلم(٢٥٩٤).

واته: نەرم و نیانی لە هەر شتێکا بێت جوانی دەکات وە لە هەر شتێکدا داڕندرا ناشرینی دەکات.

٥- عن جرير(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسولَ الله(ﷺ) يقولُ: مَنْ يُحْرَمِ الرِّفقَ يُحْرَمِ الخيرَ. رواه مسلم(٢٥٩٢).

واته: هەر یەکێك بێ بەش کرابێ لەنەرم و نیانی بێ بەش کراوە لە خێر.

٦- عن انس بن مالك(رضي الله عنه) انَّ النبيَّ(ﷺ) رأى أعرابياً يبولُ في المسجدِ فقال: دعوهُ، حتى إذا فَرغَ دعا بماءٍ فصَبَّهُ عليهِ. رواه البخاري(٢١٩).

واتە: ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) عارەبەکی دەشتەکی بینی میزی لەناو مزگەوت دەکرد فەرمووی: وازی لێ بێنن(جا ئەوانیش وازیان لێ هێنا) تا تەواو بوو، جا پێغەمبەر(ﷺ) داوای ئاوی کرد جا ئاوەکەی بەسەر میزەکەدا کرد.

٧- عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: ما خُيِّرَ رسول الله(ﷺ) بين أمرينِ إلاّ اخَذَ أَيسَرَهُما ما لم يكن إثماً، فإنْ كان إثماً كانَ أبْعد الناسِ منهُ، وما انْتَقَمَ رَسولُ الله(ﷺ) لنَفسه، إلاّ أن تُنْتَهَكَ حُرْمَةَ اللهِ عزَ وجلَّ. رواه البخاري(٣٥٦٠) ومسلم(٢٣٢٧).

واتە: عائشە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) قەت نەکراوە بەسەر پشك لە نێوانی دوو کاردا ئیللا ئاسانەکەیانی هەڵبژاردووە بەمەرجێ ئەم کارە گوناح نەبوایە، بەلام ئەگەر گوناح بوایە ئەوە لە هەموو کەس لێی دوورتر دەبوو، وە پێغەمبەر(ﷺ) تۆڵەی بۆ نەفسی خۆی وەرنەدەگرتەوە مەگەر شتێك لەقەدەغەکراوەکانی خودا(عزوجل) بشکاندرابایە.

٨-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) منْ كانَ سهلاً هيِّناً لَيِّناً حرَّمَهُ الله على النَّار. صحيح: رواه الحاكم والبيهقي(الصحيحة:٦٤٨٤).

١-سهلاً: السهل: ضِدُّ الجبل، یانی(سهل) دژەکەی چیایە، واتە: تەختایی- زەویەکی ڕاست، وە(سهل) یانی: ئاسان - سووك.

٢- هيِّناً: دەڵێ ی(شيءٌ هين) واتە: شتێکی ئاسان.

٣- ليِّناً: الليِّن: ضِدُّ الخشونة، یانی(ليِّن) دژەکەی بریتییە لە: ڕەقی - زبری، کەواتە(ليِّن) واتە: نەرم.

واتای فەرموودەکە: هەر یەکێك ئاسان و سووك و نەرم بێت خوا حەرامی دەکات لەسەر ئاگر(واتە بە ئاگری دۆزەخ نایسوتێنیٚ).

**سوو**:

ئەگەر یەکێك کەللەرەق و عینادو توندتیژ بێت بەلام کاروباری خەڵکی بەدەستەوە نەبێت ئەمانە کێشەو نارەحەتیان کەمترە لە کەسانێك کە کەللە رەق و عینادو توندوتیژن کە دایك و باوکی چەند منداڵێك بن یا کارمەندێکی دەوڵەت بن و خەڵکی زۆر کاریان بکەوێتە لای یا بە تایبەتی سەرۆکی دەوڵەت بن، ئەمانە کاتێك کە دەمرن دەزانن کە چ زەرەرو زیانێکی گەورەیان لە خۆیان داوە، خۆش بەختیش بۆ ئەو کەسانەی کە ئیمانیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووەو ئاسان و نەرم و نیان بووینەو کێشەیان بۆ خەڵك دورست نەکردووەو خەڵکیان نارەحەت نەکردووە.

## باسی تووڕه بوون (الغضب):

خوا دەفەرموێ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ﴾ (ال عمران:١٣٣-١٣٦).

**واتە: وە بە پەلە بن بۆ لێبوردنێك لە لایەن پەروەردگارتانەوە وە بەهەشتێك کە پانتاییەکەی(بە ئەندازەی) ئاسمانەکان و زەوییە کە ئامادە کراوە بۆ پارێزکاران(١٣٣) ئەوانەی ماڵ دەبەخشن لە کاتی خۆشی(دەوڵەمەندی) و ناخۆشی دا وە ڕقی خۆیان دەخۆنەوە وە خەڵك عەفو دەکەن وە خواش چاکەکارانی خۆش دەوێت(١٣٤) وە ئەوانەی کە کاتێ کردەوەیەکی زۆر ناشیرین دەکەن یا ستەم لە خۆیان دەکەن کە یادی خوایان کردەوە ئەوجا داوای لێبوردن دەکەن بۆ گوناهەکانیان ئایا کێ دەبوورێ لە گوناهەکان بێجگە لە خوا، وە بەردەوام نابن لەسەر ئەوەی کە**

کردوویانە لە کاتێکدا بزانن(گوناهە) (١٣٥) ئا ئەوانە پاداشتیان لێ بووردنە لە لایەن پەروەردگاریانەوە وە چەند باخاتێك کە رووباری زۆر دەرۆن بەژێریاندا ئەمێننەوە لەو بەهەشتانەدا بە هەمیشەیی، چەند چاکە پاداشتی چاکەکاران(١٣٦).

١-عن أبي الدَّرداء(رضي الله عنه) قال: قال رَجَلٌ لِرَسولِ الله(ﷺ) دُلَّني على عَمَلٍ يُدْخِلِني الجَنَّة؟ قال رسول الله(ﷺ) لا تَغْضَبْ ولَكَ الجَنَّةِ[1].

واتە: ئەبودەرداء (رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پیاوێك بە پێغەمبەری گوت(ﷺ) کردەوەیەکم پێ نیشان بدە بە هۆیەوە بچمە بەهەشت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تووڕە مەبە بەهەشتت بۆ دەبێت.

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رجلاً قال للنبيِّ(ﷺ) أَوصِني؟ قال: لا تَغْضَب، فَرَدَّدَ مِراراً قال: قال لا تغضَبْ. رواه البخاري(٦١١٦).

واتە: ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پیاوێك بە پێغەمبەری گوت ئامۆژگاریم بکە؟ فەرمووی تووڕە مەبە، پیاوەکە چەند جارێك ئەم قسەیەی دووبارە کردەوە پێغەمبەر(ﷺ) هەر دەیفەرموو: تووڕە مەبە.

٣- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: ليسَ الشَّديدُ بالصُّرَعَةِ إنما الشديد الذي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عندَ الغَضَب. رواه البخاري(٦١١٤) ومسلم(٢٦٠٩).

١- الصُّرعَة: الذي يصرعُ الناس كثيراً، واتە: ئەوەی لە زۆرانبازی دا

(1) قال المنذري في الترغيب والترهيب: رواه الطبراني بإسنادين أحدهما صحيح.

خەڵك زۆر بە زەوی دا دەدات.

**مانای فەرموودەكە:**

بەهێز ئەو كەسە نی یە كە لە زۆرانبازی دا خەڵكان زۆر بدا بە زەوی دا بەڵكو بەهێز ئەو كەسەیە كە لەكاتی تووڕە بووندا خۆی دەگرێ و رقی خۆی دەخواتەوە.

٤- عن معاذ بن انس(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: مَنْ كَظَمَ غيظاً وهوَ قادرٌ على أنْ يُنْفِذَهُ دعاهُ اللهُ على رؤوسِ الخلائق يومَ القيامةِ حتى يُخَيِّرَهُ من الحور العِين ما شاء. حسن: رواه ابوداود(٤٧٧٧) والترمذي(٢٠٢٨).

واتە: هەر یەكێك توڕەیی یەك بخواتەوەو قوت بداتەوە، وە توانای ئەنجامدانیشی هەبێت و بتوانێ رقەكەی بڕێژێ، ئەوە لە رۆژی قیامەت خوا لەبەر چاوی خەڵك بانگی دەكات و دەیكا بەسەر پشك كە بە ئارەزووی خۆی لە(حور العین) هەڵبژێرێ چەندی دەوێ.

٦- عن ابن عمر(رضي الله عنهما) أنَّهُ سألَ رسول الله(ﷺ) ما يُباعِدُني مِنْ غَضَبِ الله عزَّ وجَلَّ؟ قال: لا تَغْضَبْ[1].

واتە: ابن عمر(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر كردووە(ﷺ) چی دوورم دەخاتەوە لە توورەیی خوا(عزّ وجلّ) فەرمووی: تووڕە مەبە.

٧- عن سليمان بن صُرَدٍ قال: كنتُ جالساً مَعَ النبيِّ(ﷺ) ورجلان يَستَبّانِ، فأحدُهُما احمرَّ وَجْهُهُ وانْتَفَخَتْ أوداجُهُ فقال

(1) قال المنذري: رواه احمد وابن حبان في صحيحه إلاّ انَّهُ قال: ما يمنعُني؟

النبيُّ(ﷺ) إني لأعلم كلمةً لو قالها ذهبَ عنه ما يَجدُ لو قال: أعوذ بالله من الشيطان ذهبَ عنه ما يجد، فقالوا لَهُ إنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: تَعَوذْ بالله من الشيطان، فقال: وهل بي جُنون؟ رواه البخاري(٣٢٨٢) و مسلم(٢٦١٠).

واته: سولەیمانی کوری صورەد(رەزای خوای لیّ بیّت) دەلّیّ: من دانیشتبوم لەگەلّ پیّغەمبەر(ﷺ) دوو پیاو جویّنیان بەیەك دەدا، یەکیّکیان رووی سوّر داهەلّگەرابوو دەمارەکانی ملی هەلّسابوو، جا پیّغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: من ووشەیەك دەزانم ئەگەر بیلّیّ ئەم توورەییەی نامیّنیّ ئەگەر بلّیّ: أعوذ بالله من الشیطان، ئەم توورەیی یەی دەروا، جا پیّیان گوت پیّغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خوّت بپاریّزە بە خوا لە شەیتان، پیاوەکە گوتی بوّ شیّتم.

**سوود**:

لە صحیحی(مسلم) لە بری(اعوذ بالله من الشیطان) (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) هاتووە، وە هەروەها لە صحیحی(بخاری)یش لە فەرموودەی ژمارە(٦١١٥)ش(اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) هاتووە، واتە: خوّم دەپاریّزم بەخوا لە شەیتانی دورخراوە لە رەحمەتی خوا.

## عەفووكردن و لێبووردن:

١-عن انس بن مالك(رضي الله عنه) انَّ النبيَّ(ﷺ) قال: إذا وقف العبادُ للحساب جاء قومٌ واضعِي سُيُوفِهِم على رقابهم تقطرُ دماً، فازْدَحَمُوا على بابِ الجنّةِ فَقِيلَ مَنْ هؤلاء؟ قيل الشهداء كانوا أحياءً مرزوقين، ثم نادى منادٍ لِيَقُمْ مَنْ أجرهُ على الله فَلْيَدْخُلِ الجنة ، ثم نادى الثانية: لِيقُم مَن أجرهُ على الله فلْيدخل الجنة، قال: ومَن ذا الذي أجره على الله؟ قال: العافون عن الناس . ثُمَّ نادى الثالثةَ؟ لِيَقُمْ مَنْ أجرهُ على الله، فَلْيَدخلِ الجنة، فقام كذا وكذا ألفاً فَدَخلوها بغير حسابٍ. قال: المنذري في (الترغيب والترهيب) رواه الطبراني بإسناد حسن.

واته: كاتێك خەڵك دەوەستن بۆ حيساب(لەرۆژی قيامەت دا) خەڵكانێك دێن شمشێرەكانيان لەسەر شانييەو خوێنی لێ دەتكێ، قەڵەبالغی دەكەن لەبەر دەرگای بەهەشت دەگوترێ ئەمانە كێن؟ دەگوترێ ئەمانە شەهيدەكانن ئەمانە زيندوو بوون و رسق دەدران، لە پاشان بانگ دەرێك بانگ دەكات: با هەڵ بستن ئەوانەی پاداشتيان لەسەر خوايە و بچنە بەهەشت لە پاشان جاری دووەم بانگ دەكاتەوە: با هەڵبستن ئەوانەی پاداشتيان لەسەر خوايە با بچنە بەهەشت، دەڵێ: ئەوە كێ يە پاداشتی لەسەر خوايە؟ دەڵێ: ئەوانەی خەڵكيان عەفوو كرديە، لە پاشان جاری سێيەم بانگ دەكاتەوە با هەڵبستێ ئەوەی پاداشتی لەسەر خوايە با بچێتە بەهەشت، جا ئەوەندە ئەوەندە هەزارە هەڵدەستن و دەچنە بەهەشت بەبێ حيساب.

**سوود**:

١-عن مسروق: سمعت عمر يقول: كُلُّ الناسِ مِنّى في حِلّ[١].

واته: مەسروق دەڵێ: گوێم لە عومەر بوو(ڕەزای خوای لێ بێت) دەیفەرموو: گەردەنی هەموو خەڵکێك ئازاد بێت.

٢- عن الحسن قال: أفضلُ اخلاق المؤمن العفو[٢].

واته: حەسەنی بەسرایی فەرموویەتی: باشترین ڕەوشتی ئیماندار لێبوردنە لە خەڵکی.

٢- عن عبدالله بن عمرو بن العاص(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: ارحموا تُرحموا، واغْفِروا يُغْفَرْ لَكم. **قال المنذري: رواه أحمد باسناد جيد.**

واته: ڕەحم بکەن ڕەحمتان پێ دەکرێ، لە خەڵکی خۆش بن و عەفوویان بکەن خوا لێتان خۆش دەبێ.

٣- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: ما نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِن مالٍ وما زادَ اللهُ عبداً بعفوٍ إلاّ عِزاً وما تواضَعَ أحدٌ لله إلاّ رفعَهُ اللهُ عَزَّ وجلَّ. رواه مسلم(٢٥٨٨).

١-التَّواضع: خۆبەکەم گرتن.

واته: ماڵ کەم نابێت بەخێر کردن، وە خوا زیاد ناکات بۆ بەندەیەك کە خەڵکان عەفو دەکات بەرزی نەبێت، وە هەر یەکێکیش فیزی نەبێت و خۆی بەکەم بگرێ لەبەر وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا ئیللا خوا(عز وجلَّ)

---

(1) جامع العلوم الحكم، ابن رجب الحنبلي.

(2) جامع العلوم الحكم، ابن رجب الحنبلي.

بەرزی دەکاتەوە.

٤- عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: ما ضربَ رسول الله(ﷺ) شيئاً قطٌ بيده ولا امرأةً ولا خادماً إلا ان يجاهدَ في سبيل الله وما نيل منه شيء قطُ فينتقمُ من صاحبه إلاّ أن يُنتهكَ شئ من محارم الله فَيَنْتَقِمُ لله(عز وجلَّ). رواه مسلم(٢٣٢٨).

واتە: عائشە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) قەت بەدەستەکانی لە هیچ شتێکی نەداوە، نە لە ژن و نە لە نۆکەر، مەگەر لەو کاتانەدا کە جیهادی کردووە لە پێناوی خوا وە قەت ئەو ئێش و ئازارەی کە لە خەڵکانەوە پێ ی گەیشتووە تۆڵەی لە خاوەنەکەی نەکردۆتەوە. مەگەر شتێك لە قەدەغەکراوەکانی خوا بشکاندرابایە، ئەوە تۆڵەی بۆ خوا(عز وجلَّ) دەکردەوە.

٥- عن عبدالله بن عمر(رضي الله عنهما) قال: جاءَ رجلٌ الى النبيِّ(ﷺ) فقال: يا رسول الله كم نعفو عن الخادم؟ فَصَمتَ، ثُمَ عاد عليه الكلام فصَمتَ، فلما كان في الثالثةِ قال: اعفُوا عنه في كُلِّ يومٍ سبعينَ مَرَّة. حسن: رواه ابوداود(٥١٦٤).

واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی ئەی پێغەمبەری خوا چەند خزمەتکار عەفو بکەین؟ پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگ بوو وەلامی نەدایەوە، لە پاشان پیاوەکە قسەکەی دووبارە کردەوە پێغەمبەر(ﷺ) هەم دیسان بێدەنگ بوو، لە جاری سێیەم فەرمووی: لە هەموو ڕۆژێکدا حەفتا جار عەفووی بکە.

**سوود**:

ئیمام موجاهید(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی مردنی(عومەری کوری عبدالعزیز) دەڵێ: عومەر پێی گوتم: ئەی موجاهید خەڵك چی دەڵێن دەربارەی من؟ گوتم دەڵێن(مسحور) سیحری لێ کراوە، عومەر فەرمووی: سیحرم لێ نەکراوە، لە پاشان بانگی غولامەکی خۆی کردوو پێی گوت(ویْحك ما حَملكَ علی ان سَقَیْتَني السُّمَّ؟) واتە: ماڵ ئاوا چی وای لە تۆ کرد کە ئەم ژەهرەم دەرخوارد بدەی؟ گوتی(الفُ دینار أُعطیتها وأَنْ أُعتَق) واتە: هەزار دینارم پێ دراوەو وە ئازادیش بکرێم، پێ ی گوت: پارەکە بێنە، ئەویش هێنای، جا عومەر پارەکەی خستە بیت المال وە فەرمووی: ( إذهب حیث لا یراك الناس) واتە: برۆ بۆ شوێنێك کە خەڵك نەتبینن[1] .

ڕەحمەتی خوات لێ بێت ئەی عومەر هەروا بە خۆڕایی نیە کە خوا ئەو ناوو بانگە گەورەی پێداوی.

## ئایاتی قورئان دەربارەی عەفوو لێبووردن

خوا دەفەرموێ﴿وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعۡدَ ظُلۡمِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَا عَلَيۡهِم مِّن سَبِيلٍ ﴿٤١﴾ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظۡلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم

(1) سیر اعلام النبلاء.

عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾

(الشورى:٤٠-٤٣).

واته: وه تۆڵەی هەر خراپەیەك خراپەیەكە بە وێنەی خۆی جا هەر كەسێ ببورێ و ئاشتی بكات ئەوە پاداشتی ئەو لای خوایە بە راستی خوا ستەمكارانی خۆش ناوێ(٤٠) وە هەر كەس تۆڵە بسێنێ لە پاش ئەوەی ستەمی لێكراوە ئا ئەوانە هیچ خەتایەكیان لەسەر نی یە(٤١) خەتا هەر لەسەر ئەو كەسانەیە كە ستەم لە خەڵكی دەكەن وە بە ناهەق خراپە كاری دەكەن لە زەویدا ئەوانە سزای زۆر سەختیان بۆ هەیە(٤٢) وە هەر كەس خۆگرو لێ بووردە بێ بەراستی ئەمە لە كارە پر بایەخ و پەسەندەكانە(٤٣).

وە خوا دەفەرموێ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُولُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (النور:٢٢).

واته: با سوێند نەخۆن ئەوانەتان كە خاوەنی چاكەو سەروەت و سامانن كە یارمەتی نەدەن بە خزمان و هەژاران و كۆچەران لە پێناوی خوادا دەبا لێ بووردەبن و چاو پۆشی بكەن ئایا پێتان خۆش نییە خوا لێتان خۆش ببێ وە خوا لێخۆش بوو و میهرەبانە.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە:

ئیمامی ئەبوبەكر(رەزای خوای لێ بێت) پێش ڕووداوی(إفك)

خەرجی(مِسطح)ی کوری(أثاثة)ی لە ئەستۆ گرتبوو لەبەر خزمایەتی و نەداری ئەو، بەڵام کە ڕووداوی(إفك) ڕوویدا(مِسطح)یش یەکێك لەوانە بوو کە بوختانی بە عائشە هەڵبەستا، جا کاتێك ڕووداوەکە کۆتایی پیّ هات ئەبوبەکر سوێندی خوارد کە هیچی تر خەرجی(مسطح) ناکێشم، جا خودا دەربارەی ئەم سوێندەی ئەبوبەکر ئەم ئایەتەی دابەزاند جا ئەبوبەکر ووتی: بەڵێ بە خوا حەز دەکەم خوا لێم خۆش بێت و بەردەوام خەرجی(مِسطح)ی دەداو دەی ووت: بەخوا هەرگیز لیّ ی نابرم.

## جێ بەجێ کردنی پێداویستیەکانی خەڵك (قضاء الحوائج) وە سوود پێگەیاندیان:

١-عن ابن عمر(رضي الله عنهما) قال: قال رسول الله(ﷺ): أحَبُّ النّاس الى الله أنْفَعَهم، وأحبُّ الأعمال الى الله سرور تُدخِلُهُ على مسلم، او تكْشِفُ عنهُ كُربةً، او تقضي عنه ديناً، او تَطرد عنه جوعاً، ولأَن أَمشي مع أخي المسلم في حاجةٍ، أحبُّ إلَيَّ مِنْ انْ أعتكِفَ في المسجد شهراً، ومَنْ كفَّ غَضبهُ، ستر الله عورتهُ، ومَنْ كظَمَ غيظاً ولو شاءَ أَن يُمضيَهُ أمضاهُ، ملأ الله قلبَهُ رِضاً يوم القيامةِ، ومَنْ مشى مع أخيهِ المسلم في حاجته حتّى يثبتها له أثبت الله تعالى قدمَهُ يومَ تَزلُّ الأقدام، وإنّ سُوء الخُلُق لَيُفسدِ العملَ كما يُفسِدُ الخَلُّ العسلَ. حسن رواه ابن أبي الدنيا في(قضاء الحوائج) والطبراني، انظر(صحيح الجامع:١٧٦).

واتە:

١-خۆشەویسترین خەڵك لە لای خوا ئەوەیانە کە لە هەموویان سوودی زیاترە.

٢- وە خۆشەویسترین کردەوە لای خوا ئەوەیە خۆشیەك بخەیتە دڵی موسڵمانێك، یان نارەحتیەکی لەسەر لا ببەی، یان قەرزێکی بۆ بدەیەوە.

٣- وە ئەگەر لەگەڵ برایەکی موسڵمانمدا بڕۆم بۆ بەجێهێنانی پێویستیەك لام خۆشەویسترە لەوەی کە لەم مزگەوتەدا(مزگەوتی مەدینە)

یەك مانگ بمێنمەوە بۆ خوا پەرستی و ئیعتكافكردن.

٤- وە هەر كەسێك تووڕەیی خۆی بگرێتەوە ئەوا خوا عەورەتی دادەپۆشێت.

٥- وە هەر كەسێك رق و تووڕەییك بخواتەوە لە كاتێكدا ئەگەر ویستی هەبێت بەجێ ی بێنێت بەجێ ی دێنێت ئەوا خوا دڵی پردەكات لە رەزامەندی لە رۆژی قیامەت دا.

٦- وە هەر كەسێك لەگەڵ برایەكی موسڵمانیدا بڕوات بۆ بەجێهێنانی پێویستیەكی هەتا جێبەجێی دەكات بۆی ئەوا خوای بەرز پێی جێگیر دەكات لە رۆژێكدا كە پێكان دەخلیسكێن.

٧- وە رەوشت خراپی كردەوە تێك دەدات وەك چۆن خەل هەنگوین تێك دەدات.

٢- عن صفوان بن سُليم، يرفعُهُ الى النبيِّ(ﷺ) قال: السَّاعي على الأرملةِ والمسكينِ، كالمُجاهد في سبيل الله، أو كالذي يَصومُ النَّهار ويقوم الليل. رواه البخاري(٦٠٠٦) ومسلم(٢٩٨٢).

واتە: ئەو كەسەی كە كار دەكات بۆ ئەوەی چاكە بكات لەگەڵ بێوەژن و هەژاردا پاداشتی وەكو ئەو كەسەیە كە جیهاد دەكات لە پێناوی خوادا یا وەكو ئەو كەسەیە كە بەرۆژ بەرۆژوو دەبێت وە بەشەویش نوێژ بكات.

٣- عن سهل بن سعدٍ قال: قال رسول الله(ﷺ) انا وكافلُ اليتيمِ في الجنَّةِ كهاتين. وأشار بأِصبُعيه، يعني السبابة والوسطى. رواه البخاري(٥٣٠٤) والترمذي(١٩١٨).

١-كافل: ئەو كەسەی شت دەگرێتە ئەستۆی خۆی.

٢- اليتيم: بە منداڵێك دەگوترێ كە باوكی مردبێ نەك دایكی وە

بالغیش نەبووبێ.

واتە: منو ئەو کەسەی کە منداڵی هێتیم دەگرێتە ئەستۆ وەکو ئەم دووە واین. پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بە پەنجەی شایتمان و پەنجەی ناوەنددا.

## سوود:

١-کەفالەتی هێتیم: سەرپەرشتی کردنی هەموو کاروبارەکانیەتی لە بژێوی، پۆشاك، پەروەردە .... هتد.

٢- وە ئێستا رێکخراو هەن هەڵدەستن بەم کارە، تۆش دەتوانی مانگانە ئەو برە پارە بدەی بە رێکخراوەکە کە دایانناوەو ئەو پلە بەرزە بەدەست بێنی.

٤- عن أبي الدَّرداء قال: أتى النبيَّ(ﷺ) رَجُلٌ يشكو قَسوةَ قلبهِ، قال: أَتُحبُّ أنْ يَلينَ قَلْبُك، وتُدرِكَ حاجَتَكَ؟ إرحَمِ اليتيم وامسح رأسَهُ، وأطعِمهُ مِن طعامك يَلِنُ قَلْبُكَ وتُدْرِكُ حاجَتَك.

صحيح: رواه الطبراني انظر(صحيح الجامع:٨٠).

واتە: پیاوەك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵاو شکاتی دڵ رەقی خۆی دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا پێت خۆشە کە دڵت نەرم بێت وە بگەی بە پێداویستیەکانت و بەدەستی بێنی؟ بەزەییت بە هێتیم دا بێتەوە دەست بەسەری دابێنە لە خواردنی خۆت خواردنی پێ بدە دڵت نەرم دەبێت و دەگەی بە پێداویستیەکانت.

**سوود**:

جابری کوری زەید دەڵێ: لأن اتَصَدَّق بِدرهم على يتيم أو مسكينٍ أحَبُّ إليَّ مِن حَجّةٍ بعدَ حَجَّةِ الإسلام[1].

واتە: ئەگەر دیرهەمێك بدەم بە هێتیمێك یا هەژارێك بەخێر لام خۆشەویسترە لە حەجێکی سوننەت.

٥- عن ابن مسعود(رضي الله عنه) أن النبيَّ(ﷺ) قال: ما مِنْ مُسلمٍ يُقرِضُ مُسلِماً قرضاً مَرَّتينِ إلاّ كانَ كَصَدَقَتِها مَرَّةً. **صحيح الجامع الصغير(٥٧٦٩)**.

**هەر موسڵمانێك دوو جار قەرز بە موسڵمانێك بدات ئەوە وەکو ئەوە وایە کە ئەو قەرزەی جارێك کردبێتە خێر.**

٦- عن البراء بن عازب(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: مَنْ مَنَحَ منيحةَ لَبَنٍ أوْ وَرِقٍ أو هَدَى زُقاقاً كان لهُ مثلُ عتقِ رَقَبةٍ. **صحيح رواه الترمذي(١٩٥٧)**.

**١-الزقاق: الطريق، واتە: رێگا.**

**٢- عتق: ئازاد کردن.**

**٣- رقبة: کۆیلە، عەبد.**

**مانای فەرموودەکە:**

**(من منح منيحة لبن) هەر یەکێك مەرێکی شیردار یا لە جۆری ئەو بدا بە یەکێك بۆ ئەوەی سوود لە شیرەکەی وەربگرێ لە دواییدا بیداتەوە. (أو وَرِقٍ) یا زیوی پێ بدا بە قەرز(واتە قەرزی پێ بدا). (او هَدى زُقاقاً) یا**

---

(1) صفه الصفوه(٣/١٥٨).

ڕێگایەك نیشانی کوێرێك یا سەرگەردانێك بدات(كان له مثل عِتق رقبة) ئەوە وەکو ئازاد کردنی بەندەیەکە بۆی.

٧- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: مَنْ أَعتَقَ رَقَبَةً مُؤمِنةً أَعْتَقَ الله بِكُلِّ إربٍ مِنها إِرباً مِنهُ مِنَ النَّار. رواه مسلم(١٥٠٩).

إرب: وهو العضو، یانی ئەندام.

واته: هەر یەکێك کۆیلەیەکی ئیماندار ئازاد بکات، خودا بە هەر ئەندامێکی ئەم کۆیلەیە ئەندامێکی ئەو ئازاد دەکات لە ئاگر.

٨- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيَّ(ﷺ) قال: مَنْ نَفَّسَ عن مُؤمنٍ كُربَةً مِنْ كُرَبِ الدّنيا نَفَّسَ الله عنهُ كُربَةً مِن كُرَبِ يوم القيامةِ ومَن يَسَّرَ على مُعسرٍ يَسَّرَ اللهُ عليهِ في الدُّنيا والآخرة ومَن سَتَرَ مسلماً ستَرهُ الله في الدُّنيا والآخرةِ، واللهُ في عونِ العبد ما كان العبدُ في عونِ اخيهِ و مَن سَلكَ طريقاً يلتَمِسُ فيهِ علماً سَهَّلَ الله لَهُ بِهِ طريقاً الى الجنة وما اجتَمعَ قومٌ في بيتٍ من بيُوتِ الله يتلونَ كتابَ الله ويتدارسونَهُ بينهم إلاّ نزلت عليهم السكينةُ وغشيتهم الرَّحمةُ وحَفَّتهُم الملائكةُ وذكرهمُ اللهُ فيمن عندهُ ومَن بَطَّأَ بهِ عَمَلُهُ لم يسرع نَسَبُهُ. رواه مسلم(٢٦٩٩).

نَفَّسَ: خەمی ڕەواندەوە، پشووی پێ دا.

كربة: خەم و ناخۆشیەکە کە دەروون بگرێتەوە.

ستر: دایپۆشی.

عون: یارمەتی.

سلك: چووە ناویەوە.

يلتمس: يطلب، داوا دەكات.

السكينة: هێمنی، دڵنیایی.

حفتهم: دەوری دان.

بطأ: أخر: دوای خست.

ماناى فەرموودەكە:

هەر كەسێك خەم و ناخۆشیەك لەسەر بڕواداڕێك لا بدات و پشووی پێ بدات خودا خەم و ناخۆشیەكی رۆژی قیامەتی لەسەر لا دەدات، وە هەر كەسێك كار ئاسانیەك بكات بۆ بارگرانێك و قەرزارێكی هەژارو دەستكورت خوا كاری دونیاو قیامەتی بۆ ئاسان دەكات وە هەر كەسێك عەیب و عاری موسڵمانێك داپۆشێ خودا لە دونیاو لە قیامەت عەیب‌وعاری دادەپۆشێ وە خودا لە یارمەتی بەندە دایە بە درێژایی ئەو ماوەیەی كە ئەو بەندە لە یارمەتی براكەی دایە. وە هەر یەكێك ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆ ئەوەی زانستێك بە دەستی بێنێ خوا بەوە ڕێگەیەكی بەرەو بەهەشت بۆ ئاسان دەكات هیچ كاتێك نەبووە دەستەیەك لە ماڵێك لە ماڵەكانی خوادا كۆببنەوەو كتێبی خوا(واتە قورئان) بخوێننەوەو یەكتریش فێرە قورئان خوێندن بكەن كە هێمنی و ئاسایشیان بەسەردا نەهاتبێت و ڕەحمەت داینەپۆشتبن فریشتە دەوری نەدابن و وە خوا ئەوانەی لەناو ئەوانە ناوبردووە كە نزیكی خۆین، وە هەر كەسێكیش كردەوەكانی دوای بخات نەژادو بنەماڵەی بەرەو پێشی نابات.

٩- عن أبي مسعود عقبة بن عمرو الانصاري البدري(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) مَنْ دَلَّ على خيرٍ فَلَهُ مثْلُ أجرِ فاعله. رواه مسلم(١٨٩٣).

واتە: هەر كەسێ خێرێ نیشانی كەسێ بدات وەكو بكەرەكەی پاداشتی بۆ هەیە.

## ووتەی ناوداران دەربارەی جێ بەجێ کردنی پێداویستی خەڵك و سوود پێ گەیاندنیان:

١-عن الحسن(رحمه الله) قال: لأَن أَقضي لِمُسلمٍ حاجةً احَبُّ إليَّ مِنْ اَنْ أُصَلي اَلفَ وكعة[1].

واتە: ئەگەر پێداویستیەك بۆ موسڵمانێك جێ بەجێ بکەم لام خۆشەویسترە لەوەی کە هەزار رکات نوێژ بکەم.

٢- عن ابي محصن قال: جاء رجُلٌ إلى الحسين بن على بن ابي طالب(رضي الله عنهما) فسألَهُ ان يذهبَ معه في حاجة فقال: إنّي معتكف فاتى الحسن فَأخبرهُ فقال الحسن لو مشى معك في حاجتك احبُّ إليَّ من اعتكاف شهر[2].

واتە: پیاوێك هاتە لای حوسێنی کوری ئیمام عەلی(رەزای خوایان لێ بێت) داوای لێ کرد کە لەگەڵی بچێ بۆ پێداویستیەکی ئەویش گوتی من لە ئیعتکاف دام، پیاوەکە چووە لای ئیمام حەسەن ئەم دەنگ و باسەی بۆ گێرایەوە ئەویش گوتی: ئەگەر ئەو بهاتایە لەگەڵت بۆ جێ بەجێ کردنی پێداویستیەکەت خۆشەویستر بوو لام لە ئیعتکافی یەك مانگ.

٣- قال ابن شَبْرمَة(رحمه الله) إذا طلبتَ مِن أخيك حاجةً فلم يَجهد نَفْسَهُ في قضائها، فتوضّأ وضوءَك للصلاةِ وكبِّر عليه أربعَ تكبيرات وعدّه في الموتى[3].

واتە: ئەگەر داوای پێداویستیەکت کرد لە براکەت هەوڵی نەدا

---

(1) موسوعة الأخلاق الإسلامية.

(2) نفس المصدر.

(3) نفس المصدر.

جێبەجێی بکات ئەو کاتە دەستنوێژێك بشۆ وەك دەستنوێژ شوشتنت بۆ نوێژ ئەوجا چوار جار(الله اکبر) بکە لەسەری و لە ریزی مردوانی بژمێرە.

٤- قيل لمحمد بن المنكدر: ايُّ الدُّنيا أعجب إليك؟ قال: ادخال السرور على المؤمن.

واتە: بە موحەمەدی کوری مونکەدیر گوترا کام شت لە دونیا لە هەموو شتێك زیاتر حەزی لێ دەکەی و بەدڵتە؟ گوتی: دڵخۆش کردنی بڕوادار.

٥- عن طاوس(رحمه الله تعالى) قال: إذا انعم الله على عبد نعمةً ثمَّ جعلَ حوائج الناسِ إليه فإن احتمل وصبرَ وإلاّ عرَّضَ تلك النعمة للزَّوال.

واتە: تاوس دەڵێ: ئەگەر خوا نیعمەتێکی بەخشی بە بەندەیەك لە پاشان وای کرد کە خەڵك پێویستیان پێی هەبێ و بچنە لای جا ئەگەر ئارامی گرت و پێداویستی خەڵکی جێ بەجێ کرد باشە ئەگەر نا نیعمەتەکە دووچاری لەناوچوون دەبێت.

جا بزانە جێ بەجێ کردنی پێداویستیەکانی خەڵك دەرگایەکی گەورەیە لە دەرگاکانی خێرو چاکە، یەکێکە لە باشترین کردەوە چاکەکان هەوڵ بدە لەم ڕێگایەدا خێری زۆر بۆ خۆت کۆبکەیتەوە، دایك و باوکت و نزیکانت لە ریزی پێشەوە دابنێ بۆ ئەم چاکە لەگەڵ کردنە وە هەمووش بە مەبەستی ڕەزامەندی خوا ئەنجام بدە.

## راستی - درۆ - بەڵێن - پەیمان- سپاردە
## الصّدق - الكذب- الوعد- العهد- الأمانـة

خوا دەفەرموێ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾ (التوبة:١١٩).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە خۆتان بپارێزن لە(تۆڵەی) خوا وە لەگەڵ ڕاست گۆیان دا بن.

وە خوا دەفەرموێ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعًۢا بَصِيرًا﴾ (النساء:٥٨).

واتە: بەراستی خوا فەرمانتان پێ دەکات بە دانەوەی گشت سپاردەکان بۆ خاوەنەکانیان وە کاتێك دادوەریتان کرد لە نێوان خەڵکیدا بەداد حوکم بکەن بەراستی خوا بە چاکی ئامۆژگاریتان دەکات بەڕاستی خوا هەمیشە بیسەری بینایە.

وە خوا دەفەرموێ﴿وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ إِسْمَـٰعِيلَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرْضِيًّا﴾ (مريم:٥٤-٥٥).

واتە: وە لە قورئان دا باسی ئیسماعیل بکە بێگومان ئەو لە

بەڵێنەکانیدا راست گۆ بوو وە ئەو نێرراو و پێغەمبەری خوا بوو(٥٤) وە هەمیشە فەرمانی دەدا بە خێزان و کەسوکاری بە نوێژ کردن و زەکات دان وە هەمیشە لای پەروەردگاری جێگەی رەزامەندی بوو(٥٥).

وە خوا دەفەرموێ﴿إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَـٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾ (الأحزاب:٧٢).

واتە: بێگومان ئێمە ئەمانەتمان نیشانی ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان دا(هەڵگرتنی ئەمانەتی دینداریمان پێشنیار کرد بۆیان) بەڵام هیچیان رازی نەبوون کە هەڵیگرن و ترسان لەو(ئەمانەتە) کەچی ئادەمی ئەو(سپاردەی) هەڵگرت بەراستی ئەو زۆر ستەمکارو نەزانە.

وە خوا دەفەرموێ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَخُونُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓا۟ أَمَـٰنَـٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (الانفال:٢٧).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ناپاکی مەکەن لەگەڵ خواو پێغەمبەردا، وە ناپاکی مەکەن لە سپاردەکانی ناو خۆتان لە کاتێکدا کە ئێوە دەزانن(ناپاکییە).

وەخیانەتکردن لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوا هەموو گوناهێکی گەورەو گچکە دەگرێتەوە.

**پێناسەی ئەمانەت:**

**قال الكَفَويّ: الأمانة: كُلُّ ما افترض الله على العباد فهو أمانة كالصّلاة والزكاة والصيام وأداء الدَّين وأوكد الودائع: كتم الأسرار.**

**واته: كەفەوی دەڵێ: ئەمانەت بریتییە لە هەموو ئەو شتانەی کە خودا فەرزی کردووە لەسەر بەندەکان وەك نوێژ، زەکات، ڕۆژوو، دانەوەی قەرز. وە لەهەموو ئەو ئەمانەتانەی کە زیاتر جەختی لەسەر کراوە شاردنەوەی نهێنیەکانە.**

**کەواتە: خیانەت کردن لەگەڵ خواو پێغەمبەر هەموو گوناهێکی گەورەو گچکە دەگرێتەوە.**

**بۆیە ئەسحابەیەك دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەعرابیەك عارەبەکی دەشتەکیم بینی سواری حوشترێك بوبوو بەرامبەر مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) وەستا ووشترەکەی یخ کردو بەستیەوە، چووە مزگەوت و نوێژی کردو پارایەوە. کە هاتە دەرەوە ووشترەکەی نەمابوو، جا دەستەکانی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان گوتی ئەی پەروەردگارم(ادّيتُ امانتكَ، فَأين أمانتي) واتە: من ئەمانەتی تۆم جێ بەجێ کرد ئەدی کوا ئەمانەتی من؟ لە دوای ئەم قسەیەی بینی وا حوشترەکەی لە ڕێگاکانی مەدینە دێتەوە تا هات لەبەر دەستی ڕاوەستاو سواری بوو و ڕۆیشت. لەم بەسەرهاتە دەبینین کە ئەعرابیەکە ناوی نوێژ دەبات بە ئەمانەت.**

١-عن ابن مسعود(رضي الله عنه) عن النبيّ(ﷺ) قال: إنَّ الصِّدقَ يهدي الى البرِّ وإنَّ البرَّ يهدي إلى الجنَّة وإنَّ الرَّجُل ليَصْدُق حتى يُكتب عندالله صدّيقاً. وإنَّ الكذب يهدي إلى الفجور وإنَّ الفجور يهدي إلى النار وإنَّ الرَّجُل ليكذبُ حتى يُكتب عند الله كذّاباً. **رواه البخاري(٦٠٩٤) ومسلم(٢٦٠٧).**

واتە: بێگومان راستی رێنموونی(مرۆڤ) دەکات بۆ چاکەو چاکەش رێنموونی دەکات بۆ بەهەشت وە بەراستی مرۆڤ بەردەوام راست دەکات تاکو لای خوا بەڕاست گۆ دەنوسرێت. وە بیگومان درۆکردنیش رێنموونی(مرۆڤ) دەکات بۆ خراپە خراپەش سەردەکێشیٚ بۆ ئاگر وە بێگومان بەردەوام مرۆڤ درۆ دەکات تاکو لای خوا بە درۆزن دەنووسرێت.

## چیرۆکێك لەسەر راستگۆیی:

شێخ عبدالقادر گەیلانی(رەحمەتی خوای لیٚ بێت) دەڵیٚ: لە مەککە دەرچووم بەرەو بەغداد بۆ وەدەست هێنانی زانست، دایکم چل دیناری زێری پێدام وە پەیمانی لیٚ وەرگرتم کە راستگۆبم، جا کاتێك کە گەیشتینە خاکی هەمەدان کۆمەڵێك لێمان دەرکەوتن قافیلەکەیان برد، جا یەکێکیان بەلام تێپەری گوتی چیت پیٚ یە؟ گوتم چل دینار، کابرا وا گومانی برد گالتەی پیٚ دەکەم وازی لیٚ هێنام، جا پیاوێکی تر منی بینی گوتی چیت پیٚ یە گوتم چل دینار جا منی برد بۆ لای ئەمیرەکەیان پرسیاری لیٚ کردم منیش وەڵامم دایەوە جا گوتی چی وای لیٚ کردی کە راست بڵیٚ ی گوتم دایکم پەیمانی لیٚ وەرگرتووم کە راست بڵێم دەترسم پەیمانەکەی بشکێنم جا ئەمیرەکەیان کە ئەم وەڵامەی بیست هاواری لیٚ هەستاو گریا گوتی تۆ دەترسی ناپاکی لە پەیمانی دایکت بکەی بەلاٚم من ناترسم کە خیانەت لە پەیمانی خوا بکەم. ئەوجا فەرمانی کرد چیان لە قافیلەکە بردووە پێیان بدەنەوە وە گوتی من تەوبە دەکەم لەسەر دەستی تۆ، وە ئەوانەش کە لەگەڵیدا بوون گوتیان تۆ گەورەمان بووی لە ریٚ گری وە ئەمرۆش تۆ گەورەمانی لە تەوبە کردن جا هەموویان تەوبەیان کرد بەبەرەکەت و بەهۆی

راست گۆیی[1].

٢- عن بَهز بن حكيم عن أبيه عن جدّهِ قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: ويلٌ للذي يُحدِّث فَيكذِبُ لِيُضحِكَ بِهِ القومَ ويلٌ لهُ ويلٌ لَهُ. حسن رواه ابوداود(٤٩٩٠) والترمذي(٢٣١٥).

واته: وەیل بۆ ئەو کەسەی کە قسە دەکاو درۆ دەکا بۆ ئەوەی خەڵك بێنێتە پێکەنین بەم قسە درۆیەی وەیل بۆ ئەو کەسە وەیل بۆ کەسە.

٣- عن ابي أسامة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) انا زَعيمٌ ببيتٍ فِي رَبَضِ الجَنَّةِ، لِمَن تَرَكَ المراءَ وإنْ كان مُحِقّاً، وبِبَيتٍ فِي وسَطِ الجَنَّة لِمَنْ ترك الكذِبَ وإنْ كانَ مازحاً، وبِبَيتٍ فِي أعلى الجَنَّةِ لِمَن حَسُنَ خُلُقَهُ. حسن: رواه ابوداود(٤٨٠٠).

١-الزعيم: الضّامن، واته: دابین کەر.

مانای فەرموودەکە: من دەبمە دابین کەر بە خانووەك لە لێوارەکانی بەهەشت بۆ ئەو کەسەی واز لە موجادەلە دەینی ئەگەر ئەویش لەسەر حەق بیت، وە بە خانووەك لە ناوەندی بەهەشتێ بۆ ئەو کەسەی کە واز لە درۆ دەینی ئەگەر بەسوحبەتیش بێت، وە بەخانووەك لەبەرزترین شوێنی بەهەشت بۆ ئەو کەسەی رەوشتی جوانە.

٤- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: آيَةُ المُنافِقِ ثلاثٌ: إذا حَدَّث كَذَبَ، واذا وَعَدَ أَخْلَفَ، وإذا اؤْتُمِنَ خانَ. رواه البخاري(٣٣) ومسلم(٥٩).

١-آية: واته: علامة، یانی نیشانە.

مانای فەرموودەکە: نیشانەی دوو روو(منافق) سێ شتە: ئەگەر قسەی

---

[1] موسوعة الأخلاق الإسلامية.

کرد درۆ بکا، وە ئەگەر بەڵێنیدا دوا بکەوێ  وە ئەگەر سپاردەی لادانرا خیانەت و ناپاکی تیادا بکات.

## **سوود**:

١-دوو جۆر دووڕوویی(نفاق) هەیە:

أ) النِّفاق الاعتقادي[1] ئەوەیە ئینسان لەسەرەوە موسڵمان بێت و لە ناوەوەشی کافر بێت، خاوەنی ئەم جۆرە (نفاق)ە ئیمانی نییە بۆ هەتا هەتایێ لە ئاگر دەمێنێتەوە ئەگەر نەگەڕێتەوە.

ب) النفاق العملي: ئەم جۆرە(نیفاق)ە خاوەنەکەی لە بازنەی ئیمان دەرناکات ئەگەر لە قیامەت سزا درا بۆ هەتا هەتایێ لە ئاگردا نامێنێتەوە، وەکو کردنی ئەو سێ شتەی لەم فەرموودەی لای سەرەوەدایە.

٥- عن عبدالله بن عمرو أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كانَ مُنافِقاً خالِصاً ومَن كانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كانت فيه خَصْلَةٌ مِنَ النِّفاقِ حَتَّى يَدَعَها: إذا اؤْتُمِنَ خانَ، وإذا حَدَّثَ كَذَبَ، وإذا عاهَدَ غَدَرَ، وإذا خاصَمَ فَجَرَ. رواه البخاري(٣٤) ومسلم(٥٨).

واتە:چوار شت هەن هەر یەکێك تێیدا هەبن ئەوە مونافیقی تەواوە وە هەر یەکێك (خصلة) تێکی لەم چوارەی تیادا بێت ئەوە(خصلة)تێکی لە دووڕوویی تیایە تا وازی لێ دێنێ: ئەگەر کرا بە ئەمیندار خیانەت بکات، وە ئەگەر قسەی کرد درۆ بکات، وە ئەگەر پەیمانیدا بیشکێنێ، وە ئەگەر دەمەقاڵێ و موجادەلەی کرد لە حەق لابدات(قسەی ناهەق و درۆ دەکات).

---

(1) النفاق الاعتقادي:(النفاق الأكبر)یشی پێ دەوترێت.

**سوود**:

١-ئەم چوار(خصلة)ەی لای سەرەوە ئەگەر ئینسان تێیدا بوون لەگەڵ بوونی ئیماندا، ئەگەرچی ئەو کەسە زۆر بە دوو رووان دەچێ بەلاّم هەر خاوەنی ئیمانەو لە بازنەی ئیمان نەچۆتە دەرەوە.

٢- ابن رجب دەڵێ:(النفاق الأصغر وسيلةٌ الى النفاق الأكبر... يخشى على من اصَرَّ على خصال النفاق أن يسلب الإيمان فيصير منافقاً خالصاً)[1].

واتە: نیفاقی گچکە ئینسان بەرەو نیفاقی گەورە دەبات... ئەو کەسە ترسی ئەوەی لێ دەکرێ کە بەردەوام بێت لەسەر(خصلة)ەکانی نیفاقی گچکە کە ئیمانەکەی نەمێنێ و ببێتە مونافیقێکی تەواو.

٣- ابن حجر العسقلانی دەڵێ:(فَمَن اصَرَّ على نفاق المعصية(أي النفاق الأصغر) خشي عليه أن يفضي به الى نفاق الكفر(أي النفاق الأكبر)[2]

واتە: هەر یەکێك بەردەوام بێت لەسەر نیفاقی گچکە ترسی ئەوەی لێ دەکرێ کە بەرەو نیفاقی گەورەی ببات بەتەواوی دابرندرێ لەئیمان.

٤- درۆ کردن لە گەورەترین سیفات و نیشانەکانی مونافیقانن وە هەروەها درۆ کردن لە گوناهە گەورەکانیشە.

٦- عن عبدالله بن عامر(رضي الله عنه) انَّهُ قال: دَعَتْني أُمّي يوماً ورسول الله(ﷺ) قاعدٌ في بيتنا فقالت: ها تَعالَ أُعطيكَ فقال لها رسول الله(ﷺ): وما أَردتِ انْ تُعطيهِ؟ قالت أُعطيهِ تمراً، فقال

---

(1) جامع العلوم والحكم ص(٤٠٦).

(2) فتح الباري.

لها رسول الله(ﷺ) اما إنَّكِ لو لَمْ تُعطيهِ شيئاً كتبت عليك كِذبَةٌ. حسن: رواه أبوداود(٤٩٩١).

واته: عبدالله كوری عامر دەڵێ: ڕۆژێكیان دایكم بانگی كردم وه پێغەمبەریش(ﷺ) له ماڵمان دانیشتبوو، دایكم پێی گوتم: هاوەره پێت بدەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەتەوێ چی پێ بدەی؟ گوتی: خورمای پێ دەدەم پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: ئەگەر تۆ هیچ شتێكت پێ نەدابایه به درۆیەك لەسەرت دەنوسرا.

٧- عن عبدالله بن عمر(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال:لِكُلِّ غادرٍ لواءٌ يوم القيامة يُعرَفُ به. رواه البخاري(٦٩٦٦) و مسلم(١٧٣٦).

غادر: پەیمان شكێن، چاوگەكەی(الغدر) رابردووەكەی(غَدَرَ)يه.

واته: له ڕۆژی قیامەت دا هەموو پەمان شكێنێ ئاڵایەكی هەیه پێی دەناسرێتەوه.

٨- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال النبيُّ(ﷺ) أَدِّ الأمانَةَ إلى مَنِ ائْتَمنَكَ ولا تَخُنْ مَن خانَكَ. صحيح:رواه الترمذي(١٢٦٤).

واته: سپاردە بدەوه بەو كەسەی كه سپاردەی لا داناوی خیانەت و ناپاكی مەكه لەگەڵ ئەو كەسەی كه ناپاكی لەگەڵ كردووی.

٩- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: بينما النبيُّ(ﷺ) يُحدِّثُ القوم، جاءَ أعرابيٌّ فقال: متى الساعة؟ فَمضى رسولُ الله(ﷺ) يُحَدِّثُ فقال بعض القوم: سمع ما قال فَكرِه ما قال، وقال: أين أُراهُ السائلُ عن الساعة؟ قال: ها أنا يا رسول الله قال: فإذا

ضُيِّعَتِ الأمانةُ فانتظر الساعة. قال: كيف إضاعتها؟ قال: إذا وُسِّدَ الأمر الى غير أهلِهِ فانتظر الساعة. رواه البخاري(٥٩).

واته: ئەبو هورەیره دەڵێ: له کاتێکدا پێغەمبەر(ﷺ) قسەی بۆ خەڵك دەکرد ئەعرابیەك هات گوتی: قیامەت کەی دادێ؟ پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام بوو لەسەر قسەکردن یەکێك له خەڵکەکە گوتی پێغەمبەر(ﷺ) گوێی لێ بوو چی گوت بەڵام ئەوەی گوتی پێی ناخۆش بوو، وە هەندێکیان گوتیان: نا گوێ ی لێ نەبوو، جا کاتێك که قسەکەی تەواو کرد فەرمووی: له کوێ ببینم ئەوەی پرسیاری کرد دەربارەی قیامەت؟ ئەعرابیەکه گوتی منم ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر ئەمانەت نەما چاوەڕوانی قیامەت بکە، ئەعرابیەکه گوتی: چۆنە نەمانی ئەمانەت؟ فەرمووی: ئەگەر کاروبار درا دەست کەسانێك که شایستەی نەبوون ئەو کاته چاوەڕوانی هاتنی قیامەت بکە.

١٠- عن ابي الدّرادء قال: قال رسول الله(ﷺ): خمس مَن جاء بِهنَّ معَ إيمانٍ دَخَلَ الجنّة: من حافظ على الصلواتِ الخمسِ على وضوئِهنَّ، وركوعِهنَّ، وسجودهِنَّ، ومواقيتهنَّ، وصامَ رمضان، وحجَّ البيت إنِ استطاع اليهِ سبيلاً، وأعطى الزكاةَ طيِّبة بِها نَفسُهُ. وأدَّى الأمانةَ، قالوا: يا أبا الدَّرداء: وما أداء الأمانة؟ قال: الغُسلُ مِنَ الجنابةِ. حسن: رواه ابوداود(٤٢٩).

واته: پێنج شت هەن هەر یەکێك بیان هێنێ لەگەڵ ئیمان و باوەڕ دەچێتە بەهەشت: هەر یەکێك پارێزگاری له پێنج نوێژەکان بکات له دەست نوێژیان، وە له رووکوعیان، وە له سەجدەیان، وە له کاتیان، وە مانگی رەمەزان بەرۆژوو بێت، وە حەجی ماڵی خوا بکات ئەگەر پێی کرا، وە

زەکات بدات لە دلاَ پیَ ی خۆش بیَت، وە ئەمانەت جیَ بەجیَ بکات، گوتیان ئەی ئەبودەرداء جیَ بەجیَ کردنی ئەمانەت چییە؟ فەرمووی: خۆشوشتنە لە جەنابەت.

١١- عن أبي ذرّ(رضي الله عنه) قال: قلتُ يا رسول الله ألا تَستَعْمِلُني؟ قال: فضربَ بيدهِ على مِنكبي، ثم قال: يا أبا ذرّ إنَّك ضعيفٌ، وإنّها أمانةٌ، وإنّها يومَ القيامةِ خِزيٌ وندامةٌ، إلاّ مَنْ أخَذها بحقِّها وأدّى الذي عليه فيها. رواه مسلم(١٨٢٥).

واتە: ئەبو زەر دەلَیَ: گوتم ئەی پیَغەمبەری خوا دامنامەزریَنی؟ دەلَیَ: پیَغەمبەر(ﷺ) بەدەستی لە نیَوان قۆلَ و شانمی دا لە پاشان فەرمووی: ئەی ئەبو زەر تۆ بیَ هیَزی وە بیَ گومان ئەم کارەش ئەمانەتە، وە بیَ گومان ئەم کارە لە رۆژی قیامەتدا ریسوایی‌و پەشیمانییە، مەگەر یەکیَك وەری گرتبیَ بە حەقی خۆی وە ئەوەی کە لە سەریەتی لەم کارە جیَبەجیَی کردبیَ.

١٢- عن سهل بن سعد قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ يَضْمَنْ لِي ما بينَ لَحْيَيهِ ومابينَ رِجْلَيهِ أَضْمَنْ لَهُ الجَنَّةَ. رواه البخاري(٦٤٧٤).

١-من يضمن: کیَ داین دەکا، (ضمان) خستنە ئەستۆ.

٢- ما بين لحييه: واتە: زمان. ما بين لحييه: اللحيان: العظمان اللذان تنبت عليها الاسنان علوا وسفلاً والذي بين اللحيين هو اللسان. واتە: اللحيان: ئەو دوو ئیَسکەن کە ددانیان لەسەر شین دەبیَت بلَندو نزمەکە، ئەوەش لە نیَوانی ئەم دوو ئیَسکەیە زمانە.

٣- وما بين رجليه: وە ئەوەش کە لە نیَوانی دوو قاچەکانی دایە،

واتە: داوێن.

ماناى فەرموودەكە:

هەر یەكێك زمانى و داوێنیم بۆ دابین بكات(بیانپارێزێ لە گوناح). منیش بەهەشتى بۆ دابین دەكەم.

١٣- عن عُبادة بن الصَّامت(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: إضْمَنوا لِي ستاً مِنْ انفُسِكُم أَضْمَنُ لَكُمُ الجنَّة:

أُصْدُقُوا إِذا حَدَّثْتُم، وَأَوفُوا إِذا وَعَدتُمْ، وأَدُّوا إِذا ائتُمِنتُم. واحْفَظوا فُرُوجَكُمْ، وغُضُّوا أَبْصارَكُم، وكُفُّوا أَيدِيَكُم[1].

ضمان: دابین كردن، دەستەبەركردن.

ماناى فەرموودەكە:

شەش شتم لە خۆتان بۆ دابین بكەن منیش بەهەشتتان بۆ دابین دەكەم: ئەگەر قسەتان كرد راست گۆ بن، وە ئەگەر بەڵێنتاندا جێبەجێى بكەن وە ئەگەر سپاردەیەكتان لادانرا بیدەنەوە بە خاوەنەكەى، وە داوێنتان بپارێزن، وە چاوتان داخەن(لە تەماشاكردنى حەرام) وە دەستتان بگرن لە خراپە.

---

(1) حسن: انظر (السلسلة الصحيحة-١٤٧٠) و(صحيح الجامع-١٠١٨).

# قسه پچراندن له سىٚ رۆژ زياتر لهگهڵ موسڵماندا وه گهورهيى چاكردنى نێوانى خهڵك

١-عن أبي أيوبَ الانصاري (رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: لا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أنْ يَهجُرَ اخاه فَوقَ ثلاث ليالٍ يلتَقيانِ، فَيُعرِضُ هذا ويُعرضُ هذا، وخيرهما الذي يبدأ بالسَّلام. رواه البخاري(٦٠٧٧) ومسلم(٢٥٦٠).

٢-واته: جائيز نييه بۆ موسڵمان كه زياتر له سىٚ شهو قسه دابرىٚ له براكهى و قسهى لهگهڵ نهكات بهيهكترى بگهن ئهميان روو وهرگێرىٚو ئهويان روو وهرگێرىٚ، وه باشترينيشيان ئهوهيه كه له پێشدا سهلام دهكات.

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قالَ: تُفْتَح أبواب الجَنَّةِ يومَ الإثنينِ ويومَ الخميسِ، فَيُغْفَرُ لِكلِّ عبدٍ لا يُشرِكُ باللهِ شيئاً إلاّ رَجلاً كانت بينَهُ وبينَ اخيهِ شحناءُ فيقالُ:أَنْظِروا هذين حتى يصطلحَا، أَنْظِروا هذين حتى يصطلحا، أَنظِروا هذين حتى يصطلحا. رواه مسلم(٢٥٦٥).

الشحناء: العداوة: دوژمنايهتى.

أنظروا هذين: اي أخروهما، واته: دوايان بخهن.

واته: دووشهممان و پێنجشهممان دهرگاكانى بهههشت دهكرێنهوه، خوا له هەموو بهندهيهك خۆش دهبىٚ كه هيچ هاوبهشێكى بۆ خودا دانهنابىٚ تهنيا پياوێك نهبێت كه له نێوانى ئهو و له نێوانى براكهى دوژمنايهتى

هەیە، جا دەگوترێ:(خوا دەفەرمووێ بە فریشتەکان) ئەم دووانە دوا بخەن تا ئاشت دەبنەوە ئەم دووانە دوابخەن تا ئاشت دەبنەوە ئەم دووانە دوا بخەن تا ئاشت دەبنەوە.

٣- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) لايَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أنْ يَهْجُرَ أخاه فوق ثلاثٍ فَمَنْ هجر فوقَ ثلاثٍ فمات دخَلَ النار. صحيح: رواه ابوداود(٤٩١٤).

واتە: جائز نییە بۆ موسڵمان لە سێ ڕۆژان زیاتر قسە بپچڕێنێ لەگەڵ براکەی هەر یەکێك لە سێ ڕۆژان زیاتر قسە بپچڕێنێ بمرێ دەچێتە ئاگر.

٤- عن ابي خِراشٍ السُّلَميِّ(رضي الله عنه) أَنَّهُ سَمِعَ رسول الله(ﷺ) يقول: مَنْ هَجَرَ أَخاهُ سَنَةً فَهُوَ كَسَفْكِ دَمِهِ. صحيح: رواه ابوداود(٤٩١٥).

واتە: هەر یەکێك قسە بپچڕێنی لەگەڵ براکەی بۆ ماوەی ساڵێك ئەوە وەکو ئەوە وایە کە خوێنی ڕشتبێ.

**سوود**:

قال أبوداود: اذا كانت الهجرة لله فليس من هذا بشيء.

واتە: ئەگەر پچرانی نێوانەکە لەبەر خوا بێت ئەوە ئەو هەڕەشانە نایگرێتەوە.

بەڵام ئەگەر موسڵمان قسەی لەگەڵ یەکێك پچراند دەبێ لە ڕووی شەرعیەوە دڵنیا بێت کە کارەکەی ڕاست و دروستە

# چاكردنی نێوانی خەڵك

خوا دەفەرموێ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ (الحجرات:١٠).

واتە: بێگومان تەنها باوەڕداران بران كەواتە لە نێوان دوو براتان دا(ئاژاوە هەبوو) ئاشتەوایی بكەن وە لە خوا بترسن بەڵكو رەحمتان پێ بكرێ.

١-عن أبي الدرداء قال: قال رسول الله(ﷺ): الا أُخبركم بأفضلَ من درجةِ الصيام والصلاةِ والصدقةِ قالوا بلى، قال: إصلاحُ ذاتِ البينِ وفَسادُ ذاتِ البينِ الحالقة. صحيح رواه ابوداود(٤٩١٩).

واتە: ئایا خەبەرتان پێ بدەم بە باشتر لە پلەی رۆژوو و نوێژو خێر كردن بە پارەو ماڵ؟ گوتیان بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چاكردنی نێوانی خەڵك، وە تێك دانی نێوانی خەڵك داتاشەرە(واتە دین دەتاشێ).

**سوود**:

ئەو كەسانەی نێوانی خەڵك چاك دەكەن لە پێناوی خودا پاداشتێكی زۆر گەورەیان بۆ هەیە، وە ئەو كەسانەش كە نێوانی خەڵك تێك دەدەن بە تایبەتی نێوانی دایك و باوك و منداڵ یا نێوانی ژن و مێرد، ئەو كەسەی كە ئەم نێوانە تێك دەدات، دایكێك بیت كیژەكەی تێك بدات لە مێردەكەی یا خوشكێكی بیت، با ئەوانە بزانن هەر گوناهێك كە لەم نێوانە روو دەدات كە ئەوان بوینە سەبەب ئەوە ئەوانیش لە هەموو ئەو گوناهانە بەشدارن، جا بزانە ئەگەر نێوانی ژن و مێرد تێك بچێت چ گوناهی گەورە گەورە لەم نێوانەدا روودەدات.

## بدعة: داهێنراو

عن عائشة(رضي الله عنه) قالت: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ أَحْدَثَ في أمرِنا هذا ما لَيسَ مِنهُ فَهُوَ رَدٌّ. رواه البخاري(٢٦٩٧) ومسلم(١٧١٨).

أَحْدَثَ: شتێکی داهێنا

أمرنا: واته(ديننا) ئاينی ئێمه.

رد: (رد) لێرەدا مانای(مردود) دەگرێتەوە، کە مانای: بەتاڵ یا شتێکی وایە کە پشتی پێ نەبەسترێ یا حیسابی بۆ نەکرێت .

مانای فەرموودەکە:

هەر کەسێك شتێکی وای خستە ئەم ئاینەی ئێمەوە کە بەشێك نەبێت لە ئاینەکە ئەوا ئەو شتە بەتاڵەو نرخی نییە.

### سوود:

١-(بدعه) لە زمانەوانی دا واتە(ما ليس لَهُ مِثالٌ سابق) واتە: شتێك پێشتر وێنەی نەبووبێ. بەڵام(بدعة) مانای لە شەرعدا واتە(ما لم يدل عليه دليل شرعي) یانی: داهێنراو(بدِعة) مانای لە(شەرع)دا: ئەوەیە کە بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر نەبێت.

٢- فكل من احدث شيئاً ونَسبَهُ الى الدين ولم يكن له دليل فهو بدعةٌ و ضلالةٌ سواء في العقيدة أو في الأقوال او الأفعال.

واتە: هەر یەکێك شتێك دابهێنێ و بیداتە پاڵ ئاینن(دين) هیچ بەڵگەیەکیشی نەبێت، ئەوە داهێنراو(بدعه) و گومراییيە جا ئەو شتە چ لە عەقیدە بێت چ لە گوفتارو کردار بێت.

٢- عن العرباض بن السارية(رضي الله عنه) قال صَلَى بنا رسول الله(ﷺ) ذات يومٍ ثُمَّ أقْبَلَ علينا فوَعَظَنا مَوْعِظَةً بليغةً ذَرَفَتْ منها العيون وَوَجِلَتْ منها القلوبُ فقالَ قائِلٌ: يا رسول الله كأنَّ هذهِ موعظةُ مُوَدّعٍ فَماذا تَعْهَدُ الينا؟ فقال: أُصيكُم بتقوى الله والسَّمع والطَّاعةِ وإنْ عبداً حَبَشِيّاً، فإنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنكم بَعدي فَسَيَرى اختلافاً كثيراً فَعَليكم بِسُنَتي وسُنَّةِ الخُلفاءِ المهدِيِّينَ الرَّاشدينَ تَمَسَّكُوا بها وعضوا عليها بالنَّواجِذِ، وإيّاكم ومُحدثاتِ الأمورِ فإنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدعَةٌ وكُلَّ بِدعة ضلالةٌ. صحيح: رواه أبوداود(٤٦٠٧) والترمذي(٢٦٧٨).

واته: عيرباضي كوڕی ساريه(ڕەزای خوای لیّ بيّت) دەڵیّ: پيّغەمبەر(ﷺ) ڕۆژيّكيان پيّش نويّژی بۆ كردين لە پاشان ڕووی تیّ كردين، ووتاريّكی(فصيح)ی بۆ داين بە هۆی ووتارەكە چاوەكان فرميّسكيان پيّدا هاتە خوارەوە دڵەكان ترسان، جا يەكيّك گوتی ئەی پيّغەمبەری خوا دەڵیّ ی ئەم ووتارە ووتاری ماڵئاواييە، جا چيمان پیّ دەڵيّی: فەرمووی: ئامۆژگاريتان دەكەم لە خوا بترسن و لە فەرمانی دەرنەچن، وە هەروەها گویّ ڕايەڵ بن بۆ گەورەكانتان و لە فەرمانيان دەرنەچن ئەگەرچی قولەرەشيّكی حەبەشيش بيّت بەراستی هەر يەكيّك لە ئيّوە لە دوای من بميّنیّ ناكۆكيەكی زۆر دەبينیّ، جا دەست بە سوننەتی منەوە بگرن، وە هەروەها سوننەتی جیّ نشينەكانم ئەوانەی خوا هيدايەتی داون بۆ حەق و حەقيان ناسيوەو كاريان پیّ كردووە دەستی پيّوە بگرن، بە ددان بيگرن، وە خۆتان بپاريّزن لە شتە داهيّنراوەكان(البدعة) چونكە بيّگومان هەموو شتيّكی داهيّنراو بيدعەيە، وە هەموو بيدعەيەكيش گومڕايی يە.

سوود:

١-مالیکی کوری ئەنەس(رەحمەتی خوای لیّ بیّت) دەلّیّ: مَن ابْتَدعَ في الاسلام بدعةً يراها حسنةً فقد زعم انَّ محمداً(ﷺ) خان الرِّسالةَ لأنَّ الله يقولُ(اَليومَ اَكملتُ لكم دينكم) فَما لَم يكن يومئذٍ ديناً فلا يكون اليومَ ديناً.

واتە: هەر یەکێك لە ئیسلام دا بیدعەیەیەك دابهێنی وە وا تێبگات کە بیدعەیەکی حەسەنەیە، ئەو کەسە وا گومانی بردووە کە پێغەمبەر(ﷺ) خیانەت و ناپاکی لە پێغەمبەرایەتیەکەی کردووە لەبەر ئەوەی خوا دەفەرمووێ(اليومَ أكملتُ لكم دينكم) جا ئەوەی ئەو رۆژە ئایین نەبووبێ ئەمرۆ نابێ بە ئایین، لە زانایانی پێشو هەن بیدعەیان دابەش کردووە بۆ چەند بەش، بەلاّم بە دلّنیاییەوە قسەی ئەوانە راستە کە دەلّێن هەموو داهێنراوێك لە دین بیدعەیە، وە لەو فەرموودەیەی رابرد پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ(وكلّ بدعه ضلالة) جا ئەوەی تۆزێك شارەزایی هەبێت لە زمانی عەرەبی دەزانیّ(كُلّ) واتە هەموو.

٢- دانانی دین و بەرنامەی ژیان بۆ ئادەمیزادەکان تەنها مافی خودایە. خودا مۆلّەتی بە هیچ کەسێك نەداوە لەم بونەوەرەدا کە دەست لەم کارە وەربدات، ئێمە دەزانین کە سەرۆکێك رێبازو قانونێکی دەستکردی پرو پووچ بۆ ژێر دەستەکانی دادەنیّ لە هیچ کەسێك قەبولّ ناکات کە لیّ ی کەم و زیاد بکەن، جا خودا چۆن ئەوە قەبول دەکات. هەر یەکێك هەلّبستیّ لە راستی خۆیەوە شتێك زیاد بکات لەم دینە یا شتێکی لیّ کەم بکات وای لیّ دێت دینی خودا ناناسرێتەوە لە ناو ئەو هەموو بیدعەو بیدعەکاری یە، جا هەر یەکێك کاری بیدعە کاری بکات و بیدعە دابهێنیّ ئەوە دەبیّ بزانی کە دەست لە کارێك وەردەدات کە ئەم کارە تەنها مافی خودایەو تایبەتە بە خوای گەورە.

# چەند نمونەیەك لەسەر بیدعە

١-الدعاء: یەكێك لەو بیدعانەی كە پەیدا بووە دوعا كردنە لە غەیری خودا، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ(الدعاء هو العبادة) واتە: دوعا عیبادەتە، وە عیبادەتیش ئەگەر بۆ غەیری خودا بكرێ شیركە.

٢- نیەت هێنانی بە قسە لە كاتی دەست نوێژ شووشتن و غوسلی جەنابەت و دابەستانی نوێژ ئەمانە هەموو بیدەعەن، چونكە هیچ بەڵگەیەكی شەرعی لەسەر نییەو پێغەمبەر(ﷺ) وای نەكردووە.

٣- یەك سەڵاوات لێ دان لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) لە دوای هەموو بانگێك سوننەتە بۆ خۆت بیڵێی بەڵام ئەوەی ئێستا لە هەندێ شوێن دەكرێ بە دەنگی بەرز سەڵاوات لە دوای بانگەكە دەڵێن ئەمە بیدعەیە بەم شێوە لە شەرع دا نەهاتووە.

٤-(آية الكرسی) لە دوای هەموو نوێژێكی فەرز سوننەتە بخوێنرێ بەڵام لە دوای خوێندنی ئایەتەكە فوو لە دەست كردن و دەست بەلەش داهێنان ئەمانە بیدعەن چونكە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) وا ناڵێ.

٥- پا بەند بوون بە خوێندنی دوعای قونوت لە نوێژی بەیانیان بیدعەیە، هەر موسڵمانێك ئەگەر بەووردی لەم بابەتە بكۆڵێتەوە بۆی دەردەكەوێ كە ئەم دوعایە بیدعەیە.

٦- دەست هێنان بە دیواری كەعبە بۆ (تبرك) بیدعەیە، هەروەكو خەڵكانێك لە كاتی حەج و كاتی تریش ئەم كارە دەكەن بەنەزانی.

## التقوى - پارێزگاری

**پێناسەی(تقوی)**

**١-عومەری کوری عبدالعزیز لە پێناسەی(تقوی) دا دەڵێ:(لیست التَّقوى قيامُ الليل وصيامُ النهارِ والتَّخليط فيما بين ذلك، ولكن التقوى أداءُ ما افترض الله وتَرْكُ ما حرّم اللهُ فإن كانَ معَ ذلك عملٌ فهو خيرٌ إلى خيرٍ)[1]**

**واتە: (تقوی) بریتی نییە لەشەو نوێژو بەرۆژوبوونی سوننەتو تێکەڵاوی کردن لە نێوانیاندا بەڵکو(تقوی) بریتییە لە جێ بەجێ کردنی ئەوەی خوا فەرزی کردووە وە وازهێنان و تەرك كردنی ئەوەی خوا حەرامی کردووە.**

**٢- (راغب الاصفهانی) لە پێناسەی(تقوی) لە رووی شەرعیەوە دەڵێ: (حِفظُ النَّفسِ عمّا يُؤْثِمُ) واتە: خۆپاراستن لەو شتانەی کە پێ ی گوناهبار دەبیت.**

**خوا دەفەرموێ**﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى مَقَامٍ أَمِينٍ ﴿٥١﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٢﴾ يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٥٣﴾ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٥٤﴾ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴿٥٥﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ

---

(1) **جامع العلوم والحكم.**

وَوَقَىٰهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ (الدخان:٥١-٥٧).

واته: بەراستی پارێزکاران لە شوێنێکی بێ ترس دان(٥١) لە ناو باخات و نزیك کانیاوەکان دان(٥٢) لە ئاوریشمی ناسك و ئەستور دەپۆشن ڕووبەڕووی یەکتری دادەنیشن(٥٣) هەروەها(حُورٌ عِين) [1] دەکەینە هاوسەریان(٥٤) لەو بەهەشتەدا هەموو جۆرە میوەیەك داوا دەکەن بێ مەترسی(لە نەبوون و پێ نەدان و دوایی هاتنی و هیچ زیانێك)(٥٥) لە بەهەشتدا هەرگیز مردن ناچەژن جگە لە مردنی یەکەم جار وە(خوا) لە سزای دۆزەخ پاراستوونی(٥٦) ئەمە بەخششێکە لە لایەن پەروەردگارتەوە ئا ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە(٥٧).

وە خوا دەفەرموێ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ﴾ (الحجر:٤٥.....٤٨).

واته: بە ڕاستی خۆپارێزو لە خوا ترسان لە ناو باخات و کانیاوەکان دان(٤٥) (پێیان دەوترێت) بچنە ناویانەوە بە سەلامەتی(لە مردن و هەموو ناخۆشیەك) بە جۆرێ بە ئارامی و بێ باکی و بێ مەترسی(لە هەر شتێك)

---

(1) حور: واتە: ڕەشاییەکەی چاوی زۆر ڕەشە وە سپیاتیەکەی زۆر سپییە(عین) واتە چاو گەورە.

(٤٦) هەر رق و كینەیەك لە دڵیاندا بووبێ دەرمان هێناوە برای یەكترن لەسەر كورسی(٤٧) لەوێدا ماندوو بوونیان تووش نایەت وە هەرگیز لەو(بەهەشتە) دەرناكرێن(٤٨).

وە خوا دەفەرموێ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانًا وَيُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ (الأنفال:٢٩).

واتە: ئەی ئەوانەی كە باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئێوە خۆ لە نا فەرمانی خوا بپارێزن پێتان ئەبەخشێت هۆیەك بۆ جیاكردنەوە(ی ڕاست و ناڕاست) وە گوناهەكانتان دا ئەپۆشێت وە لێتان خۆش دەبێت وە خوا خاوەن بەهرەو چاكەی زۆر گەورەیە.

وە خوا دەفەرموێ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرًا﴾ (الطلاق:٤).

واتە: هەر كەسێك لە بێ فەرمانی خوا خۆی بپارێزێ(خوا) هەموو كارێكی بۆ ئاسان دەكات.

وە خوا دەفەرموێ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَـٰكُمۡ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (الحجرات:١٣).

واتە: ئەی خەڵكینە بێگومان ئێمە دروستمان كردوون لە نێرو مێیەك

وه کردومانن به چهند گهل‌و هۆزهوه بۆ ئهوهی یهکتر بناسن به ڕاستی بهڕێزترینتان لای خوا پارێزگارترینتانه بێگومان خوا زاناو ئاگاداره.

وه خوا دهفهرموێ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ (الحشر:١٨).

واته: ئهی ئهو کهسانهی که بڕواتان هێناوه له خوا بترسن وه ههموو کهسێك با سهرنج بدات(بزانێ) چی پێش خۆی ناردووه بۆ پاشه ڕۆژی وه له خوا بترسن بهڕاستی خوا شارهزایه بهوهی که دهیکهن.

وه خوا دهفهرموێ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُ﴾ (الطلاق:٢-٣).

واته: وه ههر کهسێ له خوا بترسێ و خۆی بپارێزێ لهو شتانهی قهدهغهی کردوون خوا دهروی لێ ئهکاتهوهو ڕێگای دهرچوون له تهنگی بۆ فهراههم ئههێنێ و دهربازی دهکات له خهم و خهفهتی ههردوو جیهان، وه رزق و ڕۆزی دهدات له لایهکهوه که به خهیاڵیدا نههاتووه.

کهواته به تهقوا مرۆڤ دهرگای رزگاری لێ ئهکرێتهوه له گیرو گرفتهکانی دهربازی دهبێت، وه خودا رزق و ڕۆزی پێ دهدات، ئادهمیزاد به هۆی تهقوا بهختهوهر دهبێت له دونیاو له قیامهت.

بهڵام ئینسان ئهگهر بهرهو خوا چوو دهرگای رزگار بوون له نارهحتیهکان زوو نهکرایهوه با پهله نهکات چونکه ئهو وهعدانهی که خودا

داویەتی هەمووی دێتە دی ئەگەر دەرگاشت لێ نەکرایەوە زیاتر بەخۆت دابچۆوە.

١-عن عامرِ بنِ سَعدِ قال: كان سعد بن أبي وقاص في إبلهِ. فجاءَهُ ابنهُ عُمَرُ فلَما رآهُ سعد قال: أعوذ بالله مِن شَرِّ هذا الرَّاكب. فنَزل فقال لَهُ: أنَزَلْتَ في إبِلِكَ و غَنَمِكَ و تَركْتَ الناسَ يتنازعون المُلكَ بينهم؟ فضَربَ سعد في صدرهِ فقال: أُسْكُت، سَمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: إنَّ الله يُحِبُّ العبدَ التَّقِيَّ، الغَنِيَّ ، الخَفِيَّ. رواه مسلم(٢٩٦٥).

واتە: عامری کوری سعد دەڵێ: سعدی کوری ئەبی وەققاص(رەحمەتی خوای لێ بێت) لە ناو حوشترەکانی دابوو، عومەری کوری هاتە لای کاتێك سعد بینی گوتی خۆم دەپارێزم بە خوا لە شەڕی ئەم سوارە، جا عومەر لە وولاخەکەی دابەزی بە سەعدی گوت: تۆ خەریکی حوشتر و مەرەکانتی خەڵکیشت واز لێ هێناوە لە نێوانی خۆیان دا کێشمە کێشی وە دەست هێنانی دەسەلات دەکەن، سەعد دەستی لە سینگیدا فەرمووی: بێ دەنگ بە گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو دەیفەرموو: بێگومان خوا بەندەی پارێزکاری، دڵ‌و دەروون دەوڵەمەندی، شاراوەی خۆش دەوێت.

٢- عن أبي ذر ومعاذ بن جبل(رضي الله عنهما) قالا: قال رسول الله(ﷺ): إتَّقِ الله حيث ما كنت، وأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الحَسَنَةَ تَمْحُها، وخالِقِ الناسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ. حسن: رواه الترمذي(١٩٨٧).

واتە: لە هەر شوێنێکدا بووی لە خوا بترسە، چاکە بە دوای خراپەدا بهێنە(خراپەکە) دەسرێتەوە، وە لەگەڵ خەڵکدا هەستەو دانیشەو رەفتاریان

لەگەڵ دا بکە بە رەوشتێکی جوان.

٣- عن ابي ذر ومعاذ بن جبل(رضي الله عنهما) انَّ النبيَّ(ﷺ) قال: سِتَّةُ أيامٍ، ثُمَّ اعْقِل يا أبا ذر ما يُقالُ لك بعدُ، فَلَمّا كانَ اليومُ السّابِعُ قال: أُصيكَ بتَقوى اللهِ في سِرِّ أمرِكَ وعلانِيَّتِهِ وإذا أَسَأْتَ فَأَحْسِنْ، ولا تَسْأَلَنَّ أحداً شيئاً وإِنْ سَقَطَ سَوطُكَ، ولا تَقْبِضْ أمانَةً. رواه الامام أحمد بإسناد جيد.

واتە: گێردراوەتەوە لە ئەبو زەڕرو موعازی کوری جەبەل(رەزای خوایان لێ بێت) کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: شەش رۆژ چاوەڕوان بکە لە پاشان ئەی ئەبو زەر تێ بگە کە چیت پێ دەگوترێ لە دوای ئەم شەش رۆژە، جا کە رۆژی حەوتەمدا هات فەرمووی: ئامۆژگاریت دەکەم بە پارێزگاری کردن لە کاروباری نەهێنی و ئاشکرات دا وە ئەگەر خراپەت کرد چاکەی بە دوادا بکە وە هەرگیز هیچ شتێك لە کەس داوا مەکە ئەگەر قامچیەکەشت لێ بکەوێت(مەڵێ کەس بمدەوە دەستی) وە هیچ ئەمانەتێکیش وەرمەگرە.

٤- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) من يأخُذُ عَني هؤلاء الكلمات فيعمل بِهنَّ او يُعَلِّمُ من يعمل بِهِنَّ فقال أبوهريرة: فقلت: أنا يا رسول الله فأخَذَ بيدي فَعَدَّ خَمساً وقال: اتَّقِ المحارم تكن أعبد الناس وارْضَ بما قَسَمَ الله لك تكن اغنى الناس وأَحسِنْ الى جارك تكن مؤمناً، وأَحِبَّ للناسِ ما تُحبُّ لِنَفْسِكَ تكن مسلماً ولا تُكثِرِ الضَّحِكَ فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تميت القلب. حسن: رواه الترمذي(٢٣٠٤).

واتە: ابوهريرە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ ئەم ووشانەم لێ وەردەگرێ کاری پێ بکات یا کەسێك فێر بکات کە کاری پێ دەکات؟ ابوهريرە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: گوتم من ئەی پێغەمبەری خوا جا پێغەمبەر(ﷺ) دەستی گرتم و پێنج شتی ژمارد فەرمووی: خۆت بپارێزە لە شتە حەرامەکان دەبیە خواپەرسترین کەس، وە رازی بە بەوەی خوا پێی داوی دەبیە دەولەمەندترین کەس، وە چاکە بکە لەگەڵ جیرانت دەبیە بڕوادار، وە ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ خەڵکیشت پێ خۆش بێت دەبیە موسڵمان، وە زۆر پێ مەکەنە چونکە بێگومان زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێ.

٥- عن ابن مسعود(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) كان يقول: اَللّهُمَّ إنّي أَسأَلُكَ الهُدى و التُّقى والعَفاف والغنى. رواه مسلم(٢٧٢١).

١-العفاف: العفاف والعفة هو التنزه عما لا يباح والكف عنه.

٢- الغنى: الغنى، هنا، غني النفس والاستغناء عن الناس وعما في أيديهم.

واتە: ئەی خودایە داوای هیدایەت و پارێزکاری و پاکی و دارایی باش و دەوڵەمەندیی دڵ و دەروونت لێ دەکەم.

**سوود**:

داود الطائي(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: ما أخرجَ الله عبداً مِن ذُلِّ المعاصي إلى عِز التقوى، إلاّ أغناهُ بلا مالٍ وأعزّه بلا عشيرة وآنَسهُ بلا بشر.

واتە: خودا هیچ بەندەیەکی دەرنەهێناوە لە زەلیلی گوناح و خراپە بۆ پایەبەرزی تەقوا ئیللا دەوڵەمەندی کردووە بەبێ هۆزو عەشیرەت وە

ئاوەدانی بۆ دورست کردووە بەبێ بەشەر وە(ابراهیم الخواص) رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: على قَدر إعزاز المرء لأمرِ الله يلبسهُ الله مِن عِزة ويقيم له العزَّ في قلوب المؤمنين.

واتە: بەقەد ئەوەندەی کە ئینسان فەرمانەکانی خودا بە بەرز دەزانێ، خودا بەرگی رێزو پایەبەرزی دەخاتە بەر، پایەبەرزو بەرێزی دەکات لە دڵی ئیمانداران.

# (الورَعُ) واز هێنان له گوناح و گومان لێكراوەكان

پێناسەی(الورع)

١-ابن تيميه(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ:

(الزُّهدُ: تَرْكُ ما لا يَنفَعُ في الاخرةِ، والورَعُ: تَرْكُ ما تخافُ ضَرَرُهُ في الاخرةِ)[1].

واته:(زُهد) بريتی يه له وازهێنان لەو شتانەی كه سوودی نی يه له دوا رۆژ، وە(ورع)يش بريتی يه له وازهێنان لەو شتانەی كه دەترسی زەرەری هەبێ بۆت له دوا رۆژدا.

٣- له(مُنجد)دا دەڵێ: (الورع): اجتناب المعاصي والشبهات.

واته: وَرَع: يانی: خۆپاراستن له گوناح و شته گومان لێكراوەكان.

٤- (وَرَع) چاوك(مصدر)ە (اسم فاعل)ەكەی (الوَرِعُ)وە.

٢- له(سُبُل السلام)دا دەڵێ: الورعُ: تجنبُ الشبهات خوف الوقوع في محرم.

واته: ورع: بريتی يه له خۆپاراستن له گومان لێكراوەكان له ترسی ئەوەی نەوەك بكەويه ناو حەرام.

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال قال رسول الله(ﷺ) يا أبا هريرة: كُنْ وَرِعاً تكن أعبدَ الناسِ، وكُنْ قَنِعاً تَكُنْ أَشْكَرَ النّاسِ. وأَحِبَّ للناسِ ما تُحِبُّ لِنَفْسِكَ تَكُنْ مُؤمِناً، وأَحْسِنْ جِوار مَنْ

---

(1) جامع العلوم والحكم.

جاوَرَكَ تَكُنْ مُسلِماً، وأَقِلَّ الضَّحِكَ فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ القَلبَ.
صحيح: رواه بن ماجه(٤٢١٧).

واته: ئەی ئەبوهورەیرە:

خۆپارێزەر بە لە گوناهو شتە گومان لێکراوەکان دەبیە خوا پەرسترین کەس، وە قەناعەتت هەبێت دەبیە شوکرانە بژێرترین کەس، وە ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ خەڵکیشت پێ خۆش بێت دەبیە بڕوادار، وە باش بە لەگەڵ جیران و دراوسێت دەبیە موسڵمان، وە کەم پێ بکەنە چونکە بێگومان زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێ.

٢- عن النعمان بن بشير(رضي الله عنهما) قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: إنَّ الحلالَ بَيِّنٌ، وإنَّ الحرامَ بيّنٌ، وبينهما مُشتبهاتٌ لا يَعْلَمُهُنَّ كثيرٌ من الناس، فَمَنِ اتّقى الشُّبهاتِ إستبرأَ لِدينهِ وعِرضِهِ، ومَنْ وَقَعَ في الشُّبهاتِ وَقَعَ في الحرام، كالرّاعي يَرعى حَولَ الحِمى يُوشِكُ أنْ يَرتَعَ فيه، ألا وإنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمىً، ألا وإنَّ حمى اللهِ مَحارِمَهُ، ألا وإنَّ في الجَسَدِ مُضْغَةً إذا صَلَحَتْ صَلَحَ الجَسَدُ كُلُّهُ واذا فَسَدَتْ فَسَدَ الجسدُ كُلُّهُ، ألا وهي القلب. رواه البخاري(٥٢) ومسلم(١٥٩٩).

واتە: بێگومان حەڵاڵ ئاشکرایە وە بێ گومان حەرامیش ئاشکرایە، وە لە نێوان حەلال و حەرامدا چەند شتێکی وێکچویی هەیە، وەك حەرام وایە و وەك حەلال وایە، ئەم شتانە زۆر کەس نایازانن جا هەر کەسێ خۆی بپارێزێ لەشتی شوبهەدارو گومان لێکراو ئەوە ئایینی و ئابرووی پاراستووە، بەڵام ئەوەی بکەوێتە ناو شتی شوبهەدارو گومان لێکراو ئەوە دەکەوێتە ناو حەرامەوە وەك شوانێك وایە کە ئاژەڵەکەی لە دەورووبەری

پاوانێك، واته: لەوەرگەی قەدەغەكراو بلەوەڕێنی نزیك بێ بكەوێتە پاوانەكە، بزانن هەموو پادشایێ شتێكی پاوانكراوی هەیە و سنووری بۆ داناوە، ئاگاداربن پاوانكراوی خوا ئەو شتانەیە كە حەرامی كردوون. ئاگاداربن لە ناو جەستە پارچە گۆشتێك هەیە ئەگەر ئەم پارچە گۆشتە باش بوو، جەستە هەموو باش دەبێت، وەئەگەر خراپ بوو، جەستە هەموو خراپ دەبێت، بزانن ئەم پارچە گۆشتەش دڵە.

٣- عن النَّوَّاسِ بن سمعان(رضي الله عنه) قال: سأَلْتُ رسول الله(ﷺ) عن البِرِّ والأثمِ، فقال: البِرُّ حُسنُ الخُلُقِ والإِثمُ ما حاك[1] في صَدرِكَ، وكَرِهتَ أنْ يَطَّلِعَ عليه الناسُ. رواه مسلم(٢٥٥٣).

واتە: نەوواسی كوری سەمعان(خوای لێ رازی بێت) دەڵێ: لە بارەی چاكەو خراپەوە لە پێغەمبەرم پرسی(ﷺ) جا ئەویش فەرمووی: چاكە رەوشتی جوانە، وەخراپەش ئەوەیە كە لە دڵت دا ئۆقرە نەگرێ و پێشت ناخۆش بێت كە خەڵك پێی بزانن.

٤- عن الحسن بن علي(رضي الله عنهما) قال: حفظتُ من رسول الله(ﷺ): دَعْ ما يَرِيبُكَ الى ما لا يَرِيبُكَ، فإنَّ الصِّدق طُمأنينة، وإنَّ الكَذِبَ رِيبة. صحيح: رواه الترمذي(٢٥١٨).

واتە: واز لەو شتە بێنە كە گومانی لێ دەكەیت، ئەو شتە بكە كە گومانی لێ ناكەی چونكە بێ گومان راستی دڵنیاییە وە درۆش گومان و دوو دڵییە.

---

(1) حاك: أي تحرك فيه و تردد، ولم ينشرح له الصدر وحصل في القلب منه الشك وخوف كونه ذنبا.

## ووتەی ناوداران دەربارەی(ورع).

١-قال سفيان الثوري: ما رايت أسهل من الوَرَع، ما حاك في نفسك فاتْرُكهُ.

واتە: سوفيانی سەوری دەڵێ: ئەم بینیوە ئاسانتر لە(ورع) ئەوەی کە لەدڵت ئۆقرە ناگرێ و دڵت پێ ی ئاوێ ناخواتەوە وازی لێ بێنە.

٢- قال ابراهيم بن ادهم: الوَرَعُ تركُ كُلِّ شبهةٍ، وترك ما لا يعنيكَ هو ترك الفضلات.

واتە: ئیبراهیمی کوری ئەدهەم دەڵێ:(وَرَع) بریتییە لە واز هێنان لە هەموو گومان لێکراوێك وە واز هێنان لە هەموو شتێکی بێ پێویست بۆ دونیاو دوارۆژت کە ئەوەش شتە زیادەکانە.

٣- بە ئیبراهیمی کوری ئەدهەم گوترا: ئەوە بۆچی لە ئاوی زەمزەم ناخۆیتەوە؟ ئەویش ووتی: ترسم لە ئەوە هەیە کە دەولکەکەی ئاوی پێ دەردەهێنن هی سەرۆکەکان بێت.

٤- حەسەنی بەسرایی دەڵێت:( مازالت التقوى بالمتقين حتى تركوا كثيراً من الحلال مخافة الحرام).

واتە: بەردەوام تەقوا لەگەڵ تەقوا داران دایە تا ئەو کاتەی کە واز لە زۆر شتی حەڵاڵ دەهێنن لە ترسی حەرام.

٥- قال بعض الصحابة: كنا ندع سبعين باباً من الحلال مخافة أن نقع في باب من الحرام.

واتە: یەکێك لە ئەسحابەکان گوتویەتی: ئێمە حەفتا دەرگامان لە حەلال واز لێ دەهێنا لە ترسی ئەوەی نەوەك بکەوینە دەرگایەك لە حەرام.

٦- قال بعض السلف: لا يبلغ العبد حقيقة التقوى حتى يدع مالا بأس به حذراً مما به بأس.

واتە: یەکێك لە پێشینەکان گوتویانە: بەندە ناگاتە حەقیقەتی تەقوا تاوەکو هەندێ شت واز لێ نەهێنێ کە هیچی تێدا نی یە لە ترسی ئەوەی نەوەك شتی تێدا بێت.

## گەورەیی خۆش ویستن بۆ خوا:

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: إنَّ رجلاً زار اخاً له في قريةٍ أُخرى فأرصدَ اللهُ له على مدرجته مَلَكاً فَلما أتى عليه قال أين تُريدُ؟ قال: أريدُ اخاً لي في هذهِ القرية. قال: هل لك عليه مِنْ نعمةٍ تَرُبُّها؟ قال: لا غَيرَ أني أحببتهُ في اللهِ عزَّ وجلَّ، قالَ: فإِنّي رسولُ الله اليك بأنَّ الله قَدْ أحبَّكَ كما أحببَتَهُ فيه. رواه مسلم(٢٥٦٧).

١-مَدرجة: طريق، ریگا.

٢- مَلَك: فریشته، بەڵام(مَلِك) واته: پاشا.

٣- تَرُبُّها: تقوم بها وتسعى في صلاحها، واته: پیّ ی هەڵبستیت، وه هەولْ بدەیت چاکی بکەیت.

واته: پیاویّك سەردانی برادەریّکی خۆی کرد لە گوندیّکی تردا، جا خوا فریشتەیەکی نارد بۆ سەر ریّگاکەی و کاتیّك هات بۆ لای پیّی ووت: بۆ کویّ دەچیت؟ ئەویش ووتی: بۆ لای برادەریّکم دەچم لەم گوندەدا. فریشتەکه ووتی: ئایا هیچ بەرژەوەندیەکت هەیه لەگەڵیدا پیّی هەڵبستیت و هەوڵی چاکردنی بدەیت؟ ئەویش ووتی: نەخیّر تەنها ئەوە نەبیّت کە من لەبەر خوا خۆشم دەویّت. فریشتەکە ووتی: جا من نیّردراوی خوام بۆ لای تۆ بۆ ئەوەی پیّت ڕابگەیەنم کەوا خواش تۆی خۆش دەویّت وەك چۆن تۆ ئەوت خۆش دەویّت لەبەر خاتری خوا.

## سوود:

١-خۆش ویستنی یەکتر لەبەر ڕەزامەندی خوا پاداشتی زۆر گەورەی هەیە، با موسڵمان هەوڵ بدات لەم ڕێگایەدا پشکی باشی هەبێت لە کۆکردنەوەی خێرو چاکەو ئەو برادەرانەی لەبەر خوا خۆشی دەوێن لە دەستیان نەدات.

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيّ(ﷺ) سَبعَةٌ يُظلِّهُمُ اللهُ في ظلِّهِ يومَ لا ظلَّ إلاّ ظِلُّهُ:

إمامٌ عادِلٌ، وشابٌ نَشَأَ في عِبادةِ الله عزَّ وجَلَّ، ورَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ بالمساجِدِ، ورجلان تحابّا في الله، اجتمعا عليه، وتَفرَّقا عليه. ورَجُلٌ دَعَتْهُ امرأةٌ ذاتُ مَنْصِبٍ وجمالٍ، فقال: إنّي أخاف الله. ورَجُلٌ تَصَدَّقَ بصَدقَةٍ فأخفاها حتى لا تعلمَ شِمالُهُ ما تُنفِقُ يَمينُهُ. ورَجُلٌ ذكَرَ الله خالياً ففاضَت عيناه. رواه البخاري(١٤٢٣) ومسلم(١٠٣١).

واتە: حەوت دەستە هەن خوا لە ڕۆژی قیامەت دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆی، کە لەو ڕۆژەدا هیچ سێبەر نی یە تەنها سێبەری ئەو نەبێت:

-پێشەوایەکی دادپەروەر.

- وە گەنجێك لە عیبادەت و خوا پەرستیدا پێگەیشتبێ.

- وە پیاوێك دڵی بەسترابێتەوە بە مزگەوت.

- وە دوو پیاو لەبەر خوا یەکتریان خۆش ویستبێ لەسەر ئەم خۆشەویستیە کۆبوونەتەوە وە لە سەریشی جیابوونەتەوە.

- وە پیاوێك ئافرەتێکی خاوەنی پلەو پایەو جوان بانگی بکات(بۆ زینا کردن لەگەڵیدا) جا ئەویش بڵێ: من لە خوا دەترسم.

- وه پیاوێك خێرێك بكات و بیشارێتەوه تا وەكو دەستی چەپی نەزانێ كه دەستی راستی چی بەخشیووه.

- وه پیاوێك كه تەنیایەو كەس نایبینێ یادی خوا بكات و فرمێسك به چاوی دا بێته خوارەوه(له ترسی خوا).

٣- عن ابن مسعود(رضي الله عنه) قال: جاءَ رَجُلٌ إلى رسول الله(ﷺ) فقال: يا رسول الله كيف تقولُ في رجُلٍ احَبَّ قوماً ولَمْ يَلْحَق بِهِم؟ فقال رسول الله(ﷺ) ( المَرءُ مَعَ مَنْ أحَّب. رواه البخاري(٦١٦٩) ومسلم(٢٦٤٠).

واته: عبدالله كوری مسعود(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پیاوێك هاته لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی دەڵێ ی دەربارەی پیاوێك خەڵكانێكی خۆش دەوێت(بەڵام له كردنی كاری باشدا) ناگا بەوان؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پیاو(له رۆژی قیامەت دا) لەگەڵ ئەو كەسەدایه(كه له دونیادا) خۆشی ویستووه.

٤- عن أنس(رضي الله عنه) ان اعرابياً قال لرسول الله(ﷺ) متى السَّاعةُ؟ قال رسول الله(ﷺ): ما أَعْدَدْتَ لها؟ قال حُبُّ اللهِ ورسوله، قال: أنتَ مع مَنْ أحبَبتَ. رواه البخاري(٦١٦٧) ومسلم(٢٦٣٩).

واته: ئەنەس(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەعرابیەك گۆتیه پێغەمبەری(ﷺ) كەی قیامەت دادێ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چیت بۆ ئامادە كردووه؟ عارەبه دەشتەكیەكه گوتی خۆش ویستنی خواو پێغەمبەرەكەی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەوه دای كه خۆشت ویستووه.

٥- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): إنَّ الله يَقولُ يومَ القِيامةِ: أينَ المُتحابُّونَ بجلالي؟ اليومَ أُظِلُّهُم في ظلِّي يومَ لا ظِلَّ إلاّ ظِلِّي. رواه مسلم(٢٥٦٦).

واته: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: بێگومان خودا لە ڕۆژی قیامەت د دەفەرمووێ: کوان ئەوانەی لە دونیادا لەبەر گەورەیی مندا یەکتریان خۆش ویستووە؟ ئەمڕۆ دەیانخەمە ژێر سێبەری خۆم، ئەمڕۆ هیچ سێبەرێك نی یە بێجگە لە سێبەری من نەبێت.

٦- عن معاذ(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: قالَ الله عَزَّ وجَلَّ: المُتحابّونَ في جلالي لَهُم منابرُ من نور يَغْبِطُهُم[1] النَّبيُّون والشُّهداء. صحيح: رواه الترمذي(٢٣٩٥).

الغبطة: ئەوەیە حەز بکەی ئەوەت بۆ ببێ لە نیعمەت وەکو خەڵکان کە هەیانە، بێ لە ناو چوونی نیعمەتی ئەوان.

منابر: کۆی(منبر)ە واتە: دوانگە.

مانای فەرموودەکە:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: خوا (عز وجل) فەرموویەتی: ئەوانەی(لە دونیادا) لەبەر گەورەیی من یەکتریان خۆش دەوێ، بۆ ئەوان هەیە(لە ڕۆژی قیامەت) چەند مینبەرێك لە ڕووناکی(نور) پێغەمبەران و شەهیدان خۆزگەیان پێ دەخوازن.

٧- عن معاذ بن جبل(رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: قال الله تعالى: وَجَبَت مَحَبَّتي لِلْمتحابين فيَّ

(1) الغبطة: تمني مثل ما للغير من الخير.

والمتجالسينَ فيَّ، والمُتزاورينَ فِيَّ، والمُتباذِلين فِيَّ. صحيح: انظر(صحيح الجامع:٤٣٣١).

واته: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: خوای بەرز دەفەرموێ: خۆشەویستی من پێویست بوو بۆ ئەوانەی لە پێناوی مندا یەکتریان خۆش دەوێ، وە ئەوانەی لە پێناوی من دا بە یەکەوە کۆڕ دەبەستن، وەبۆ ئەوانەی کە لەبەر من دا هاموشۆی یەکتری دەکەن، وە بۆ ئەوانەی کە لەبەر من دا شت بە یەکتری دەبەخشن.

٨- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): لا تَدخُلون الجَنَّةَ حَتى تؤمنوا، ولا تُؤمنوا حتَى تحابُوا، أوَلا أدُلُكم على شيءٍ إذا فعَلْتُموهُ تحاببتم أفشوا السَّلام بَينكُمْ. رواه مسلم(٥٤).

واته: ناچنە بەهەشت تا وەکو بڕوا نەهێنن وە باوەڕی تەواویش ناهێنن هەتا یەکتریتان خۆش نەوێ، ئایا شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر کردتان یەکترتان خۆش بوێ؟ سەلام لە نێوانی خۆتان دا بڵاوبکەنەوە.

٩- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: الرَّجُلُ على دينِ خَليلهِ فَلْيَنظُرْ أحَدُكُم مَنْ يُخالِلُ. حسن: رواه ابوداود(٤٨٣٣) والترمذي(٢٣٧٨).

واته: ئینسان لەسەر ئایینی برادەرەکەیەتی، جا با هەر یەکێکتان تەماشا بکا کە کێ دەگرێ بە برادەر.

**سوود**:

یەکێك لە گەورەترین ئەو بەڵگانەی کە ئینسانی پێ بناسرێ کە ئایا چی لە ناخی دایە ئەوەیە بزانە لەگەڵ کێ قسە دەکاو کێ ی خۆش دەوێ، چونکە مرۆۋ لەسەر ئایینی برادەرەکەیەتی، وە باڵندەش لەگەڵ ئەو

باڵندانەدا دەبیت کە وەکو خۆین(الطیور علی اشکالها تقع) کۆتر لەگەڵ کۆترو کەو لەگەڵ کەوی.

١٠- عن المقداد بن معد یکرب(رضي الله عنه) عن النبيِّ (ﷺ) قال: اذا أَحَبَّ الرَّجُلُ اخاهُ فَلْيُخبِرْهُ انَّهُ يُحِبُّهُ. صحيح: رواه ابوداود(٥١٢٤) والترمذي(٢٣٩٢).

واتە: ئەگەر پیاو براکەی خۆش ویست، با هەواڵی پێ بدات کە خۆشی دەوێت.

١١- عن انس بن مالكٍ انَّ رجُلاً كانَ عند النبيِّ(ﷺ) فَمَرَّ به رجُلٌ فقالَ: يا رسول الله إنّي لأُحبُّ هذا، فقال له النبيُّ(ﷺ): أَعْلَمْتَهُ؟ قالَ: لا، قال: أَعْلِمْهُ، قالَ: فَلَحِقَهُ فقال: إنّي أُحبُّكَ في الله. فقال: أحَبَّكَ الذي أحْبَبْتَني لَهُ. حسن: رواه ابوداود(٥١٢٥).

واتە: پیاوێك لای پێغەمبەر بوو(ﷺ) پیاوێکی بەلادا تێپەری، پیاوی یەکەم گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ئەم پیاوەم خۆش دەوێت. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا ئاگادارت کردووەتەوە؟ پیاوەکە ووتی: نەخێر، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پێی بڵێ، ئەویش رۆیشت بە دوای داو پێی گەیشت ووتی: من تۆم خۆش دەوێت لەبەر خوا، ئەویش ووتی: ئەو خوایە خۆشتی بوێ کە منت لە پێناوی ئەودا خۆش دەوێت.

١٢- عن علي(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): لا يُحبُّ رجُلٌ قوماً إلاّ حُشِرَ معهم[1].

واتە: هیچ پیاوێك نییە کەسانێکی خۆش بوێت ئیللا لەگەڵ ئەواندا حەشر دەکرێت.

---

(1) رواه الطبراني في المعجم الصغير(٢/٤٠) و صححه الالباني في صحيح الترغيب والترهيب رقم:٣٠٣٧).

# خۆش ویستنی خوا،
# وه خۆش ویستنی خوا بۆ بەندە:

١-عن أنس(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: ثلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيه وجَدَ حلاوةَ الإيمان: أَنْ يكونَ اللهُ و رسوله أحَبَّ إليه ممّا سِواهما، وأنْ يُحبَّ المرءَ لا يُحِبَّهُ إلاّ لله، وأنْ يَكرَهَ أنْ يعودَ في الكُفرِ كما يَكرَهُ أَنْ يُقْذَفَ في النار. رواه البخاري(١٦) ومسلم(٤٣).

واته: سێ شت له هەر کەسێکدا هەبن شیرینایەتی بڕوای چێژتووە، خوداو پێغەمبەری خوای له هەموو شتێکی تر لەلا خۆشەویستر بێ، وه ئەگەر کەسێکی خۆش ویست خۆشی نەوێ لەبەر خوا نەبێت، وه پێ ی ناخۆش بێت که بگەڕێتەوه بۆ کوفرو بێ بڕوایی هەروەکو چۆن پێی ناخۆشە که فڕێ بدرێتە ناو ئاگر.

**سوود:**

موسڵمان له بازنەی ئیمان دەچێتەدەر به هۆی خۆش ویستنی کەسێك به ئەندازەی خۆش ویستنی خوای گەورە یا زیاتر جا هەر کەسێك بیت.

خوا دەفەرمووێ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ

ٱلْعَذَابِ﴾ (البقره:١٦٥).

واته: وه كەسانى وا هەيه له خەڵكى كه هاوبەشى زۆر بۆ خوا پەيدا دەكەن خۆشيان دەوين وەك خۆشەويستى خوا بەلاّم ئەوانەى بڕوايان هێناوه زۆر زياتر خوايان خۆش دەوێت ئەگەر ببينن ئەوانەى ستەميان كردووه( به هاوبەشى پەيداكردن بۆ خوا) كاتێك كه چاويان دەكەوێت به سزا(ى خوا دەزانن) كه هەرچى دەسەلاّت هەيه هەمووى بۆ خوايه وه بێگومان سزاى خوا زۆر سەختە.

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) إنَّ الله قال: مَنْ عادى لي وَلِيّاً فَقَد آذَنْتُهُ بالحرب، وما تَقَرَّبَ إلي عبدي بشيءٍ أحَبَّ إليَّ مِمّا افْتَرَضْتُهُ عليه، وما يزالُ عبدي يتقربُ إلي بالنوافِل حَتى أُحِبَّهُ فإذا أحببْتُهُ كنتُ سمعهُ الذي يَسمَعُ به وبَصرَهُ الذي يَبصُر بِهِ، ويَدهِ التي يَبْطِشُ بِها ورِجْلَهُ التي يَمشي بِها، وإنْ سَألَني لأُعطِيَنَّهُ، ولئن استعاذ بي لأُعيذَنَّهُ وما ترددتُ عن شَيءٍ أنا فاعِلُهُ تَرَدُّدي عن نفس المُؤمِنِ يَكرَهُ المَوتَ وأنا أكرهُ مَساءَتَهُ. رواه البخاري(٦٥٠٢).

الولي: هو المؤمن التَّقي، واته:(ولي) يانى: ئيمانداريَكى پاريزكارو (مُتَّقى).

آذنته: واته: أعلمته بأني محارب له، يانى: ئاگادارى دەكەمەوه كه من خۆم جەنگى لەگەڵدا دەكەم.

النوافل: سوننەتەكان، وەك: نوێژى سوننەت، رۆژى سوننەت.

استعاذ: خۆى پاراست، پەناى گرت.

ٱلْعَذَابِ﴾ (البقرە:١٦٥).

واتە: وە کەسانی وا هەیە لە خەڵکی کە هاوبەشی زۆر بۆ خوا پەیدا دەکەن خۆشیان دەوین وەك خۆشەویستی خوا بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوە زۆر زیاتر خوایان خۆش دەوێت ئەگەر ببینن ئەوانەی ستەمیان کردووە( بە هاوبەشی پەیداکردن بۆ خوا) کاتێك کە چاویان دەکەوێت بە سزا(ی خوا دەزانن) کە هەرچی دەسەڵات هەیە هەمووی بۆ خوایە وە بێگومان سزای خوا زۆر سەختە.

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) إنَّ الله قال: مَنْ عادى لي وَليّاً فَقَد آذَنْتُهُ بالحرب، وما تَقَرَّبَ إلي عبدي بشيءٍ أحَبَّ إليَّ مِمّا افْتَرَضْتُهُ عليه، وما يزالُ عبدي يتقربُ إلي بالنوافِل حَتى أُحِبَّهُ فإذا أحببْتُهُ كنتُ سمعهُ الذي يَسمَعُ به وبَصرَهُ الذي يَبصُر بِهِ، ويَدهِ التي يَبْطِشُ بِها ورِجْلَهُ التي يَمشي بِها، وإنْ سَأَلني لأُعطيَنَّهُ، ولئن استعاذ بي لأُعيذَنَّهُ وما ترددتُ عن شَيءٍ أنا فاعِلُهُ تَرَدُّدي عن نفس المُؤمِن يَكرَهُ المَوتَ وأنا أكرهُ مَساءَتَهُ. رواه البخاري(٦٥٠٢).

الولي: هو المؤمن التَّقي، واتە:(ولي) یانی: ئیماندارێکی پارێزکارو (مُتَّقی).

آذنته: واتە: أعلمته بأني محارب له، یانی: ئاگاداری دەکەمەوە کە من خۆم جەنگی لەگەڵدا دەکەم.

النوافل: سوننەتەکان، وەك: نوێژی سوننەت، ڕۆژی سوننەت.

استعاذ: خۆی پاراست، پەنای گرت.

ماناى فەرموودەكە:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: خودا فەرموویەتی: هەر کەسێك دوژمنایەتی بکات لەگەڵ دۆستێکی مندا ئاگاداری دەکەمەوە کە من خۆم جەنگی لەگەڵ دا دەکەم، وە بەندەی من بە هیچ شتێك لە من نزیك نابێتەوە کە خۆشەویست تر بێ لام لەوەی لەسەرم پێویست کردووە، وە بەندەی من بەردەوام بە هۆی سوننەتەکانەوە لێم نزیك دەبێتەوە هەتا خۆشم دەوێ، جا ئەگەر خۆشم ویست دەبمە ئەو گوێ یەی کە پێی دەبیستێ و ئەو چاوەی کە پێی دەبینێ و ئەو دەستەی کە پێی لێ دەدا وە ئەو قاچەی کە پێی دەڕوا، وە ئەگەر داوای شتێکم لێ بکات دەیدەمێ وە ئەگەر خۆی پێم بپارێزێ بێگومان دەیپارێزم، وە من لە کردنی هیچ شتێك وەك ئەوە سێ و دوو ناکەم کە لە کێشانی گیانی ئیمان داردا سێ و دوو دەکەم چونکە ئەو حەزی لە مردن نی یە و منیش بێ دڵی ئەوم پێ ناخۆشە.

**سوود**:

١-وەك گوتمان(ولي) واتە:(المُؤمِنُ التَّقِي) یانی: ئیماندارێکی پارێزگار(متقي). وە پارێزگاریش ئەوەیە ئەوەی لە سەری واجبە دەیکاو جێبەجێی دەکا وە ئەوەی لە سەری حەرامە خۆی لێ دەپارێزێ.

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): إنَّ الله إذا أَحبَّ عبداً دعا جبريلَ فقال: إنِّي أُحِبُّ فُلاناً فَأَحِبَّهُ، قال: فَيُحِبُّهُ جبريلُ، ثُمَّ يُنادي في السماء فيقولُ: إنَّ اللهَ يُحِبُّ فُلاناً فَأَحِبُّوهُ، فَيُحِبُّهُ أهلُ السماءِ قال: ثُمَّ يوضَعُ لَهُ القبولُ في الأرض. وإذا أَبغضَ عبداً دعا جبريلَ، فيقولُ: إني أُبغضُ فلاناً فَأَبْغِضْهُ،

قال: فَيُبْغِضُهُ، ثُمَّ يُنادي في أهلِ السَّماءِ: إنَّ اللهَ يُبْغِضُ فلانا فأَبْغِضُوهُ، ثُمَّ تُوضَعُ لَهُ البغضاءُ في الارضِ. رواه البخاري(٣٢٠٩) ومسلم(٢٦٣٧).

واته بێگومان خوا ئەگەر بەندەیەکی خۆش بوێت، بانگی جبریل دەکات دەفەرموێ: من فلانە کەسم خۆش دەوێت تۆش خۆشت بوێ، فەرمووی: جبریل ئەو کەسەی خۆش دەوێ لە پاشان جبریل بانگ دەکات لە ناو خەڵکی ئاسمان دەفەرموێ: بێگومان خوا فلانە کەسی خۆش دەوێت ئێوەش خۆشتان بوێت خەڵکی ئاسمانیش خۆشیان دەوێت فەرمووی: لە پاشان ئەو کەسە وەردەگیری لە دڵی خەڵکی زەوی داو خۆشەویست دەبێت.

وە ئەگەر خوا رقی لە بەندەیەك بێتەوە بانگی جبریل دەکات دەفەرموێ: من رقم لە فلانە کەس دەبێتەوە تۆش رقت لێی بێتەوە فەرمووی: جبریل رقی لێی دەبێتەوە لە پاشان بانگ دەکات لە ناو فریشتەکانی ئاسمان خوا رقی لە فلانە کەس دەبێتەوە جا ئێوەش رقتان لێ ی بێتەوە ئەوانیش رقیان لێی دەبێتەوە، لە پاشان رق لێ بوونەوە لەو کەسە لە دڵی خەڵکی سەر زەوی دادەنرێت.

**سوود:**

١-خوا دەفەرمووێ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا﴾ (مريم:٩٦).

واتە: بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیشیان

کردووه خوای میهرەبان خۆشەویستیان دەکات(لە دڵی باوەڕداران دا).

٢- یەحیای کوری موعاز دەڵێ:(علی قَدر حُبِّك لله يُحِبُّك الخلق، وعلی قدر خَوفِكَ منَ الله يَهابُكَ الخلق).

واتە: بە ئەندازەی خۆشەویستیت بۆ خوا، خەڵك تۆیان خۆش دەوێت، وە بە ئەندازەی ترسانت لە خوا خەڵك لێت دەترسن.

## چاكەی چی بۆ خۆ پێ خۆش بوون بۆ خەڵكانیش

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال: رسول الله(ﷺ): مَنْ يأخُذُ عني هؤلاء الكلمات فَيَعمَلُ بهنَّ او يُعلِّمُ مَن يعمل بِهنَّ فقال ابوهريرة: فقلتُ: أنا يا رسول الله، فأخذ بيدي فَعَدَّ خَمساً وقال: إتَّقِ المحارِمَ تَكُنْ أَعْبَدَ النّاسِ، وارْضَ بِما قَسَمَ اللهُ لَكَ تَكُنْ أغنى الناسِ، وأَحْسِنْ إلى جارك تَكُن مُؤمِناً واَحِبَّ للناسِ ما تُحِبُّ لِنَفسِكَ تَكُنْ مُسْلِماً، ولا تُكثِرِ الضَّحِكَ فَإنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُميتُ القلب. حسن: رواه الترمذي(٢٣٠٥).

واتە: ئەبوهوريرە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ هەیە ئەم ووشانەم لێ وەربگرێ کاری پێ بکات یا کەسێك فێر بکات کە کاری پێ دەکات؟ ئەبو هریرە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: گوتم من ئەی پێغەمبەری خوا، جا پێغەمبەر(ﷺ) دەستی گرتم پێنج شتی ژمارد و فەرمووی: خۆت بپارێزە لە شتە حەرامەکان دەبیە خوا پەرسترین کەس وە رازی بە بەوەی کە خوا پێ ی داوی دەبیە دەولەمەندترین کەس وە چاکە بکە لەگەڵ جیرانت دەبیە بڕوادار وە ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ خەڵکیشت پێ خۆش بێت دەبیە موسڵمان وە زۆر پێ مەکەنە چونکە بێ

گومان زۆر پیٚ کەنین دلٚ دەمریٚنیٚ.

٢- عن عبدالله بن عمرو بن العاص(رضي الله عنهما) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ أحَبَّ أَنْ يُزَحْزَح عن النّارِ، ويَدْخُلَ الجنَة. فَلْتَأْته مَنِيَّتُهُ وهوَ يُؤمِنُ باللهِ واليومِ الآخرِ ولْيَأْتِ الى الناسِ الذي يُحِبُّ انْ يُؤتَى إليه. رواه مسلم(١٨٤٤).

أن يزحزح: أى يبعد، واته: دوور بخريٚتەوه.

المنية: الموت، واته: مردن.

ماناى فەرموودەكە:

هەر كەسيٚك پیٚ ى خۆشە دوور بخريٚتەوه لە ئاگر وە بچيٚتە بەهەشت با كاتیٚ مردنى بۆ ديٚت بڕواى بە خواو بە ڕۆژى دوايى هەبيٚت وە چۆنى پیٚ خۆشە خەڵكى لەگەڵيدا موعامەلە بكەن و بجوليٚنەوە ئەويش وابيٚت لەگەڵ خەڵك.

٣- عن انس(رضي الله عنه) عن النبيَّ(ﷺ) قال: لا يؤمن احدُكم حتى يُحِبُّ لأَخيهِ ما يُحِبُّ لِنفسهِ. رواه البخاري(١٣) ومسلم(٤٥).

واتە: هيچ كەسيٚك لە ئيٚوە بڕواى تەواو نابيٚت تاوەكو ئەوەى بۆ خۆى پيٚى خۆشە(لە تاعەت و عيبادەت و شتە حەڵاڵەكان) بۆ براكەشى پیٚ ى خۆش نەبيٚت.

# باسى سەلام كردن

١-عن عبدالله بن عمرو أنَّ رجلاً سأَلَ رسولَ الله(ﷺ) أيُّ الإسلامِ خَيرٌ قال: تُطعِمُ الطَّعامَ وتقرأُ السَّلامَ على مَنْ عَرفتَ ومَنْ لَم تَعرِف. رواه البخاري(٢٨) ومسلم(٣٩).

واتە: پياوێك پرسيارى لە پێغەمبەر(ﷺ) كرد ووتى: كام كردەوە لە ئيسلامدا پاداشتى زياترە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: خواردن بدەى وە سەلام بكەى لەو كەسەى كە دەيناسى وە لەوەش كە نايناسى.

٢- عن عمران بن الحصين(رضي الله عنهما) قال: جاءَ رَجُلٌ إلى النبيِّ(ﷺ) فقال: السَّلامُ عليكم، فَرَدَّ عليه ثُمَّ جَلَسَ فقال النبيُّ(ﷺ): عَشْرٌ ثُمَّ جاءَ اخَرُ فقال، السَّلامُ عليكم ورحمةُ الله، فَرَدَّ عليهِ فَجَلَسَ فقال: عشرون، ثُمَّ جاء اخَرُ فقال: السلام عليكم ورحمة الله وبركاتهُ، فَرَدَّ عليهِ فَجَلَسَ، فقال: ثلاثون. صحيح: رواه ابوداود(٥١٩٥) والترمذي(٢٦٨٩).

واتە: عيمرانى كورى(حصين) (رەزاى خواى لىٚ بێت ) دەڵىٚ: پياوێك هاتە لاى پێغەمبەر(ﷺ) گوتى(السلام عليكم) پێغەمبەر(ﷺ) وەلامى دايەوە لە پاشان پياوەكە دانيشت، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى (١٠) خێرى گەيشتىٚ، لە پاشان يەكێكى تر هات گوتى(السلام عليكم ورحمة الله) پێغەمبەر(ﷺ) وەلامى دايەوە جا پياوەكە دانيشت، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى(٢٠) خێرى گەيشتىٚ لە پاشان يەكێكى تر هات گوتى(السلام عليكم ورحمة الله وبركاته) پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامى دايەوە جا پياوەكە دانيشت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى(٣٠) خێرى گەيشتىٚ.

**سوود**:

١- سەلام کردن سوننەتە بەڵام وەڵام دانەوەی واجبە جا وەڵام دانەوەی سەلام دەبێ بە شێوەیەکی شەرعی بێت جا کەسێك سەلامی لێ بکەیت بڵێ(اهلا سەرچاوم) یا وەڵامی لەم جۆرانە بداتەوە ئەوە ئەو کەسە وەلامی سەلامی نەداوەتەوەو واجبەکەی لە سەر لا نەکەوتووە.

٢- نەوەوی(رەحمەتی خوای لێ بێت) لە(ریاض الصالحین) لە(باب کیفیة السلام) دا دەڵێ:

ئەو کەسەی کە لە پێشەوە سڵاو دەکات سوننەتە بڵێ: السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته، راناوی کۆمەڵ بەکار بێنێ با سڵاو لێکراوەکەش یەك کەس بێت ئەو کەسەش کە وەڵامی سلاوەکە دەداتەوە بڵێ(وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته) واوی(عطف) لەگەڵ(وعلیکم) دا بڵێ.

٣- وەڵام دانەوەی سەلام فەرزە بە کۆڕای زانایان خوا دەفەرموێ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ۗ﴾(النساء:٨٦).

واتە: وە کاتێك سلاوتان لێ کرا بە سڵاوێك، جا ئێوەش باشتر لەو یا هەروەکو ئەو وەڵامی سڵاوەکەی بدەنەوە.

نووی(رحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەگەر سەلام لە یەك کەس کرا ئەوە فەرزی(عین)ە لەسەری کە وەڵام بداتەوە بەڵام ئەگەر سەڵام لە کۆمەڵێك کرا ئەوە فەرزی(کفایە)یە لەسەریان ئەگەر یەکێکیان وەڵامی سەلامەکەی داوەیەوە فەرزەکە لە سەر شانی ئەوانی تریش لادەچێ.

٤- ئەم سڵاوە داهێنراوانەی کە بەکار دەهێنرێن وەك: بەیانیت باش. ئەو کاتەت باش، ئەمانەو غەیری ئەمانەش جائیز نییە بەکارهێنانیان.

٣- عن الطُّفيل بن أبيٍّ بن كعب أنَّهُ كان يأتي عبدالله بن عمر، فَيَغْدُو مَعَهُ إلى السُّوقِ، قال غَدَونا إلى السوقِ، قال: فاذا غَدَونا إلى السوقِ لَم يَمُرَّ عبدالله على سَقاطٍ ولا صاحِبِ بَيعَةٍ ولا مِسكينٍ ولا احَدٍ إلاّ سَلَّمَ عليه، قال الطفيل: فَجئتُ عبدالله بن عمر يوماً، فاستتبعني إلى السوقِ، فقلت له: ما تصنع بالسوق، وأنت لا تَقِفُ على البَيْعِ، ولا تَسألُ عَنِ السِّلَعِ، ولا تَسُومُ بِها، ولا تَجْلِسُ في مجالسِ السُّوقِ؟ وأقولُ: إجلس بنا هَهُنا نَتَحَدَّثْ فقال يا أبا بَطنٍ وكان الطفيل ذا بَطنٍ، إنّما نَغْدُو من أجلِ السلام، فَنُسَلِّمُ على مَنْ لَقيناهُ. رواه مالك في الموطأ بإسناد صحيح(١٧٩٣).

واته: طفيل(رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت) دەچووە لای عبدالله کوری عومەر(رەزای خوای لیٚ بیٚت) جا لەگەڵیدا دەچووە بازار(طفيل) دەڵیٚ: کاتیٚك کە دەگەیشتینە بازار(عبدالله) بەلای هەر یەکیٚکدا برۆیشتبایە کە شتی کەم نرخی بفرۆشتبا، یا شتی نرخ گرانی بفرۆشتبایە، یا هەژار بوایە، یا هەر یەکیٚك بوایە ئیللا سەلامی لیٚ دەکرد، (طفيل) دەڵیٚ: رۆژیٚکیان چوومە لای(عبدالله) داوای لیٚ کردم کە شویٚنی بکەوم بۆ بازار، جا منیش پیٚم گوت: چی دەکەی لە بازار، تۆ نە شتیٚ دەکریت، وە نە لە کەل و پەلیٚ دەپرسی، وە نە سەودای شتیٚ دەکەی لە بازار وە نە لە کۆری دانیشتنی ناو بازاردا دادەنیشیت؟ جا من دەڵیٚم با لیٚردا دابنیشین بۆ خۆمان قسە بکەین، جا(عبدالله) فەرمووی: ئەی وورگن- طفيل خۆی زگی گەورە بووە- ئیٚمە لەبەر سڵاو کردن دەچین سەلام دەکەین لە هەر کەسیٚك کە پیٚ ی بگەین.

٤- عن أنس(رضي الله عنه) انَّهُ مَرَّ على صِبيانٍ فَسَلَّمَ عليهم وقال: كانَ النبيُّ(ﷺ) يَفعَلُهُ. رواه البخاري(٦٢٤٧) ومسلم(٢١٦٨).

واته: ئەنەسی کوری مالیك(رەزای خوای لێ بێت) بەلای هەندێ منداڵدا رۆیشت سەلامی لێ کردن وە گوتی: پێغەمبەر(ﷺ) وای کرد.

٥- عن ربْعيّ قال: حَدَّثنا رجلٌ من بني عامر أنَّهُ اسْتَأْذَنَ على النبيِّ(ﷺ) وهو في بيتٍ فقال: ألِجُ، فقال النبيُّ(ﷺ) لِخادمِهِ: أُخرجْ إلى هذا فَعَلِّمهُ الإستِئذانَ فَقُل لَهُ: قل: السلام عليكم أأدخُلُ، فَسمعه الرَّجُلُ فقال، السَّلام عليكم أأدخُلُ؟ فَأَذِنَ لَهُ النبيُّ(ﷺ) فَدَخل صحيح: رواه أبوداود(٥١٧٧).

الج: وَلَجَ، يَلِجُ، واتە: چووە ژوورەوە، دەچێتە ژوورەوە.

واته: ریبعی دەڵێ: پیاوێك لە بەنی عامیر بۆی گێرامەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵێکدا بووە ئەویش داوای مۆڵەتی کردووە کە بچێتە لای پێغەمبەر(ﷺ) جا پێغەمبەر(ﷺ) بە خزمتکارەکەی گوتووە: برۆ لای ئەوە فێری مۆڵەت وەرگرتنی بکە بۆ ژوورەوە، جا پیاوەکە گوێی لەم قسەیە بوو گوتی(السلام علیکم) ئایا بێمە ژوورەوە ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی پێدا بێتە ژوورەوە، ئەویش هاتە ژوورەوە.

٦- عن أبي أمامة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) إنَّ أولى الناس بالله مِنْ بَدَأَهُم بِالسَّلام. صحيح: رواه أبوداود(٥١٩٧).

واته: بێگومان نزیکترین خەڵك بە(رەحمەتی) خوا ئەو کەسەیە کە لە پێشدا سلاو لە خەڵکان دەکا.

٧- عن جابر (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ على الماشي والماشي على القاعِدِ والماشيان ايُّهُما بَدَأَ فَهُوَ أَفْضَلُ. رواه البزار وابن حبان في صحيحه.

واته: سوار سەلام لە پیادە دەکا، پیادە سەلام لە دانیشتوو دەکا وە دوو کەس کە دەڕۆن کامیان لە پێش دا سڵاو بکا ئەوە ئەوەیان باشترە.

٨- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ على الماشي، والماشي على القاعد، والقليلُ على الكثير. رواه البخاري(٦٢٣٢) وميلم(٢١٦٠).

واته: سوار سڵاو لە پیادە دەکا، وە پیادە سڵاو لە دانیشتوو دەکا، وە کەم سڵاو لە زۆر دەکا.

٩- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن رسول الله(ﷺ) قال: إذا لَقِيَ احَدُكُم اخاهُ فَلْيُسَلِّم عليهِ، فإن حالَتْ بينَهُما شَجَرَةٌ أو جِدارٌ او حَجَرٌ ثُمَّ لَقيَهُ فَلْيُسَلِّمْ عليهِ. صحيح: رواه أبوداود(٥٢٠٠).

واته: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە گەیشتە برکەی با سەلامی لێ بکات جا ئەگەر دارێك یا دیوارێك یا بەردێکیان کەوتە نێوانو لە پاشان پێی گەیشتەوە با دیسان سەلامی لێ بکاتەوە.

١٠- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: لا تَبدَؤوا اليَهودَ ولا النصارى بالسَّلام فإذا لقيتم أحدَهُمْ في طريقٍ فاضْطَرُّوهُ على أَضْيَقِهِ. رواه مسلم(٢١٦٧).

واته: ئێوە لە پێشدا سڵاو لە دیان و جولەکە مەکەن جا ئەگەر ئێوە گەیشتن بە ئەوان لە ڕێگایەکدا ناچاریان بکەن بۆ تەنگترینی ڕێگاکە.

**سوود:**

ئيمام(نووى) ناوونيشانى بابەتێك لە(رياض الصالحين) بەم شێوەيە دەهێنێتەوە(باب تحريم ابتداء الكافر بالسلام وكيفية الردّ عليهم واستحباب السلام على اهل مجلس فيهم مُسلمون وكفار).

واتە: حەرامە لە سەرەتاوە سڵاو لە كافر بكرێت وە چۆنيەتى وەڵام دانەوەى سڵامى بێ بڕوا وە سوننەتە سەلام كردن لە خەڵكى كۆرێك كە موسڵمان و كافرى تيادا بێت.

١١- عن عائشة(رضي الله عنها) انَّ النبيَّ(ﷺ) قال لها: يا عائشةُ هذا جِبريلُ يَقرأُ عليكِ السَّلام، فقالتْ: وعليه السلام ورحمة الله وبركاتهُ. رواه البخاري(٣٢١٧) ومسلم(٢٤٤٧).

واتە: عائشە(رەزاى خواى لێ بێت) دەڵێ: كە پێغەمبەر(ﷺ) پێ ى فەرمووە: ئەى عائيشە ئەوە(جبريل)ە سەلامت لێ دەكات، ئەويش گوتى: وعليه السَّلام ورحمة الله وبركاته.

١٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): إذا انتهى أَحَدُكُمْ إلى المجلس فَلْيُسَلِّم، فإذا ارادَ أن يَقومَ فَلْيُسَلِّمْ فَلَيَستِ الأولى بأحقَّ مِنَ الآخرةِ. حسن صحيح: رواه ابوداود(٥٢٠٨) والترمذي(٢٧١٥).

واتە: ئەگەر يەكێك لە ئێوە چووە كۆرێكەوە با سەلام بكات وە ئەگەر ويستى هەڵبستێ با سەلام بكات چونكە سەلامى يەكەم حەقتر نى يە لە سەلامى دوايى.

١٣- عن أسامة(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) مَرَّ على مَجْلِسٍ فيه أخلاط من المسلمين والمشركين - عبدة الأوثان واليهود-

فَسَلَّمَ عليهم النبيّ(ﷺ). رواه البخاري(٤٥٦٦) ومسلم(١٧٩٨).

واته: ئوسامه(ڕەزای خوای لیّ بیّت) دەڵیّ: پیّغەمبەر(ﷺ) بەلای کۆڕیّکدا ڕۆیشت موسڵمان و موشریکی تیّدا بوو – بتپەرست و جوولەکە – پیّغەمبەر(ﷺ) سەلامی لیّ کردن.

**سوود**:

جائزە سەلام بکریّ لە کۆمەڵیّ موسلمان و کافری تیّدا بیّت وە مەبەستی موسڵمانەکان بیّت بە سەلامەکەی.

١٤– عن أبي أُمامة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: ثلاثةٌ كُلّهم ضامِنٌ على الله، إنْ عاشَ رُزِقَ وكُفِي، وإن ماتَ أدْخلهُ اللهُ الجنة: مَنْ دخَلَ بيتهُ فَسلَّمَ، فهو ضامِنٌ على الله، ومَنْ خَرَجَ إلى المسجد فَهو ضامِنٌ على الله، ومن خرجَ في سبيل اللهِ فهو ضامِنٌ على الله[1].

واته: خوا کەفیلی سیّ کەس دەکات: بەوەی ئەگەر ژیا ڕزق و ڕۆزی و پیّویستی بۆ دابین دەکات وە ئەگەر مردیش دەیخاتە بەهەشتەوە، یەکیّ بڕواتەوە بۆ ماڵەوە سڵاو بکات، ئەوە زەمانەتی لە سەر خوایە، وە هەر کەسیّك لە ماڵ دەربچیّ بەرەو مزگەوت بۆ نویّژی جەماعەت، ئەوەش زەمانەتی لە سەر خوایە، وە هەر کەسیّکیش لە ماڵ دەرچیّ بۆ جیهادو تیّکۆشان لە ڕیّی خوادا ئەوەش زەمانەتی لەسەر خوایە.

---

(1) رواه أبوداود(٢٤٩٤) والحاكم في المستدرك وصححه ووافقه الذهبيُّ والبيقي في السنن الكبرى، وابن حِبان في (الصحيح) وقال محققة: حديث صحيح، وصححه الشيخ الألباني في(صحيح الترغيب والترهيب:٣١٩).

# باسی زیکر[1]

پێناسەی زیکر:

زیکر بە موتلەقی: نوێژ دەگرێتەوە، خوێندنی قورئان دەگرێتەوە. فێربوون و فێرکردنی قورئان دەگرێتەوە، زانیاری بە سوود دەگرێتەوە، وە هەروەها گوتنی زیکرەکان وەك(لا اله الا الله) وە(الله اكبر) دەگرێتەوە.

## گەورەیی یادی خوا

١-عن ابي الدَّرداء(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) الا أُنبِّئُكم بخير أعمالكم وأزكاها عند مَليككم وأرفعِها في دَرجاتكم وخيرٌ لكم مِن إنفاقِ الذَّهبِ والفِضَّةِ وخيرٌ لكُم مِنْ أنْ تَلْقَوا عَدُوَّكم فتَضرِبوا أَعْناقَهم ويَضْرِبوا اعناقكم؟

قالوا بلى، قال: ذكرُ الله تعالى. صحيح: رواه الترمذي(٣٣٧٧) وابن ماجه(٣٧٩٠).

واتە: ئایا هەواڵتان پێ بدەم بە باشترین کردەوەکانتان وە پاکترینی لە لای گەورەو سەرۆکتان وە بەرزترینی لەبەرز کردنەوەی پلەتاندا، وە چاکتر

---

(1) هەندێ زیکرو یادی خوا هەن لێرە باس نەکراون وەك زیکری ناو نوێژو زیکری پێش سەلام دانەوەی نوێژو زیکری دوای سەلام دانەوە ئەوانە لە باسی نوێژ باس کراون، وە زیکری خواردن و خواردنەوە لە باسی خواردن و خواردنەوە باس کراوە، وە زیکری رۆژی هەینی لە باسی رۆژی هەینی باس کراوە وە هەرەوها.

بێ بۆتان له بەخشینی زێرو زیو، وه چاکتر بێ بۆ ئێوه لەوەی که بگەنه دوژمنەکانتان و له ملیان بدەن و ئەوانیش له ملتان بدەن؟ ئەوانیش گوتیان بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: یادی خوای بەرز.

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) سَبَقَ المُفَرِّدونَ قالوا: وما المُفردون يا رسول الله؟ قال: الذّاكرونَ الله كثيراً والذّاكراتُ. رواه مسلم(٢٦٧٦).

١-المفردون: تاك بووەکان، بۆیه پێیان دەوترێ(تاك بوەوەكان) چونكه به هۆی زۆر یاد كردنی خوا له خەڵكی جوێ بوونەوەو تاق بوونەوە.

ماناى فەرموودەكە:

تاق بوەوەكان پێش- خەڵكی - كەوتوون گوتيان: ئەی پێغەمبەری خوا تاق بوەوەكان كێن؟! فەرمووی پیاوان و ئافرەتانی زۆر خوا له یادن.

٣- عن ابي موسى الأشعري(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: مَثَلُ الذي يذكُرُ ربَّهُ والذي لا يذكُرُهُ مَثَلُ الحَيِّ والمَيِّتِ. رواه البخاري(٦٤٠٧) ومسلم(٧٧٩).

واته: وێنەی ئەو كەسەی یادی پەروەردگاری دەكات و ئەوەی یادی ناكات وەك مردوو و زیندوو وایه.

٤- عن عبدالله بن بُسرٍ(رضي الله عنه) أنَّ رجلاً قال: يا رسول الله إنَّ شرائعَ الإسلامِ قد كَثُرَت عليَّ فأخبرني بشيءٍ أتَشَبَّثُ بهِ قال(لا يَزالُ لِسانُكَ رَطْباً مِنْ ذكر الله. صحيح: رواه الترمذي(٣٣٧٥) وابن ماجه(٣٧٩٣).واتەی ووشه:

١-اتَشَبَّثُ بِهِ: أتَعَلَّقُ بِهِ، واته: دەستی پێوه بگرم.

٢- الرَّطبُ: واته: تەڕ، پێچەوانەكەشی(يابِس)ە واته: ووشك.

**ماناى فەرموودەکە:**

**عبدالله كورى بوسر(رەزاى خواى لىٚ بيٚت) دەڵىٚ: پياويٚك گوتى ئەى پيٚغەمبەرى خوا بيٚگومان ياساكانى ئيسلامم لەسەر زۆر بوون جا هەواڵم بدىٚ بە شتيٚك كە دەستى پيٚوە بگرم، پيٚغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: با بەردەوام زمانت تەڕ بيٚت بە يادى خوا.**

## ناوداران و يادى خوا:

**١-قال معاذ: لأن أذكر الله من بكرةٍ إلى الليل أحبُّ إليَّ مِن ان أحمل على جياد الخيل في سبيل الله من بكرة إلى الليل.**

**واتە: موعاز دەڵىٚ: ئەگەر يادى خوا بكەم لە بەيانى تاوەكو شەو خۆشەويسترە لەوەى سوارى ئەسپ و ماينيٚكى باش بم لە پيٚناوى خوا لە بەيانى تاوەكو شەو.**

**٢- عيكريمە دەڵىٚ: ئەبو هورەيرە رۆژانە دوازدە هەزار زيكرى دەكرد وە دەيگوت من بە قەد گوناهەكانم زيكر دەكەم.**

**٣- حەسەنى بەسرايى كاتيٚك دەست بە تاڵ بووە زۆر زيكرى(سبحان الله العظيم)ى كردووە.**

**٤- ئەبو موسليمى خەولانى زۆر يادى خواى دەكرد هەندىٚ خەڵك بينيان گومانيان بۆ ئەوە برد كە تيٚك چووبيٚت، بە هاوريٚكانى ئەبو موسليميان گوت هاوريٚكەتان شيٚتە؟ ئەبو موسليم گوىٚ ى لىٚ بوو گوتى نەخيٚر ئەى برام، بەڵام ئەوە دەرمانى شيٚتيە.**

**٥- كەعب ووتويەتى(من اكثر ذكر الله بريء من النفاق).**

**واتە: هەر يەكيٚك يادى خوا زۆر بكات ئەو كەسە بەريە لە نيفاق و دووروويى.**

## گەورەیی زیکری بەیانیان و ئێواران:

خوا دەفەرموێ:﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرٗا كَثِيرٗا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾﴾ (الاحزاب:٤١-٤٢).

بكرة: لە زمانی عەرەبی دا بە نێوانی نوێژی بەیانی و ڕۆژهەڵاتن دەوترێ.

(الاصيل)، لە(موختار الصحاح) دا دەڵێ:(الوقت بعد العصر إلى المغرب) واتە: نێوانی عەسرو مەغریب.

مانای ئایەتەکە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە یادی خوا بکەن بە یادێکی زۆر وە بەیانیان و ئێواران بە پاکی بگرن.

وە خوا دەفەرموێ:﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ﴾ (الاعراف:٢٠٥).

١-الغدوة: لە(مختار الصحاح) دا دەڵێ:(ما بين صلاة الغداة و طلوع الشمس) واتە: نێوانی نوێژی بەیانی و ڕۆژ هەلاتن.

٢- الآصال: قال اهل اللغة: جمع أصيل: وهو ما بين العصر والمغرب. واتە:(الآصال) کۆی(اصيل)ە ئەمەش نێوانی عەسرو مەغریبە.

مانای ئایەتەکە:

وە لە(دڵ و) دەروونتدا یادی پەروەردگارت بکە بە گەردن کەچی و ترس و بیمەوە، بەبێ ئەوەی دەنگ بەرز بکەیتەوە لە بەیانیان و لە ئێواراندا وە لەوانە مەبە کە بێ ئاگان.

١-عن انس بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ) لأَنْ أَقْعُدَ مَعَ قوم يَذكرونَ الله تعالى من صلاةِ الغداة حتَّى تطلعَ الشمسُ أحبُّ إلي مِنْ أَنْ أُعْتِقَ أربَعَةً مِنْ وَلَدِ إسماعيل، ولأَنْ أَقْعُدَ مَعَ قومٍ يَذكرون الله مِنْ صلاةِ العصرِ إلى أَنْ تَغْرُب الشَّمسُ أحبُّ إليَّ مِنْ أَنْ أُعْتِقَ أربعة حسن: رواه ابوداود(٣٦٦٧).

واته: ئەگەر لەگەڵ کۆمەڵێکدا دابنیشم زیکری خودا بکەن لە نوێژی بەیانییەوە تا رۆژهەڵاتن لام خۆشەویستترە لەوەی چوار کەس لە مندالأنی(إسماعیل) ئازاد بکەم، وە ئەگەر لەگەڵ کۆمەڵێك دابنیشم زیکری خوا بکەم لە نوێژی عەسرەوە تاوەکو رۆژ ئاوا دەبێت لام خۆشەویسترە لەوەی چوار کەس ئازاد بکەم.

## کاتی ذیکری بەیانیان و ئێواران

أذكارُ الصَّباح يَبْتَدِىءُ وَقْتُها مِنَ الفَجرِ إلى طُلُوعِ الشَّمس، وَ أذكارُ المَساءِ ما بَينَ العَصْرِ وَ الغُروب[1].

واتە: زیکری بەیانیان کاتەکەی دەست پێ دەکات لە بانگی بەیانیەوە تا رۆژ هەلاتن، وە زیکری ئێواران کاتەکەی دەکەوێتە نێوانی عەسرو رۆژ ئاوابوون.

را جیایی(خلاف) هەیە لە نێوان زانایان دا لەسەر کاتی زیکری بەیانیان و ئێواران، بەڵام ئەم دوو کاتەی لێرەدا باس کراوە هیچ(خلاف)ێکی لەسەر نی یە.

وە باشتر وایە ئەم ذیکرانە لە یەکەم کاتی دەستپێکردنیان بکرێن.

(1) فقه السنة.

بەڵام ئەگەر لە کۆتا کاتەکانیش کران واتە پێش ڕۆژ هەڵات و پێش ڕۆژ ئاوا بوون هەر باشەو بۆت بەردەکەوێت. وە دەشتوانی لە کردنی زیکرەکان پاش و پێشیان پیێ بکەی، وە ئەگەر کات و ڕۆژگاری وات بەسەردا هات کە بێ تاقەتی ڕووی تێ کردی ئەو کاتە ئەوەندەی پێت بکرێ لەم زیکرانە بیکە، وە هەر کاتێکیش کە بێتاقەتیەکەت نەما ئەوە هەوڵ بدە بە تەواوی زیکرەکان بکەی، لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە(ﷺ) کە بەهەشتیەکان داخ لەسەر ئەم کاتانە دەخۆن کە لە دونیادا بەسەریان دا ڕۆیشتووەو لە کاری خێرو عیبادەت بەسەریان نەبردووە.

## زیکری بەیانیان و ئێواران

## ئەم زیکرە بەیانیان یەك جار دەکرێ:

| |
|---|
| اَللهم بِكَ أَصْبَحْنا، وبِكَ أَمْسَينا، وبِكَ نَحيا وبِكَ نَموت، وإليكَ النُّشور.<br>واتە: ئەی خودایە بە هۆی تۆوە بەیانیمان کردەوە، وە بەهۆی تۆوە ئێوارەمان کردەوە، وە بەهۆی تۆوە دەژین، وە بەهۆی تۆوە دەمرین، وە دەگەڕێینەوە بۆ لای تۆ. |

## ئەم زیکرەش ئێواران یەك جار دەکرێ:

| |
|---|
| اَللهُمَ بِكَ أَمْسَينا، وبِكَ أَصبَحنا، وبِكَ نَحيا، وبِكَ نَموتُ، وإليكَ المصيرُ.<br>ئەی خودایە بە هۆی تۆوە ئێوارەمان کردەوە، وە هۆی تۆوە بەیانیمان کردەوە، وە بەهۆی تۆوە دەژین، وە بەهۆی تۆوە دەمرین، وە دەگەڕێینەوە بۆ لای تۆ. |

١-عن أبي هريرة قال: كانَ رَسول الله(ﷺ) يُعَلِّمُ أصحابهُ يقول:(اذا أَصبَحَ أحدكم فليَقُلْ: أَللهمَّ بِكَ اصبَحنا، وبك أَمسَينا. وبِكَ نَحيا، وبِكَ نَموت، وإليك النُّشور، واذا أمسى فَلْيَقُل: أَللهُمَّ بَك أَمسَينا، وبِكَ أَصبَحنا، وبِكَ نَحيا، وبِكَ نَموتُ وإليكَ المَصيرُ). صحيح: رواه ابوداود(٥٠٦٨) والترمذي(٣٣٨٨).

واته: ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لیّ بیّت) دەڵیّ: پیّغەمبەر(ﷺ) ئەسحابەکانی فیّر دەکرد، دەیفەرموو: ئەگەر یەکیّك لە ئیّوە بەیانی کردەوە با بڵیّ: أَللهمَّ بِكَ أصبَحنا، وبِكَ أَمسَينا، وبِكَ نَحيا، وبِكَ نَموت، وإليك النُّشور.

وە ئەگەر ئیّوارەسشی کردەوە با بڵیّ: أَللهُمَّ بَكَ أَمسَينا، وبِكَ أَصبَحنا. وبِكَ نَحيا، وبِكَ نَموتُ وإليكَ المَصيرُ.

بەیانیان یەك جارو ئیّوارانیش یەك جار خویّندنی(ایهُ الكرسى).

قال رسول الله(ﷺ):

(مَنْ قالها حينَ يُصبِحُ أُجيرَ مِنَ الجنِّ حتّى يُمسي، ومَنْ قالها حينَ يُمسي أُجيرَ مِنهمْ حتى يُصْبِحَ) اخرجهُ الحاكم وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب.

واته: هەر یەکیّك(ايه الكرسى) بخویّنیّ کاتیّك کە بەیانی دەکاتەوە دەپاریّزریّ لە جنۆکە تا وەکو ئیّوارە دەکاتەوە، وە هەر یەکیّکیش بیخویّنی کاتیّك کە ئیّوارە دەکاتەوە دەپاریّزریّ لە جنۆکە تاوەکو بەیانی دەکاتەوە.

بەیانیان سێ جارو ئێوارانیش سێ جار خوێندنی
سوورەتی(اخلاص) و(فلق) و(ناس)

٣- عن عبدالله بن خبيب(رضي الله عنه) قال: خرجنا في ليلةٍ مَطيرةٍ وظُلمةٍ شديدةٍ نطلبُ رَسولَ اللهِ(ﷺ) يُصَلّي لنا، قال: فأَدْرَكتُهُ فقال:(قل) فلم أقل شيئاً، ثُمَّ قال:(قل) فلم أقُل شيئاً قال:(قل) فقلتُ: ما أَقولُ؟ قال: قل:(قل هو الله أحدٌ)، والمعوِّذَتين حينَ تُمسي و تُصْبحُ ثلاث مرّات تَكفيكَ مِنْ كلِّ شيءٍ). حسن: رواه أبوداود(٥٠٨٢) والترمذي(٣٥٧٥).

واتە: عبدالله کوری خوبەیب(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ لە شەوێکی باراناوی زۆر تاریکدا رۆیشتین بە دوای پێغەمبەردا دەگەراین بۆ ئەوەی پێش نوێژیمان بۆ بکات، جا عبدالله دەڵێ بە پێغەمبەر گەیشتم فەرمووی بڵێ، منیش هیچم نەگوت، لە پاشان فەرمووی بڵێ، منیش هیچم نەگوت، فەرمووی بڵێ گوتم چی بڵێم. فەرمووی بڵێ(قل هو الله احد) وە(فلق) و(ناس)یش بخوێنە کاتێك کە ئێوارە دەکەیتەوە وە کاتێکیش کە بەیانی دەکەیتەوە سێ جاران هەموو زیان خراپەیەکت لێ لا دەدەت(تدفع عنك كل سوء).

بەیانیان(١٠٠) جار ئێوارانیش(١٠٠) جار بڵێ ی(سبحان الله وبحمده).

٤- عن أَبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ قالَ حِينَ يُصْبحُ وحِينَ يُمسي: سبحانَ اللهِ وبحمدهِ مِئَةَ مَرَّة لَم يأْتِ أحدٌ يومَ القيامةِ بأفضَلَ مما جاءَ بهِ، إلاّ أحَدٌ قالَ مِثْلَ ما قالَ

أو زادَ) رواه مسلم(٢٦٩٢).

سبحان الله وبحمده: پاكی بۆ خواو ستايش بۆ وی.

مانای فەرموودەكە: هەر يەكێك كاتێك كە بەيانی دەكاتەوە وە كاتێكيش كە ئێوارە دەكاتەوە سەد جاران بڵێ(سبحان الله وبحمده) كەس نايێ لە ڕۆژی قيامەت شتێكی لە ئەو باشتری هێنا بێ تەنها يەكێك نەبيت وەكو ئەوی گوتبی يا زياتر.

## سوود:

عن جابر(رضي الله عنه) أَنَّ رسول الله(ﷺ) قال:(مَن قال سُبحانَ الله وبحمده فِي يومٍ مائَةَ مَرَّةٍ حُطَّتْ خطاياه وإن كانت مِثل زَبَدِ البحر). رواه البخاري(٦٤٠٥).

واتە: هەر يەكێك لە ڕۆژێكا(١٠٠) جار بڵێ(سبحان الله وبحمده) گوناهەكانی دەسرێنەوە ئەگەر وەكو كەفاوی دەرياش بێت.

> (١٠) جار بەيانی(١٠) جاريش ئێواران گوتی(لا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير.

٥- عن أبو أيوب الأنصاري(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ قال غُدوةً لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير. عشر مرّات كتبَ الله له عشر حسنات، ومحا عنه عشر سيِّئات وكُنَّ لَهُ بِقَدر عَشرِ رِقابٍ، وأجارهُ

الله من الشيطان، ومن قالها عشيةً مثل ذلك)[1].

غُدوةً: بەیانی(ما بين صلاة الغداة وطلوع الشمس) یانی: نێوانی نوێژی بەیانی و ڕۆژهەڵاتن.

عَشيةً: نێوانی نوێژی(مغرب) و عشا، زوهری دەڵێ(العشيُّ) ما بين زوال الشمس وغروبها، ئەم فەرموودەیە لە ڕیوایەتی(امام احمد هاتووە دەڵێ: فإن قالها حين يمسي).

واتە: واتە هەر یەکێك لە کاتی بەیانی دا دە جاران بڵێ: لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير. خوا دە چاکەی لە بۆ دەنوسی وە دە خراپەی لێ دەسرێتەوە وە بۆی دەبنە مایەی پاداشتێك بە ئەندازەی ئازاد کردنی دە کۆیلە وە خوا دەیپارێزی لە شەیتان، وە هەر یەکێکیش کاتی ئێوارەکەش ئەم دە جارە بڵێ هەمان ئەو چاکانەی بۆ هەیە.

یەك جار بەیانیان یەك جاریش ئێواران گوتنی(لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير).

٦- عن أبي عَيَّاش أنَّ رسول الله(ﷺ) قال:(مَنْ قالَ إذا أصبحَ: لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير، كانَ لَهُ عِدلُ رَقَبَةٍ من ولَدِ اسماعيل، وكُتبَ له عشر حسنات، و حُطَّ عنهُ عَشرُ سيِّئاتٍ، و رُفِعَ له عشرُ درجاتٍ، وكانَ

---

(1) رواه النسائي في عمل اليوم والليلة برقم(٢٤) وقال الألباني في(سلسلة الصحيحة) رقم(١١٣): وهذا إسناد صحيح رجاله ثقات رجال مسلم غير قران هذا وهو ثقة. وانظر(صحيح الترغيب والترهيب:٢٧٢/١)

في حِرزٍ مِنَ الشيطانِ حتى يُمسيَ، وإن قالها إذا أَمسى كانَ لَهُ مثل ذلك حتى يُصبحَ).

قال في حديث حَمّاد: فرأى رجلٌ رسول الله(ﷺ) فيما يرى النائمُ فقال: يا رسول الله إنَّ أبا عياش يُحدِّثُ عنك بكذا وكذا قال(صدقَ أَبو عياش). صحيح: رواه ابوداود(٥٠٧٧ والترمذي(٣٨٦٧).

واته: هەر یەکێك کاتێ کە بەیانی دەکاتەوە بڵێ(لا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير). بە ئەندازەی ئازاد کردنی بەندەیەك لە نەوەکانی(اسماعیل) پاداشتی بۆ دەنوسرێ، وە دە چاکەی بۆ دەنوسرێ، وە دە خراپەی لەسەر لا دەبرێ، وە دە پلەی بەرز دەکرێتەوە، وە پارێزراو دەبێ لە شەیتان تاوەکو ئێوارە دەکاتەوە. وە ئەگەر کاتێکیش کە ئێوارە دەکاتەوە بیڵێ ئەو خێرو بێرانەی بۆ هەیە تاوەکو بەیانی دەکاتەوە، لە ریوایەتی(حماد) دا دەڵێ: پیاوێك پێغەمبەری(ﷺ) لە خەودا بینی، گوتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەبو عیاش فەرموودەیەکی ئاواو ئاوا لە تۆ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەبو عیاش راست دەکات.

> ١٠٠ جار بەیانیان گوتنی: لا إله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير.

٧- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله(ﷺ) قال: لا إله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير، في يومٍ مِئَةَ مَرَّةٍ كانت لَهُ عَدلَ عشرِ رِقابٍ، وكُتبتْ لَهُ

مئةُ حَسنةٍ، ومُحيت عنهُ مئَةُ سَيِّئةٍ، وكانت لَهُ حِرزاً من الشيطانِ يومَهُ ذلكَ حتى يُمسيَ، ولَمْ يأتِ أحَدٌ بأفضَلَ ممّا جاءَ بِهِ، إلاّ أحَدٌ عَمِلَ أكثَرَ مِنْ ذلك. رواه البخاري(٣٢٩٣) ومسلم(٢٦٩١).

واتە: هەر یەکێك لە ڕۆژێکا(١٠٠) جاران بڵێ(لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير) بە قەد ئازاد کردنی دە بەندە پاداشتی بۆ دەنوسرێ، وە(١٠٠) چاکەی بۆ دەنوسرێ، وە(١٠٠) خراپەی لێ دەسرێتەوە، وە بۆی دەبنە پارێزەرێك لە شەیتان ئەو ڕۆژەی تا وەکو ئێوارە، وە هیچ کەسێك نایێ(لە قیامەت) کارێکی لەو باشتری هێنا بێت مەگەر یەکێك لە ئەو زیاتری کردبێت.

**سوود**:

ئەم زیکرە تەنها بەیانیان سەد جار دەگوترێ موسڵمان دەتوانێ کە بانگی بەیانی دا هەر لە ڕێ ی چوونە مزگەوت و لە کاتی چاوەڕوانی کردنی نوێژی بەیانی ئەم زیکرە بکات ئەوەش کە پێرانەگەیشت لە دوای نوێژ تەواوی بکات.

٨- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ أبابكرٍ الصِّدِّيقَ(رضي الله عنه) قال: يا رسول الله مُرْني بكلماتٍ أقولُهُنَّ إذا أصبحتُ وإذا أمسيتُ، قال: قُلْ:(اَللهمَّ فاطِرَ السَّماوات والأرضِ، عالِمَ الغيبِ والشَّهادةِ، رَبَّ كُلِّ شيءٍ ومَليكَهُ، اشهدُ ان لا إله إلا انت،اعوذُ بكَ مِن شَرِّ نَفسي و شَرِّ الشيطانِ وشِركِهِ) قالَ: قُلها إذا اصبحتَ، وإذا أمسَيتَ، وإذا أخَذتَ مَضْجِعَكَ. صحيح: رواه ابوداود(٥٠٦٧)

والترمذي(٣٣٩٢).

فاطر: داهێنەر.

ومليكه: أي: مالكه، یانی: خاوەنی.

وشرِكهِ: أي ما يدعو اليهِ من الإشراك بالله. یانی: لەوەی کە بانگی بۆ دەکات لە شەریك پەیدا کردن بۆ خوا.

واتە: ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەبوبەکر(خوای لێ رازی بێت) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا هەندێ ووشەم پێ بفەرموو بەیانیان و ئێواران بیڵێم: ئەویش فەرمووی: بڵێ:(اللهمَّ فاطرَ السَّماوات والأرضِ، عالمَ الغيبِ والشَّهادةِ، ربَّ كُلِّ شيءٍ ومَليكَهُ، أشهدُ أن لا إله إلا أنت،أعوذُ بكَ من شرِّ نَفسي و شرِّ الشيطانِ وشِركه).

واتە: ئەی خودایە داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانای پەنهان و ئاشکرا، پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێك، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوی بە ڕاستی نی یە بێجگە لە تۆ، خۆم دەپارێزم بە تۆ لە شەری نەفسم وە لە شەری شەیتان و ئەوەی بانگی بۆ دەکات لە شیرك. جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە بڵێ کاتێ کە بەیانی دەکەیتەوە، وە کاتێك کە ئێوارە دەکەیتەوە وە کاتێکیش کە دەچیتە ناو جێگای نوستن.

٩- عن ابن بُريدة عن أبيه عن النبيِّ(ﷺ) قال: من قال حينَ يُصبحُ أو حين يُمسي: واتە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەر یەکێك کاتێك کە بەیانی دەکاتەوە یا کاتێك کە ئێوارە دەکاتەوە بڵێ:

اللهمَّ أنت ربّي لا اله إلاّ أنت خلقتني وأنا عبدكَ وأنا على عَهدك ووعدِكَ ما اسْتَطعت، أعوذ بك من شرِّ ما صنعتُ، أبوءُ بنعمَتك أبوء بِذَنبي فَاغفر لي إنَّهُ لا يغفرُ الذُّنوب إلا أنت). فماتَ من يومه أو من ليلته

دَخلَ الجنّة[1].

واتە: لە ڕۆژەکەی دا بمرێ یا لە شەوەکەی دەچێتە بەهەشت.

## سوود:

١-لە ریوایەتی بخاری لە بری(أبوءُ بنعمتك) (أبوءُ لكَ بنعمتك عليَّ) هاتووە، وە لە بری(إنَّهُ) فَإنَّهُ) هاتووە.

٢- مانای زیکرەکە: ئەی خودایە ئەتۆ پەروەردگاری منی، هیچ پەرستراوێکی بە ڕاستی نی یە بێجگە لە تۆ، منت دورست کردووە وە منیش بەندەی تۆم، وە من بە پیێ ی توانا لەسەر ئەو پەیمان و بەڵێنەم کە بە تۆم داوە، خۆم دەپارێزم بە تۆ لە خراپە و زیانی ئەوەی ئەنجامم داوە لە گوناح، دان دەنێم بە نازو نیعمەتەکانت، وە دان دەنێم بە گوناهەکانم، جا لێم خۆش بە، چونکە بە ڕاستی جگە لە تۆ هیچ کەسێك نیە لە گوناهان خۆش بیت.

١٠- عن أبي الدَّرداء(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَن صلَّى عليَّ حين يُصبحُ عشراً، و حين يُمسي عشراً، ادركتهُ شفاعتي يوم القيامة. حسن: رواه الطبراني انظر(صحيح الجامع:٦٣٥٧).

واتە: هەر یەکێك دە سەڵەواتم لەسەر بدات کاتێك کە بەیانی دەکاتەوە، وە کاتێکیش کە ئێوارە دەکاتەوە دە جاران، تکاو شەفاعەتی منی پێ دەگات لە ڕۆژی قیامەت دا.

---

(1) صحيح: رواه ابو داود(٥٠٧٥) و هذا لفظهُ والبخاري(٦٣٠٦) عن شداد بن اوس.

## سوود:

ئـەم دە سـەڵەواتە ئەگـەر وەكـو سـەڵەواتى نـاو نوێـژ بگـوترێ واتـە: سەڵەواتى ئيبراهيمى باشترە.

١١- عـن عثمـان بـن عفـان(رضـي الله عنـه) قـال: قـال رسـول الله(ﷺ) ما مِن عبدٍ يقولُ في صباحِ كلِّ يومٍ و مساءِ كُلِّ ليلةٍ: بسم الله الـذي لا يَـضُرُّ مـع اسْـمِهِ شـيءٌ في الارض ولا في الـسَّماء وهـو الـسَّميعُ العليم، ثـلاث مَـرات، إلاّ لم يَـضُرَّه شـيء. حـسن صـحيح: رواه ابوداود(٥٠٨٨) والترمذي(٣٣٨٨).

واتە: هەر بەندەيەك(عەبدێك) بەيانى هەموو رۆژێك وە ئێوارەى هـەموو شـەوێك سـێ جـاران بڵـێ:( بـسم الله الـذي لا يَـضُرُّ مـع اسْـمِهِ شـيءٌ في الارض ولا في الـسَّماء وهـو الـسَّميعُ العلـيم)، هـيچ شـتێك زيـانى پـێ ناگەيەنى.

١٢- عن عبدالله بـن عمـر(رضـي الله عنهمـا) لم يكـن الـنبيّ(ﷺ) يَدَعُ هؤلاء الكلمات حين يُمسى و حين يُصبح: اللهمَّ إنـي اسألك العافية في الدنيا والاخرة، اللهم إني أسألك العَفْوَ والعافيـة في ديـني ودنيـاي وأهلـي ومـالي، اللـهم استُرْ عـوراتي وآمِـنْ روعـاتي، اللـهم احْفَظني من بينِ يَدَيَّ و مِنْ خَلْفي و عـن يَمـيني وعـن شمـالي ومِـنْ فَــوقِي واعــوذُ بِعظَمَتِــكَ اَنْ اُغتــالَ مِــنْ تَحــتي. صــحيح: رواه أبوداود(٥٠٧٤) والنّسائي وابن ماجه.

١-العافية: السلامه، بێ وەيى.

٢- عوراتي: عەيبەكانم.

٣- روعاتي: ترسەکانم.

٤- أُغتال: رۆ بچم بە ناخی زەوی دا،(الخسف).

واتــە: عبــدالله کــوری عومــەر(رەزای خوایــان لــێ بێــت) دەڵــێ: پێغەمبــەر(ﷺ) ئــەم ووشــانەی واز لــێ نــەدەهێنان کاتێــك کــە ئێــوارەی دەکردەوە وە کاتێکیش کە بەیانی دەکردەوە(**اللهمَّ إني اسألُكَ العافية في الدنيا والآخرة، اللهم إني أسألُك العَفْوَ والعافية في ديني ودنياي وأهلي ومالي، اللهم استُرْ عوراتي وآمِنْ روعاتي، اللهم احْفَظني من بينِ يَدَيَّ و مِنْ خَلْفي وعن يَميني وعن شمالي ومِنْ فَوقِي وأعوذُ بِعظَمَتِكَ أنْ أُغتالَ مِنْ تَحتي**).

واتە: ئەی خودایە من داوای بێ وەیت لێ دەکەم لە دونیاو دوارۆژ، ئەی خودایە من داوای لێبوردن و بێوەیت لێ دەکەم بۆ دین و دونیاو کەس و کارو ماڵم، ئەی خودایە عەیب و عارم داپۆشە، وە ترسەکانم مەهێڵە، ئەی خودایە بمپارێزە لە پێشمەوەو لە دوامەوە، وە لە راست و چەپمەوە وە لە سەروومەوە، وە خۆم دەپارێزم بە گەورەیی تۆوە لەوەی کە رۆ بچم لە ژێرمەوە( بە ناخی زەوی دا).

یەك جار بەیانیان و یەك جارانیش ئێواران گوتنی ئەم زیکرە(یاحيُّ یا قیوم برحمتِكَ أستغيثُ، أصلحْ لِي شأني كُلَّهُ و لا تكلْني إلى نفسي طَرفةَ عين).
واتە: ئەی زیندووی هەڵسوڕێنەری بوونەوەر، بەبەزەیت داوای فریاکەوتن دەکەم هەموو کاروبارێکی(دونیاو دوا رۆژم) بۆ چاك بکە، بۆ چاو لێك نانێك مەمدەرە دەستی نەفسی خۆم.

١٣- عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) لفاطمة: ما يَمنَعك أنْ تقولي اذا أصبحتِ و اذا امسيتِ: يا حيُّ يا قيوم بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغيثُ، أصلِحْ لي شَأني كُلَّهُ، ولا تكلْني إلى نفسي طَرفةَ عَين. رواه النَّسائي والبزار والحاكم وصححه، ووافقه الذهبي.

واته: پێغەمبەر(ﷺ) بە فاتیمەی فەرموو: چی مەنعت دەكات كاتێك كە بەیانی دەكەیتەوە وە كاتێكیش كە ئێوارە دەكەیتەوە بڵێ ی(یا حيُّ یا قیوم بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ، أصلِحْ لي شَأني كُلَّهُ، ولا تكِلْني إلى نفسي طَرفة عَين).

**سوود**:

ئەم دوعایە دوعایەكی شاملە هەموو خێرو بێرەكانی دونیاو قیامەت دەگرێتەوە، با موسڵمان هەوڵ بدات جگە لەم دوو كاتە لە كاتی تریش ئەم دوعایە بكات.

١٤- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: من قال حِينَ يُمسي ثلاثَ مراتٍ: أعوذُ بِكلِماتِ الله التَّاماتِ مِنْ شَرِّ ما خَلَقَ، لَمْ يَضُرَّهُ حُمَةٌ تِلكَ الليلةَ. صحيح رواه النسائي(٥٩٠) في(عمل اليوم والليلة) والترمذي (٣٦٠٤).

واته: هەر یەكێك كە ئێوارە دەكاتەوە سێ جاران بڵێ: أعوذُ بِكلِمات الله التَّاماتِ مِنْ شَرِّ ما خَلَقَ.

لەم شەوەدا هیچ زەهرێك زەرەری پێ ناگەیەنێ. (وەك زەهری مارو دوپشك و ئەم جۆرانە).

**سوود**:

١-مانای زیکرەکە: خۆم دەپارێزم بە ووشە تەواوەکانی خوا( کە قورئانە) لە زیانی ئەوەی دروستی کردووە.

٢- حُمَه: هەموو زیندەوەرێك کە زەهری هەبێت وەك: دووپشك و مارو لەم جۆرانە.

٣- ئەم زیکرە تەنها ئێواران سێ جار دەکرێ بەیانیان ناکرێ.

٤- لێرە داواکراوە کە خۆ بپارێزرێ بە کەلامی خوا، کەواتە کەلامی خوا سیفەتی خوایە، مەخلوق نی یە، ئەگەر مەخلوق بوایە خۆی پێ نەدەپاراسترا.

١٥- عن امِّ المؤمنينَ جُويرية بنت الحارث( رضـي الله عنها) أنَّ النبيَّ(ﷺ) خَرَج مِنْ عندها بُكرةً حينَ صلّى الصبح وهي في مسجدها، ثُمَّ رجعَ بعدَ أن أضحى و هي جالسةٌ فقال: ما زِلتِ على الحالِ التي فارقتُكِ عليها؟ قالت: نعم، فقال النبيُّ(ﷺ) لقد قُلتُ بعْدَك أربعَ كلماتٍ ثلاثَ مرّاتٍ، لَوْ وزنَتْ بما قُلْتِ مُنذُ اليوم لوَزَنَتْهُنَّ، سبحانَ الله وبحمده عددَ خلقه، ورضا نفسه، وزنةَ عرشِهِ ومدادَ كلماتهِ، وفي روايةٍ لَهُ(سُبحانَ الله عدد خلقه، سبحان الله رضا نفسهِ، سبحان الله زِنَةَ عرشِهِ، سبحانَ الله مداد كلماته)[1].

---

(1) رواه مسلم(٢٧٢٦) و(ابوداود(١٥٠٣) والترمذي(٣٥٥٠).

**مانای ووشه:**

١-في مسجدها: موضع صلاتها، شوێنی نوێژ کردنی.

٢- اضحی: دخلَ في وقت الضحی، چووه ناو کاتی چێشتەنگاوەوە.

٣- لوزنتهنّ: لساوتهنّ في الاجر والفضل، بەرامبەر دەبن لە پاداشت.

٤- عدد خلقه: بە قەد ژمارەی دورستکراوەکانی خودا.

٥- ورضا نفسهِ: وە ئەوەندەی خودا خۆی پیێ ی رازی بێت.

٦- وزنة عرشه: وە بە قەد سەنگی عەرشی خودا.

٧- ومداد کلماته: وە قەد ئەندازەی مەرەکەبی کەلیمەو ووشەکانی خوا.

**مانای فەرموودەکە:**

دایکی ئیمانداران جوەیریەی کچی حارث(رەزای خوای لیێ بێت) کە خێزانی پێغەمبەر بووە(ﷺ) دەفەرمووێ: بەیانیەکی زوو پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی بەیانی کردو دەرچووە دەرەوە، منیش لەو کاتەدا لە شوێنی نوێژکردنم دا بووم، لە پاشان لە چێشتەنگاودا هاتەوە، هێشتا من لەو شوێنەی خۆم دا دانیشتبووم، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تۆ هێشتا لەو بارو حالەتەدای کە من بەجێم هێشتووی لەسەری؟ گوتم بەلێ، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: من لە دوای تۆ چوار ووشەم گوتووە سیێ جار. ئەگەر هەڵبکێشرێن لەگەڵ ئەوەی کە تۆ کردووتە بە درێژیی ئەو ماوەیە هەردوولا بەرامبەر دەوەستن(سبحانَ اللهِ وبحمده عددَ خلقهِ، ورضا نفسه، وزنَةَ عرشهِ ومدادَ کلماتهِ) وە لە ریوایەتەکی تری(مسلم) بەم شێوەیە هاتووە:(سُبحانَ اللهَ عدد خلقهِ، سبحان الله رضا نفسه. سبحان الله زِنَةَ عرشهِ، سبحانَ الله مِداد کلماته).

کەواتە بەم دوو شێوەی لای سەرەوە بە ئارەزووی خۆت دەتوانی بەیەکێکیان بخوێنی، وە ئەم زیکرە تەنها بەیانیان دەکریێ.

## زیکری شەوو زیکری نوستن

١-عن ابي مسعود البدري عن النبيِّ(ﷺ) قال: مَنْ قرأ بالآيتين مِن آخِرِ سورةِ البقرة في ليلةٍ كفتاهُ. رواه البخاري(٥٠٠٩) ومسلم(٨٠٨).

واتە: هەر یەکێك لە شەوێکدا دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی(البقره) بخوێنێ بەسیەتی( لە قیام اللیل)وە گوتراویشە بەسیەتی بۆ پارێزران لە شەڕو زیانی ئەم شەوە.

**سوود**:

١-شەو کاتەکەی دەست پێ دەکات لە بانگی ئێوارە تا بانگی بەیانی.

٢- دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی(بقرة) دەست پێ دەکات لە﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ﴾ تا کۆتایی سورەتەکە.

٢- عن جابر قال: كان النبيُّ (ﷺ)،لا ينام حتَّى يقرأ بـ(تَنزيل) السجدة و بـ(تبارك). صحيح: رواه الترمذي(٣٤٠٤).

واتە: جابر دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) نەدەنوست تا وەکو سورەتی سەجدەو(ملك)ی نەخوێندبایەوە.

**سوود**:

١-عن عبدالله بن مسعود قال: من قرا(تبارك الذي بيده الملك) كُلَّ ليلةٍ مَنَعهُ اللهُ من عذاب القبر. رواه النّسائي واللفظ له والحاكم

وقال صحيح الاسناد.

واته:(ابن مسعود) دەڵێ: هەر یەکێك هەموو شەوێ(تبارك الذي بيده الملك) بخوێنێ، خوا لە ناو قەبردا عەزابی نادات.

٢- عن ابن مسعود قال: قال: رسول الله(ﷺ): سورةُ تبارك هي المانعة من عذاب القبر. صحيح: انظر(صحيح الجامع:٣٦٤٣).

واته: خوێندنی سورەتی(تبارك) رێگرە لە عەزابی قەبر.

٣- عن حذيفة قال: كان النبيُّ(ﷺ) اذا نام قال: اللهمّ باسمك أحيا وأموت. واذا استيقظ قالَ: الحمد لله الذي أحيانا بعد ما أماتنا و إليه النُّشور. رواه البخاري(٦٣١٤) و مسلم(٢٧١١) وأبوداود(٥٠٤٩).

واته: حوزەیفە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر نووستبا دەیفەرموو(اللهمّ باسمكَ احيا وأموت) واته: ئەی خودایە بە ناوی تۆ دەژیم و دەمرم، وە ئەگەر بەخەبەر بهاتبایە دەیفەرموو(الحمد لله الذي احيانا بعد ما اماتنا و إليه النُّشور) واته: هەموو سوپاس ستایشێك بۆ ئەو خوایەی کە زیندووی کردوینەوە دوای ئەوەی کە ئێمەی مراندبوو، وە هەر بۆ لای ئەوە گەڕانەوە.

٤- عن حَفْصَةَ زوج النبيِّ(ﷺ) أنَّ رسول الله(ﷺ) كانَ إذا اراد أن يرقُدَ وضعَ يدهُ اليُمنى تحتَ خدِّهِ ثُمَّ يقولُ:(اللهمَّ قني عذابكَ يومَ تبْعث عبادَكَ) ثلاث مرار[1].

---

(1) رواه ابوداود(٥٠٤٥) ئەلبانی دەڵێ ئەم فەرموودەیە(صحيح)ە، بەڵام(ثلاث مرار)ی لەگەڵ دا نەبێت، واته گوتنی یەکجار ئەم زیکرە بە(صحيح)ی هاتووە.

واتە: حەفسەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) بیویستبا پاڵ بداتەوە دەستی راستی لە ژێر رووەمەتی دادەناو لە پاشان دەیفەرموو(اللهمَّ قِني عذابكَ يومَ تبعَثُ عبادَكَ) سێ جار ئەمەی دەفەرموو. (بەڵام گوتمان تەنها گوتنی یەك جار بە(صحيح)ی هاتووە).

**سوود**:

١-ئەم فەرموودەیە لە(سنن الترمذي) بە(صحيح)ی هاتووە لە فەرموودەی ژمارە(٣٣٩٨) باسی یەك جار گوتنی زیکرەکە دەکات.

٢- مانای زیکرەکە: واتە: ئەی خودایە بمپارێزە لە عەزابت لەو رۆژەی کە بەندەکانت زیندوو دەکەیەوە.

٥- عن علي((رضي الله عنه) انَّ رسولَ الله(ﷺ) قالَ لَهُ ولِفاطمة: إذا أَخَذْتُما مضاجِعَكما فكَبِّرا اللهَ اربعاً وثلاثين، واحمدا ثلاثاً وثلاثينَ، وسَبِّحَا ثلاثاً وثلاثين. رواه البخاري(٣١١٣) ومسلم(٢٧٢٧).

واتە: ئیمامی عەلی(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەو و فاتیمەی فەرمووە: ئەگەر چوونە ناو جێگای نووستن(٣٤) جار بڵێن(الله اكبر) وە(٣٣) جار بڵێن(الحمد الله) وە(٣٣) جار بڵێن(سبحان الله).

٦- عن عائشة: أنَّ النبيَّ(ﷺ) كانَ اذا أوى الى فِراشِهِ كُلَّ ليلةٍ جمعَ كفَّيهِ ثُمَّ نَفَثَ فيهما فقَرأ فيهما:﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ و﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ و﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ ثُمَّ يَمسحُ بهما ما استطاعَ مِن جسده، يبدأُ بِهما على رأسهِ ووجههِ، وما أقبَلَ مِنْ جَسدهِ، يفعلُ ذلك ثلاث مَرّات. رواه البخاري(٥٠١٧) وابوداود(٥٠٥٦).

النَّفثُ: نفخٌ لطيف بلا ريق، واته: فووەكی نەرم بەبیٚ تف.

واتـە: عائـشە(ڕەزای خـوای لـیٚ بیٚـت) دەڵـیٚ: پیٚغەمبـەر(ﷺ) ئەگـەر بچووبایە ناو جیٚگای نووستن هەموو شەویٚ هەردوو دەستی پیٚكەوە دەنـاو لـە پاشـان فـووەكی نـەرمی تـیٚ دەكـرد ئینجـا سـورەتی(إخـلاص) و(فلـق) و(نـاس)ی تیـادا دەخویٚنـد، لـە پاشـان هـەردوو دەسـتەكانی دەهیٚنـا بەسـەر جەستەی دا ئەوەندەی پیٚ ی بكرایە یەكەم جار سەرو دەم و چاوی مەسح دەكـرد لەگـەڵ پیٚـشەوەی جەسـتەی دا وە ئەمەشـی سـیٚ جـار دووبـارە دەكردەوە.

٧- عن الحارث بن جبلة قال: قلتُ يا رسول الله عَلِّمني شيئ أقولُهُ عند منامي قال: إذا أخذت مَضجعك من الليل فاقرأ ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ فإنها براءةٌ من الشِّرك. حسن: رواه أحمد في المسند(٢٧٨٩٤).

واتە:(حارث بن جبلة) دەڵیٚ: گوتم ئەی پیٚغەمبەری خوا شتیٚكم فیٚر بكـە لـە كـاتی نوسـتن دا بیلـیٚم، فـەرمووی: ئەگـەر چـوویە نـاوی جیٚگـای نووسـتن﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ بخویٚنـە، چـونكە بیٚگومـان ئـەم سوورەتە بەریبوونە لە شیرك و هاوبەش.

## سوود:

یـەكیٚكی تـر لـە سـوننەتەكانی خـەوتن خویٚنـدنی(اية الكرسي)یـە، هـەر یەكیٚك لە كاتی نووستن(اية الكرسي) بخویٚنی، شەیتان نزیكی ناكەویٚتـەوە

تا بەیانی دەکاتەوە هەروەکو لە(صحیح)ی بوخاری دا هاتووە(٤/٤٨٧) بەڵام فەرموودەکە درێژ بوو بۆیە نەقل نەکرا.

٨- عن البراء بن عازب قال: قال رسول الله(ﷺ) إذا أتيت مَضجعك، فتوضَّأْ وضوءَك للصلاةِ، ثُمَّ اضطَجِع على شِقِّك الأيمنِ وقُل:

واتە: ئەگەر چویە ناو جێگای نووستن، دەست نوێژ بشۆ وەك ئەو دەست نوێژەی بۆ نوێژ دەیشۆی، لە پاشان لەسەر لای راست پاڵ بدەوەو بڵێ:(أللهم أسلمتُ نفسي إليكَ، وفوَّضتُ أمري إليك، وألجأتُ ظهري إليك، رهبةً ورغبةً إليك، لامَلجأ ولا مَنجا منك إلاّ إليك، آمنتُ بكتابِك الذي انزلتَ، وبنبيِّك الذي أرسلت).

فَإن مُتَّ مُتَّ على الفطرة، فاجْعَلْهُنَّ آخِرَ ما تقول. رواه البخاري(٦٣١١) ومسلم(٢٧١٠).

واتە: ئەگەر(ئەم زیکرە بکەی و) بمری ئەوە لەسەر ئیسلام دەمری، وە ئەم زیکرەش لە کۆتایی زیکرەکانت دا بکە.

## سوود:

(صحیح)ی بخاری(٧٥٦٣) فەرموودەیە بە دووبارەوە بۆ نمونە ئەم فەرموودەیە لە(صحیح)ی بخاری پێنج جار دووبارە بویتەوە هەمووشیان لە بەرراء ریوایەت کراوە، وە هەموو فەرموودەکانیش بە یەك شێوە نەهاتوون، ئەمەش ژمارەی فەرموودەکانە لە بخاری(٢٤٧ - ٦٣١١ - ٦٣١٣ - ٦٣١٥ - ٧٤٨٨).

# گەورەیی زیکری(لا اله الله وحده لا شریك له.....)

١-عن عمرو بن شعیب عن ابیه عن جده انَّ النبيَّ(ﷺ) قال: خیرُ الدعاء دعاءُ یوم عرفة، وخیرُ ما قلتُ أنا والنبیون من قَبلي: لا إله الا الله وحدهُ لا شریك له لهُ الملكُ وله الحمد وهو على كل شيء قدیر. حسن رواه الترمذي(٣٥٨٥).

**واته: باشترین پارانەوە پارانەوەی ڕۆژی عەرەفەیە وە باشترین شتێ کە من و پێغەمبەرانی پێش من ووتومانە:( لا إله الا الله وحدهُ لا شریك له لهُ الملكُ وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدیر)ە.**

٢- عن ابي ایوب الأنصاري(رضي الله عنه) عن النبيِّ قال: منْ قال: لا إله الا الله وحدهُ لا شریك له لهُ الملكُ وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدیر، عشْرَ مرّات كانَ كمَنْ أعْتَقَ أربعةَ أنْفُسٍ منْ ولد إسماعیل. رواه مسلم(٢٦٩٣).

**واته: هەر یەكێك دە جاران بڵێ(لا إله الا الله وحدهُ لا شریك له لهُ الملكُ وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدیر) وەكو ئەوە وایە كە چوار بەندە(عبد)ی ئازاد كردبێ لە مندالانی(اسماعیل) پێغەمبەر.**

## سوود:

**١-ئەم زیكرە لەگەڵ ئاسانیەكەی پاداشتێكی زۆری لە بەرامبەر دا هەیە، فەرموودەكەش(صحیح)ە و(مسلم) ریوایەتی كردووە.**

**٢- ئەم زیكرە هەر دەمێ بتەوێ بیكەی دەتوانی بیكەی كاتی گوتنەكەی سنووردار نی یە.**

**٣- لەم فەرموودەیەدا باسی ئازاد كردنی چوار بەندەی تیایە لە**

منـدالأنی(اسماعیـل) جـا بـۆ ئـازاد کردنـی یـەك بەنـدە پێغەمبـەر(ﷺ) دەفەرموێ(مَن اعْتَقَ رَقَبَةً مُؤمنةً، اعْتَقَ اللهُ بِكلِّ إربٍ[1] مِنها إرباً منهُ مِنَ النار[2].

٣- عن البراء بن عازب(رضي الله عنه) ان رسول الله(ﷺ) قال: مَنْ مَنَحَ مَنيحَةَ وَرِقٍ أو مَنيحة لَبَنٍ أو هَدَى زُقاقاً فهو كعِتاقِ نَسَمَةٍ، ومَنْ قالَ: لا إله الا الله وحدهُ لا شريك لـه لـهُ الملكُ ولـه الحمـد وهـو على كل شيءٍ قدير فهو كعِتقِ نَسمةٍ[3].

واتە: هەر یەکێك قەرزێك بدات یا حەیوانێکی شیردار بدا بە یەکێك و سوود لە شیرەکەی وەربگرێ و لە پاشان بۆی بگێڕێتەوە، یا ڕێگایەك بە کوێرێك یا سەرگەردانێك نیشان بدات ئەوە وەکو ئەوە وایە عەبدێکی ئازاد کردبێت. وە هەر یەکێکیش بڵێ(لا إله الا الله وحدهُ لا شريك له لهُ الملكُ وله الحمد وهو على كل شيءٍ قدير) ئەوەش وەکو ئازاد کردنی بەندەیەك وایە.

سوود:

١-گـەورەیی سـەد جـار گـوتنی ئـەم زیکـرە لـە باسـی زیکـر لـە بەشـی زیکری بەیانیان و ئێواران باس کراوە، وە هەروەها هەر لەم بەشە باسی گوتنی(١٠) جار و(١) جاریش ئەم زیکرە لە کاتی بەیانیان و ئێواران باس کراوە.

---

(1) الإرب: هو العضو، واتە: ئەندام.

(2) رواه مسلم(١٥٠٩) عن ابي هريرة.

(3) قال المنذري في الترغيب والترهيب: رواه احمد وراته محتج بهم في الصحيح، وە(ترمـذي) بەشـی یەکـەمی ئـەم فـەرموودەی ڕیوایـەت کـردووە بـە ژمارە(١٩٥٧) ئەلبانیش دەڵێ(صحيح)ە.

٢- ده جار گوتنی ئەم زیکرە بە زیادکردنی(یحي و یمیت) لە باسی نوێژ لە بەشی زیکر لە دوای سەلام دانەوەی نوێژە فەرزەکان باس کراوە.

## زیکری چوونە ناو بازار:

١-عن عمر بن الخطاب(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: مَنْ دَخَلَ السُّوقَ فقال: لا إله الا الله وحدهُ لا شريك له لهُ الملكُ وله الحمد، يحي ويميتُ، وهوَ حَيٌّ لا يموتُ، بيده الخير وهو على كل شيءٍ قدير، كَتَبَ الله لهُ ألفَ حسنةٍ ومحا عنهُ ألفَ سَيِّئَةٍ ورَفَع له ألفَ ألف دَرَجَة[١]. حسن: رواه الترمذي(٣٤٢٨).

واتە: هەر یەکێك چووە بازار بڵێ: لا إله الا الله وحدهُ لا شريك له لهُ الملكُ وله الحمد، يحي ويميتُ، وهوَ حَيٌّ لا يموتُ، بيدهِ الخير وهو على كل شيءٍ قدير، خودا هەزار هەزار خێری بۆ دەنوسێ(واتە یەك ملیۆن) وە هەزار هەزار گوناحی لێ لادەبا، وە هەزار هەزار پلەی بەرز دەكاتەوە.

**سوود:**

ئیمام نووی(رەحمەتی خوای لێ بێت) لە پەرتووكی(الأذكار) (باب ما يقول اذا دخل السوق)دا دەڵێ: وزاد الحاكم في بعض طرقه: قال الراوي: فقدمت خراسان فأتيتُ قُتيبة بن مسلم فقلت: اتيتُكَ بِهديَّةٍ فَحَدَّثْتُهُ بالحديث فكانَ قتيبة بن مسلم يركب في موكبهِ حتى ياتيَ السوقَ فيقوله ثُمَّ ينصرف.

واتە:(حاكم) دەگێڕێتەوە دەڵێ: یەكێك لە گێڕەرەوەكانی ئەم فەرموودە

(1) رواه الترمذي(٣٤٢٤) والحاكم واحمد وحَسَّنَهُ الألباني.

دەڵێ: چوومە خۆراسان جا چوومە لای(قتیبة)ی کوڕی مسلم پێم گوت دیاریەکم بۆ هێناوی جا ئەو فەرموودەیم بۆ گێڕاوە، جا(قتیبة) شواری ووشترەکەی دەبوو دەچووە بازارو ئەم زیکرەی دەکردو لە پاشان دەگەڕایەوە.

## گەورەیی زیکری(لا حول ولا قوة إلا بالله):

١-عن قيس بن سعد بن عبادة(رضي الله عنهما) انَّ اباهُ دفعهُ إلى النبيِّ(ﷺ) يخدمُه قال: فمرَّ بي النبيُّ(ﷺ) وقد صليتُ فضربني برِجْله وقال: ألا أدُلُّك على بابٍ من أبواب الجنة؟ قلتُ: بلى، قال: لا حول ولا قوة إلا بالله. **صحيح: رواه الترمذي(٣٥٨١).**

**واتە:** قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: باوکم منی بردە لای پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی خزمەتی بکەم، قەیس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بە لام دا تێپەری لەو کاتەدا نوێژم تەواو کردبوو پێیەکی لێ دام و فەرمووی: ئایا دەرگایەك لە دەرگاکانی بەهەشتت نیشان بدەم؟ گوتم بەڵێ، فەرمووی(لا حول ولا قوة إلا بالله).

### سوود:

ا-مانای(لا حول ولا قوة إلا بالله) واتە:(لا تحوُّل من حال إلى حال ولا قوة على ذلك، إلاّ بالله) یانی: گۆڕان نی یە لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر، وە توانا نی یە بۆ ئەم گۆڕان کاریە مەگەر بە خوا نەبێت.

ب- مانایەکی تری ئەم زیکرە: لادان نی یە لە خراپەو توانا نی یە بۆ چاکە بە خوا نەبێت.

(لا حول في دفع الشَّر ولاقوة في تحصيل الخير إلاّ بالله).

ئەگەر ويست و دەسەلاّتی خوا نەبێت ئێمە ناتوانین خۆبپارێزین لە هیچ گوناهێك و هیچ چاكەیەك ئەنجام بدەین.

ج- كنز: واتە: خەزنە، یا گەنجینە.

٢- عن ابي موسى(رضي الله عنه) قال: قال لي رسول الله(ﷺ): الا أَدُلُّكَ على كنزٍ من كُنوز الجنةِ. فقلت: بلى يا رسول الله، قال: لا حول ولا قوة إلا بالله. رواه البخاري(٢٩٩٢) ومسلم(٢٧٠٤).

واتە: ئەبو موسا دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) پێ ی فەرمووم: ئایا خەزنەیەك لە خەزنەكانی بەهەشتت پێ نیشان بدەم؟ گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: لا حول ولا قوة إلا بالله.

**سوود:**

١-(كنز) كۆیەكەی(كنوز)ە، بەو خەزنەو ماڵ و سامانە دەگوترێ كە پێش ئیسلام خەڵكی لە ژێر گڵ و بن بەردو كەڵەك و ئەشكەوت دا شاردوویاننەوەو پەنهانیان كردوون.

٢- (كنز من كنوز الجنة) واتە: موسڵمان بە هۆی گوتنی ئەم زیكرە پاداشتێكی بە نرخی لە بەهەشت بۆ پاشەكەوت دەكرێ.

٣- عن ابي ذرّ قال: قال رسول الله(ﷺ) ألا أَدُلُّك على كنزٍ من كنوزِ الجنةِ؟ قلت: بلى يا رسول الله، قال: لا حول ولا قوة إلا بالله صحيح: رواه ابن ماجة(٣٨٢٥).

واتـە:(ابـو ذر) دەڵـێ: پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: ئایـا خەزنەیـەك لـە خەزنـەكانی بەهەشـتت نیـشان بـدەم؟ گـوتم: بـەڵێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا، فەرمووی(لا حول ولا قوة إلا بالله).

# زیكری
# (سبحان الله والحمدلله ولا اله الا الله والله أكبر)

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قـال رسـول الله(ﷺ) لأَن أَقـولَ: سـبحان الله، والحمـدلله، ولا إلـه الا الله، والله اكـبر، أحـبُّ إلَيَّ ممّا طَلَعَت عليه الشمسُ. رواه مسلم(٢٦٩٥).

واته: سوێندم به خوا ئەگەر بڵێم(سـبحان الله، والحمـدلله، ولا الـه الا الله والله اكبر) لام خۆشەویستره لەوەی كه رۆژی بەسەردا هەڵدێ.

**سوود:**

مانای ئەم زیكرانه بەم شێوەیه:

١-سـبحان الله: خـوا پـاك و بـێ گـەردە لـە هـەموو كـەم و كوریـەك و ناتەواویيەك.

٢- الحمدلله: هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ خوا.

٣- لا اله الا الله: هیچ پەرستراوێكی بە ڕاستی نی یە بێجگه له خوا.

٤- الله اكبر: خوا گەورەترە(لە هەموو شتێك).

٢- عـن جـابر(رضـي الله عنــه) قـال: سمعـت رسـول الله(ﷺ) يقـول: أفْـضَلُ الـذِّكرِ: لا الـه الا الله. حـسن: رواه الترمـذي(٣٣٨٣) وابن ماجه(٣٨٠٠).

واته: گەورەترین زیکر گوتنی (لا اله الا الله)ە.

یا(لا اله الا الله) گەورەترین یادی خوایه.

٣- عن سعد بن ابي وقاص(رضي الله عنه) قال كنا عند رسول الله(ﷺ) فقال:(أَيَعْجِزُ أَحَدُكم ان يَكسِبَ كلَّ يوم ألف حسنةٍ، فسأله سائلٌ من جلسائِهِ: كيف يكسبُ أحدنا ألف حَسَنَةٍ؟ قالَ:(يُسبّح مئَة تَسبيحةٍ، فَيُكتَبُ لهُ ألفُ حَسَنَةٍ ويُحَطُّ عنُ ألفُ خطيئَةٍ. رواه مسلم(٢٦٩٨) والترمذي(٣٤٦٣).

واتە: ئەوە یەکێك لە ئێوە ناتوانێ هەموو ڕۆژێ(١٠٠٠) چاکە بە دەست بێنێ، پرسیارکەرێك لە دانیشتوان پرسیاری کرد: چۆن یەکێك لە ئێمە(١٠٠٠) چاکە بە دەست بێنێ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (١٠٠) جار(سبحان الله)دەڵێ، (١٠٠٠) چاکەی بۆ دەنوسرێ، وە(١٠٠٠) گوناحی لێ لا دەبرێ.

٤- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) أَنَّ النبيَّ(ﷺ) مَرَّ به وهو يَغرِسُ غَرْساً، فقالَ: يا أبا هريرة، ما الذي تغرسُ؟ قلتُ غِراسا. قال: ألا أَدُلُّك على غراسٍ خيرٍ من هذا؟ سبحان الله والحمد لله. ولااله الاالله، والله أكبر، تُغْرَسُ لك بكُلِّ واحدةٍ شجرةٌ في الجنة صحيح: رواه ابن ماجه(٣٨٠٧).

واتە: ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بە لام دا تێپەری لەو کاتە نەمامێکم دەچاند، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە ئەوە چ دەچێنی؟ گوتم لقە دارخورمایەکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا نەمامێکت نیشان بدەم باشتر بێت لەوە(سبحان الله والحمدلله ولا اله الا الله والله اکبر) بە گوتنی هەر یەکێکیان دارێکت لە

بەهەشت بۆ دەچێنرێ.

٥- عن أُمَّ هانيءٍ قالت: أتيتُ الى رسول الله(ﷺ) فقلتُ يا رسول الله دُلَّني على عملٍ، فإني قد كبرتُ وضَعُفتُ وبَدُنتُ، فقال: كبرِّي الله مئَةَ مَرَّةٍ، واحمدي الله مئَةَ مَرَّةٍ، وسبِّحي الله مئَةَ مَرَّةٍ خيرٌ من مئَةِ فَرسٍ مُلْجَمٍ مُسْرَجٍ في سبيل الله، وخيرٌ من مئَة بدنَةٍ وخيرٌ من مئَةِ رَقبةٍ. حسن: رواه ابن ماجة(٣٨١٠).

واتە: (أم هانيء) دەڵێ: چوومە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا کردەوەیەکم پێ نیشان بدە، چونکە بێگومان من گەورە بووم و بێ هێز بووم و قەڵەو بوویمە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (١٠٠)جار بڵێ الله اکبر، وە (١٠٠) جار بڵێ (الحمد لله) وە(١٠٠) جار بڵێ(سبحان الله)، باشترە لە(١٠٠) ئەسپ و ماینی لغاوکراوو زین کراو لە ڕێی خوادا، وە باشترە لە(١٠٠) ووشتر وە باشترە لە(١٠٠) کۆیلە.

## زیکری(سبحان الله وبحمده) وە(سبحان الله العظیم):

١-عن أبي هريرة أنَّ رسولَ الله(ﷺ) قال: مَنْ قال سبحان الله وبحمده في يومٍ مِئَةَ مَرَّةٍ، حُطَّت خطاياهُ وإنْ كانت مثل زَبدِ البَحرِ. رواه البخاري(٦٤٠٥) ومسلم(٢٦٩١).

واتە: هەر یەکێك لە ڕۆژێکدا(١٠٠) جاران بڵێ(سبحان الله وبحمده) گوناهەکانی هەڵدەوەرێن ئەگەر وەکو کەفاوی دەریاش بن.

**سوود**:

له باسی زیکری بەیانیان و ئێواران فەرموودەیەکمان هێناوەتەوە کە باس لە گەورەیی گوتنی ئەم زیکرە دەکات(١٠٠) جار لە کاتی بەیانی وە(١٠٠) جاریش لە کاتی ئێوارە.

٢- عن ابي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): كلمتان خفيفتان على اللسان، ثقيلتانِ في الميزان، حبيبتان الى الرّحمن: سبحان الله وبحمده سبحان الله العظيم. رواه البخاري(٦٤٠٦) ومسلم(٢٦٩٤).

واتە: دوو ووشە هەن ئاسانن لەسەر زمان ، گرانن لەسەر تەرازوو. خۆشەویستن لای خوای بەبەزەیی:(سبحان الله وبحمدهِ) (سبحان الله العظيم).

**سوود**:

مانای ئەم دوو زیکرە بەم شێوەیە:

سبحان الله وبحمده: پاکی بۆ خواو ستایش بۆ ئەو.

سبحان الله العظيم: خوای گەورە پاك و بێ گەردە لە هەموو کەم و کوڕیەك.

## زیکری(سبحان الله العظيم وبحمده):

١-عن جابر عن النبيّ(ﷺ) قال: مَنْ قال: سبحان الله العظيم وبحمده، غُرسَتْ لَهُ نَخلَةٌ في الجنّة. صحيح: رواه الترمذي(٣٤٦٤).

واتە: هەر یەکێك بڵێ:(سبحان الله العظيم وبحمده) دارخورمایەکی بۆ دەچێنرێ لە بەهەشت دا.

**سوود**:

١-( سبحان الله العظيم وبحمده) واته: پاكى بۆ خواى گەورەو ستايش بۆ وى.

٢- هەر چەند جارێ ئەم زيكرە دووبارە بكەيتەوە دارخورمايەكى زياترت بۆ دەچێنرێ لە بەهەشت دا.

## زيكرى(رضيت بالله ربّاً....):

عن ابي سعيد الخدري قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ قال رَضِيتُ بالله رَبّاً وبالإسلام ديناً وبمحمدٍ(ﷺ) نبياً وجبت لَهُ الجنة[1].

واته: هەر يەكێك بڵێ(رَضِيتُ بالله رَبّاً وبالإسلام ديناً وبمحمدٍ(ﷺ) نبياً) بەهەشتى بۆ واجب دەبێت.

**سوود**:

گوتنى ئەم ووشانە پاداشتيان بەهەشتە بەلأم نابێت گوتنى ئەم ووشانە تەنها قسەى بێ ناوەرۆك بن، بۆ نمونە كە دەڵێ ى(وبالإسلام دينا) دين: واتە رێبازو بەرنامە جا كە تۆ دەڵێ ى رازيم ئيسلام دين و بەرنامەم بێت دەبێ تۆ بۆ هەموو لايەنەكانى ژيانت بگەرێيتەوە بۆ ئەم ئيسلامە لە لايەنى عيبادەت و سياسەت و ئابوورى و كۆمەلأيەتى و هەموو لايەنەكانى تر، وە ئيسلاميش باسى هەموو لايەنەكانى ژيانى تێدايە بە تەواوى وە بە شێوەيەك كە لە ئەوپەرى رێك و پێكى دايە چونكە بەرنامەى خوايە.

---

(1) رواه ابن حبان في صحيحه(٨٦٥) وقال: شعيب الأرنؤوط: اسناده قويّ.

# سەڵەوات دان لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)

١-عـن ابـي هريـرة أنَّ رسـول الله(ﷺ) قـال: مـنْ صـلّى علـي واحدة صلى الله عليه عشراً. **رواه مسلم(٤٠٨) وابوداود(١٥٣٠).**

**واتـە: هـەر یـەکێك یـەك سـەڵەواتم لەسـەر لێبـدات خـودا دە سـەڵەواتی لەسەر لێ دەدات.**

**سوود:**

**لـە باسـی نوێـژ بـەهێزترین فـەرموودەی پێغەمبـەرمان هێناوەتـەوە دەربـارەی چـۆنیەتی سـەڵەوات لەسـەر پێغەمبـەر(ﷺ) وە ماناکەشـی لێـك دراوەتەوە.**

٢- عن عليّ قال: قال رسول الله(ﷺ): اَلبخِيلُ مَن ذُكِرتُ عنده فلَم يُصلِّ عليَّ. **صحيح: رواه الترمذي(٣٥٤٦).**

**واتە: رەزیل ئەو کەسەیە کە ناوی منی لە لا دێت سەڵەواتم لەسەر لێ نادات.**

٣- عن ابي هريرة قال: قال رسـول الله(ﷺ): **لا** تجعلوا قبري عيداً، وصلّوا عليَّ فَإنَّ صلاتَكم تَبلُغني حيث كنتم. **صحيح: رواه ابوداود(٢٠٤٢).**

**واتە: سەر گۆڕەکەم وەك ڕۆژی جەژن لێ مەکەن، وە سەلەواتم لەسەر لێبدەن، بێگومان سەڵەواتەکانتان پێم دەگەن لە هەر کوێیەك بن.**

**سوود:**

**جائیز نییە سەفەر کردن بۆ سەردانی گۆری پێغەمبەر(ﷺ) بەلاّم سوننەتە ئەگەر سەفەر بکەی بۆ مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ نوێژ کردن تیادا وە هەر نوێژێکیش لەم مزگەوتەدا بە هەزار نوێژ هەیە.**

٤- عن اوس بن اوس قال: قال رسول الله(ﷺ) إنَّ من أفضل أيّامكم يوم الجمعة فيه خَلَقَ اللهُ آدمَ وفيه قُبِض وفيه النَّفخَةُ، وفيه الصَّعْقَةُ، فَأكثروا عليَّ من الصلاة فيه، فَإنَّ صلاتكم معروضَةٌ عليَّ، قالوا: كيف تُعرضُ صلاتنا عليك وقدْ أرِمتَ؟ فقال: إنَّ الله عز وجل حرَّم على الأرضِ أجساد الأنبياء. **صحيح: رواه ابوداود(١٠٤٧) و ابن حبان(٩١٠).**

**واتە: بێگومان لە باشترین رۆژەکانتان رۆژی جومعەیە، لەم رۆژەدا خوا ئادەمی دورست کردووە، وە لەو رۆژەدا گیانی کێشراوە، وە لەو رۆژەدا فوو بە(صور)دا دەکرێ، وە لەو رۆژەدا هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەوی دان دەمرن(مەگەر کەسانێ خوا بیەوێ نەمرن)، جا لەم رۆژەدا زۆر سەڵەواتم لەسەر بدەن، چونکە بێگومان سەڵەواتەکانتان نیشانم دەدرێ، گوتیان: چۆن سەڵەواتەکانمان نیشانت دەدرێ لە کاتێکا کە تۆ رزیوی؟ فەرمووی: بێگومان خوا(عز وجل) قەدەغەی کردووە لەسەر زەوی کە جەستەی پێغەمبەران(بخوات).**

٥- عن ابی الدّرداء قال: قال رسول الله(ﷺ): من صلّى عليَّ حينَ يُصبحُ عشراً وحينَ يُمسي عشراً أدْركتْهُ شفاعتي يوم القيامة. **حسن: انظر(صحيح الجامع:٦٣٥٧).**

واتە: هەر یەکێك دە سەڵەواتم لەسەر لێبدات کە بەیانی دەکاتەوە وە کاتێکیش کە ئێوارە دەکاتەوە، تکاو شەفاعەتی منی پێدەگات لە ڕۆژی قیامەت دا.

**سوود:**

بەیانی کاتەکەی دەست پێ دەکات لە بانگی بەیانیەوە تا ڕۆژهەڵاتن، وە ئێوارەش کاتەکەی دەکەوێتە نێوانی عەسرو ڕۆژئاوا بوونەوە.

## چی دەکەی ئەگەر خەونی ناخۆشت بینی

١-عن أبي قتادة قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: الرُّؤيا مِنَ اللهِ والحُلُمُ من الشيطان فإذا رأى أحَدكُم شيئاً يَكْرَهُهُ فَلْيَنْفُثْ عن يساره ثلاث مرَات ولْيَتَعَوّذ بالله من شَرِّها فإنّها لنْ تَضُرَّهُ. رواه مسلم(٢٢٦١).

واتە: خەونی ڕاست لە خواوەیە، زیندە خەون و خەونی ناخۆش لە شەیتانەوەیە، جا هەر کات یەکێکتان شتێکی دیت پێی ناخۆش بوو با سێ جار بە نەمی فوو لە لای چەپی بکات وە خۆی بپارێزێ بە خوا لە خراپەو زیانی، ئەوە بێ گومان زیانی لێ نادات.

**سوود:**

قەتادە(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەو ئەسحابەی کە ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەر(ﷺ) گێڕاوەتەوە دەڵێ:(إن كنتُ لأرى الرؤيا اثقلُ عليَّ مِن جبل، فما هو إلا أنْ سمعتُ بهذا الحديث فما أُباليها).

واتە: من پێشتر خەونی وام دەدیت ئەوەندەی چیایەك زیاتر لەسەرم قورستر بوو(دەترسام) بەڵام کە گوێم لەم فەرموودەیە بوو ئیتر گوێم نەدەدایێ. دەتۆش ئەگەر خەونێکت بینی پێت ناخۆش بوو، وەك ئەوەی لەم فەرموودەدا هاتووە وا بکە هیچ گوێی پێ مەدەو مەترسە.

## زیکری لە ماڵ دەرچوون:

١-عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): من قال إذا خرجَ من بيتهِ: بسم الله توكلتُ على الله ولا حول ولا قوة إلاّ بالله، يُقالُ لهُ: كُفيت وَ وُقيتَ، وتنحّى عنه الشيطان. صحيح: رواه ابوداود(٥٠٩٥) والترمذي(٣٤٢٦).

واتە: هەر کەسێك کە لە ماڵی خۆی دەچێتە دەرێ بڵێ:( بسم الله توكلتُ على الله ولا حول ولا قوة الا بالله) ئەوە پێ ی دەگوترێ: ئەوەندەت بەسە، وە پارێزراوی، وە شەیتان لێ ی دوور دەکەوێتەوە.

**سوود**:

مانای زیکرەکە: بە ناوی خوا، پشتم بەست بە خوا، لادان لە هەڵەو خراپەو توانا بۆ خێرو چاکە نیە مەگەر بە خوا.

## چۆن پێڵاو لە پێ دەکەی:

١-عن أبي هريرة أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: إذا انتَعلَ أحَدُكم فَلْيبدأْ باليُمنى، وإذا خَلَعَ فَلْيبدأْ بالشّمال، ولْيُنْعِلهما جميعاً أو لِيَخلَعْهُما جميعاً. رواه البخاري(٥٨٥٦) ومسلم(٢٠٩٧).

انتعل: پێڵاوی لە پێ کرد(النَّعل) واتە:الحِذاء، یانی: پێڵاو.

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە پێڵاو و نەعلی لە پێ کرد با بەراستە دەست پێ بکات، وە ئەگەر لە پێی کردەوە با بەچەپە دەست پێ بکات، وە با هەردووکیان پێکەوە لەپێ بکات، یا با هەردووکیان پێکەوە لەپێ بکاتەوە.

**سوود**:

١-سوونەتە بەپێ ی راستە پێڵاو و نەعل لە پێ بکەی، وە بەپێ ی چەپە لە پێ ی بکەیتەوە.

٢- مەکروهە موسلمان بەیەك تاکە پێڵاو بڕوا بەرێوە.

٣- چەند کەمتەرخەمیەکی گەورەیە موسڵمان سوننەتێکی وا ئاسان جێ بەجێ نەکات و ڕۆژانە ئەو هەموو خێرە لە دەست خۆی بدات.

## چی دەڵێی کاتێ
## کە کەسێك ببینی گیرۆدە بووە بە بەلایەك

١-عن ابن عمر(ﷺ) عن رسول الله(ﷺ) انَّهُ قال: مَنْ رأى مُبتلى فقال: الحمد لله الذي عافاني ممَّا ابتلاك به، وفضَّلني على كثير ممَّن خلقَ تفضيلاً، لم يُصبه ذلك البلاء). **رواه الإمام أحمد في المسند(٥٦٠٥) بسند صحيح.**

واتە: هەر یەکێك کەسێك ببینێت کە گیرۆدە بووە بە بەلایەك بڵێ(الحمد الله الذي عافاني ممَّا ابتلاكَ بهِ وفضلني على كثير ممن خلق تفضيلا) ئەم بەلایەی تووش نابێت.

**سوود**:

**١-ئەم زیکرە یەك جار دەخوێنرێت لەو کاتەی یەکێك دەبینی تووشی بەڵاو کارەسات بووە.**

**٢- مانای زیکرەکە بەم شێوەیە(هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ ئەو خوایەی منی پاراستووە لەوەی کە دووچاری بوویت وە فەزڵی منی داوە بەسەر زۆر لە دورستکراوەکانی دا.**

## دوعای گەشتیار بۆ ئەوانەی جێیان دێڵێ

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيّ(ﷺ) انَّهُ قال: مَنْ أراد أنْ يسافِر فَلْيَقُل لِمَنْ خَلْفَهُ(أسْتَودِعُكُم الله الذي لا تَضيعُ ودائعَهُ). **رواه أحمد(٢/٤٠٣) وابن ماجه(٢/٩٤٣) واسناده حسن.**

**واتە: هەر یەکێك ویستی سەفەر بکات با بڵێ بەوانەی کە جێیان دێڵێ لە دوای خۆیدا. بەو خوایەتان دەسپێرم کە سپاردە نافەوتێنێ.**

**سوود**:

عن ابن عمر(رضي الله عنه) ان رسول الله(ﷺ) قال:(إنَّ الله إذا استودع شيئاً حفظهُ). **رواه احمد في المسند(٥٦٠٥) بإسناد صحيح.**

**واتە: بێگومان هەر شتێك بە خوای گەورە بسپێردرێت ئەیپارێزێت.**

## تارەت گرتن و چوونە سەر ئاو:

١-عن عليّ أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: سترُ ما بين أَعين الجنَ وعورات بني آدمَ إذا دَخَلَ أحَدُكُم الخلاءَ أن يقولَ: بسم الله. صحيح: رواه الترمذي(٦٠٦) وابن ماجه(٢٩٧).

واتە: پەردەی نێوان جنۆكەو عەورەتی ئادەمیزادكان كاتێك كە یەكێكتان دەچێتە سەر پێشاو ئەوەیە كە بڵێ(بسم الله) واتە: بە ناوی خوا.

٢- عن أنس قالَ: كانَ النبيُّ(ﷺ) اذا دخلَ الخلاء قال: أللهمَ إنّي أعوذُ بك من الخُبثِ والخبائث. رواه البخاري(١٤٢) ومسلم(٣٧٥).

١-الخُبث: كۆیە، تاكەكەی(خبیث)ە، واتە: شەیتانی نێرە. وە ئەم وشەیە بە(الخُبُث)یش دەخوێندرێتەوە واتە بە بۆر(ضمة) لەسەر پیتی بائەكە.

٢- الخبائث: كۆیە، تاكەكەی(خبیثة)یە، واتە: شەیتانی مێ یە.

واتە: ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر چووبا سەر پێشاو(پێش ئەوەی پێ ی بچێتە سنووری ئەو شوێنەوە) دەیفەرموو(اللهم إني أعوذُ بِكَ منَ الخُبثِ والخبائث). واتە: ئەی خودایە خۆم دەپارێزم بە تۆ لە شەیتانە نێرەكان و مێیەكان.

٣- عن عائشة أنَّ النبيَّ(ﷺ) كان إذا خَرجَ من الغائطِ قال: غفرانك. صحيح: رواه أبوداود(٣٠) وابن ماجة(٣٠٠).

واتە: عائشە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر لە ئاودەست دەربچووبایە دەیفەرموو(غُفرانك) (داوای) لێبوردنت(لێ دەكەم خودایە).

**سوود**:

**فەرموودەیـەك هەیـە دەڵـێ: كاتێـك كـە پێغەمبـەر(ﷺ) لـە ئـاو دەسـت بهاتبایەدەر دەیفەرموو(الحمدلله الذي اذهـبَ عنّـي الأذى وعافاني) ئـەم فەرموودەیە(ضعیف)ە، جائز نی یە كاری پێ بكرێ.**

٤- عـن ابـي قتـادة عـن الـنبيِّ(ﷺ) قـال: إذا بـالَ أحـدُكم فـلا يأخُـذَنَّ ذكـرهُ بيمينـهِ، ولا يـستنجي بيمينـهِ، ولا يتـنفَّسْ في الإنـاء. **رواه البخاري(١٥٤).**

**واتە: ئەگەر یەكێك لە ئێوە میزی كرد با زەكەری بە دەستی راستی نەگرێ، وە با تارەت نەگرێ بە دەستی راستی وە با هەناسەش نەخواتەوە لە ناو جام دا.**

**سوود**:

**حەرامە تارەت كردن بە دەستی راستە.**

٥-عن حفصة أنَّ النبيَّ(ﷺ) كانَ يَجعلُ يَمينـهُ لطعامـهِ وشـرابهِ وثيابه ويَجعلُ شمالَهُ لما سوى ذلك. **صحيح: رواه أبوداود(٣٢).**

**واتە: حەفسەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر(ﷺ) راستـەی بە كاردەهێنا بۆ خواردن وە بۆ خواردنەوە وە بۆ جل و بەرگ لەبەر كردن، وە چەپەشی بۆ غەیری ئەوانە بەكار دەهێنا.**

**سوود:**

هەر چەندە بەڵگەیەکی راستەخۆ نی یە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بەپێ ی چەپ چووبێتە ئاودەست و بە پێ ی راست لێ ی دەرهاتبێ بەڵام ئیمام شەوکانی لە(السیل الجرار) دا بە شێوەی گشتی بە سوننەتی داناوە.

## دانیشتن لە دوای نوێژی بەیانی:

١-عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): منْ صَلّى الغداةَ في جماعةٍ ثُمَّ قَعَدَ يَذكرُ اللهَ حتى تَطلعَ الشَّمسُ. ثُمَ صَلّى رَكعتينِ. كانت لَهُ كأجرِ حَجَّةٍ وعُمرةٍ، تامَّةٍ تامَّةٍ تامَّةٍ. حسن: رواه الترمذي(٥٨٦).

واتە: هەر یەکێك نوێـژی سبەینێ بە جەماعەت بکات، لە پاشان دابنیشێ(لە شوێنی نوێژەکەی) یادی خوا بکات تاوەکو رۆژهەڵدێ، لە پاشان دوو رکات نوێژ بکات، بۆ ئەو کەسە هەیە ئەجرو پاداشتی حەج و عومرەیەکی تەواو تەواو تەواو.

**سوود:**

وە فەرموودەیەکی تریش کە(طبراني) ریوایەتی کردوەو(ألباني) بە(حسن)ی داناوە بەم شێوەیە:(مَنْ صَلّى صلاة الصبح في جماعةٍ، ثُمَّ ثبتَ حتى يُسَبِّحَ للهِ سُبحةَ الضحى كان لهُ كَأجرِ حاجّ ومُعْتَمِرٍ، تامَّاً لَهُ حَجُّةُ وعمرتُهُ).

سُبحة الضحى: صلاة الضحى، نوێژی چێشتەنگاو.

عُثـيمين (رەحمـەتی خـوای لـێ بێـت) دەڵـێ: نوێـژی چێـشتەنگاو کاتەکەی(١٥ یا ٢٠) دەقیقە لە دوای رۆژهەڵاتن دەست پێ دەکات.

## جل و بەرگ(اللباس):

١-عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): سترُ ما بينَ أعينِ الجنِّ وعورات بني آدم إذا وضَعَ أحدهُم ثوبَهُ ان يقول: بسم الله. **صحيح: انظر(صحيح الجامع:٣٦١٠).**

**واتە: پەردەی نێوان چاوی جنۆکەکان و عەورەتی ئادەمیزاد ئەوەیە کە کاتێ یەکێکیان پۆشاکی لەبەر کردەوە بڵێ: بسم الله.**

٢- عن ابي هريرة قال: قالَ رسول الله(ﷺ) إذا لَبِستم وإذا توضّأْتم فابْدءوا بأيامِنِكُم. **صحيح: رواه ابوداود(٤١٤١).**

**واتە: ئەگەر شتێکتان لەبەر کرد، وە ئەگەر دەست نوێژتان شوشت بە لای راستەتان دەست پێ بکەن، کەواتە:**

**کراس و قەمسەڵەو کورتەك و فانیلەو شەرواڵ و پانتۆل و بێجامە و لەم جۆرانە بە دەستی راست و پێ ی راست دەست پێ دەکەی.**

٣- عن معاذ بن انس عن ابيه أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: من لَبسَ ثوباً فقالَ: الحمدلله الذي كساني هذا الثوب ورزقنيه من غير حَولٍ منّي ولا قوة غُفر لَهُ ما تقَدَّمَ من ذنبه وما تأخَّرَ. **رواه ابو داود(٤٠٢٣) قال الألباني حسن دون زيادة(وما تأخر).**

**واتە: یەکێك پۆشاکێك لەبەر بکات جا بڵێ(الحمدلله الذي كساني هذا الثوب ورزقنيه من غير حَولٍ منّي ولا قوة) خوا لە گوناهەکانی پێشوو پاشوی خۆش دەبێت.**

**سوود**:

١-سوننەتە ئەو کەسەی جل و بەرگی نویٚ لەبەر دەکات بڵێ( اللهم لك الحمد أنت كَسوتَنيه، أسألُك من خَيره وخير ما صُنِعَ لَهُ، وأعوذ بكَ من شَرِّه وشَرِّ ما صُنعَ لَهُ). **صحيح: رواه ابوداود(٤٠٢٠)**.

٤- عن ابي سعيدٍ الخدريّ قال: قال رسول الله(ﷺ): إزرةُ المُسلمِ الى نصف السَّاق، ولا حَرجَ(أو لا جناح) فيما بينه وبين الكعبين، فما كانَ أسفلَ من الكعبينِ فهو في النار، ومن جَرَّ إزاره بطراً لم يَنظُرِ اللهُ إليه. **صحيح الأسناد: رواه ابوداود(٤٠٩٢)**.

واتە: جل و بەرگی موسڵمان تا نیوەی لاقە وە گوناح نی یە ئەگەر جل و بەرگەکە لە نێوانی نیوەی قاچ و گۆزینگەکان بن، وە ئەوەش کە لە خوار گوزینگەکانە ئەوە لە ئاگرە، وە ئەو کەسەش کە جلەکەی شۆڕ دەکا لەبەر خۆ بەگەورە زانین ئەوە خوا تەماشای ناکات.

**سوود**:

عثیمین(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر(ﷺ) درێژی کراسی دابەش کردووە بۆ چوار بەش:

١-السنة: کە هەتا نیوەی لاقە.

٢- الرخصة: ئەوەیە کە لە نیوەی لاق شۆڕبێتەوە تا گۆزینگ ئەمە جائیزە.

٣- كبيرة من كبائر الذنوب: ئەوەیە لە گۆزینگ زیاتر شۆڕ بێتەوە بەڵام لەبەر خۆ بە گەورە زانین نەبێت، ئەمە لە گوناهە گەورەکانە.

٤- ئەوەیە کە لەبەر خۆ بەگەورە زانین جلەکانی شۆڕ دەکاتەوە.

گوناهەکەی لە قسمی سێ یەم گەورە ترە[1].

کەواتە کەسێك بۆ جوانی یا بەبێ بیر لێ کردنەوە جلەکانی لە گۆزینگی زیاتر شۆر دەکاتەوە لەبەر خۆ بەگەورە زانینی نی یە ئەوەش تووشی گوناهە گەورەکان و سزای سەخت دەبێت.

## زیکری سوار بوونی وولاخ و سەیارەو لەم جۆرە:

١-بسم الله، الحمدلله، ﴿سُبْحَـٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَـٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ۝ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ۝﴾

(الزخرف:١٣-١٤)

الحمدلله، الحمد لله، الحمدلله، الله اكبر، الله اكبر، الله اكبر، سبحانك إنّي ظلمتُ نفسي فاغفر لي فإنَّهُ لا يَغفِرُ الذُنوب إلاّ أنت.

صحيح: رواه ابوداود(٢٦٠٢).

سوود:

١-لێرە تەنها زیکرەکە نەقل کراوە فەرموودەکە کەمەك درێژ بوو.

٢- کە پێت خستە ناو سەیارەکە بڵێ(بسم الله) کە دانیشتی ئەوجا زیکرەکانی تریش تەواو بکە.

---

(1) رياض الصالحين، بشرح عثيمين.

## چی دەڵێ ی کە لە شوێنێك دادەبەزی:

١- عن خولة بنت حكيم قالت: سمعتُ رسول الله (ﷺ). يقول: (مَنْ نزلَ مَنزلاً ثُمَّ قال:(أعوذ بكلمات الله التامّات من شَرِّ ما خلقَ) لم يَضُرَّهُ شيء حتى يرتحِل من منزله ذلك) رواه مسلم(٢٧٠٨).

**واتە: هەر یەکێك چووە جێگایەکەوە لە پاشان بڵێ:( اعوذ بكلمات الله التامّاتِ مِن شَرِّ ما خلقَ) هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیەنی تا لەم جێگایە دەڕوات.**

**سوود:**

**١-یەك جار ئەم زیکرە دەخوێنی کاتێك دەچیە ماڵێك یا هەر جێگایەك.**

**٢- مانای ئەم زیکرە بەم شێوەیە(خۆم دەپارێزم بە ووشە تەواوەکانی خوا(واتە قورئان کە هیچ ناتەواویەکی تیا نی یە) لە زیانی ئەوەی کە دورستی کردووە.**

## چی دەڵێ ی پێش ئەوەی لە کۆڕێك دا هەڵسی:

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) من جلس في مَجْلسٍ فَكَثُرَ فيهِ لَغَطُهُ فقال قَبلَ أنْ يقوم مِن مَجلِسهِ ذلك: سبحانك اللهم وبحمدك، أشهدُ أن لا اله الا أنت، أستغفرك وأتوب إليك، إلاّ غُفر له ما كان في مجلسه ذلك. **صحيح: رواه أبوداود والترمذي(٣٤٣٣).**

واتە: هەر یەکێك لە کۆڕێکدا دابنیشێ کە غەڵبە غەڵبی زۆر تێدا بووبێ، جا ئەویش بەر لەوەی لەو کۆرەیدا هەڵسێ ئەوە بڵێ(سبحانك اللهم وبحمدك، أَشهَدُ أن لا الهَ الا انت، أستغفرك واتوب اليك) ئەوە هەرچی لەو کۆڕەیدا بوویەتی لێی دەسڕێتەوە.

## تەسبیحات کردن بەدەستی راستە

١-عن عبدالله بن عمْرو قال: رايت النبيَّ (ﷺ) يعقد التسبيح بِيمينه. صحيح رواه أبو داود (٨١/٢) والترمذي (٣٤٨٦).

واتە: عبدالله کوڕی عەمر دەڵێ: پێغەمبەرم بینی (ﷺ)، بە دەستی راستی تەسبیحاتی دەکرد.

### سوود:

موسڵمان تا بۆی دەکرێ تەسبیحات بەدەستی راستی بکات (عثیمین) رەحمەتی خوای لێ بیت دەڵێ جائیزە تەسبیحات کردن بەتەسبیح، وەئاگادار بە خەڵکانێك ئەگەر مەنعیان بکەی لەوەی تەسبیحات بەتەسبیح بکەن لەوانەیە زیکری خوا هەر زۆر بەکەمی ئەنجام بدەن.

## دوعا عیبادەتە

١-عن النعمان بن بشير(رضي الله عنهما) عن النبي(ﷺ) قال: الدُّعاءُ هُو العِبادَةُ، ثُمَّ قرأ: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ (غافر:٦٠). صحيح: رواه ابوداود(١٤٧٩) والترمذي(٢٩٦٩).

واتە: پاڕانەوە پەرستنە، لە پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە،﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ واتە: وە پەروەردگاری ئێوە فەرمووی لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە بێگومان ئەوانەی خۆ بەزل دەزانن لە پەرستنی من بە مل کەچی و زەلیلییەوە دەچنە دۆزەخ.

### سوود:

١-هەر وەك لەم فەرموودەیەدا دیارە کە دوعا عیبادەتە، عیبادەتیش ئەگەر بۆ غەیری خوا ئەنجام بدرێ ئەوە هاوبەش دانان و شیرکە بۆ خودا.

کەواتە دوعا جائیز نی یە لە غەیری خودا لە هیچ کەسێکی تر بکرێ، جا ئەو کەسە فریشتەیەك بێت یا پێغەمبەرێك بێت یا هەر کەس و هەر شتێکی تر بێت.

٢- ئەگەر لەو سەری قورئان تا ئەو سەری قورئان تەماشا بکەین یەك ئایەتی تیا نابینیتەوە کە ڕێ ی بەوە دابێت کە ئینسان داوا لە غەیری خوادا بکات، وە ئەگەر سەرێك لە هەموو فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بدەین یەك فەرموودە نی یە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمان بکات ئێمە لە غەیری خوا بپارێینەوە، وە پێغەمبەریش(ﷺ) لە ژیانی دا جگە لە خوا لە هیچ کەسێکی تر نەپارایتەوە، قەت نەیفەرمووە یا ئیبراهیم یا موسی یا عیسی یا جیبریل یا فلانە کەس ئەم کارەم بۆ بکەن، بەڵکو بۆ هەموو شتێك تەنها لە خوا پاراوەتەوە، کەواتە پاڕانەوە لە غەیری خودا بیدعەیەکە لە بابی عەقیدەو هاوبەش بریار دانە بۆ خوا.

## گەورەیی دوعاو پارانەوە:

١-عن أبي هريرة عن النبيِّ(ﷺ) قال: ليس شيءٌ أكرمُ على الله تعالى من الدُّعاء. حسن: رواه الترمذي(٣٣٧٠) وابن ماجه(٣٨٢٩).

واتە: هیچ شتێك لە پارانەوە بەرێزتر نیە لە لای خودای بەرز.

## سوود:

١-دعاء : لە(دعى يدعو)ەوە هاتووە لە ئەسلی زماندا بە مانای داواکردن دێت، وە لە شەرعیش دا بریتیە لە داوای شت کردن لە خوا.

٢- فەرموودەیەك هەیە بەم شێوەیە(الدعاء مُخُّ العبادة) ئەم فەرموودەیە بەم شێوەیە(ضعيف)ە.

٢- عن سلمان قال: قال رسول الله(ﷺ): إنَّ رَبَّكُم تبارك وتعالى حَيِيٌّ كريم يَستَحْيِي مِن عبدهِ إذا رفَعَ يديهِ إليهِ انْ يَرُدَّهما صِفرا.
صحيح: رواه ابوداود(١٤٨٨) والترمذي(٣٥٥٦).

واته: بێگومان پەروەردگارتان(تبارك وتعالى) بەشەرم بەخشندەیە. شەرم دەكات لە بەندەی خۆی ئەگەر دوو دەستەكانی بەرز بكاتەوە بۆ لای ئەو بە بەتاڵی بیانگێڕێتەوە.

**سوود:**

ناوی(حَيِيّ) ئەوە ناوو سیفەتی خوایە، جیایە لەگەڵ(حَيّ) كە ئەمەش یەكێكی ترە لە ناو و سیفەتەكانی خوا، ئی یەكەمیان واتە: بەشەرم بەلام دووەمیان واتە: زیندوو، ئی یەكەمیان سێ یائی هەیە دووەمیان دوو یائی هەیە.

٣- عن سلمان قال: قال رسول الله(ﷺ): لا يَرُدُّ القضاءَ إلاَّ الدُّعاءُ، ولا يزيدُ في العُمُر إلاَّ البِرُّ. حسن: رواه الترمذي(٢١٣٩).

واته: قەزاو چارەنووس رەت ناكاتەوە مەگەر دوعا نەبێت، وە هیچ شتێك تەمەن زیاد ناكات مەگەر چاكە نەبێت.

٤- عن عبادة بن الصامت أنَّ رسولَ الله(ﷺ) قال: ما على الأرضِ مسلمٌ يدعو الله تعالى بدعوةٍ إلاّ اتاهُ الله إيّاها، أو صرف عنه من السوء مِثلها، ما لم يَدعُ بإثمٍ أو قطيعةِ رحم، فقال رجُلٌ من القوم إذاً نُكثِرُ قال: الله اكثر. حسن صحيح: رواه الترمذي(٣٥٧٣).

واتە: هەر موسڵمانی لەسەر ئەم زەوی یەدا بپارێتەوە لە خوای بەرز بە پاڕانەوەیەك ئیللا خوا ئەو شتەی دەداتیٚ، یا بە قەد ئەو شتەی کە داوای کردووە شەڕو خراپەی لیٚ لا دەدا، بەمەرجیٚ کە داوای شتێکی گوناح نەکات، یا خزمایەتی پچراندن.(واتە داوایەکەی نزایەکی خراپ نەبێت لەوانەی کە کەس و کارو سیلەی رەحمی ئەون) جا پیاوێك لە خەڵکەکە گوتی: کەواتە زۆر دەپارێتەوە، فەرمووی: بەخششی خوا زیاترە.

## بە چی دەست بە دوعا دەکەی

١-عن فضالة بن عبيد قال: قال رسول الله(ﷺ): إذا صلّى أحدكُم فلْيبدأْ بِتَحْميدِ ربِّهِ جَلَّ وعزَّ والثناء عليه ثُمَّ يُصلّي على النبيِّ(ﷺ)، ثُمَّ يَدْعو بَعدُ بما شاءَ. صحيح: رواه ابوداود(١٤٨١).

واتە: ئەگەر یەکێکتان پارایەوە با دەست پیٚ بکات بە سوپاس کردنی پەروەردگاری پایە بەرزو بالأدەست وە ستایش کردنی لە پاشان سەڵەوات لەسەر پێغەمبەر بدات ئەوجا دوایی چی دەویٚ با داوا بکات.

**سوود**:

عن عمر بن الخطاب قال: إنّ الدّعاءَ مَوقوفٌ بين السماء والأرض لا يَصعدُ منه شيء حتى تُصلّي على نبيِّك. حسن: رواه الترمذي(٤٨٦).

واتە: عومەری کوری خەتتاب دەڵیٚ: بیٚ گومان دوعا وەستێنراوە لە نێوانی ئاسمان و زەوی دا هیچی لیٚ بەرز نابێتەوە تا سەڵەوات لەسەر پێغەمبەرەکەت نەدەیت.

## پەلە نەکردن لە وەڵام دانەوەی دوعا:

١-عن أبي هريرة عن النبيِّ(ﷺ): أنَّهُ قال: لا يزالُ يُستجاب للعبد ما لم يدعُ بإثمٍ أو قطيعة رحمٍ ما لم يَستعجل. قيل يا رسول الله ما الإستعجالُ؟ قال: يقول قد دعوتُ وقد دعوتُ فلم يستجيبُ لي فيستحسرُ عند ذلك ويدعُ الدُّعاء. **رواه مسلم(٢٧٣٥).**

**واتە: بەردەوام وەڵامی(پاڕانەوەی) بەندە دەدرێتەوە بە مەرجێ داوای شتێکی گوناح نەکات یا خزمایەتی پچڕاندن مادام پەلە نەکات، گوترا ئەی پێغەمبەری خوا پەلە کردن چۆنە؟ فەرمووی: ئەوەیە بڵێ پاڕامەوەو پاڕامەوە پێم وانی یە کە وەڵامم بداتەوە، ئەوجا لە پاڕانەوە واز دێنێ و کۆڵ دەدات.**

## دوعای پاشملە بۆ براکەت:

١-عن أبي الدرداء أنَّهُ سَمع رسول الله(ﷺ) يقول: إذا دعا الرَّجُلُ لأخيه بظهر الغيب قالتِ الملائكةُ: آمين ولك بمثل. **رواه مسلم(٢٧٣٢) وأبوداود(١٥٣٤).**

**واتە: ئەگەر پیاو دوعای کرد بۆ براکەی لە پاشملە ئەوە فریشتە دەڵێن: ئامین وێنەی دوعاکەی تۆیش بۆ تۆش بێت.**

٢- عن أمّ الدرداء أنَّ النبيَّ(ﷺ) كان يقول: دعوةُ المرء المسلم لأخيهِ بظهر الغيبِ مُستجابةٌ عند رأسه مَلك مُوَكَّلٌ كلما دعا لأخيه

بخير قال الملك المُوكّلُ به آمين ولك بمثلٍ. **رواه مسلم(٢٧٣٣).**

**واته: دوعای کەسی موسڵمان بۆ براکەی لە پاشملە گیراو قەبولە، لە لای سەری فریشتەیەك هەیە راسپێرراوە، هەر چەند ئەو دوعا بۆ براکەی بکات بە باشە ئەو فریشتەیەش کە راسپێرراوە بە ئەو دەڵێ: ئامین، وە وێنەی نزاکەی تۆیش بۆ تۆش بێت.**

## دوعا بۆ دایك و باوك:

١-عن عبدالله بن مسعود قال: سألتُ رسول الله(ﷺ): أيُّ الأعمال أحبُّ إلى الله؟ قال: الصَّلاة على وقتها، قلتُ: ثُمَّ أيُّ؟ قال: ثُمَّ برُّ الوالدين، قلتُ: ثُمَّ أيُّ؟ قال: ثُمُّ الجهاد في سبيل الله. **رواه البخاري(٥٢٧) ومسلم(٨٥).**

**واته:(عبدالله) کوری مسعود دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر کرد(ﷺ) کام لە کردەوەکان خۆشەویسترە لای خوا؟ فەرمووی: نوێژ کردن لە یەکەم کاتی خۆی، گوتم لە پاشان کامیان؟ فەرمووی: لە پاشان چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك، گوتم لە پاشان کامیان؟ فەرمووی: لە پاشان جیهاد کردن لە رێ ی خوادا.**

### سوود:

**یەکێك لەو کارانەی کە موسڵمان زۆر پێ ی لە خوا نزیك دەبیتەوە چاکەکردنە لەگەڵ دایك و باوك، وە یەکێکیش لەو کارە زۆر چاکانەی کە لەگەڵیان دا بکرێ داوای لێخۆش بوون و رەحمەتی خوایە بۆیان خوا**

دەفەرموێ﴿وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا﴾ (الإسراء:٢٤).

واتە: وە بڵێ ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێ بکە هەرچۆنێ ئەوان منیان پەروەردەکرد بە منداڵی.

جا تۆش زۆر بڵێ (رَبِّ اغفر لي ولِوالديَّ وارحَمهُما كما ربَّياني صغيراً) وە ئەوەش بڵێ(ربِّ اغفر لي ولِوالديَّ وللمؤمنين والمؤمنات) ئەم دوو دوعایە لە کاتی ژیانیان و لە دوای مردنیشیان بیڵێ ئومێد وایە لەم ڕێگایەدا پاداشتێکی زۆر گەورە کۆبکەیتەوە بۆ قیامەتت.

## هەندێ کات و شوێن و شێوازو کەس بۆ قەبول بوونی دوعا:

١-عن أبي هريرة أن رسول الله(ﷺ) قال: أقرب ما يكونُ العبدُ من ربِّهِ وهو ساجدٌ فأكثروا الدعاء. رواه مسلم(٨٤٢) وأبوداود(٨٧٥).

واتە: نزیکترین حاڵەتی بەندە لە پەروەردگاری یەوە کاتێکە کە سەجدەی بردووە، جا لەو حاڵەتەدا زۆر بپاڕێنەوە.

٢- عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ) لا يُرَدُّ الدُّعاءُ بين الأذانِ والإقامةِ. صحيح: رواه ابوداود(٥٢١).

واتە: دوعاو پارانەوە ناگەڕێندرێتەوە لە نێوانی بانگ و قامەت دا(واتە قەبول دەبێت).

**سوود**:

ئەگەر وەڵامی بانگت دایەوەو داوای وەسیلەت کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) وە نوێژی سوننەتت کرد ئینجا دوعا بکە، با یەکێك لە دوعایەکانت ئەوە بێت بڵێ:(اللهم إني أسألُكَ العافية في الدنيا والاخرة) واتە: ئەی خودایە داوای سەلامەتی و بێ وەیت لێ دەکەم لە دونیاو لەدوا ڕۆژدا.

٣- عن سعد قال: قال رسول الله(ﷺ): دَعوةُ ذِي النّونِ إذ دعا وهو في بطن الحوت: لا اله إلا أنت سبحانك إنّي كُنت من الظالمين، فَإنَّهُ لم يَدعُ بها رجلٌ مسلمٌ في شيءٍ قطُّ إلاّ استجاب الله لَهُ. **صحيح**: رواه الترمذي(٣٥٠٥).

واتە: دوعای یونس پێغەمبەر کاتێك کە دوعای کرد وە ئەو لە ناو زگی نەهەنگەکەدا بوو فەرمووی( لا إله الا انت سبحانك إنّي كنت من الظالمين) جا بێگومان قەت هیچ موسڵمانێك نەبووە بەو دوعایە بپاڕێتەوە دەربارەی هەر شتێك ئیللا خوا دوعاکەی قەبول کردووە.

**سوود**:

مانای دوعاکە: هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نییە بێجگە لە تۆ، پاك و بێگەردی بۆ تۆ، بە ڕاستی من لە ستەم کاران بووم.

٤- عن أبي أمامة قال: قيل: يا رسول الله أيُّ الدُّعاءِ اسمعُ؟ قال: جوف الليل الآخِرِ ودُبُرَ الصلواتِ المكتوبات. حسن: رواه الترمذي(٣٤٩٩).

واتە: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا کام دوعا قەبول ترو گیراترە؟ فەرمووی: لە ناوەڕاستی بەشی کۆتایی شەوگاردا وە لە پاش نوێژە فەرزەکان.

**سوود**:

(عُثـيمين): دەڵـێ:(و دُبُـر الـصلوات المكتوبـات) ئەمـە واتـە كۆتـایی نوێژەكان و پێش سەلام دانەوە، دەڵێ: چونكە دوای سەلام دانەوە شوێنی دوعاو پارانەوە نی یە بەڵكو شوێنی زیكرە.

٥- عـن أبـي هريـرة أنَّ رسـول الله(ﷺ) قـال: ثـلاثُ دعـوات مُـستَجاباتٌ لاشـكَّ فِـيهنَّ، دعـوةُ الوالـدِ، ودعـوةُ المُـسافرِ ودعـوة المظلوم. حسن: رواه أبو داود (١٥٣٦).

الوالد: باوك، الوالده: دایك، الوالدان: دایك و باوك.

واتـە: سـێ دوعـاو پارانـەوە وەڵام دەدرێنـەوەو گـیرا دەبـن هـیچ شـەك و گومـانی تیـا نـی یـە: دوعـای بـاوك، وە دوعـای ڕێبـوار، وە دوعـای سـتەم لێكراو.

**سوود**:

پیرەمێردی شاعیر دەڵێ:

لــە ئــاهو نــزای مــەزلوم بترســە

ئـاهی چـەند مـاڵی روخانـد بپرسـە

## هەندێ دوعاو پارانەوە:

١-عن أنس قال: كانَ أكثرُ دعاءِ النبيِّ(ﷺ): أللهمَّ ربّنا آتنا في الدُّنيا حسنةً وفي الاخرةِ حسنةً وقنا عذابَ النار. رواه البخاري(٦٣٨٩) ومسلم(٢٦٩٠).

واتە: ئەنەس دەڵێ: زۆربەی پارانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەبوو(اللهمَّ ربّنا آتنا في الدُّنيا حسنةً وفي الاخرةِ حسنةً وقِنا عذابَ النار).

## سوود:

١-موسلیم لە ریوایەتێکی تردا ئەم دوعایەی ریوایەت کردووە لە پێغەمبەر(ﷺ) بەبێ گوتنی(اللهم) هەر لە فەرموودەی ژمارە(٢٦٩٠).

٢- ئەم دوعایە گشت گیرە(حسنه) لە دونیادا واتە(کل ما يَسرُّ ولا يضر) هەموو شتێکە کە کەیف خۆشت دەکات و زیانی نییە بۆت لە ئافرەتی چاك و منداڵی باش و لەش ساغی و زانست و عیبادەت و رسقی حەلال و ......

٣- مانای فەرموودەکە: ئەی خودایە پەروەردگارمان لە دونیادا چاکەو لە دوا رۆژیش چاکەمان پێ ببەخشە وە بمانپارێزە لە ئازاری ئاگر(ی دۆزەخ).

٢- عن ابي مالك الأشجعي عن أبيه(رضي الله عنهما) قال: كانَ الرَّجُلُ إِذا أسلمَ عَلَّمَهُ النبيُّ(ﷺ) الصلاة، ثُمَّ أمَرَهُ أنْ يَدعُوَ بِهؤُلاءِ الكلماتِ(اللهمَّ اغفِر لي وارحَمني واهدني وعافني وارزقني). رواه مسلم(٢٦٩٧).

واتە: باوکی مالکی ئەشجەعی(رەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: جاران

کە پیاوێك موسڵمان دەبوو پێغەمبەر(ﷺ) نوێـژی فێردەکرد لە پاشان ئەمری پێ دەکرد کە ئەم ووشانە بڵێ:( اللهمَّ اغفِر لي وارحَمني واهدني وعافني وارزقني) واتە: ئەی خودایە لە گوناحم خۆش بە وە رەحمم پێ بکە وە رێنمونیم بکە وە سەلامەتم بکە وە رۆزیم بدە.

٣- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) كانَ يقول في سجوده(اللهمَّ اغْفِرْ لي ذنبي كُلَّهُ: دِقَّهُ وجِلَّهُ وأوَّلَهُ وآخِرَهُ. وعلانيتهُ وسِرَّهُ رواه مسلم(٤٨٣) وأبوداود(٨٧٨).

دِقَّهُ: اي صغيره، واتە، گچکەکانی.

جِلَّهُ: اي كبيره، واتە: گەورەکانی.

واتە: ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) لە سەجدەکانی دەیفەرموو:( اللهمَّ اغْفِرْ لي ذنبي كُلَّهُ: دِقَّهُ وجِلَّهُ وأوَّلَهُ وآخِرَهُ. وعلانيتهُ وسِرَّهُ) واتە: ئەی خودایە لە هەموو گوناهەکانم خۆش بە: لە وردی و لە درشتی، لە پێشنی و لە پاشینی، لە ئاشکرای و لە پەنهانی.

٤- عن شَكَلِ بن حميد(رضي الله عنه) قال: قلتُ يا رسول الله عَلِّمني دعاءً قال: قُلْ:: اللهمَّ إني أعوذُ بك مِنْ شَرِّ سَمْعِي، ومِنْ شَرِّ بَصري، ومِنْ شَرِّ لِساني، ومن شَرِّ قَلْبي، ومن شَرِّ مَنِيِّي. صحيح: رواه أبو داود (١٥٥١) والترمذي (٣٤٨٧)

واتە: شەکلی کوری حمید(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا دوعایەکم فێر بکە؟ فەرمووی بڵێ:(اللهمَّ إنی أعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ سَمْعِي، ومِنْ شَرِّ بَصري، ومِنْ شَرِّ لِساني، ومن شَرِّ قَلْبي، ومن شَرِّ مَنِيِّي).

واتە: ئەی خودایە من خۆم دەپارێزم بە تۆ لە شەڕی گوێم، وە لە

شەڕی چاوم، وە لە شەڕی زمانم، وە لە شەڕی دڵم، وە لە شەڕی داوێنم.

٥- عن العباس بن عبدالمطلب(رضي الله عنه) قال: قلت يا رسول الله عَلِّمني شيئاً اسألُهُ الله، قال:(سَلِ الله العافيةَ) فَمكثْتُ ايّاماً ثُمَّ جئتُ فقلتُ: يا رسول اللهِ عَلِّمني شيئاً أَسألُهُ الله؟ فقال لي: يا عباس يا عمَّ رسول الله سَلِ الله العافية في الدُّنيا والآخرة. صحيح: رواه الترمذي(٣٥١٤).

واتە: عەبباسی كوری عبدالمطلب(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا شتێكم فێر بكە كە داوای بكەم لە خوا؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی داوای سەلامەتی و بێ وەیی بكە لە خوا، جا دەڵێ ماوەیەك مامەوە لە پاشان چوومەوە گوتم ئەی پێغەمبەری خوا شتێكم فێر بكە كە داوی بكەم لە خوا؟

جا دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) پێ ی فەرمووم: ئەی عەبباس ئەی مامی پێغەمبەری خوا داوای سەلامەتی بكە لە خوا لە دونیاو لە دوارۆژدا.

**سوود**:

ئەم دوعایە بەم شێوەیە بكە: اللهم إني أسألك العافية في الدنيا والاخرة.

٦- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال كان رسول الله(ﷺ) يقول: أللهم أَصلِحْ لِي ديني الذي هُوَ عِصْمَةُ أمري، وأصْلِحْ لي دونيايَ التي فيها معاشي، وأَصلِحْ لِي آخِرَتي التي فيها معادي، واجعل الحياة زيادة لِي في كلِّ خَيرٍ واجعَلِ الموتَ راحةً لي مِنْ كُلِّ شَرِّ. رواه مسلم(٢٧٢٠)

واتـه: پێغەمبـەر(ﷺ) دەیفەرموو: ئەی خوایە ئەو دینداری یەمم بۆ چاك بكە كە مایەی ڕاوەستانی كاروبارمە، وە ئەو ژیانە دونیاییەمم بۆ باش بكە كە گوزەرانمی تێدایە، وە دوا ڕۆژم بۆ باش بكە كە بۆی دەگەڕێمەوە، وە ژیانم بۆ بگێڕە بە مایەی زیاد بوونی هەموو چاكەیەك، وە مردنیشم بۆ بگێڕە بە مایەی حەسانەوە لە هەموو شەرێ.

٧- عن ابن عباس أنَّ نبيَّ الله(ﷺ) كانَ يقولُ عند الكرب.

واتـه: پێغەمبـەر(ﷺ) لـه كاتی غەمباری دا دەیفەرموو:(لا إلـه إلا الله العظيم الحليم، لا إلـه إلا الله ربُّ العرش العظيم، لا إلـه إلا الله ربُّ السماوات وربُّ الأرضِ، وربُّ العرشِ الكريم) **رواه البخاري(٦٣٤٥) مسلم(٢٧٣٠)**.

**١-الكرب: خەمێكە كە دەروون بگرێتەوە.**

**٢- لا اله الا الله: هیچ پەرستراوێكی بە ڕاستی نی یە بێجگە لە خوا.**

٨- عـن عائـشة(رضـي الله عنهـا) انَّ الـنبيَّ(ﷺ) عَلَّمَهـا هـذا الدُّعاء.

واتـه: عائـشە(ڕەزای خـوای لـێ بێـت) دەڵـێ پێغەمبـەر(ﷺ) ئـەم پاڕانەوەی فێركردووە:

أللهمَّ إنّي أسألك من الخير كُلِّه عاجله وآجله[1] ما علمتُ منهُ وما لم أعلم وأعوذ بِك مِنَ الشَرِّ كُلِّه عاجلهِ وآجلِه ما علمتُ منه وما لم أعلم. أللهم إني أسألك من خير ما سألك عبدك ونَبيُّكَ وأعوذ بك مِنْ

---

(1) عاجله: ما يحصل مستعجلاً يريد خير الدنيا(اجله) ما يحصل مؤجلاً اي مُؤخراً يريد خير الاخرة.

شَرِّ ما عاذ منهُ عبدك ونبيُّك اللهم إنّي أسألك الجنّةَ وما قَرَّب اليها من قول وعمَل وأعوذ بك من النار وما قَرَّب اليها من قول أو عمل وأسألك أن تجعل كُلَّ قضاء قضيتهُ لي خيرا. **صحيح: رواه ابن ماجه(٣٨٤٦).**

٩- عن ابي بردة بن عبدالله أن أباه حدَّثهُ أنَّ النبيَّ(ﷺ) كانَ إذا خافَ قوماً قال:(اللهمَّ إنّا نجعلُكَ في نُحورهم ونعوذُ بِك من شُرُورهم. **صحيح: رواه ابوداود(١٥٣٧)**

**واته: پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر لە خەڵکانێك بترسابایە دەیفەرموو: اللهمَّ إنّا نجعَلُكَ في نُحورهم ونَعوذُ بِكَ من شُرُورهم) واتە: ئەی خودایە تۆ دەکەین بە بەرۆکیانەوەو پەنا دەگرین بە تۆ لە شەڕیان.**

# باسی قورئان خوێندن

## گەورەیی خوێندن و فێربوونی قورئان

خوا دەفەرمووێ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾﴾ (الفاطر:٢٩-٣٠)

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە کتێبی خوا دەخوێننەوە بە چاکی نوێژیان بە جێ هێناوە وە لە وەی کە پێمان داون بە نهێنی و ئاشکرا دەبەخشن چاوەڕوانی بازرگانییەکن هەرگیز زەرەر ناکات (٢٩) بۆ ئەوەی (خوا) بە تێرو تەواوی پاداشتییان بداتەوە و لە بەهرەی خۆی زیاتریشییان پێ بدات بەڕاستی خوا لێبوردەی سوپاس وەرگرە(٣٠).

١-(عن عبدالله بن عَمْرو بن العاص-رضي الله عنه- عن النبّي (ﷺ) قال: (يُقالُ لِصاحِبِ القرآنِ إقرا وارتقِ ورتل كما كنتَ تُرتل في الدُنيا، فإنَّ منزلتك عند آخرِ آيةٍ تَقْرَؤُها) حسن : رواه ابو داود (١٤٦٤) والترمذي (٢٩١٤)..

يُقالُ: دەگوترێ، قِيلَ: گوترا.

(لصاحب القرآن: المراد بصاحب القرآن في الحديث من يلازمُهُ بتلاوتهِ والعمل بما فيه): یانی لەم فەرموودەیە مەبەست بە (صاحب القرآن) ئەوانەن کە دەیخوێننەوە و کاری پێ دەکەن.

(وارتق): بەرزبەوە (إرتقاء) سەرکەوتن، بڵند بوون، وە سەرکەوتن.

(ورتل): (ترتيل القراءة: التأني فيها وتبيين حروفها وحركاتها)

واتە: قورئان خوێندن بە (ترتيل) بريتييە لە لەسەرخۆ خوێندن و ئاشكرا كردن و دەرخستنى پيت و حەرەكاتەكان.

ماناى فەرموودەكە: (لە قيامەت) دەگوترێتە هاوەڵى قورئان بخوێنە و بەرز بەوە (لە بەهەشت) وە قورئان بە (ترتيل) بخوێنە هەروەكو لە دونيادا بە (ترتيل)ت خوێندووە، بێگومان شوێنى تۆ (لە بەهەشت) لاى كۆتا ئايەت دايە كە دەيخوێنى.

## سوود:

(مُنذري) لە (الترغيب والترهيب) لە دواى ئەم فەردەدا دەڵێ:

(قال الخطابي: جاء في الأثر أن عدد آي القرآن على قَدْر دَرَج الجنة، فيقال للقارئ ارقَ في الأدراج على قَدْرِ ما كنت تقرأ من آي القرانِ فَمن استوفى قِراءة جميع القرآن استولى على أقصى دَرَج الجنة في الآخرة، ومَن قرأ جُزءاً منه كان رقيُّهُ في الدّرج على قَدْرِ ذلك فيكون منتهى الثواب عند منتهى القراءة)

واتە: خەتابى دەڵێ: لە (أثَر)ێكدا هاتووە كە ژمارەى ئايەتەكانى قورئان ئەوەندەى پلەكانى بەهەشتن، جا دەگوترێتە قورئان خوێن بەرزبەوە لەو پلانەدا بەقەد ئەوەندەى كە خوێندووتە لە ئايەتەكانى قورئان، هەر يەكێك هەموو قورئانى خوێندبێ دەگاتە ئەوپەڕى و بەرزترين پلەكانى بەهەشت لە دوا ڕۆژدا، وە هەر يەكێك جوزئێكى خوێندبێ بەرزبوونەوەى لە پلەكان بە قەد ئەو جوزئە دەبێت، كۆتايى پاداشت لەگەڵ كۆتايى خوێندنەوەكەيە.

٢- (عن إبن مسعود-رضي الله عنه- قال: قال رسول الله (ﷺ):
( مَن قرأ حَرْفاً من كتاب الله فَلَهُ به حسنة، والحسنة بعشر أمثالها. لا أقول (ألم) حرف ولكن ألِفٌ حرفُ ولامٌ حرف وميم حرفٌ
صحيح: **رواه الترمذي (٢٩١٠)**.

**واته: هەر یەکێك یەك پیت لە قورئان بخوێنێ، بەهۆی خوێندنی ئەم پیتە چاکەیەکی بۆ هەیە، وە هەر چاکەیەکیش بە دە چاکەیە، من ناڵێم (ألم) یەك پیتە، بەڵکو (ألِف) یەك پیتە وە (لام) یەك پیتە، وە (میم) یەك پیتە.**

٣-(عن عائشة-رضي الله عنه- قالت: قال رسول الله (ﷺ):(الذي يقرأ القرآن وهو ماهرٌ بهِ مع السفرةِ الكرام البررة، والذي يقرأ القرآن ويتتعتعُ فيهِ وهو عليه شاق له اجران) **رواه البخاري (٤٩٣٧)ومسلم(٧٩٨)**.

**(ماهر): کارامە، شارەزا، لێزان.**

**(السفرة): ئەو فریشتانەن کە دەنێررێن بۆ لای پێغەمبەران.**

**(الكرام): بەرێز.**

**(البررة): (المطيعين) چاکەکەران.**

**(يتتعتع فيه): (يتردد في قراءته)**

**مانای فەرموودەکە: ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێ تێیدا شارەزایە (بە ئاسانی دەیخوێنێ بەبێ وەستان و لێ تێك چوون) لەگەڵ ئەو فریشتە بەرێز و چاکە کارانەدان کە دەنێردرێن بۆ لای پێغەمبەران.**

**وە ئەو کەسەش کە قورئان دەخوێنێ و زمانی تەتەڵە دەکات تیایدا لەسەری زەحمەتە دوو پاداشتی بۆ هەیە.**

**سوود**:

**زانایان دەڵێن: ئەوانەی یەکەم کە شارەزان لەخوێندنی قورئاندا باشتر و یادداشتییان زیاترە لە ئی دووەم.**

**٤- عن ابن عمر (رضي الله عنهما) عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال: لاحسد إلا في اثنتين: رجلٌ آتاه الله القرآن، فهو يقومُ بِهِ آناء الليل و آناء النهار، ورجلٌ آتاه الله مالاً فهو ينفقه آناء الليل وآناء النهار. رواه البخاري (٥٠٢٥) و مسلم (٨١٥).**

**الحسد: خۆزگە خواستنە بەنەمانی نیعمەتێك كەبەیەكێك دراوە جا چ دینی بێت یا دونیایی، بەڵام (غبطـة) حەز دەكەی ئەو نیعمەتەی كە بەبەرامبەرەكەت دراوە بەتۆش بدرێ بێ ئەوەی لە ئەو بسەندرێتەوە، جا لێرەدا (لاحسد) واتە (لاغبطة).**

**والآناء: الساعات: كاتەكان**

**مانای فەرموودەكە: ئێرەیی بردن دروست نییە، تەنها لەدوو شت نەبێت: پیاوێك خودا قورئانی پێ داوە، ئەویش بەشەو و بەرۆژ دەیخوێنێتەوە، وە پیاوێكیش خودا ماڵ و سامانی پێ داوە، ئەویش بەشەو و بەرۆژ دەیبەخشێتەوە.**

**ئەم فەرموودەیە هاندانە بۆ موسڵمانان كە هەوڵ بدەن ئەم دوو نیعمەتە گەورەیە بەدەست بێنن.**

**٥- عن عثمان بن عفان (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): (خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرآنَ وَعَلَّمَهُ) رواه**

البخاري(٥٠٢٧).

واتـه: باشـترینتان ئەوکەسـەیە کـە فێـری قورئـان دەبێـت و خـەڵکیش فێردەکات.

لە ریوایەتێکی (بخاری) ئەم فەرموودە بەم شێوەش هـاتووە (إنَّ افضلكُم من تَعَلم القرآن وعَلَّمَهُ) جائەوانەی کە خەڵکان فێری قورئان دەکەن ئەوە بۆیان دەبێت بە (صدقة جارية) لەدوای مردنیشیان سوودی لێ وەردەگرن. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ: (إذا مـاتَ إبْنُ ادم انقطع عمله إلا من ثلاثٍ: صدقةٍ جاريـة، أو علم ينتفع بـه، أو ولدٍ صالح يدعو لَهُ) رواه مسلم.

٦- عـن أنـس بـن مالـك (رضـي الله عنـه) قـال: قـال رسـول الله (صلى الله عليه وسلم): (إنَّ لله أهلِين من النـاس، قـالوا يارسولَ الله مَن هُمْ؟ قال: هم أهل القرآن أهل الله وخاصته) (صحيح: رواه ابن ماجه) (٢١٥).

أهلِين: وە (اهلون) هەردووکیان کۆن تاکەکەیان (أهل)ە

وخاصتهَ : (خَاصّ) وە (خاصّة) واتە تایبەت..

واتە: بێ گومان خوا لەناو خەڵکیدا نزیکی هەیە (لەپلەو پایەدا)، گوتیان ئەمانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوانە ئەهلی قورئانن (ئەوانەی خوێندویانەو کاریان پێ کردووە ئەوانە) نزیکن لەخواو پیاوە تایەبتەکانی ئەون.

## سورەتی (فاتحة) گەورەترین سورەتە

عن رافع بن المعلّى (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ألا أُعلِّمُك أعظم سورةٍ في القرآن قبل أن تخرج من المسجد؟ فأخَذَ بيدي، فَلَمَّا أردنا أن نخرج قلت يا رسول الله إنك قلتَ: لأُعَلِّمَنكَ أعظم سورةٍ في القرآن؟ قال: الحمد لله رب العالمين، هي السبعُ المثاني والقرآن العظيمُ الذي أُتِيتُهُ. رواه البخاري (٥٠٠٦).

السَّبعُ المثاني: زانایان چەند مانایەكیان بۆ لێك داوەتەوە لەمانە:

١- چونكە لەم سوورەتەدا ئینسان سوپاس و ستایشی خوا دەكات.

٢- چونكە ئەم سوورەتە لەهەموو ركاتێكدا دووبارە دەكرێتەوە.

**ماناى فەرموودەكە:**

رافیعی كوڕی موعەللا (رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی پێم: ئایا گەورەترین سورەتی قورئانت فێر بكەم پێش ئەوەی لەمزگەوت بچیتە دەرەوە؟ دەستی گرتم، جا كاتێ كە ویستمان بچینە دەرەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ فەرمووت گەورەترین سورەتی قورئانت فێردەكەم، فەرمووی: الحمد لله رب العالمين كە ئەویش حەوت ئایەتی دووبارە بووەوەو قورئانی گەورەیە، كە بەمن دراوە.

## سوود:

ماناى سورەتی (فاتحة) لەباسی نوێژ لەبەشی (فاتحة)و ماناكەی لێك دراوەتەوە

## گەورەیی خوێندنی سورەتی (بقرة) و(آل عمران)

١- (عن ابي امامة الباهلي -رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (إقرءُوا القرآن فإنَّهُ يأتي يومَ القيامة شفيعاً لأصحابه، إقرءوا الزّهراوين البقرة وسورة آل عمران، فإنهما تأتيانِ يوم القيامة كأنهما غمامتان، أو كأنهما غيايتان، أو كأنهما فرقان من طير صوافَّ، تحاجان عن أصحابهما.

إقرءُوا سورة البقرة، فإن أخذها بركة وتركها حسرةٌ، ولا تستطيعها البطلة)

قال معاوية بلغني أن البطلة : السحرة. (رواه مسلم/ ٨٠٤).

**واته: قورئان بخوێنن، چونکه ڕۆژی قیامەتێ دێت تکا بۆ هاوەڵانی دەکات، هەردوو شەوقدارەکە بخوێنن (بقرة وآل عمران) چونکە ئەم دوو سوڕەتە لە ڕۆژی قیامەت دێن وەك دوو پەڵە هەور یا وەك دوو سێبەر یا وەك دوو پۆل لە باڵندە کە باڵییان کردبێتەوە بەرگری لە خاوەنەکانییان دەکەن، سوڕەتی (بقرة) بخوێنن چونکە خوێندنی پیت و بەرەکەتە و وازلێهێنانی مایەی داخە، وە کەسانی جادوگەر پێی ناوێرن.**

٢-عن ابي هريرة أنَّ رسول الله (ﷺ) قال: لا تَجعلوا بُيُوتكم مَقابرَ، إنَّ الشّيطانَ يَنْفرُ منَ البيتِ الذي تُقرأ فيه سورةُ البقرة.

رواه: مسلم: (٧٨٠)

**واته: ماڵەکانتان مەکەن بەگۆڕستان، بێگومان شەیتان ڕادەکات لەو ماڵەی کە سورەتی(بقرە)ی تیادا دەخوێنرێ.**

# (آية الكرسي) و ماناكەی

١- عَن أبَـيِّ بـنِ كعـبٍ (رضـي الله عنـه) قـال: قـال رسـول الله (صلى الله عليه وسلم): يا أبا المنذر أتدري أيُّ آيَـةٍ مِن كتـاب الله معك أعظم، قال، قلتُ: الله ورسولُه أعلمْ، قال: يا أبا المنـذر أتـدري أيُّ آيةٍ مـن كتـاب الله معـك أعظـم، قـال، قلـت: (الله لا الـه الله الا هُـوَ الحي القيوم) قال: فـضرب في صـدري وقـال: والله ليهنـك العلـم أبـا المنذر، رواه مسلم (٨١٠) وابو داود (١٤٦٠).

واتـه: ئوبـەی كـوڕی كـەعب ( ڕەزای خـوای لـیٚ بێـت) دەڵـیٚ: پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) فـەرمووی: ئـەی (ابـو المنـذر) ئایـا دەزانـی چ ئایـەتێك لـەكتێبی خـوا لای تـۆ لەهـەمووی گـەورەترە؟ ئوبـەی دەڵـیٚ، گـوتم: خـواو پێغەمبـەری خـوا زانـاترە، فـەرمووی ئـەی (ابـو المنـذر) ئایـا دەزانـی چ ئایـەتێك لەكتێبی خـوا لای تـۆ گـەورەترە؟ ئوبـەی دەڵـیٚ، گـوتم: (الله لا الـه الا هـو الحـيُّ القيـوم) ئوبـەی دەڵـیٚ: پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) دەسـتی لەسـینگم دا فـەرمووی: بـەخوا (پێكاوتـە) زانـست و زانیاریـت لـیٚ پیرۆزبێـت ئـەی (ابـو المنذر).

# مانای (آية الكرسى)
# ئایەتی (٢٥٥) لەسوورەتی (البقرة).

(الله لا اله إلا هو) خوا ئەو خوایەیە كە هیچ پەرستراوێكی (ڕاست) نییە بێجگە لەو.

یا بەشێوەیەكی تر بڵێین: خوایە كە ناوی (الله)یە هیچ پەرستراوێكی تر نییە بەڕاستی و هیچ شتێك شیاو و شایانی پەرستن نییە بێجگە لەو.

(الحيُّ القَيّوم) زیندووەو سەرپەرشتیكەرە.

(الحـيّ) زينـدووه بـەبێ سـەرەتاو دوايـی هـاتن واتـه نـەبوونی نـەبووه و نەمانيشی بۆنييه، كەواته زيندوويەكەی لەخۆيەتی لەغەيری خۆی دەست كەوتی نەبووه.

(القيوم) تەدبيركەرو راگری بوونەوەره بەگياندارو بێ گيانييەوه.

(لا تأخـذهُ سـنة ولا نـوم) نـه بـۆرژان دەيگـرێ و نەخـەو، يـا بڵـێين: نەوەنەوز ئەيگرێ و نەخەو.

چـونكه ئەگـەر يـەكێك لـەم دووانـه بەسـەر خـودادا بێـت بوونـەوەرتێك دەچێت.

(لَهُ مافي السماوات وما في الأرض) هەرهی ئەوه هەرچی لەئاسمانەكان و هەرچی لەزەوی دايه.

(من ذا الذي يشفَعُ عنده إلاّ بإذنه) كێيه ئەوكەسەی لـەو رۆژەدا بتـوانێ تكای لەلا بكات مەگەر به رێپێدانی خۆی.

(يعلــم مــابين أيــديهم ومــا خلفهــم) ئاگــاداره بەئــەوەی بەبــەردەمی (ئـادەمی)يەوەيـه (لـه دونيـا لەبەردەسـتياندايه) وه ئـەوەی لەدواوەيـەتی (لەرۆژی دواييدا بۆيان ئامادەكراوه).

عن السدي (يعلم مابين أيديهم) قال: مابين أيـديهم فالـدنيا (ومـا خلفهـم) فالآخرة.

واته: (سدی) دەڵـێ: (مـابين أيـديهم) ئەمـه مەبەسـت پێـی دونيايـه (ومـا خلفهم) ئەمه مەبەست پێی دوا رۆژه.

واتـه: خـوا دەزانـێ و ئاگايـه بەهـەموو كاروبـاری جيهـانی، هەرچـی وا لەئاسمانەكان و زەويدا، وه بەهەموو كاروباری رۆژی دواييان.

(ولا يحيطـون بـشيء مـن علمـه إلا بمـا شـاء) وه كـەس ئاگـای لـەهيچ زانينێكی ئەو نييه مەگەر بەوەی كەخۆی بيەوێ.

(وَسِعَ كرسِيّهُ السماواتِ والأرضَ) كورسی خوا هەموو ئاسمانەکان و زەویی گرتۆتەوە.

یا بڵێین: کورسی خوا فراوانی هەیە بۆ ئاسمانەکان و زەوی و هەمووی ئەگرێتەوە و دەوری داوان.

قال السدی: (السموات والأرض في جوف الكرسي والكرسي بين يدي العرش) واتە: ئاسمانەکان و زەوی لەناو کورسی دان، کورسیش لەژێر عەرش دایە.

(وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَا) وە پارێزگاری کردنی ئاسمانەکان و زەوی قورس و گران نییە لەسەری.

یا بەم شێوە: وە ئاگاداری کردن و پارێزگاری ئاسمانەکان و زەوی خوا ماندوو ناکات و ئەرك و زەحمەتی نییە بۆی.

عن ابن عباس (رضي الله عنه): في قولهِ تعالى ﴿ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَا ﴾ قال لا يثقل عليه حِفظهما، واتە: وە گران نییە لەسەری پارێزگاری کردنیان.

(وهو العليُّ العظيم) وە ئەوە، بڵند و گەورەیە.

یا بڵێین: وە ئەوە، بڵند پلەی پایە گەورە.

## دووئایەتی کۆتایی سورەتی (بقرة)

١- عن أبي مسعود البدريّ (رضي الله عنه) عن النبيّ (صلى الله عليه وسلم) قال:

( مَنْ قرأ بالآيتين من آخرِ سُورةِ البقرة في ليلةٍ كفتاهُ) رواه

البخاري (٥٠٠٩) و مسلم (٨٠٨).

واتـه: هەركەسـێك دوو ئايـەتى كۆتـايى سـورەتى (البقـرة) بخوێنێ لەشەوێكدا بەسيەتى (له قيام الليل).

## سوود:

شـەو كاتەكـەى دەسـت پـێ دەكـات، لـه رۆژئـاوا بوونـەوە تـا بـانگى بەيانى يا تا (طلوع الفجر).

جا هـەر موسـڵمانێك لەشـەوێكدا ئەم دوو ئايەتـه بخـوێنێ كەلـه (ءَامن الرَّسول) دەست پێ دەكات تا كۆتايى (بقره) ئەوە بەسيەتى، (قيل: كفتاه المكروه تلك الليلة) واته: گوتراوە: بەسيەتى بۆ پارێزران لەشەڕ و زيـانى ئەم شەوە.

٢- عن ابن عباس قال، بينما جِبريلُ قاعد عند النبيِّ (ﷺ). سمع نقيضاً مِن فوقهِ فرفَعَ رأسه فقال: هذا باب من السَّماء فُتح اليومَ ولم يُفتح قطُّ الّا اليومَ ، فنزلَ منه ُ ملكٌ فقال: هذا ملكٌ نزل إلى الأرضِ لم ينزل قطُّ الاّ اليومَ فسلَّمَ وقالَ: أبشِرْ بنورين أُتيتَهما. لم يؤْتهما نبيٌّ قبلك: فاتحةِ الكتاب، وخواتيم سورةِ البقرةِ، لنْ تقرأ بحرفٍ منها إلا أعطيتَه. رواه مسلم(٨٠٦).

١- النقيض: الصوت، دەنگ

واته: (ابن عباس) دەڵێ: لەكاتێكدا جيبريل لەلاى پێغەمبەر (ﷺ)، دانيشتبوو، گوێ ى لەدەنگێك بوولەسەرووى خۆيەوە، جاسەرى بەرزكردەوە.

فەرمووی (واتە جیبریل): ئەوە دەرگایەك بوو لەئاسمان ئەمڕۆ کرایەوە قەت نەکراوەتەوە ئەمڕۆ نەبێت، فریشتەیەکی لێ دابەزی فەرمووی: ئەوە فریشتەیەك بوو دابەزی بۆ سەر زەوی قەت دانەبەزیوە ئەمڕۆ نەبێت جا سەلامی کرد، وەفەرمووی: موژدەت لێ بێت بەدوو نورو روناکی کە پێت دراوە، بەهیچ پێغەمبەرێك نەدراوە لەپێش تۆ، سورەتی (فاتحة) وە کۆتاییەکانی سورەتی (بقرة) هیچ پیتێکی لێ ناخوێنی ئیللا پێت دەدرێ (بۆ نموونە کەلەکۆتاییەکانی سورەتی (بقرة) دەڵێ: (واعفُ عنّا واغفر لنا وارحمنا) خوا ئەم داواکاریانەت هەمووی بۆ جێ بەجێ دەکا.

٣- عن النعمان بن بشير أن رسول الله (ﷺ)، قال: إنّ الله كتب كتاباً قبل أن يخلقَ السماواتِ والأرض بألفي عامٍ أنزلَ منهُ آيتين خَتم بهما سورة البقرة ولايُقرآن في دار ثلاثَ ليال فيقربها الشيطان. **صحيح : رواه الترمذي (٢٨٨٢) والحاكم (٢٠٦٥) والدرامي (٣٣٧٨).**

واتە: بێ گومان خوا کیتابێکی نوسیوە پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات بەدوو هەزار ساڵ، وە دووئایەتی دابەزاندووە لەم کیتابە کۆتایی سورەتی(بقرة)ی پێهێناوە، ناخوێنرێن لەماڵێك سێ شەوان شەیتان نزیکی ئەو ماڵە بکەوێتەوە(واتە ئەگەر سێ شەوان لەماڵێك بخوێنرێ شەیتان نزیکی ئەو ماڵە ناکەوێتەوە).

## خوێندنی سورەتی (کهف)

**عن ابي سعيد الخدريّ (رضي الله عنه) أن النبيّ (صلى الله عليه وسلم) قال: من قرا سورة الكهف في يوم الجمعةِ أضاء لَهُ من النور مابين الجمعتين، رواه ابن ماجه والحاكم والبيهقي**

وصححه الالباني في صحيح الجامع.

واتـه: هەریـەكێك سـورەتی (كهـف) بخـوێنیٚ لـەرۆژی هەینیـدا نێـوانی هەردوو هەینیەكەی بۆ رۆشن دەبێتەوە.

٢- عن أبي سعيد الخدري قال: من قرأ سورة الكهف ليلة الجُمعة أضاءِ لَهُ من النور فيما بينه وبين البيتِ العتيق[١].

صحيح: رواه: الدارمي (٣٤٠٧).

واته: هەر يەكێك سورەتی (كهف) بخوێنیٚ لەشەوی جومعەدا نێوانی خۆیو كەعبەی بۆ رووناك دەبێتەوە.

## سورەتی (ملك) و (سجدة)

١- عـن جـابر (رضـي الله عنـه) أن الـنبيّ (صـلى الله عليـه وسـلم) كـان لاينـامُ حتـى يقـرأ ﴿الم تنزيـل﴾ و ﴿تَبَـٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ﴾ صحيح رواه الترمذي (٢٨٩٢).

واتـه: جـابر (رەزای خـوای لـیٚ بێـت) دەڵـیٚ: پێغەمبـەر (صـلى الله عليـه وسلم) نەدەخەوت تاوەكو سورەتی (سجدة) و (مُلْك)ی نەخوێندبايەوە.

يەكێك لەو شتانەی كە موسڵمان بەهۆیەوە دەربازی دەبێت لەسزای گۆڕ، خوێندنی سورەتی (ملك)ە واتە: ﴿تَبَـٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ﴾.

---

(1) قال حسين سليم اسد: اسناده صحيح إلى ابي سعيد وهو موقوف عليه.

**سوود**:

**عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: من قرأ (تبارك الذي بيده الملك) كُلَّ ليلةٍ منَعَهُ الله عز وجل بها من عذاب القبر) رواه النسائي واللفظ له والحاكم وقال صحيح الأسناد.**

**واته: (عبدالله)ی کوڕی مسعود (رەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: هەریەکێك هەموو شەوێ ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾. بخوێنێ، خودا بەهۆی خوێندنی مەنعی دەکات لەسزای ناو گۆڕ.**

٢- عن عبدالله بن مسعود قال: قال رسول الله (ﷺ):

سورة تبارك هي المانعة من عذاب القبر. **صحيح: انظر (صحيح الجامع - ٣٦٤٣).**

**واته: خوێندنی سورەتی ( تبارك) ڕێگرە لە سزای قەبر.**

٣- عن أبي هريرة، عن النبي (ﷺ)، قال: إنَّ سورةً من القرآن ثلاثون آيةً شَفَعتْ لِرجلٍ حتى غُفِر له، وهي سورةُ تبارك الذي بيده الملك. **حسن : رواه أبو داود (١٤٠٠) والترمذي (٢٨٩١).**

**واته: بێ گومان سورەتێك لەقورئان دا سی ئایەتە تکای کرد بۆ پیاوێك تاوەکو لێی بوردرا، ئەم سورەتەش سورەتی (تبارك الذي بيده الملك)ە**

## سورەتی (کافرون)

**١-عن ابن عمر (رضي الله عنه) قال: رمقْتُ النبيّ (صلى الله عليه وسلم)شهراً وكانَ يقرأ في الرَّكعتين قبل الفجر (قل يا أيّها الكافرون) و(قل هو الله أحد) صحيح رواه الترمذي (٤١٧).**

واته: (عبدالله) کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لیّ بێت) دەڵێ: ماوەی مانگێك چاوم بڕیبووە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەدوو ركات سوننەتی پێش نوێژی سبەینێ (قل يا أيّها الكافرون) وە (قل هو الله أحد)ی دەخوێند.

٢- عن أنس قال: قال رسولُ الله (ﷺ) من قرأ.... (قل ياأيها الكافرون) عَدَلَتْ له بربع القرآن، ومن قرأ (قل هو الله أحد) عدلَتْ له بثلث القرآن)

حسن: رواه الترمذي (٢٨٩٣) انظر: (صحيح الجامع -٦٤٦٦).

واته: هەریەکێك (قل ياأيهاالكافرون) بخوێنێ، بارتەقای خوێندنی چواریەکی قورئانە بۆی، وەهەریەکێك (قل هو الله أحد) بخوێنێ، بارتەقای خوێندنی سێیەکی قورئانە بۆی.

## سورەتی (اخلاص)

١- عن أبي سعيد الخدريّ (رضي الله عنه) أن رسولَ الله (صلى الله عليه وسلم) قال: في (قل هو الله أحد) والذي نفسي بيده إنها لتعدلُ ثلثَ القرآن. رواه البخاري (٥٠١٣).

واته: ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی (قل هو الله احد) فەرمووی: سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەستە، بێ گومان (قل هو الله أحد) یەکسانە بە سێیەکی قورئان.

واتە پاداشتی خوێندنەکەی بەرامبەر سێیەکی قورئانە، یانی هەریەکێك یەك جار (قل هو الله احد) بخوێنێ خێری خوێندنی (١٠) جزء

قورئانی بۆ دەنووسرێ.

٢- عن ابي الدرداء (رضي الله عنه) عن النبيّ (صلى الله عليه وسلم) قال: (أيعجز احدكم أن يقرأ في ليلة ثلث القرآن) قالوا: وكيف يقرأ ثلث القرآن؟ قال: (قل هو الله احد) تعدلُ ثلث القرآن، رواه مسلم (٨١١).

واتە: ئەوە یەکێك لەئێوە ناتوانێ لەشەوێکا سێیەکی قورئان بخوێنێ، وتیان: جا سێیەکی قورئان چۆن دەخوێندرێت؟ فەرمووی: (قل هو الله احد) بەرامبەر سێیەکی قورئانە.

٣- عن معاذ بن أنس الجهني (رضي الله عنه) عن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال: من قرأ: قل هو الله احد، حتى يختمها عشر مرّات بنى اللهُ لَهُ قصراً في الجنة، **اخرجه احمد والدرامي والطبراني وصححه الالباني.**

واتە: هەریەکێك (١٠) جار (قل هو الله احد) بخوێنێ تا تەواوی دەکات خودا (قصر)ەکی لەبەهەشت بۆ دروست دەکات.

## خوێندنی سورەتی (فلق) و (ناس)و ماناکەیان

١- عن عقبة بن عامر (رضي الله عنه) أنَّ رسولَ الله (صلى الله عليه وسلم) قال: الم تر آياتٍ أُنزلَتْ هذهِ الليلة لم يُر مثْلُهنَّ قطُّ قُل أعوذ بربّ الفلق وقل اعوذ بربّ الناس) رواه مسلم(٨١٤) والترمذي(٢٩٠٢) .

واتە: ئایا نابینیت هەندێ ئایەت ئەم شەو نێرراونە خوارەوە قەت

شتی وا نەبینراوە (قل اعوذ برب الفلق) وە (قل اعوذ برب الناس).

٢- عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) قال: (كان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يتعوذ من الجانّ وعين الإنسان حتى نزلَت المعوّذتان، فَلما نَزَلتا، اَخَذَ بهما وترك ما سواهما) صحيح رواه الترمذي (٢٠٥٨).

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆی دەپاراست لە جنۆکەو چاوی ئادەمیزاد تا سورەتی (فلق) و (ناس) هاتنە خوارەوە، جا کاتێك ئەم دوو سورەتە هاتنە خوارەوە دەستی پێوەگرتن و وازی لە جگە لەم دووە هێنا.

## مانای سوورەتی (فلق):

(بسم الله الرحمن الرحيم) بەناوی خوای بەبەزەیی و بەخشندە.

(قل اعوذ برب الفلق) (ئەی محمد، صلى الله عليه وسلم) بڵێ: خۆم دەپارێزم بە دروستکەری بوونەوەر.

الفلق: الصبح، وقيل: جميع المخلوقات.

ئەگەر (الفلق) بە (الصبح) لێك بدەینەوە مانای ئایەتەکە وای لێدێت: (بڵێ: خۆم دەپارێزم بەپەروەردگاری بەیان).

(مِن شَر ما خلق) لەزیانی ئەوەی کە دروستی کردووە.

(ومِن شَر غاسقٍ اذا وقبَ) وە لەزیانی تاریکی کاتێك کە دابێ.

عن مجاهد: قولهُ (غاسقٍ) قال: الليل (اذا وقبَ) قال: اذا دخل، واتە: (مجاهد) دەڵێ (غاسق) واتە: شەو (اذا وقبَ) واتە: کاتێك کە بێت.

شەو: کاتەکەی دەست پێ دەکات لە رۆژئاوابوونەوە تا بانگی بەیانی.

(ومـن شـر النفاثـاتِ في العقـد) وه لـەزيانی فووكـەران (جادووكـەران) بەگرێياندا.

النفاثـات: (النفّاثـة) سـيغەی موبالەغەيـە، بـۆ نێـرو مـێ دەگـوترێ، كۆيەكەی (النفاثات)ە.

العقد: كۆی (عقدة)يە واتە: گرێ.

(ومن شر حاسدٍ اذا حسد) وه لەزيانی حەسوود كاتێك كە حەسوودی ببات.

## مانای سوورەتی (ناس)

(بسم الله الرحمن الرحيم) بەناوی خوای بەبەزەيی بەخشندە.

(قل أعوذ برب الناس) (ئەی موحەمەد، صلى الله عليه وسلم) بڵێ: خۆم دەپارێزم بەپەروەردگاری خەڵكی.

(ملك الناس) پادشای خەڵكی (إله الناس) پەرستراوی خەڵكی.

(مـن شـر الوسـواس الخنـاس) لـەزيانی وەسوەسـە پەيداكـەری خـۆ پەنهانكەر.

(قتادە) دەڵێ: (الوَسْواس) واتە: شەيتان.

(الخنـاس) الـذي يخـتبيء ويرجـع، واتـە: ئـەوەی خـۆی دەشـارێتەوەو دەگەڕێتـەوە، شـەيتان كاتێـك ئينـسان يـادی خـوا بكـات خـۆی دەشـارێتەوە كاتێك كە بێ ئاگا بوو دەست دەكات بە وەسوەسە.

(الذي يوسوس في صـدور النـاس) ئەوەی كـە وەسوەسـە دەكـات لـەدڵی خەڵكيدا.

(من الجنة والناس) لەجنۆكەو لەئادەميزاد.

# گەورەیی گوێ گرتن بۆ قورئان

خوا دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ (الأعرف: ٢٠٤).

واتە: وەکاتێك کە قورئان خوێندرا گوێ بگرن بۆی وە بێ دەنگیش بن بەڵکو میهرەبانیتان پێ بکرێ.

زانایـان زۆر تەفـسیریان بـۆ ئـەم ئایەتـە کـردووە، بـەڵام رووکـەش و رواڵـەتی ئـەم ئایەتـە ئەوەیـە: وەك زانایـانی زاهـیری ئەفـەرموون: کەلەهـەر شوێنێ و لەهەر کاتێ و لەبەر هەر هۆیە قورئان خوێنرا، پێویست و فەرزە گوێگرتن بۆی‌و بێ دەنگ بوون.

عـن مجاهـد يقـول في هـذه الآيـة: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟﴾ (الاعراف:٢٠٤) قال : في الصلاة والخطبة يوم الجمعة.

واتـە: مجاهـد دەربارەی ئـەم ئایەتـە دەفـەرمووێ: ئەمـە بۆکـاتی نوێـژ و خوتبەی رۆژی هەینییە.

وە (طبري)یش ئەم تەفسیرەی پێ لەهەموویان بەهێزترە.

(ابن كثير) لە تفسیرەکەیدا دەڵێ: عن مجاهد قال: لا بأس اذا قرأ الرجلُ في غـير الـصلاة أن يـتكلم، وكـذا قـال سـعيد بـن جـبير والـضحاك وابـراهيم النخعي وقتادة والشعبي والسدى وعبدالرحمن بن زيـد بـن أسـلم: أن المـراد بذلك في الصلاة.

واتە: موجاهید (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: موسڵمان گوناهبـار نابێـت ئەگـەر لـەدەرەوەی نوێـژ قورئـان خـوێنراو ئـەو قـسە بکـات وە بـەم

شێوەش سەعیدی کوڕی جوبەیر و (ضحاك) و ابراهیمی نەخەعی و قەتادە و شعبی و سدی و عبدالرحمن کوڕی زەیدی کوڕی (أسلم) فەرموویانە: مەبەست پێی لەوە لەناو نوێژە.

بەڵام موسڵمان با هەوڵ بدات وەکو ئەوە بکات کە زانایانی زاهیری فەرموویانە.

وە خوا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُمۡ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَمَغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٤﴾﴾ (الانفال:٢-٤).

واتە: بێ گومان بڕواداران تەنها کەسانێکن کە کاتێك کەباسی خوا کراو ناوی هێنرا دڵیان دەترسێت و ترسی لێ دەنیشێت، کاتێکیش ئایەتەکانی خوا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بڕوایان زیاد دەبێت و هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن(٢) ئەوانەن کەبەڕاستی نوێژەکانیان بەجێ دەهێنن وە لەو رسق و رۆزیەی پێمان داون دەیبەخشن(٣) هەر ئەوانە بڕوادارانی راستەقینە پلەی بەرزیان بۆ هەیە لای پەروەردگاریان، وە لێ خۆشبوون و رۆزی پەسەند و چاك (یان بۆ هەیە)(٤).

١- عن ابن مسعود (رضي الله عنه) قال: قالَ لي النبيّ (صلى الله عليه وسلم): اقرأ عليَّ القرآنَ، فقلتُ: يارسولَ الله أقرأُ عليك

وعليك انزلَ؟! قال: إني أحبُّ أن اسْمَعَهُ من غيري، فقرأتُ عليه سورة (النساءِ) حتى جئتُ إلى هذه الآية ﴿فكيف إذا جئنا من كل أمةٍ بشهيدٍ وجئنا بك على هؤلاء شهيداً﴾ قال: حَسْبُك الآن فالتفتُ إليه فاذا عيناهُ تذرفان. رواه البخاري (٤٥٨٢)ومسلم(٨٠٠).

واته: (عبدالله)ی كوڕی (مسعود) (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم: قورئانم بۆ بخوێنە، دەڵێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا قورئان بۆتۆ بخوێنم كە بۆتۆ دابەزیوە؟ فەرمووی: من حەزدەكەم لەغەیری خۆمەوە گوێم لێ بێت، منیش سورەتی (النساء)م بۆ خوێندەوە تا گەیشتمە ئەو ئایەتە ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَـٰؤُلَاءِ شَهِيداً﴾ ( النساء:٤١)

فەرمووی: ئێستا ئەوەندە بەسە، تەماشام كرد بینیم چاوەكانی فرمێسكیان لێ دەهاتە خوارەوە.

٢- عن انس (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) لِأُبي بن كعب: (إن الله أمرني أن أقرأ عليك (لم يكن الذين كفروا) قال: وسماني لك؟ قال: نعم فبكى، رواه البخاري ومسلم.

واته: ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بە ئوبەی كوڕی كەعب، خودا فەرمانی پێ داوم كە سوورەتی (لم يكن الذي كفروا) بخوێنم بۆت، ئوبەی وتی: ناویشی هێنام لات؟ فەرمووی: بەڵێ، ئوبەی لەخۆشیاندا دەستی كرد بەگریان.

جا هەروەكو چۆن ئەوكەسەی كە قورئان دەخوێنێ چ پاداشتێكی بۆ هەیە هەمان پاداشتیش هەیە بۆ ئەو كەسانەی كە گوێی بۆ دەگرن.

جا سوپاس بۆ خوا هەریەکێك بیەوێ لەرێگای بیستنی قورئاندا پاداشت کۆ بکاتەوە کارەکە زۆر ئاسان بووە لەماڵ بێت یا لەسەیارە یا لەدوکان یا لەهەر شوێنێکی تر لەرێگای رادیۆ یا تەلەفزیۆن یا تەسجیل یا قەناتە فەزاییەکان یا شتی تر دەتوانی گوێ بیستی چەندین دەنگی خۆش و خوێندنەوەی قورئانی رێك و پێك بێت لەم رێگایەوە پاداشتی گەلێك زۆر بۆخۆی کۆبکاتەوە.

## خوێندنی قورئان بۆ ریابازی

١-عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسولَ الله (صلى الله عليه وسلم) يقول: (إنَّ أوَّلَ الناس يُقضى يوم القيامة عليه رجل استشهدَ، فَأُتيَ به، فعَرَّفَهُ نعمهُ، فعَرَفَها، قال: فما عملت فيها؟ قال: قاتلت فيك حتى استُشهدتُ، قال كَذَبْتَ، ولكنَّكَ قاتلت لأَن يُقال جريٌّ! فقد قِيلَ، ثمَّ أمر به، فَسُحِبَ على وجهه حتى أُلقي في النار.

ورجلٌ تعلمَ العلم وعملَهُ، وقرأ القرآن، فَأُتيَ بِهِ، فعرَّفَهُ نِعَمه فعرفها، قال: فما عملت فيها؟ قال: تعلمت العلم وعلمتهُ، وقرأتُ فيك القرآن، قال: كذبتَ، ولكنك تعلمت ليقال: عالم، وقرأت القرآن ليقال هو قاريءٌ! فقد قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ، فسحب على وجهه حتى أُلقي في النار.

ورجل وسَّعَ الله عليه، وأعطاهُ من أصناف المال، فأُتِيَ بِهِ فعرفهُ نِعَمَهُ، فعرفها، قال: فما عملت فيها؟ قال: ماتركت من سبيل تحبُّ

أن يُنفقَ فيها إلاّ أنفقتُ فيها لك، قال: كذبت، ولكنّك فعلت ليقال: هو جوادٌ! فقد قيل، ثُمَّ أُمر به فَسُحب على وجهه ثمَّ أُلقيَ في النار. رواه مسلم (١٩٠٥).

فَأُتِيَ به: (جاءت به الملائكة يوم القيامة) فریشته دەیهێنن لەقیامەت.

جريء: ئازا.

جواد: سەخی.

واتە: یەکەم کەس کە لەرۆژی قیامەتدا مەحکەمە دەکرێ و حوکم دەدرێ پیاوێکە شەهیدکراوە، دەیهێنن، خودا چاکەکانی خۆی یەکە یەکە بیردەخاتەوە ئەویش یەك بەیەك دەیانناسێتەوە.

جا خوا دەفەرموێ: لەجیاتی ئەو چاکانە تۆ چی کارێکی باشت کردووە؟

دەڵێت: لەپێناوی تۆدا جەنگاوم هەتا شەهید کراوم، دەفەرمووێت: درۆت کرد، بەڵکو بۆئەوە جەنگاویت کە بڵێن ئازایە، وە ئەمەش گوترا.

پاشان فەرمان دەکرێت لەسەر روو رادەکێشرێت هەتا فڕێ دەدرێتە ئاگری دۆزەخەوە.

وە پیاوێك فێری زانیاری بووەو خەڵکی فێر کردووەو قورئانی خوێندووە دەیهێنن، خودا چاکەکانی دەخاتەوە بیری ئەویش دەیانناسێتەوە.

دەفەرمووێت: تۆ لەجیاتی ئەمانە چی کارێکی باشت کردووە!

دەڵێت: زانست فێربووم و خەڵکیشم فێرکردو لەبەر رەزامەندی تۆ قورئانم خوێند.

خوا دەفەرمووێ: درۆت کرد، بەڵکو تۆ بۆیە فێری زانین بووی تا بڵێن زانایە، وە بۆیە قورئانیشت خوێندووە تا بڵێن قورئان خوێنە، وە ئەم

قسەش گوترا.

پاشــان فــەرمان دەکرێــت و لەســەر رووی رادەکێــشرێت هــەتا فــڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

وە پیاوێك کـە خـودا لـەدونیادا داراو دەوڵەمەنـدی کـردووەو لەهـەموو چەشنە ماڵێکی پێ داوە، دەیهێنن، خودا چاکەکانی خۆی وەبیر دەخاتـەوە ئەویش دەیانناسێتەوە.

خودا دەفەرمووێت: چیت پێ کردن.

دەڵێـت: هـیچ رێگەیـەکم نەهێـشتەوە کـەتۆ پێـت خـۆش بێـت تیایـدا ببەخشرێتەوە، ئیللا بەخشیمەتەوە تیایدا لەبەر تۆ، خـودا دەفـەرمووێت: درۆت کرد، بەڵکو بۆیە وات کرد تا بڵێن سەخییە، وە ئەم قسەیەش گوترا.

پاشـان فـەرمان دەدرێـت و لەسـەر رووی رادەکێشرێت و فـڕێ دەدرێتـە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

## سوود

ئێمە بۆئەوەی لەقیامەتدا پاداشت لەسەر چاکەکانمان وەربگرین دەبێ چوار شتمان تێدا بێتەجێ:

١- دەبێ بڕواداربین، چونکە ئەگەر بڕوادار نەبین لەقیامەتـدا سـوود لەکردەوەو چاکەکانمان وەرناگرین.

٢- دەبـێ ئـەوکارەی کەدەیکـەین بەڵگەیـەکی شـەرعی لەســەربێت کەئەمە کارێکی چاکەو داهێنراو (بدعة) نییە.

٣- دەبێ لەکردنی کارە چاکەکەدا مەبەستمان تەنها خودا بێت.

٤- دەبـێ بـەئیمان داریـش بمـرین، چـونکە ئەگـەر تـۆ لەسـەرەتای ژیانـت بـڕوادار بوویـت و کـاری چـاکەت زۆر کـرد بـەڵام لەکۆتاییـدا

بەكافری مردی ئەوە كردەوەكانت هەمووی دەسڕێتەوە.

جـا ئەوكەسـەی كەدەیـەوێ پاداشـت لەسـەر قورئـان خوێندنەكـەی وەربگرێ دەبێ تەنها لەبەر خوا بیخوێنێ، موسڵمان ئەگەر بیەوێ بەهۆی ریابازییەوە پلەو پایە بەدەست بێنێ لەدڵی خەڵكا ئەوە بەهەڵە داچووە. رێز و قەدری ئادەمیزاد بەختەوەری ئادەمیزاد لەدونیاو لەقیامەت بەهۆی تەقوایە، بێ رێزی و بەدبەختیشی لەدونیاو لەقیامەتدا بەهۆی تاوان و گوناهە.

## سەجدەی خوێندنی قورئان

١- عن ابن عمر (رضي الله عنهما) قال: (أن النبيَّ (صلى الله عليه وسلم) كان يقرأ القرآن، فيقرأ سورة فيها سجدة، فيسجدُ ونسجُدُ معه، حتى مايجد بعضنا موضعاً لمكانِ سَجْدتِهِ) رواه البخاري (١٠٧٥) ومسلم (٥٧٥).

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كاتێك قورئانی دەخوێند جاری وابوو سوورەتێكی دەخوێند كە سەجدەی تێدابوو، جا ئەو سەجدەی دەبرد و ئێمەش سەجدەمان لەگەڵ دەبرد، هەتا جاری وابوو هەندێكمان شوێنی سەجدە لەسەر بردنمان دەست نەدەكەوت.

### سوود

١-لەلای زۆربەی هەرە زۆری زانایان سوننەتە كە قورئان خوێن لە نوێژو غەیری نوێژیشدا هەروەها ئەو كەسانەی كەلە دوایەوە نوێژ دەكەن، ئەگەر ئیمام بوو، یان ئەوانەی كە گوێی لێ دەگرن ئەگەر لەغەیری نوێژدا

بوو، لەکاتی خوێندنی یەکێك لەو ئایەتانەدا کە بەئایەتی سەجدە ناسراون سەجدە بەرێ.

٢- بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سورەتی (نجم)ی خوێنووە سەجدەی بردووە.

٣- هەروەها (زيد بن ثابت) (خوا لێی رازی بێت) گێڕاویەتیەوە کە سوورەتی (نجم)ی بەسەر پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) خوێندووە و سەجدەی نەبردووە، رواه البخاري ومسلم.

٤-وە هەروەها (بخاری) گێڕاویەتیەوە کە (عمر بن الخطاب) (رەزای خوای لێ بێت) لەرۆژی هەینیدا سوورەتی (النحل)ی لەسەر مینبەرداخوێندووەو هەتا گەیشتۆتە شوێنی سەجدە ئەوجا دابەزیوەو سەجدەی بردووە و خەڵکیش سەجدەیان بردووە لەگەڵیدا، بەڵام بۆ جومعەی داهاتوو هەمان سوورەتی خوێندووەو لەشوێنی سەجدەش سەجدەی نەبردووە ئەوجا بەخەڵکەکەی گوتووە: ئەی خەڵکینە ئێمە فەرمانمان پێ نەکراوە سەجدەی قورئان خوێندن بەرین جا هەرکەس سەجدەی بردووە پێکاویەتی، ئەوکەسەش کە سەجدەی نەبردووە گوناحی ناگاتێ.

# شوێنەکانی کڕنووش (سجده)
# (١٥) شوێنن کە ئەمانەن

١- الأعراف / ٢٠٦

٢- الرعد / ١٥

٣- النحل / ٤٩

٤- الاسراء / ١٠٧

٥- مريم / ٥٨

٦- الحج / ١٨

٧- الحج / ٧٧

٨- الفرقان / ٦٠

٩- النمل / ٢٥

١٠- السجدة / ١٥

١١- ص / ٢٤ ئەمە سەجدەی شوکرە

١٢- فصلت / ٣٧

١٣- النجم / ٦٢

١٤- الإنشقاق / ٢١

١٥- العلق / ١٩

جا ئێستا لە قورئانەکاندا لەشوێنی سەجدەکەدا نیشانەیەکی بەم شێوە ⬆ کراوە.

# چۆنیەتی بردنی سەجدەی قورئان خوێندن

ئیبین باز دەڵێ: سەجدەی قورئان خوێندن یەك جار گوتنی (الله اکبر)ی تێدایە ئەویش ئەو کاتەیە کە دەچی بۆ سەجدە بەڵام کە لەناو نوێژ سەجدەی قورئان خوێندن ببەی پێویستە دووجار (الله اکبر) بڵێی لەکاتی چوونە سەجدە وەلە کاتی هەستانەوە.

جا دەڵێ: دەست نوێژ مەرج نی یە بۆ سەجدەی تیلاوە، وەهەروەها سەلام دانەوەشی تیادا نییە[1].

(ابن حزم) لە (اَلمُحَلّی)دا دەڵێ:

(لیس السجود فرضاً لکنه فضل، ویسجد لها في الصلاة الفریضة والتطوع، وفي غیر الصلاة في کل وقت، وعند طلوع الشمس وغروبها واستوائها إلی القبلة وإلی غیر القبلة، وعلی طهارة وعلی غیر طهارة).

واتە: سەجدەی (تلاوة) فەرز نییە بەڵکو سوننەتە، وە ئەم سەجدەیە دەبردرێ لەناو نوێژی فەرزو سوننەت، وە هەروەها لەدەرەوەی نوێژیش وە لەهەموو کاتێکیشدا، لەکاتی رۆژهەڵاتن لەکاتی ئاوابوونی رۆژ وە لەکاتێ کە رۆژ لەناوەندی ئاسماندایە (استواء) بەرەو قیبلە بێ یا بەرەو قیبلە نەبێت، دەست نوێژی هەبێت یان نەبێت.

وە ئیمام (بخاری) ریوایەتی کردووە لە (ابن عمر) کە ئەم سەجدەیەی بەبێ دەستنوێژ بردووە.

---

[1] فتاوي مهمة تتعلق بالصلاة، ابن باز

# چی دەگوترێ لەسەجدەی قورئان خوێندن

١- عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: كان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يقولُ في سجود القرآن بالليل يقول في السجدة مراراً (سجد وجهي للذي خلقه وشق سمعه وبصرة بحوله وقوته) صحيح: رواه ابو داود(١٤١٤) والترمذي (٥٨٠).

واتە: عائشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەشەو لەسەجدەی خوێندنی قورئان چەندجار دەیفەرموو (سجد وجهي للذي خلقه وشق سمعه وبصره وبحوله وقوته) واتە: ڕووم کڕنووشی برد، بۆ ئەو زاتەی کە دروستی کردووەو وێنەی کێشاوە، وە بەهێزو تواناى خۆی بیستن و دیتنی تێدا پەیدا کردووە.

٢- عن ابن عباس قال: كنت عند النبي (صلى الله عليه وسلم) فأتاه رجل فقال: إني رأيت البارحة - فيما يرى النائم - كأني أصلي إلى أصل شَجَرةٍ، فقرأت السجدة فسجدتُ، فسجدت الشجرة لسجودي، فسمعتها تقول: اللهم احْطُطْ عني بها وِزراً، واكْتُبْ لي بها أجراً، وَاجْعلها لي عندك ذُخْراً.

قال ابن عباس: فرأيت النبي (صلى الله عليه وسلم) قرأ السجدة فسجد فسمعته يقول في سجوده مثل الذي أخبره الرجل من قول الشجرة. حسن رواه الترمذي (٥٧٩) وابن ماجه (١٠٥٣).

واتە: ابن عباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: لەلای پێغەمبەر بووم (صلى الله عليه وسلم) پیاوێك هاتەلای گووتی: ئەم شەو لەخەونمدا بینیم نوێژم دەکرد بەرەو ڕووی بنی دارێك ئایەتێکی سەجدەم خوێندو ئینجا سەجدەم برد، دارەکەش سەجدەی برد، گوێم لێ بوو دەیگووت (اللهم احطط عني بها وزراً، واكتب لي بها أجراً واجعلها لي عندك ذُخْراً) واتە: خوایە بەهۆی ئەم سەجدەیەم گوناهم پێ لاببە، وە بەهۆیەوە پاداشتم

بۆ بنووسه، وه لەلای خۆت بۆم بکه به زەخیره.

جا (ابن عباس) دەڵێ: پێغەمبەرم بینی (صلی الله علیه وسلم) ئایەتێکی سەجدەی خوێندەوەو سەجدەی برد گوێم لێ بوو لەسەجدەکەیدا ئەوەی دەگووت وەکو چۆن پیاوەکە خەبەری پێ دابوو لەقسەی دارەکە.

## ڕوونکردنەوەی زیاتر دەربارەی سەجدەی خوێندنی قورئان:

١- سەجدەی سوورەتی(ص) زۆربەی زانایان بەسەجدەی سوپاسگوزاری (سجدة الشكر)ی دادەنێن، ئەم سەجدەیەش لەنوێژو لەدەرەوەی نوێژ دروست (جائز)ه، لەلای شافیعییەکان تەنها سوننەتە لەدەرەوەی نوێژ ببرێ.

٢- ئەگەر قورئان خوێن چەندجار ئایەتی سەجدەی دووبارە کردەوە یان یەکێك چەندجار گوێی لەئایەتێکی سەجدەبوو دووبارە کرایەوە ئەوە یەك سەجدە دەبات لەکۆتاییەکەی، بەڵام ئەگەر لەدوای خوێندنی یەکەم سەجدەی برد ئەوە دیسان سەجدە دووبارە دەکاتەوە.

٣- (جمهور) لەسەر ئەوەن کە (مستحب)ه کڕنووش ببردرێ دوای خوێندنی ئایەتی سەجدە یا بیستنی، بەڵام ئەگەر سەجدەکەی زوو نەبرد ئەوە دەتوانێ سەجدەکە ببات بەمەرجێك نێوانەکە درێژ نەبووبێتەوە، بەڵام ئەگەر درێژ بوبێتەوە ئەوە سەجدەکە کاتی نامێنێ و قەزاش ناکرێتەوە.

٤- دروست نییە هەتا ئایەتی سەجدەکە تەواو نەخوێندرێ سەجدەی (تلاوة) ببردرێ.

## بەچەند قورئان خەتم بکرێ

١-عن عبدالله بنِ عَمْرو، قال: أنكحَني أبي إمراةً ذاتَ حَسَبٍ. فكانَ يتعاهَدُ كنَّتَهُ فَيَسْألُها عن بَعْلِها فتقولُ: نعم الرَّجُلُ مِنْ رجُلٍ لَمْ يَطَأْ لنا فِراشاً ولَمْ يُفَتِّشْ لنا كنَفَاً منذُ أَتيناهُ، فَلَمَّا طالَ ذلك عليه ذكر للنبيِّ (صلى الله عليه وسلم) فقالَ: الْقِني به، فلقيتُهُ بَعْدُ فقال: كيفَ تصومُ؟ قالَ كلَّ يومٍ، قال: وكيفَ تختِمُ؟ قالَ: كل ليلةٍ. قال: صُمْ في كُلِّ شهرٍ ثلاثة، واقْرَإِ القرآنَ في كُلِّ شهر، قال: قلتُ أطيقُ أكثر مِنْ ذلك، قال: صم ثلاثة أيامٍ في الجُمُعةِ، قلتُ: اطيق أكثر من ذلك، قالَ: صُمْ أفضلَ الصَّومِ صَومَ داودَ: صيامَ يومٍ وإفطار يومٍ، واقرا في كُلِّ سَبْعِ ليالٍ مَرّة، فَلَيتني قبلت رخصة رسولِ الله (صلى الله عليه وسلم) وذاكَ اني كبرتُ وضَعُفْتُ يقرا على بعضِ أهلهِ السُّبْعَ مِنَ القرآن بالنَّهارِ، والذي يقرؤُهُ يَعرضُهُ مِنَ النهار ليكونَ اخَفَّ عليه بالليل، واذا أرادَ أن يتقوى افطر أيّاماً واحصى وصام مِثْلَهُنَّ كراهِيَةَ أنْ يَترُك شيئاً فارقَ النبيَّ (صلى الله عليه وسلم). رواه البخاري (٥٠٥٢).

واتە: (عبدالله)ی کوڕی عەمر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: باوکم ژنێکی خانەدانی بۆم هێنا، ناوە ناوە سەری لە بووکەکەی دەدا، وە هەواڵی مێردەکەی لێ دەپرسی، ئەویش پێی دەڵێ: پیاو لەوە چاتر دەبێ چۆن بێ (لم يطأ لنا فراشاً ولم يفتش لنا كنفاً منذ اتيناهُ) ئەم ڕستەیەی مانای ئەوەیە لەوەتەی هاتوومە لای سەرجێی لەگەڵدا نەکردوومە، کە ئەم حاڵە درێژەی کێشا باوکم ئەمەی بە پێغەمبەر گووت (صلى الله عليه وسلم)

ئەویش فەرمووی بۆمی بهێنە، جا لەوەدوا چووم بۆلای فەرمووی: چۆن بەرۆژوو دەبی؟ گوتم: هەموو رۆژێ، فەرمووی: چۆن خەتمی قورئان دەکەی؟ گوتم: هەموو شەوێ، فەرمووی: لەهەر مانگێکدا سێ رۆژ بەرۆژوو بە، وە هەموو مانگێکیش یەك خەتم بکە، دەڵێ گوتم: من لەمە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: لە هەفتەی سێ رۆژ بەرۆژووبە، گوتم: لەمە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: دوو رۆژ بەرۆژوو مەبەو یەك رۆژ پێ بە، دەڵێ گوتم: لەمە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: باشترین بەرۆژووبوون بەرۆژبە رۆژووگرتنی داود، بەرۆژوبوونی رۆژێك و بەرۆژونەبوونی رۆژێك (واتە رۆژێك نا رۆژێك) وە لەهەر حەوت شەوێکیشدا یەك جار قورئان خەتم بکە.

جا (عبدالله) دەڵێ: خۆزیا مۆڵەتەکەی پێغەمبەری خوام قەبووڵ بکردایە، چونکە ئێستا تەمەنم گەورە بووەو بێ هێز بوویمە.

لەدواییدا دەچوو ئەو حەوت یەکەی کەبەشەو دەیخوێند لە قورئان بەرۆژ لای یەکێ لەکەس و کارەکەی خۆی دەوری دەکردەوە هەتا بە باشی رەوانی بێ، هەتا شەو بەئاسانی بیخوێنێ.

وە کاتێك بیویستبا بەهێز بووایە چەند رۆژێك بەرۆژوو نەدەبوو رۆژووەکانی دەژمارد لەدواییدا رۆژووەکانی دەگرتنەوە، لەبەرئەوە پێی ناخۆش بوو کە ئەو شتەی لەسەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) کردبوونی وازی لێ بێنێ.

٢-وعن عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما) أن النبيَّ (صلى الله عليه وسلم) قال: (لا يفقه من قرأ القرآن في أقَلَّ مِنْ ثلاث) صحيح: رواه أبو داود (١٣٩٤)..

واتە: (تێ ناگات ئەوکەسەی کە قورئان لەسێ رۆژان کەمتر دەخوێنێتەوە).

٣-عن عبدالله بن عمرو ان النبيّ (ﷺ) قال لهُ (اقرا القرآن في اربعين) حديث صحيح رواه الترمذي (٢٩٤٧) وابو داود (١٣٩٥).

واتـه: عبـدالله كـوڕی عمـرو دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ)پێـی فـەرمووە کەلەماوەی (٤٠) ڕۆژ قورئان خەتم بکات.

**سوود**:

ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم دەڵێ: (لانحبُ للرّجلُ ان ياتي عليه اكثر من اربعين يوماً ، ولم يقرا القرآن لهذا الحديث).

واتـه: پێمـان خـۆش نییـه پیـاو چـل ڕۆژی زیـاتر بەسـەردا بـڕوات و قورئان ختم ناكات لەبەر ئەم فەرمودەیە.

**سوود**

ئیمام نووی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ:

١-(ينبغي ان يحافظ على تلاوته ليلا ونهاراً، سفراً وحضرا).

وە دەفـەرمووێ: پێـشینەکان هەریەکەو لـەماوەی جیـا قورئانیـان خـەتم دەکرد کۆمەڵێك بەدوو مـانگ جارێك قورئانیـان خـەتم دەکـرد، هەنـدێکی تـر لەماوەی مانگێك خەتمایان دەکرد، وە هەنـدێکی تـر لـەماوەی حەفتەیەکدا قورئانیـان خـەتم دەکـرد، کـە ئـەوە کـاری زۆربـەیان بـوو، لەپێـشینەکان (سلف).

٢- هەندێك لە زانایان دەڵێن ئەگەر قورئان کـەمیش بخوێنرێتـەوە بـەڵام لەسەرخۆو بەبیرلێکردنـەوە بخوێنرێتـەوە باشـترە لـەوەی زۆر بخوێنرێتـەوە، بەڵام بەپەلـە بخوێنرێتـەوە، ئەمـەش ڕێگـای (ابن عبـاس) و (ابن مسعود) و جگە لەمانیشە.

٣- یەکێك لەپێشینەکان فەرموویەتی (قال بعض السلف): (نـزل القـرآن لِيُعْمَلَ به فاتخذوا تلاوته عملا) واته: قورئان دابەزیووه بۆئەوەی کاری پـیّ بکریّ بەلاّم ئەوان خوێندنەوەکەیان بەکارپێکردن وەرگرتووه.

٤- لـه (مجاهـد)یـان پرسـی دەربـارەی دوو پیـاو یـەکێکیان لـەناو نوێـژ تەنها سورەتی (بقرة) بخوێنیّ، ئەوەی تریان (بقرة) و (آل عمـران) بخـوێنیّ، بەلاّم سوجدەو رکوعیـان وەکـو یـەك بێـت، نوێژەکە لەیـەك کـات تەواوبکـەن، فەرمووی: ئەوەی تەنها سورەتی (بقرة) دەخوێنیّ باشترە.

٥-(بخاری) (رەحمەتی خوای لیّ بێت) دەگێڕێتەوە: کە (أبـو حمـزة) بـە (ابن عباس)ی گوت من کەسێکم بەپەلە قورئـان دەخـوێنم وە جـاری وا بـووه لەشەوێکدا هەموو قورئانم خوێندووه (وربما قرأت القرآن كله مرة في الليلة) (ابن عباس) فەرمووی: ئەگەر یـەك سـوورەت بخـوێنم لەسـەر خـۆو بیری لـیّ بکەمەوە لام خۆشەویسترە لەوەی کەتۆ دەیکەی، بەلاّم ئەگەر هەر بەپەلـەش دەیخوێنی (فاقرأ قراءة تسمعها اذنك ويعيها قلبك) بەشێوەیەك بیخوێنە کـە بیبیستی و دڵت لێی تیّ بگات.

## وەستان لەسەری ئایەت سوننەتە

١-عـن امّ سَـلمَةَ (رضـي الله عنهـا) قالـت: انَّ الـنبيّ (صـلى الله عليـه وسـلم) كـان اذا قـرأ قَطـعَ قراءتـهُ آيـةً آيـة، يقـول (بـسم الله الـرحمن الـرحين) ثـم يقـف، ثـم يقـولُ (الحمـد لله رب العـالمين) ثُـمّ يقـف، ثـم يقـولُ (الـرحمن الـرحيم) ثـمَّ يقـف، ثـمّ يقـولُ (مالـك يـوم الدّين) ثم يقف. صحيح رواه أبو داود والترمذي(٢٩٢٧).

واتـە: (أم سـلمە) (رەزای خـوای لـیّ بێـت) دەڵـیّ: کاتێـك کـە پێغەمبـەر

(صـلى الله عليـه وسـلم) قورئـانی بخوێنـدبا ئایـەت ئایـەت دەیخوێنـد. دەیفـەرموو: (بـسم الله الـرحمن الـرحیم) لەپاشـان دەوەسـتا، لەپاشـان دەیفـەرموو: (الحمـد لله رب العـالمین) لەپاشـان دەوەسـتا، لەپاشـان دەیفـەرموو: (الـرحمن الـرحیم) لەپاشـان دەوەسـتا، لەپاشـان دەیفـەرموو: (مالك یَوم الدین) لەپاشان دەوەستا.

## سوننەتە بەدەنگی خۆش قورئان بخوێنرێ

١- عن البراء بن عازب قال: قال رسولُ الله (صلى الله عليه وسلم)، زيِّنوا القرآن بأصواتكم. صحیح: رواه ابن ماجه (١٣٤٢)

واتە: قورئان برازێننەوە بەدەنگەکانتان.

٢- عن ابی لُبابَة قال: سمعتُ رسول اللهِ (صلى الله عليه وسلم)، يقولُ: ليس منّا مَنْ لَمْ يتغَنَّ بالقرآن. حسن صحیح : رواه أبو داود (١٤٧١).

واتە: لەئێمە نییە ئەو کەسەی کەقورئان بەدەنگی خۆش ناخوێنێتەوە.

**سوود**:

هەر لەدرێژەی ئەم فەرموودەیەدا لە (ابن أبي مُليكة) پرسیارکراوە (يا أبا محمد أرأيت اذا لم يكن حسنَ الصوت؟ قال: (يُحَسِّنُهُ ما استطاع) واتە: پێم بڵێ ئەگەر کەسەکە دەنگی خۆش نەبوو فەرمووی: ئەوەندەی پێی دەکرێ خۆشی بکات.

# بۆ ئەوانەی قورئانیان لەبەرە

١-عن أبي موسى عن النبيِّ (ﷺ) قال: تعاهدوا هذا القرآن فوالذي نفسُ محمد بيدهِ لهو اشدُّ تَفلّتاً من الإبلِ في عقلها. رواه البخاری (٥٠٣١) ومسلم (٧٨٩)

واتە: ئاگاداری ئەم قورئانە بن، چونکە سوێندبەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە قورئان لەحوشتران کەبە پەتك دەبەسترێنەوە توندتر دەردەچیٚ‌و دەڕوات.

(واتە ئەگەر زوو نەیخوێنن لەبیرتان دەچێتەوە خۆی لەپەتی زەین‌و مێشکتان دەکاتەوەو دەڕوات)

**سوود**:

١- مانای چەند وشەیەکی فەرموودەکە

ا- تعاهدوا:تَعَهُّد: رعایە، چاودێری، ئاگاداری، بەسەرکردنەوە.

ب- تفلتا: التفلُّت: التخلُّص، دەرباز بوون، قورتاربوون، هەڵاتن.

ج- عقلها: کۆیە تاکەکەی (عِقال)ە، بەو پەتە دەڵێن کەحوشتری پیٚ دەبەسترێتەوە لەنیوەی دەستی.

٢- موسڵمان کەویستی قورئان لەبەر بکات با لە بەرخوا لەبەری بکات، وەبەکەسیش نەڵیٚ کە چەندەی قورئان لەبەرە.

٣- باشترین دەرمانی لەبەر کردن (حفظ) خۆ پاراستنە لەگوناح، وەکیعی کوڕی جەڕراح دەڵیٚ: ( والله ماجربت دواءً للحفظ مثل ترك المعاصي) واتە: سوێند بەخوا هیچ دەرمانێکم تاقی نەکردۆتەوە بۆ شت لەبەر کردن وەك وازهێنان لەگوناح.

# باسی الجهاد

الجهاد: له زمانی عەرەبی دا ئەسڵی ووشەی جهاد یەعنی(بَذلُ واستفراغُ ما في الوسع والطاقة من القول والفعل) واتە: هەرچی له تواناادا هەیە بەکاری بێنی له قسەو له کردەوە، یان هەموو توانای(نظري و عملي) خۆت به کار بێنی.

زانایانی شەرعیش دەڵێن:

جیهاد بریتییە لە(بذل الجهد من المسلمين في قتال الكفار والبغاة والمرتدين ونحوهم).

واتە: صەرف کردن و بەخشینی ئەو پەری توانا له لایەن موسڵمانانەوە بۆ جەنگ کردن و کوشتار کردن له کافران و یاخی بووان و هەڵگەڕاوان و ئەوانەی وەکو ئەوانن.

ئینجا جیهاد له ئەسڵدا به پێی رای زانایان فەرزی کیفایەیە چونکه فەرز(واجب) دوو بەشە:

١-(فرض العين) ئەمەیە کە لەسەر هەر کەسێك واجب بێت دەبێ خۆی ئەنجامی بدات وەك پێنج نوێژەکان.

٢- (فرض الكفاية) ئەو فەرزەیە کە یەکێك له موسڵمانان یان کۆمەڵێکیان ئەو فەرزەیان ئەنجامدا ئەوا بەر ئەوانی تریش دەکەویت و گوناحبار نابن ئەگەر نەیشیکەن.

بەڵام جیهاد له سێ کاتدا لەسەر تاکی موسڵمانانی ئەو شوێنە دەبێتە(فرض العين) ئەگەر هەر کامێکیان پێی هەڵنەستن مادام عوزرێکی شەرعی نەبێت گوناهبار دەبێت کە ئەمانەن:

١-له كاتێكدا موسڵمان له بەرەی جەنگدا بێت لەسەری واجب دەبێت جەنگ بكات و نابێ بێ هۆیەكی شەرعی پاشه كشەو پشت له دوژمن بكات.

٢- كاتێك دوژمن بێته وولاتی موسڵمانانەوه زەوییەك كه زەوی موسڵمانانه داگیری بكات و دەسەلاتی خۆی بەسەردا فەرز بكات لەسەر موسڵمانانی ئەو شوێنه ئەگەر بەشی بكەن ئەگەر نا لەسەر هەموو موسڵمانانی دنیا فەرز دەبێ ئەو دوژمنه داگیر كەره له وولات و خاكی خۆیان دەربكەن.

٣-كه خەلیفه(ئیمام و پێشەوا)ی موسڵمانان(نفير عام) واته: حاڵەتی دەنگ دانی گشتی بۆ جیهاد و جەنگ رابگەیەنێ لەم حاڵەتەشدا لەسەر هەموو موسڵمانان دەبێته(فرض العين) كه جیهاد بكەن.

## گەورەیی جیهاد كردن:

خوا دەفەرموێ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَـٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ۝١٠ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝١١ يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ وَمَسَـٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّـٰتِ عَدْنٍ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ (الصف:١١-١٢).

واته: ئەی ئەوانەی کە برواتان هێناوە ئایا بازرگانییەکتان نیشان بدەم کە رزگارتان بکات لە سزایەکی پر لە ئازار(١٠) (کە ئەوەش ئەمەیە) بڕوا بێنن بە خواو پێغەمبەری خوا، وە جەنگ بکەن لە رێی خوادا بەسەرو ماڵی خۆتان ئەمەتان باشترە بۆ خۆتان ئەگەر بزانن(١١) (ئەگەر وابکەن) لە گوناحەکانتان خۆش دەبێ وە ئەتان باتە ناو باخاتێکەوە کە جۆگە ئاوی زۆر بە ژێریاندا دەروا وە(داتان ئەنێ) لە چەند خانوو و کۆشکی پاك و خۆشەوە لە بەهەشتانی هەتا هەتاییدا ئەمەیە سەرکەوتنی گەورە(١١).

١-عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: مرَّ رجُلٌ من اصحاب رسول الله(ﷺ) بِشِعبٍ فيه عُيينَةٌ من ماءٍ عَذبَة، فأعْجَبَتْهُ لِطيبها. فقال: لو اعْتَزلتُ الناسَ فَأَقمْتُ في هذا الشِّعْب؟، ولَنْ أفعَلَ حَتَّى استأذِن رسول الله(ﷺ) فذَكر ذلك لرسول الله(ﷺ) فقال: لا تفعَلْ. فإنّ مُقامَ أحدكُم في سبيل الله أفْضَلُ من صلاته في بيتهِ سبعين عاما الا تُحبّون انْ يغْفِر الله لَكم ويُدخِلَكُمُ الجنَّة؟ أُغْزوا في سبيل الله من قاتَلَ في سبيل الله فُواقَ ناقةٍ وجَبَتْ لَهُ الجنَة. **حسن: رواه الترمذي(١٦٥٠).**

**١-شعب: دۆل.**

**٢- عيينة: کانیۆکەك.**

**٣- عذبة: شیرین.**

**٤- اعتزال: کەناگیری، گۆشەگیری.**

**٥- حتى استأذن: تاوەکو ئیزن وەردەگرم.**

**٦- فواق ناقة: (نووی) لە(رياض الصالحين) دا دەڵێ(مابين الحلبتين) واتە: نێوانی دوو دۆشینی حوشتر، لە(تاج) دا دەڵێ:(قدر حلبها) واتە: بە**

قەد دۆشینی ووشترێك، وە هەندێکی تر دەڵێن(فواق ناقة) واتە(ما بین فتح یدك وقبضها علی الضرع) واتە: بە قەد ماوەی ئەو نێوانەی کە دەستت لە گوانی حوشترێك دەکەیەوەو دەیگوشیەوە.

ماناى فەرموودەکە:

ئەصحابەیەك لە ئەصحابەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بەلای دۆڵێکدا رۆیشت کانیاوێکی گچکەی شیرینی تیادا دەبێ زۆر بە دڵی دەبێ دەڵێ: ئەگەر دووره پەرێزیم لە خەڵك بکردبایەو بۆ خۆم لەم دۆڵەدا جێ نشین بوومایە بەلام واناکەم تا وەکو داوای مۆڵەت لە پێغەمبەر نەکەم(ﷺ)، جا ئەوەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: وا مەکە، چونکە تاقە پێهەڵسانێکی ئێوە لەبەر رەزای خودا باشترە لە نوێژی ماڵەوەی بۆ ماوەی حەفتا ساڵان، ئایا حەز ناکەی کە خودا لێتان خۆش بێ و وە بتانباتە بەهەشت؟ غەزا بکەن لە رێ ی خوادا، هەر یەکێك لە رێی خوادا بەقەد ماوەی دۆشینی حوشترێك شەر بکات بەهەشتی بۆ واجب دەبێت.

٢- عن أنس بن مالك عن النبيّ(ﷺ) أنهُ قال: لروْعَة في سبيل الله أو غدْوَةٌ خيرٌ منَ الدُّنيا وما فيها، ولقابُ قوسِ أَحدكمْ من الجنة أو مَوضعُ قيدٍ-يعني سوطه- خيرٌ من الدُّنيا وما فيها، ولوْ أنَّ امرأةً من أهل الجنَّة إطَّلعَتْ إلى أهلِ الارضِ لأَضاءَت ما بينهما و لَمَلأَتْهُ ريحاً، ولَنَصيفُها على رأْسها خَيرٌ من الدُّنيا وما فيها. رواه البخاري(٢٧٩٦) وابن حِبّان في صحيحه.

١-الروحة: المرة الواحدة من الرواح وهو الخروج في أيّ وقت كان من زوال الشمس الى غروبها.

٢-والغدوة: بالفتح- المرة الواحدة من الغدو، وهو الخروج في أي وقت

كان من اول النهار إلى انتصافه.

٣- (وقاب قوس احدكم) اي قدره.

واته:دەرچوون لە هەر كاتێك بێت لەو كاتەوە كە رۆژ دەگاتە ناوەراستی ئاسمان تا ئاوابوونی، یا دەرچوون لە هەر كاتێك بێت لە سەرەتای رۆژەوە تا ناوەراستی، لە پێناوی خوا(بۆ جیهاد) باشترە لە دونیاو لەوەش كە لە دونیا دایە، وە بەقەد شوێنی كەوانی یەكێك لە ئێوە لە بەهەشت یا بەقەد قامچییەك باشترە لە دونیاو لەوەی تێیدایە، وە ئەگەر ئافرەتێك لە خەڵكی بەهەشت تەماشای زەوی بكات نێوانیان رووناك دەكاتەوە، وە پری دەكات لە بۆن(ی خۆش)، وە ئەو سەرپۆشەی كە لە سەریەتی باشترە لە دونیاو لەوەی تێیدایە.

٣- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): لا يَلِجُ النار رجلٌ بكى من خَشية الله حتى يعود اللّبنُ في الضَّرعُ ولا يَجْتمِعُ غُبارٌ في سبيل الله ودخان جَهنّم. صحيح: رواه الترمذي(١٦٣٣).

١-لا يلج: واته: لا يدخُلُ، یانی ناچێتە ژوورێ.

٢- اللبن: شیر.

٣- الضرع: گووان.

٤- غبار: تۆز.

مانای فەرموودەكە:

ناچێتە ناو ئاگر پیاوێك گریابێ لە ترسی خوا تاوەكو شیر نەچێتەوە ناو گوان، وە كۆنابێتەوە(لەسەر بەندەیەك) تۆزی رێگای خواو دوكەڵی جەهەننەم.

٤- عن أبي سعيد الخدري(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: يا أبا سعيد: منْ رضيَ بالله رباً، وبالإسلام ديناً وبمحمدٍ رسولاً وجَبَتْ لهُ الجنّة. فعَجِبَ لها أبو سعيد فقالَ أعدْها عليَّ يا رسول الله، ففعَلَ، ثُمَّ قالَ(وأُخرى يرفعُ بها العَبْدُ مِئَةَ درجةٍ في الجنَةِ، ما بينَ كُلِّ دَرَجتين كما بين السماء والارض) قال وما هي يا رسول الله؟ (قال الجهاد في سبيل الله الجهاد في سبيل الله) رواه مسلم(١٨٨٤).

واته: هەر یەکێك رازی بێت بەخودا بە پەروەردگارێتی، وە بە ئیسلام کە دینی بیّ وە بە(محمد) کە پێغەمبەری بێت بەهەشتی بۆ واجب دەبێت، ئەبو سعید ئەم فەرموودەی زۆر لا خۆش و دڵگیربوو، گوتی ئەی پێغەمبەری خوا بۆم دووبارە بکەوە جا بۆی دووبارە کردەوە، لە پاشان فەرمووی: وە شتێکی تریش هەیە بەندە لە بەهەشتدا سەت پلە پێی بەرز دەبێتەوە، نێوانی هەردوو پلەیەك وەکو نێوانی زەوی و ئاسمان وایە، ئەبو سعید گوتی ئەو شتە چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: جیهاد کردنە لە رێی خوا، جیهاد کردنە لە رێی خوا.

٥- عن عَبايةَ بن رفاعة قال: أدركَني أبو عَبسٍ وأنا أذهبُ إلى الجمعة فقال: سمعتُ النبيَّ(ﷺ) يقولُ: مَنِ اغْبَرَّتْ قَدَماهُ في سبيل الله حَرَّمَهُ الله على النار. رواه البخاري(٩٠٧).

واته: عەبایەی کوری ریفاعە(رەزای خوای لیّ بێت) دەڵیّ:(أبو عبس)م پیّ گەیشت لەو کاتەدا من دەچووم بۆ نوێژی هەینی، گوتی گوێم لە پێغەمبەر بووە(ﷺ) فەرمووی: هەر یەکێك پێیەکانی تۆزاوی بێن لە رێگای خوادا خوا قەدەغەو حەرامی دەکات لە ئاگر.

٦- عن أبي سعيد الخدري(رضي الله عنه) قال: أَتى رَجُلٌ رسولَ الله(ﷺ) فقالَ أيُّ الناسِ أفضَلُ؟ قالَ: مُؤمِنٌ يُجاهِدُ بِنَفسِهِ ومالِهِ في سبيل الله، قال ثُمَّ مَنْ؟ قال: مؤمِنٌ في شِعبٍ مِنَ الشِّعابِ يَعْبُدُ اللهَ ويدعُ الناس مِن شَرِّه. رواه البخاري(٢٧٨٦) ومسلم(١٨٨٨).

واته:

ئەبو سعيد(رەزای خوای لیّ بێت) دەڵیّ پیاوێك لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: كام لە خەڵكان باشترە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئیمانداریّك كە جیهاد دەكات بەسەرو ماڵی لە ریّ ی خوادا، گوتی لە پاشان كیّ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئیمانداریّك لە دۆڵێك لە دۆڵەكان خوا دەپەرستیّ و شەری خۆی لە خەڵكی لادەدا.

## گەورەیی ئێشك گرتن(رباط) لە ریّ ی خوادا:

١-عن سلمان(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله يقول: رباطُ يومٍ وليلةٍ خير من صيام شَهرٍ وقيامه، وإن ماتَ جرى عليه عَمَلُهُ الذي كان يَعْمَلُهُ، وأُجْرِيَ عليهِ رِزقُهُ، وأمِنَ الفَتّان. رواه مسلم(١٩١٣).

١-رباط: ئێشك گرتن، بريتی يە لە مانەوەو ئارام گرتن لە سنووری دوژمندا بۆ پاراستنی موسڵمانان.

واتە: ئێشك گرتنی رۆژ و شەویّ باشترە لە رۆژوو و شەو نوێژی يەك مانگ، وە ئەگەر مرد( لە كاتی ئێشك گرتنی) هەموو ئەو كردەوانەی كە

دەیکردن(تا رۆژی قیامەت) پاداشتەکەی هەر بۆ دەنوسریٚ، وە رزق و رۆزیشی پیٚ دەدریٚ، وە گرفتاری تاقی کردنەوەی ناو گۆریش نابیٚ و ترسی نەکیر و مونکەری نامینیٚ.

٢- عن عثمان(رضي الله عنه) سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: رِباط يومٍ في سبيل الله خَيرٌ مِنْ أَلْفِ يومٍ فِيما سِواهُ مِنَ المنازِلِ. حسن: رواه الترمذي(١٦٦٧).

الرباط: چاو لە سنوور بوون لە پیٚناوی خوا.

واتە: سەنگەر نشینی رۆژیٚك لە ریٚگەی خوادا باشترە لە هەزار رۆژ بیٚجگە لەو لە مالٚەوە.

٣- عن فضالة بن عبيد(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) قال: كُلُّ مَيِّتٍ يُخْتَمُ على عَمَلِه إلا الذي ماتَ مرابطاً في سبيل الله، فإنَّهُ يَنمِي لَهُ عَمَلُهُ إلى يوم القيامة ويأمَنُ من فِتنَة القبر. صحيح: رواه ابوداود(٢٥٠٠) والترمذي(١٦٢١).

١-الفتنة: لە زمانەوانی دا واتە(الأمتحان والاختبار) یانی: تاقی کردنەوە.

٢- ويأمن من فتنة القبر: واتة(لا يسأله الملكان) یانی: دوو فریشتەکە(نەکیرو مونکەر) تاقی ناکەنەوەو پرسیاری لیٚ ناکەن.

٣- يأمَنُ: بیٚ ترس دەبیٚ، رابردووەکەی(أَمِنَ)یە واتە: ترسی نەما.

واتە:هەموو مردویٚك کردەوەکانی بە مردنی کۆتایی پیٚ دیٚت، تەنها ئیٚشك گرو سەنگەر نشین نەبیٚت لە ریٚگای خوا، کردەوەکانی تا رۆژی دوایی بە بەردەوامی بۆ دەنوسریٚ، وە ئەمینیش دەبیٚت لە تاقی کردنەوەی ناو گۆر(پرسیاری لیٚ ناکریٚ).

٤- عن ابن عباس(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: عينان لا تَمَسُّهُما النارَ: عينٌ بَكَت مَن خَشيةِ الله وعينٌ باتَت تَحْرُسُ في سبيل الله. صحيح: رواه الترمذي(١٦٣٩).

واته:دوو چاو ئاگريان پێ ناكەوێ: چاوێك له ترسى خوادا گريابێ، وه چاوێكيش شەوى بەسەربردبێ به حەرەسيات گرتن و ئێشكەگرتن له پێناو خوا.

## گەورەيى بريندار بوون له پێناوى خوادا:

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) ما مِنْ مَكلومٍ يُكْلَمُ في سبيل الله إلا جاءَ يوم القيامةِ وكَلْمُهُ يَدْمَى، اللونُ لونُ دَمٍ، والرِّيحُ رِيحُ مِسك. رواه البخاري(٥٥٣٣) و مسلم(١٨٧٦).

مكلوم: بريندار(مجروح).

يكلم: بريندار بێت(يجرح).

واته:هەر برينداريك له رێگاى خوادا بريندار بێت،(ئيللا) رۆژى قيامەت دێت برينەكەى خوێنى لەبەر دەڕوات، رەنگەكەى رەنگى خوێنه، وه بۆنەكەى بۆنى ميسكه.

## پلەو پایەی شەهید:

١-عن مسروق(رضي الله عنه) قال: سالنا عبدالله(هو ابن مسعود) عن هذه الاية﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ﴾ (آل عمران:١٦٩).

قال: أمَا إنّا قد سَألنا عن ذلك فقال: أرواحهم في جوف طيرٍ خُضْرٍ، لها قناديلُ مُعَلَّقَةٌ بالعرشِ تَسرحُ من الجنةِ حيثُ شاءَت، ثُمَّ تأوي إلى تلك القناديلِ فاطّلَعَ إليهم ربُّهُم إطّلاعَةً، فقال: هل تشتهون شيئاً؟ قالوا: أيَّ شيءٍ نشتهي؟ ونحنُ نَسرحُ من الجنّةِ حيثُ شئنا. فَفعَلَ ذلك بِهم ثلاث مرّاتٍ، فَلَمّا رأوا أنّهم لن يُتركوا مِن أن يُسألوا، قالوا: يارَبِّ! نريدُ أنْ تَرُدَّ أرواحنا في أجسادنا حتى نُقتَل في سبيلكَ مرَّةً أُخرى، فَلَمّا رأى أن ليس لهم حاجةٌ تُرِكوا. رواه مسلم(١٨٨٧) وابن ماجة(٢٨٠١).

واتە:مسروق(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پرسیارمان کرد لە عبدالله کوری مەسعود(رەزای خوای لێ بێت) دەربارەی ئەو ئایەتە﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ﴾.

عبدالله فەرمووی ئێمەش دەربارەی ئەمە پرسیارمان لە پێغەمبەر کرد(ﷺ) فەرمووی (شەهیدان) رووحەکانیان لە ناو لەشی باڵندەی کەسک(سەوز) دانە، چەند چرایەکی بە عەرشەوە هەڵواسراویان هەن، بە کەیفی خۆیان لە بەهەشتێدا دەگەرێن، پاشان دەچنەوە ناو ئەو چرایانە،

جا پەروەردگاریان سەرنجێکی لێدان و فەرمووی: ئارەزووی شتێك ناکەن؟ گوتیان جا حەزمان لە چی بێت لە حاڵەتێکدا کە لە بەهەشتێدا دەگەڕێین لە هەر کوێی بمانەوێ جا خودا سێ جاران ئەوەی لێ دووبارە کردنەوە، جا کاتێك زانیان کە وازیان لێناهێنرێ و دەبێ هەر شتێك داوا بکەن، گوتیان: ئەی پەروەردگار دەمانەوێ روحەکانمان بگێڕیتەوە نێو جەستەکانمان تاکو جارێکی دیکەش لە ڕێی تۆدا بکوژرێین! ئەوجا کە خوا بینی هیچ پێویستییان نیە وازیان لێهێنرا.

٢- عن عبدالله بن عمرو بن العاص (أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: يُغْفرُ للشَّهيدِ كُلُّ ذَنبٍ إلاّ الدَّينَ. رواه مسلم(١٨٨٦).

إلا الدين: اراد حقوق الادميين من الاموال والدماء والاعراض. فإنها لا تعفى بالشهادة.

واتە:شەهید هەموو گوناحێکی دەپۆشرێ بێجگە لە قەرز(واتە مافی خەڵك).

٣- عن المقداد بن يكرب(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): للشهيد عندَ الله ستُّ خصال: يُغْفرُ لَهُ في أوَّلِ دُفْعَة. ويَرى مقعدهُ منَ الجَنة، ويجارُ من عذابِ القبرِ، ويأمَنُ مِنَ الفزعِ الأكبرِ. ويُوضَعُ على رأسهِ تاجَ الوقارِ، الياقوتَةُ منها خير من الدنيا وما فيها، ويزوجُ اثنتين وسبعين زوجةً من الحور العين، ويَشفَعُ في سبعين من أقاربه. صحيح: رواه الترمذي(١٦٦٣) وابن ماجة(٢٧٩٩).

أول دفعة: أول دفعة من دمه.

واتە: شەهید لای خوا شەش خەسڵەتی بۆ هەیە: لەگەڵ یەکەمین

دەرچوونی دڵۆپە خوێنی لە گوناهەکانی دەبووریٚ، وە شوێنی خۆی لە بەهەشت دەبینیٚ، وە لە عەزابی گۆر دەپارێزریٚ، وە لەو کاتەی بۆ جاری دووەم فوو بە کەڕەنا(صور)دا دەکریٚ ئەو ئەمین و بیٚ ترسە وە تاجی رێزو حورمەت و ویقاری لەسەر سەری دادەنریٚ، کە یەك گەوهەرو مرواری لەو تاجەدا لە دونیاو لەوەی تێیدایە باشترە، وە حەفتاودوو هاوسەری لە(الحور العين) لیٚ مارە دەکریٚ، وە تکاو شەفاعەت بۆ(٧٠) کەس لە خزمانی دەکات.

٤- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: والذي نفسي بيده لوددْت أنّي أُقْتَلُ في سبيل الله ثُمَّ أحيا، ثُمَّ أُقْتَلُ ثُمَّ أحيا، ثُمَّ أُقْتَلُ ثُمَّ أحيا، ثُمَّ أُقْتَلُ. **رواه البخاري(٢٧٩٧) ومسلم(١٨٧٦).**

**واتە: سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەستە پێم خۆشە من بکوژرابامە لە پێناوی خوا لە پاشان زیندوو بامەوە، لە پاشان بکوژرابامەوە لە پاشان زیندوو بامەوە، لە پاشان بکوژرابامەوە.لە پاشان زیندوو بامەوە، لەپاشان بکوژرابامەوە.**

٥- عن أنس(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: ما مِنْ أحدٍ يَدخُلُ الجنَّةَ يُحِبُ أنْ يرجع إلى الدُنيا، وأنَّ لَهُ ما على الأرض مِنْ شيءٍ، غيرُ الشهيد، فإنَّهُ يتمَنَى أنْ يرجعَ فيُقتَل عشْر مرَّاتٍ، لما يرى من الكرامة. **رواه البخاري(٢٧٩٥) ومسلم(١٨٧٧).**

**واتە: نییە هیچ کەسێك کە بچێتە بەهەشت حەز بکات بگەرێتەوە بۆ ژیانی دونیا، ئەگەر هەرچییەك کە لەسەر زەویدایە بیدەنیٚ بێجگە لە شەهید، خۆزگە دەخوازیٚ کە بگەرێتەوە بۆ دونیا دە جاران بکوژریٚ لەبەر ئەو هەموو رێزو حورمەتەی کە دەیبینیٚ.**

٦- عن جابر بن عبدالله(رضي الله عنهما) قال: قال رجُلٌ للنبيِّ(ﷺ) يومَ أحدٍ: أرأيت إن قُتِلْتُ فأين أنا؟ قال في الجنة، فألقى تمراتٍ في يدهِ، ثُمَّ قاتلَ حتىَ قُتلَ. رواه البخاري(٤٠٤٦) ومسلم(١٨٩٩).

ارأيت: پێم بڵێ، خەبەرم پێ بدە.

واتە: جابر(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پیاوێك گوتیە پێغەمبەر(ﷺ) لە رۆژی ئوحود: پێم بڵێ ئەگەر کوژرام لە کوێم؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: لە بەهەشت، پیاوەکە چەند دەنکە خورمایەکی بەدەستەوە بوو فرێ ی دان لە پاشان شەری کرد تا کوژرا.

٧- عن انس(رضي الله عنه) أن أمّ الرُّبيع بنتَ البراء وهي أمّ حارثة بن سُراقة أتت النبيَّ(ﷺ) فقالت: يا نبيَّ اللهِ ألا تحدِّثني عن حارثة - وكان قُتِلَ يومَ بدرٍ أصابَهُ سَهْمٌ غَرَبٌ - فلإن كانَ في الجنّة صبرتُ، وإنْ كانَ غير ذلك اجتهدتُ عليهِ في البكاء. قال: يا أمّ حارثة إنها جِنانٌ في الجنّةِ وإنَّ ابنَكِ أصابَ الفِردَوسَ الأعلى. رواه البخاري(٢٨٠٩).

واتە:ئەنەس(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: دایکی حارثەی کوری سوراقە هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی ئەی پێغەمبەری خوا ئایا باسی حارثەم بۆ ناکەی- حارثە لە رۆژی بەدر کوژرا بوو- تیرێکی بەرکەوتبوو کە تیر هاوێژەکەی نەدەناسرا، جا گوتی ئەگەر بەهەشتی بێت ئەوە ئارام دەگرم، بەڵام ئەگەر وا نەبێ ئەوە زۆر بۆی دەگرێیم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەی دایکی حارثە: چەند بەهەشتێك لە بەهەشتدان وە بێ گومان کورەکەی تۆ فیردەوسی هەرەبەرزی پێ دراوە.

## پایەی داوای شەهیدی كردن بەراستی:

١-عن سهل بن حنيف(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) قال: مَنْ سألَ الله الشهادةَ بِصدقٍ، بَلَّغَهُ اللهُ منازلَ الشُّهداءِ، وإن ماتَ على فراشهِ. رواه مسلم(١٩٠٩).

واته:هەر یەكێك داوای شەهیدی لە خوا بكات بە راستی و بە دڵ خودا پایەی شەهیدی دەداتێ ئەگەر لە ناو جێگاكەشیدا بمرێ.

## شەهیدو ئەزیەتی كوشتنی:

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) ما يجدُ الشَّهيدُ مِن مَسِّ القَتْلِ[1] إلاّ كما يَجِدُ أحَدُكُمْ مِنْ مَسِّ القَرصَةِ. حسن صحيح: رواه الترمذي(١٦٦٨).

القرص: الاخذ بأطراف الأصابع، واته: گرتن بەسەری پەنجەكان لە(تاج العروس) دا دەڵێ: القرص: أخذك لحم الأنسان بإصبعيك حتى تؤلمه، یانی گرتنی گۆشتی ئینسانێك بە دوو پەنجەكانت تا دەیهێشێنی، لە هەولێر و دەوروبەری پێ ی دەڵێن: قونجركە.

**مانای فەرمودەكە:**

شەهید لە كاتی كوشتنەكەی هیچ ئازاری پێ ناگات(ئیللا) وەكو ئەوەندە ئازارە نەبێت كە یەكێك لە ئێوە پێ ی دەگات لەو كاتەی كە نوقورچەیەكی لێ دەدرێت.

---

(1) ما يجد الشهيد من مس القتل/ اي من الألم الذي يصيبه من العدو وغيره عند الشهادة و خروج الروح.

# جۆرەكانی شەهید

شەهید دەكرێ بە سێ جۆر ئەمانەن:

**١-شەهیدی دونیاو قیامەت:**

ئەو كەسەی كە لە جەنگی دژی كافران دا كوژرا بێت بە هۆیەك لە هۆیەكانی جەنگەوە، ئەم جۆرە شەهیدە هەم پاداشتی دوا رۆژی بۆ هەیەو هەم حوكمە دنیاییەكانی شەهیدیشی هەن، كە ناشۆرێ و نوێژی لەسەر ناكرێ.

**٢- شەهیدی دوارۆژ:**

ئەمەش ئەوەیە كە پلەو پایەی شەهیدی هەیە لە دوارۆژ بەڵام حوكمی شەهیدی نی یە لە دونیادا، واتە: دەشۆردرێ و نوێژی لەسەر دەكرێ وەك: مردوو بە ژانە زگ، بە تاعوون، بە خنكان لە ناو ئاو، بە سووتان، بە شت بەسەردا رووخان، وە كوژراو لەبەرگری لێ كردنی ماڵ و ساماندا.... هتدیش.

**٣- شەهیدی دونیا:**

ئەو كەسەیە لە لایەن خەڵكەوە معامەلەی شەهیدی لەگەڵ دەكرێ واتە ناشوشترێ و كفن ناكرێ، بەڵام ئەو بۆ دەمارگیری(حمیة) یا روپامایی(ریاء) شەری كردووە.

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) الشهداء خَمسةٌ: المطعون، والمبطون، والغَريقُ، وصاحبُ الهدم. والشهيد في سبيل الله عزَّ وجلَّ. رواه البخاري(٦٥٣) ومسلم(١٩١٤).

واتە: شەهیدان پێنجن: ئەو كەسەی بە كولێرا(طاعون) دەمرێ، وە ئەو كەسەی بەدەردی ناو زگ دەمرێ، وە ئەو كەسەی كە لە ئاوێ دا دەخنكێ،

وە ئەوەی لە ژێر رووخاودا دەمرێ، وە ئەو کەسەش کە لە خەباتی رێگای خوای(عزَّ وجَلَّ) بکوژرێ.

٢- عن جابر بن عتيك(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: الشهادة سَبْعٌ سِوى القتل في سبيل الله، المطعون شهيدٌ، والغَرِق شهيد، وصاحبُ ذات الجنب[١] شهيد، والمبطون شهيد، وصاحب الحرق شهيد، والذي يموت تحت الهدم شهيد، والمرأة تموت بجُمْع[٢] شهيدة. صحيح: رواه ابوداود(٣١١١).

واتە: شەهیدیی حەوت جۆرە- جگە لەوەی کە لە رێگای خوادا دەکوژرێ، کەسێك بە کولێرا(طاعون) بمرێ شەهیدە، کەسێك لە ئاودا بخنکێ شەهیدە، وە کەسێك بە ئازاری کەلەکە بمرێ شەهیدە، وە کەسێك بە دەردی ناو زگ بمرێ شەهیدە، وە کەسێك بە سووتان بمرێ شەهیدە، وە ئەوەی لە ژێر رووخاوا دەمرێ شەهیدە، وە ئافرەت کە لەسەر منداڵ بوون دەمرێ شەهیدە.

٣- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): ما تَعُدُّونَ الشهيد فيكُمْ؟ قالوا يا رسول الله، مَنْ قُتل في سبيل الله فهو شهيد، قال: إنَّ شُهداءَ أُمَّتي إذاً لَقَليلٌ، قالوا فَمَن هم يا رسول الله؟ قال: مَنْ قُتِلَ في سبيلِ الله فهو شهيد، و منْ مات في سبيل الله[٣] فهو شهيد، ومن ماتَ في الطاعون فهو شهيدٌ، ومن ماتَ في البطن فهو

---

(1) ذات الجنب: القروح تصيب الإنسان داخل جنبه و تنشأ عنها الحمى والسعال.

(2) بجمع: أي التي تموت عند الولادة.

(3) في سبيل الله: اي في طاعته.

شهيد، والغريق شهيد. رواه مسلم(١٩١٥) وابن ماجه(٢٨٠٤).

واته: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویە ئەصحابەکان: ئێوە لە ناو خۆتاندا کێ بە شەهید دادەنێن؟ گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی لە ڕێ ی خوادا بکوژرێ ئەوە شەهیدە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر وابێ شەهیدانی ئومەتی من زۆر کەمن، گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەی کێ شەهیدە؟ فەرمووی: ئەوەی لە ڕێگای خوادا بکوژرێ ئەوە شههیدە، وە کەسێك لە ڕێ ی خوادا بمرێ ئەویش شەهیدە، وە کەسێك بە تاعوون بمرێ شەهیدە، وە کەسێك بە نەخۆشی زگ بمرێ ئەوە شەهیدە، وە ئەوەی لە ئاودا بخنکێ شەهیدە.

٤- عن عبدالله بن عمرو بن العاص(رضي الله عنه) قال رسول الله(ﷺ): مَنْ قُتِلَ دونَ مالهِ فَهُوَ شَهيدٌ. رواه البخاري(٢٤٨٠) ومسلم(١٤١).

واته: هەر کەسێك لە پێناو بەرگری کردن لە ماڵ و سامانی دا بکوژرێ ئەوە شەهیدە.

٥- عن سعيد بن زيد(أحد العشرةِ المشهود لهم بالجنة) (رضي الله عنه) قال سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: مَنْ قُتِلَ دونَ مالهِ فَهُو شَهيدٌ، ومَن قُتِلَ دونَ دينهِ فهو شَهيدٌ، ومَنْ قُتِلَ دونَ دَمهِ فَهُو شهيد(١)، ومَنْ قُتِلَ دون أهلهِ فَهُوَ شهيد(٢). صحيح: رواه ابو

---

(1) ومَنْ قتل دون دينه فهو شهيد: اي من قتل بسبب محافظته على دينه وتمسكه بشرعة ربه فقتل بسبب ذلك فهو شهيد.

(2) ومن قتل دون دمه فهو شهيد: اي ومن قتل وهو يدافع عن نفسه فهو شهيد. والله تعالى اعلم.

داود(٤٧٧٢) والترمذي(١٤٢١).

واتە: هەر یەکێك لە پێناو بەرگری کردن لە ماڵ و سامانیدا بکوژرێ ئەوە شەهیدە، وە هەر یەکێك لەسەر دینی بکوژرێ ئەوە شەهیدە، وە هەر کەسێك لەسەر خوێنی بکوژرێ ئەوە شەهیدە، وە هەر یەکێك لەسەر کەس و کاری بە ناهەق بکوژرێ ئەوە شەهیدە.

## خیانەت کردن لە دەست کەوتی جەنگ(الغنیمە):

١-عن عبدالله بن عمرو قال: كان على ثَقَلِ النبيِّ(ﷺ) رجُلٌ يُقالُ لهُ كِرْكِرة فماتَ فقال رسول الله(ﷺ) هو في النار، فذَهَبوا ينظرون إليهِ فوَجَدوا عَبَاءَةً قَدْ غَلَّها. رواه البخاري(٣٠٧٤).

ثقل: العيال وما يثقل حمله من الأمتعة. خاوو خێزان و ئەو کەل و پەلەی هەڵگرتنی گرانە.

غلَّ: (الغلول) واتە: خیانەت کردن لە دەست کەوتی جەنگ پێش دابەشکردنی(غَلَّ) (فعل ماضي)یە واتە: خیانەتی کرد لە غەنیمەت پێش دابەش کردنی.

الغنيمة: دەست کەوتی جەنگ.

غنيمة: تاکە، کۆیەکەی(غنائم)ە مانای لە زمانەوانیدا واتە(ما يناله الإنسان بسعي) واتە: ئەوەی ئینسان بە تێکۆشان و هەوڵ دان دەستی دەکەوێ. بەڵام مانای لە شەرع دا(هي المال المأخوذ من أعداء الأسلام عن الطريق الحرب والقتال) واتە: ئەو ماڵەیە کە لە دوژمنانی ئیسلام وەردەگیرێ لە ڕێگای شەڕەوە.

واتە: عبدالله کوڕی عەمر دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پیاوێکی لەگەڵدا بوو

پێی دەوترا – كير كيرە– مرد، پێغەمبەر (ﷺ)، فەرمووی: ئەو لەئاگرە، جارۆیشتن تەماشای بكەن بینیان عەبایەكی لە دەست كەوتی جەنگی دزیوە.

٢– عن ابن عباس(رضي الله عنه) قال: حدثني عمر بن الخطاب(رضي الله عنه) قال: قِيلَ: يا رسول الله إنَّ فلاناً قد استُشهِد قال: كَلاّ قد رأيتُهُ في النار بعباءة قد غَلَّها. قال:(قُمْ يا على فناد: إنَّهُ لا يَدخُلُ الجنة إلاّ المؤمنون ثلاثاً. صحيح: رواه الترمذي(١٥٧٤).

واتە: ابن عباس(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: عومەر كوری خەتتاب(رەزای خوای لێ بێت) بۆی گێرامەوە فەرمووی: گوترا ئەی پێغەمبەری خوا فلانە كەس شەهید بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەخێر بێ گومان بینیم لە ناو ئاگر بە هۆی عەبایەك كە دزی بووی لە غەنیمەت پێش دابەش كردنی، فەرمووی: هەستە ئەی عەلی بانگ بكە كە بێ گومان ناچێتە بەهەشت ئیللا ئیمانداران نەبن، سێ جاران.

**سوود:**

١–ئیمام نووی(رەحمەتی خوای لێ بێت) یەك دەنگی(إجماع) زانایان دەگێرێتەوە لەسەر ئەوەی كەوا لە دەست كەوتی شەڕ بردن پێش دابەش كردنی لە تاوانە گەورەكانە.

## گەورەیی خیانەت نەکردن لە غەنیمەت:

عن ثوبان مولى رسول الله(ﷺ) عن رسول الله(ﷺ) انَّهُ قال: مَنْ فارقَ الروحُ الجسدَ وهو بريءٌ من ثلاثٍ دخلَ الجَنّة: مِن الكبرِ، والغلولِ، والدَّين. صحيح: رواه ابن ماجه(٢٤١٢) والترمذي(١٥٧٢).

واتە: هەر یەکێك گیانی لە لاشەی جیابێتەوە بەری بێت لە سێ شت دەچێتە بەهەشت: لە خۆ بە گەورە زانین و دزی کردن لە دەست کەوتی شەرو قەرزاری.

## یارمەتی دانی موجاهید و خێزانەکەی:

١-عن ابي عبدالرحمن زيد بن خالد الجهني(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ جهَزَّ غازياً في سبيل الله فقد غزا ومَنْ خَلَفَ غازياً في أهلِهِ بخيرٍ فقد غزا. رواه البخاري(٢٨٤٣) ومسلم (١٨٩٥).

واتە: هەر یەکێك پێداویستیەکانی موجاهیدێك جێ بەجێ بکات ئەوە وەك وایە کە خۆی جیهادی کردبێ، وە هەر یەکێکیش کارو بارو پێویستیەکانی خێزانی موجاهیدێك پێك بێنی بە چاکە ئەوە وا دادەنرێ کە خۆشی جیهادی کردبێ.

## ئەوەی دەمرێ جیهادی
## نەکردوەو نیازیشی نەبووبێ:

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) مَنْ ماتَ ولَمْ يَغْزُ ولَمْ يُحَدثْ بِهِ نَفْسَهُ، ماتَ على شُعْبَةٍ مِنْ نِفاقٍ. رواه مسلم(١٩١٠).

واته: هەر کەسێك بمرێ و جیهادی نەکردبێ و نیازیشی نەبووبێ بیکات ئەوە لەسەر بەشێك لە بەشەکانی دوو روویی مردووه.

## بکوژی کافر لەگەڵی کۆنابێتەوە لە ئاگر:

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: لا يَجْتَمِعُ كافِرٌ و قاتِلُهُ في النّارِ أبَداً. رواه مسلم(١٨٩١).

واته:هیچ کاتێك کافرێك و بکوژەکەی(واته ئەوەی کوشتویەتی) پێکەوە لە ئاگر کۆنابنەوە.

## السلب:

١-عن أبي قتادة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): مَنْ قَتَلَ قتيلاً، لَهُ عَلَيهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلْبُهُ. رواه البخاري(٣١٤٢) ومسلم(١٧٥١).

واته: هەر کەسێك کەسێك بکوژێت بەڵگەی هەبێت لەسەری(ئەگەر یەك شاهێدیش بێت) ئەوە چی پێیە بۆ خۆیەتی.

سوود:

هەر موسڵمانێك لە مەیدانی جەنگدا كافرێك بكوژێ، شاهێدی هەبێت ئەگەر یەك كەسیش بێت ئەوە چی پێیە بۆ خۆیەتی لە جل و بەرگ و خشڵ و چەك و وە هەروەها ئەوووڵاغەش كە لەسەری كوژراوە.(بۆ زیاتر سەر لە كتابە فیقهیەكان بدە).

## فێڵ كردن لە كاتی شەر:

١-عن أبي هريرة و عن جابر(رضي الله عنهما) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قالَ: اَلْحَرْبُ خَدْعَةٌ. رواه البخاري(٣٠٣٠) ومسلم(١٧٣٩).

واتە: جەنگ فێڵ كردنە.

سوود:

جائزە درۆكردن و فێڵ كردن لە شەردا مادام پەیمان شكاندن و خەلەل بە ئەمانی تیا نەبێت(الإخلال بالأمان).

## هەڵاتن لەشەر لە كاتی بە یەك گەیشتن:

خوا دەفەرموێ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ (الانفال:١٥-١٦).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە کاتێك(لە جەنگ دا) ڕووبەڕووی زۆرێك لە بێ باوەڕان بوونەوە قەت پشتیان تێ مەکەن و هەڵمەیەن(١٥) وە هەر کەس لەو ڕۆژەدا پشتیان تێ بکات و هەڵبێت مەگەر(مەبەستی ئەوە بێت) بۆ هێرش کردن بگەڕێتەوە یان بڕوات بۆ لای کۆمەڵێکی تر(و یارمەتیان بدات) ئەوە بێ گومان بەرق و خەشمی خواوە دەگەڕێتەوە وە جێگای دۆزەخ دەبێت کە جێگایەکی زۆر خراپو بەدە.

**سوود**:

١-هەڵاتن لە کاتی بە یەك گەیشتن لەگەڵ دوژمن لە گوناحە گەورەکانە.

٢- هەڵاتن لە کاتی شەر دورستە ئەگەر دوژمن دوو ئەوەندەی تۆ زیاتر بوو. (بۆ زیاتر سەر لە کیتابە فیقهیەکان بدە).

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: إجْتَنِبُوا السَّبْعَ المُوبقات، قالوا: يا رسولَ اللهِ وما هُنَّ؟ قال: الشِّرْكُ باللهِ، والسِّحْرُ، وقَتلُ النَّفْسِ التي حَرَّمَ اللهُ إلاّ بالْحَقِّ، وأكلُ الرِّبا، وأكْلُ مالِ اليتيمِ، والتَّوَلِّي يَومَ الزَّحفِ، وقَذْفُ المُحْصنات المُؤمنات الغافِلات. رواه البخاري ومسلم

١-الموبقات: المُهلكات، واتە: بە هیلاك دەرەکان.

٢- التولي يوم الزحف: أي: التولي وقت لقاء الجيش للكفار فراراً.

واتە:خۆتان بپارێزن لە حەوت تاوانی فەوتێنەر، گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەم حەوت تاوانە چین؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: هاوبەشی پەیدا کردن بۆ خوا، وە جادووگەری (سحر)، وە کوشتنی کەسێك کە خودا قەدەغەی کردووە مەگەر بەرەوا نەبێ، وە خواردنی ریبا، وە خواردنی ماڵی

هەتیو، وەپشت هەڵکردن لە شەڕ لە کاتی بە یەك گەیشتن لەگەڵ کافران دا، وە بوختانی داوین پیسی هەڵبەستن بۆ ئافرەتانی داوێن پاکی بێ ئاگای بڕوادار.

## جیهادکردن بەردەوام دەبێت تا هاتنی قیامەت:

١-عن جابر بن سمرة(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) أنَّهُ قال: لَنْ يَبْرحَ هذا الدِّينُ قائماً يُقاتِل عليه عصابَةٌ منَ المسلمين حتى تقومَ السَّاعةُ. رواه مسلم(١٩٢٢).

واتە: بەردەوام ئەم ئایینە وەستاو دەبێت، کۆمەڵێك لە موسڵمانان شەڕی لەسەر دەکەن تا قیامەت دادێت.

## (اخلاص) و نیاز پاکی لە جیهادکردن:

١-عن أبي أُمامة(رضي الله عنه) قال: جاءَ رجلٌ فقال يا رسول الله أرأيت رجلاً غزا يَلتَمِسُ الأجرَ والذكر مالَهُ؟ قال(ﷺ) لاشيء لَهُ ثم قال رسول الله(ﷺ) إنَّ الله لا يقبلُ مِن العمل إلاّ ما كان لَهُ خالصاً وابْتُغِيَ بِهِ وَجْهُهُ. رواه ابو داود والنسائي بإسناد جيد.

أرأيت: اخبرني، خەبەرم پێ بدە.

واتە: ئەبو ئومامە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پیاوێك هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا پێم بڵێ: ئەگەر پیاوێك غەزای کرد مەبەستی پاداشت و ناووبانگ بوو چی بۆ هەیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هیچی بۆ نییە پیاوەکە سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هەموو جارێ دەیفەرموو: هیچی بۆ نییە، لە پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بێ گومان

خوا هیچ کردەوەیەك وەرناگرێ تەنها ئەوانە نەبن پاك بۆ خوان و مەبەست بە کردنی ڕەزامەندی خوا بووە.

٢- عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسولَ الله (صلى الله عليه وسلم) يقول: (إنَّ أوَّلَ الناس يُقضى يوم القيامة عليه رجل استشهدَ، فَأُتِيَ به، فَعَرَّفَهُ نعمَه، فَعَرَفَها، قال: فما عَمِلْتَ فيها؟ قال: قاتلت فيك حتى استُشهدتُ، قال كَذَبْتَ، ولكنَّكَ قاتلتَ لأَن يُقال جريٌّ! فقد قِيلَ، ثمَّ أمر به، فَسُحِبَ على وجهه حتى أُلقي في النار.

ورجلٌ تعلمَ العلم وعلَّمهُ، وقرأ القرآن، فَأُتِيَ بِهِ، فعرَّفَهُ نِعَمه فعرفها، قال: فما عملت فيها؟ قال: تعلمت العلم وعلمتهُ، وقرأتُ فيك القرآن، قال: كذبتَ، ولكنك تعلمت ليقال: عالم، وقرأت القرآن ليقال هو قاريءً! فقد قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ، فسحب على وجهه حتى أُلقي في النار.

ورجل وسَّعَ الله عليه، وأعطاهُ من أصناف المال، فأُتِيَ بِهِ فَعرفَهُ نِعَمَهُ، فعرفها، فال: فما عملت فيها؟ قال: ماتركت من سبيل تحبُّ أن يُنفَقَ فيها إلاّ أنفقتُ فيها لك، قال: كذبت، ولكنّك فعلت ليقال: هو جوادٌ! فقد قِيلَ، ثُمَّ أُمر بِهِ فَسُحِبَ على وجهه ثمَّ أُلقِيَ في النار. رواه مسلم.

فَأُتِيَ به: (جاءت به الملائكة يوم القيامة) فریشتە دەیهێنن لەقیامەت.

جريء: ئازا.

جواد: سەخی.

واتە: یەکەم کەس کە لەڕۆژی قیامەتدا مەحکەمە دەکرێ و حوکم

دەدرێ پیاوێکە شەهیدکراوە، دەیهێنن، خودا چاکەکانی خۆی یەکە یەکە بیردەخاتەوە ئەویش یەك بەیەك دەیانناسێتەوە.

جا خوا دەفەرموێ: لەجیاتی ئەو چاکانە تۆ چی کارێکی باشت کردووە؟

دەڵێت: لەپێناوی تۆدا جەنگاوم هەتا شەهید کراوم، دەفەرمووێت: درۆت کرد، بەڵکو بۆئەوە جەنگاویت کە بڵێن ئازایە، وە ئەمەش گوترا.

پاشان فەرمان دەکرێت لەسەر روو رادەکێشرێت هەتا فڕێ دەدرێتە ئاگری دۆزەخەوە.

وە پیاوێك فێری زانیاری بووەو خەڵکی فێر کردووەو قورئانی خوێندووە دەیهێنن، خودا چاکەکانی دەخاتەوە بیری ئەویش دەیانناسێتەوە.

دەفەرمووێت: تۆ لەجیاتی ئەمانە چی کارێکی باشت کردووە!

دەڵێت: زانست فێربووم و خەڵکیشم فێرکردو لەبەر رەزامەندی تۆ قورئانم خوێند.

خوا دەفەرمووێ: درۆت کرد، بەڵکو تۆ بۆیە فێری زانین بووی تا بڵێن زانایە، وە بۆیە قورئانیشت خوێندووە تا بڵێن قورئان خوێنە، وە ئەم قسەش گوترا.

پاشان فەرمان دەکرێت و لەسەر رووی رادەکێشرێت هەتا فڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

وە پیاوێك کە خودا لەدونیادا داراو دەوڵەمەندی کردووەو لەهەموو چەشنە ماڵێکی پێ داوە، دەیهێنن، خودا چاکەکانی خۆی وەبیر دەخاتەوە ئەویش دەیانناسێتەوە.

خودا دەفەرمووێت: چیت پێ کردن.

دەڵێت: هیچ رێگەیەکم نەهێشتەوە کەتۆ پێت خۆش بێت تیایدا

ببەخشرێتەوە، ئیللا بەخشیمەتەوە تیایدا لەبەر تۆ، خودا دەفەرمووێت: درۆت کرد، بەڵکو بۆیە وات کرد تا بڵێن سەخییە، وە ئەم قسەیەش گوترا.

پاشان فەرمان دەدرێت و لەسەر رووی رادەکێشرێت و فڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

## سوود:

شێخ عبدالقادر دەڵێ:

١-پیاوێك دەچێ بۆ غەزا مەبەستی ئەوە نییە ووشەی(الله) بەرز بێت بەڵکو مەبەستی پارەو ماڵە، یا ریا، یا ناوبانگ(سمعة)، یا جگە لە مانە لە دونیا، یا بۆ جاسوسی کردن لەسەر موسڵمانان یا بۆ ئەوەی تەنیا بکەوێ لەگەڵ موسڵمانێ بیکوژێ لە کاتی شەڕدا، ئەوە لە ئاگرە.

٢- پیاوێك دەچێ بۆ غەزا مەبەستی بەرز کردنەوەی ووشەی خوایە وە مەبەستیشی بەشی نەفسی خۆیەتیشی لە ماڵ، یا ناوبانگ(سمعة)، یا ریایە، ئەوە هیچ پاداشتی بۆ نی یە.

٣- پیاوێك دەچێ بۆ غەزا تەنها مەبەستی پێ بەرزکرنەوەی ووشەی خوایە، جگە لەم مەبەستە هیچ مەبەستی تری نییە(ثُمَّ حَصَلَ له شيء من المغنم ضِمناً لا قصداً) لە پاشان لەم غەزایە غەنیمەتی دەست دەکەوێ ئەوەیان پاداشتی جیهادی بۆ هەیە لە رێ ی خوا بەڵام پاداشتەکەی کەمی کردووە بە هۆی ئەوەی پێ ی براوە لە غەنیمەت.

٤- پیاوێك دەچێ بۆ غەزا، هیچ مەبەستی نییە تەنها بەرز کردنەوەی ووشەی خوا نەبێت لەم غەزایە هیچ بەشێکی دونیایی دەست ناکەوێ ئەوەیان پاداشتی تەواوی بۆ هەیە، لەم خاڵی چوارەمە هەموو وەك یەك نین ئەوەیان کە لە هەمووان زیاتر پاداشت وەردەگرێ ئەوەیانە کە خوێنی دەرژێ و ئەسپەکەی دەکوژرێ و ماڵەکەی دەروا.

## باسی دایك و باوك:

قال تعالى﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًاۚ إِمَّا يَبۡلُغَنَّ عِندَكَ ٱلۡكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوۡ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفّٖ وَلَا تَنۡهَرۡهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوۡلٗا كَرِيمٗا ﴿٢٣﴾ وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا﴾ (الاسراء:٢٣-٢٤).

واته: وه پەروەردگارت بڕیاری داوه كه جگه لەوی(هیچ شتێك) نەپەرستن وه چاكه لەگەڵ باوك‌و دایكتاندا بكەن، جا ئەگەر هات یەكێكیان یان هەردووكیان له لات بەساڵ دا چوون ئەوه پێیان نەڵێی(ئۆف) وه تێیان مەخوڕه وه قسەی بەرێزەوەیان لەگەڵ بكه(٢٣) وه باڵی گەردن كەچی یان له رووی بەزەییەوه بۆ شۆڕ بكەوەو بڵێ: پەروەردگارم رەحمیان پێ بكه وەك چۆن به گچكەیی بەخێویان كردووم(٢٤).

## ئەزیەتی دانی دایك وباوك له گوناهه گەورەكانه

١- عن عبدالله بن عمرو بن العاص(رضي الله عنهما) عن النبيِّ(ﷺ) قال: الكبائرُ، الإشراكُ باللهِ، وعقوقُ الوالِدَيْنِ، وقتْلُ النَّفسِ واليَمِينُ الغَموسُ. رواه البخاري(٦٦٧٥).

اليمين الغموس: التي يحلفها كاذباً عامداً، سميت غموساً لأنها تغمس

الحالف في الأثم.

واته: اليمين الغموس: ئەوەیە خاوەنەکەی ئەم سوێندە بە ئەنقەست و بەدرۆ دەخوا بۆیە ناوی لێندراوە(غموس) چونکە خاوەنەکەی نوقم دەکا لە گوناه.

## سوود:

پێناسەی عقوق الوالدین:

عقوق الوالدين: هو إيذاؤُهُما بأَيٍّ نَوعٍ مِنَ الأذى قَلَّ او كَثُرَ، أَو مُخالَفَتُهما فيما يأمرانِ بهِ أَو يَنهَيان عَنْهُ بشَرْطِ إنتقاءِ المعصية[1].

واته: عقوق الوالدین: بریتییە لە ئەزیەت دانی دایك و باوك بە هەر جۆرێك لە جۆرەکانی ئەزیەت جا کەم بێت یا زۆر یان پێچەوانەی ئەمرو نەهی ئەوان بکەی بە مەرجێ ئەمرو نەهیەکەیان بۆ گوناە نەبێت.

٢- عن أبي بكرة قال: قال رسول الله(ﷺ) الا أُنَبِّئُكَم بأكبر الكبائرِ؟ قلنا بلى يا رسول الله، قال: الإشراك بالله، وعقوق الوالدين، وكان مُتَّكِئاً فَجَلَسَ فقال: الا وقولُ الزُّور وشهادة الزور، الا وقولُ الزور، وشهادة الزور، فمال زالَ يقولها حتى قُلتُ لا يسكت. رواه البخاري(٥٩٧٦) ومسلم(٨٧).

واته: ئایا خەبەرتان بدەمێ بە گەورەترینی گوناهە گەورەکان؟ گوتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی: هاوبەشی دانان بۆ خوا، وە ئەزیەت دانی دایك و باوك، پێغەمبەر(ﷺ) پاڵی دابۆوەو هەستا دانیشت و فەرمووی: ئاگادار بن قسەی درۆو شایەتی بەدرۆش، ئاگاداربن قسەی

(1) الخطايا في نظر الإسلام، عفيف طبارة

درۆو شایەتی بە درۆش(واتە ئەم دووەش لە گەورەترین گوناهە گەورەکانن) جا پێغەمبەر(ﷺ) زۆر ئەمەی دووبارە کردەوە تاوەکو گوتم بێ دەنگ نابێت.

## سوود:

پێغەمبەر(ﷺ) ئەم گوناهانەی باس کرد بە(اکبر الکبائر) واتە لە ناو گوناهە گەورەکان ئەمانە لە گەورترینیانن کەواتە موسڵمان دەبێت زۆر ووریا بێت لە قسەو هەڵس و کەوتی لەگەڵ دایك و باوکی دا، دایك و باوك رێگایەکی فراوانن بەرەو بەهەشت یا بەرەو دۆزەخ.

٣- عن عبدالله بن عمرو أنّ رسول الله(ﷺ) قال: مِن الكبائر شَتَمُ الرَّجُلِ والِدَيه، قالوا: يا رسولَ اللهِ هل يشتِمُ الرَّجلُ والِدَيه؟ قال: نعم يَسبُّ أبا الرَّجُلِ فيَسُبُّ أَباهُ ويَسبُّ أُمَّهُ فَيَسُبُّ أُمَّهُ. رواه البخاري(٥٩٧٣) ومسلم(٩٠)

١-الشتم: السَّب، جوێن.

واتە: لە گوناهە گەورەکانە پیاو جوێن بە دایك و باوکی بدات، گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئایا پیاو جوێن بە دایكو باوکی دەدات؟ گوتی بەڵێ: جوێن بە باوکی پیاوێك دەدات ئەویش جوێن بە باوکی دەداتەوە، وە جوێن بە دایکی دەدات ئەویش جوێن بە دایکی دەداتەوە.

## سوود:

ئیمامی شافعی دەڵێ: ما ادركتُ أُمّي فأَبُرَّها، ولكن لا اسُبُّ احداً فَيَسُبُّها.

واتە: نەگەییم بە دایکم تا چاکەی لەگەڵ دا بکەم بەڵام جوێن بە کەس نادەم ئەویش هەڵبستێ جوێن بە دایکم بدات.

## گەورەیی چاكە كردن لەگەڵ دایك وباوك:

١-عن أبي هريرة قال: جاء رجلٌ إلى رسولِ الله(ﷺ) فقال: يا رسول الله، من احَقُّ الناسِ بِحُسنِ صَحابتي؟ قال: أُمُكَ، قال: ثُمَ مَنْ؟ قال: أمُك، قال: ثُمَّ مَنْ؟ قال: أمك، قال: ثم من؟ قال: ثُمَّ أبوك. **رواه البخاري(٥٩٧١) ومسلم (٢٥٤٨).**

**١-الصحابة: بمعنى الصُحبة، واتە: هاورێیەتی، یاوەری، دۆستایەتی، برادەرێتی.**

**واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا كێ لە هەموو كەس حەقترە كە هاورێتی بكەمو چاكەی لەگەڵ دا بكەم؟ فەرمووی: دایكت، گوتی: لە پاشان كێ؟ فەرمووی: دایكت، گوتی: لە پاشان كێ؟ فەرمووی: دایكت، گوتی: لە پاشان كێ؟ فەرمووی: لە پاشان باوكت.**

## سوود:

**١-قال ابن عباس: إني لا أعلم عملاً أقربُ الى الله من بر الوالدة.**

**واتە: ابن عباس دەڵێ: من هیچ كردەوەیەك نازانم زووتر بتگەیەنی بە خوا لە چاكە كردن لەگەڵ دایك.**

**٢-قال محمد بن المنكدر رحمهُ الله: بتُّ أَغمِزُ رجلَ أمي وبات اخي عمر يُصلي، وما يَسرُّني ان ليلتي بِليلَتهِ.**

**واتە: (محمد بن المنكدر) دەڵێ: عومەری برام شەوی بە شەو نوێژ بە سەر بردو منیش لاقی دایكم دەشێلا، بەڵام شەوەكەی خۆم بە هی ئەو ناگۆرمەوە.**

٣- حەیاتی کوری شورەیح کە یەکێکە لە پێشەوایانی موسڵمانان جای وا هەبوو دادەنیشت زانیاری فێری خەڵکی دەکرد، دایکی پێی دەگوت حەیات هەستە جۆی بدە مریشکەکان ئەویش یەکسەر هەڵدەستاو دەرسەکەی بەجێدەهێشت.

٤- ابن عون(رحمه الله) نادته أُمّهُ مَرّةً فَأجابها بصوتٍ عالٍ فأعتقَ رَقبتين.

واتە: (ابن عون) جارێکیان دایکی بانگی کرد، ئەویش بە دەنگێکی بەرز وەڵامی دایەوە لەبەر ئەوە دوو عەبدی ئازاد کرد.

٢- عن عبدالله بن عمرو عن النبيِّ(ﷺ) قال: رضى الرَّبِّ في رضى الوالدِ، وسَخَطُ الرَّبِّ في سَخَطِ الوالدِ. صحيح: رواه الترمذي(١٨٩٩).

الوالد: باوك(الوالدة) دايك(الوالدين) دايك وباوك.

واتە: رەزامەندی پەروەردگار لە رەزامەندی باوك دايە، وە تورەیی پەروەردگار لە تورەیی باوك دايە.

**سوود**:

رأى ابو هريرة رجلاً يمشي خَلفَ رجلٍ فقالَ من هذا قال ابي، قال: لا تَدْعُهُ باسْمِهِ ولا تَجلِسْ قَبْلَهُ ولا تَمشي امامَهُ.

واتە: ئەبو هریرە پیاوێکی بینی لە دوای پیاوێك دەرۆیی گوتی ئەوە کێ یە؟ ووتی: باوکمە. فەرمووی: بە ناوی خۆی بانگی مەکە، وە لە پێشی ئەو دامەنیشە وە لە پێش ئەویش مەرۆ.

٣- عن ابي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ) رَغِمَ أنْفُهُ ثم رَغِمَ

أنْفُه ثمَّ رَغم أنفه قيل من يا رسول الله؟ قال: مَنْ أدرك والِدَيْه عند الكِبَر أحَدُهما أو كليْهما ثُمَّ لَمْ يَدْخُل الجنَة. رواه مسلم(٢٥٥١).

رغم أنفه: الرُّغام: خۆڵ، أنف: کەپوو ئەم رستە(کناية)یە بۆ ریسوایی.

واتە: کەپووی بە خۆڵەوە نووسا، لە پاشان کەپووی بە خۆڵ وەنوسا لەپاشان کەپووی بەخۆڵەوە نووسا (واتە ریسوا بوو) گوتیان کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەو کەسەی کە دەگات بە دایك و باوکی لە کاتی بە تەمەن داچونیان بگات بە یەکێکیان یا هەردووکیان لە پاشان نەچێتە بەهەشت.

## سوود:

١-کاتێك دایکی(إیاس)ی کوری(معاویه) مرد، (إیاس) گریا، پیٚ ی گوترا بۆچی دەگری؟ گوتی: دوو دەرگای کراوەم هەبوو بەرەو بەهەشت(واتە دایك و باوکی) ئێستا یەکێکیان داخرا.

<u>٢- هەندیٚ لەو چاکانەی کە لەگەڵ دایك و باوك دا دەکریٚ:</u>

١-سەردانی کردنیان دانیشتن لە گەڵیان دا.

٢- ئەگەر نەخۆش بوون هەوڵی چارەسەرکردنیان بدەی.

٣- داوای رەحمەت و لێخۆش بوونیان بۆ بکەی لە خوا.

٤- ئەگەر پێویستیان بە پارەو ماڵ هەبوو پێیان بدەی.

٥- ئەگەر پێویستیان بە گەڕان و سوڕان و سەردان هەبوو بیان بەی.

٦- دەعوەتیان بکەی ناوە بە ناوە بۆ نان خواردن.

٧- ئەگەر یەکێك لە براو خوشکەکانت نارەحەتیان دەکردن مەنعیان بکەی.

٨- ناوە بە ناوە دیاریان بۆ ببەی.

٩- ئەگەر غەمبار بوون هەوڵ بدەی غەمەکەیان نەهێڵی.

١٠- ئەگەر پێداویستیەکیان هەبوو بچی بۆیان جێ بەجێ بکەی.

١١- فێری ئیسلام و دین داریان بکەی.

١٢- ئەگەر شتێکی ناشەرعیان هەبوو هەوڵ بدەی بە شێوەیەکی جوان بۆ لابردنی.

١٣- ئەگەر کێشەیەك هەبوو لە نێوان دایك و باوکت هەوڵ بدەی کێشەکە نەهێڵی.

١٤- شتی تریش هەن، بەڵام پێم باشە ئەوەش بڵێم هەرچی لەگەڵ دایك و باوکت دەکەی لە چاکە نیەتی لێ بێنە ئەگەر تەنانەت پەرداغێك ئاویشت پێ دان چونکە هەموو کارێکی خێر ئەگەر نیەتت نەبوو بۆت بەخێر نانوسرێ.

٤- عن عبدالله بن عمرو قال: جاءَ رجلٌ الى النبيِّ(ﷺ) يَستأْذِنُهُ في الجهاد فقال: أَحَيٌّ والداك؟ قالَ نَعَمْ، قال: فَفِيهما فَجاهد. رواه البخاري(٥٩٧٢) ومسلم(٢٥٤٩).

واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) ئیزنی لێ دەخواست بۆ جیهاد کردن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا دایك و باوکت ماوە؟ گوتی بەڵێ، فەرمووی: دەجا لەوان جیهاد بکە(مەبەست خزمەت کردن و چاکە کردنە لە گەڵیان).

٥- عن أبي سعيدٍ الخدري أنَّ رجلاً هاجرَ الى رسول الله(ﷺ) مِن اليمن، فقال: هل لك أحدٌ باليَمنِ؟ قال: أبوايَ، قال: أذِنا لكَ؟ قال: لا، قال: ارْجع اليهما فاسْتأذِنْهما فإنْ أذِنا لكَ فجاهِد وإلاّ فَبِرَّهُما. صحيح: رواه أبوداود(٢٥٣٠).

واتە:پیاوێك لە یەمەن هیجرەتی كرد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: كەسێكت هەیە لە یەمەن؟ پیاوەكە گوتی: دایك و باوكم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئیزنیان دای؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: بگەڕێوە بۆ لایان ئیزنیان لێ وەربگرە ئەگەر ئیزنیان دای ئینجا وەرە جیهاد بكە، وە ئەگەر ئیزنیان نەدای ئەوە چاكەیان لەگەڵ بكە.

**سوود**:

١-بۆ جیهادی فەرز ئەگەر دایك و باوكیشت ئیزنیان نەدای هەر دەبێت بیكەی، بەڵام(ابن بان) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: ئەگەر بۆ جیهادی فەرزیش ئیزنیان پێ نەدای نابێت بیكەی.

٦-عن عبدالله بن مسعود قال: سألتُ رسول الله(ﷺ): أيُّ الأعمال أحبُّ إلى الله؟ قال: الصَّلاة على وقتها، قلتُ: ثُمَّ أيٌّ؟ قال: ثُمَّ بِرُّ الوالدين، قلتُ: ثُمَّ أيٌّ؟ قال: ثُمَّ الجهاد في سبيل الله. رواه البخاري(٥٢٧) ومسلم(٨٥).

واتە:(عبدالله) كوری مسعود دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر كرد(ﷺ) كام لە كردەوەكان خۆشەویسترە لای خوا؟ فەرمووی: نوێژ كردن لە یەكەم كاتی خۆی، گوتم لە پاشان كامیان؟ فەرمووی: لە پاشان چاكەكردن لەگەڵ دایك و باوك، گوتم لە پاشان كامیان؟ فەرمووی: لە پاشان جیهاد كردن لە ڕێی خوادا

**سوود**:

چاكە كردن لەگەڵ دایك و باوك دەرگایەكە موسڵمان دەتوانی لیّ ی بچێتە ژوورەوە لەم دەرگایەدا پاداشتی یەكجار زۆر بۆ خۆی كۆبكاتەوە.

**شنقیطي**(رەحمەتی خوای لیّ بێت) دەڵیّ: وبشرِ البارَّ بِكُلِّ خير من الله، ومَنْ حَفِظَ وصيّةَ الله في والدِيه فإنَّ اللهَ سيُوَفِّقُهُ لِكلِّ خيرٍ يرجوهُ، واللهِ ما قَرعَ البارُّ باباً مِنَ الخيرِ إلاّ فَتَحَهُ الله في وَجْهِه، ولا سَلَكَ سَبيلَ طاعةٍ إلاّ يَسَّرَهُ اللهُ لَهُ بأَمْرِهِ، بِرُّ الوالدين مِن أعظمِ القُرُباتِ وأحَبِّها إلى الله.

**واتە**: مژدە بدە بەوانەی چاكە لەگەڵ دایك و باوكیان دەكەن بە هەموو خێریّ لە لایەن خواوە، وە هەر كەسێك راسپاردەی خوا دەربارەی دایك و باوكی بپارێزیّ، خوای گەورە یارمەتی دەدا بۆ هەموو خێرێك كە رەجای وایە بۆی ببیّ، والله ئەوانەی چاكە لەگەڵ دایكو باوكیان دەكەن لە هەر دەرگایەكی خێر بدەن خوا بە روویاندا دەیكاتەوە، وە هەر رێگایەكی طاعەت بگرنەبەر خوا ئاسانی دەكا بۆیان بە فەرمانی خۆی، چاكە كردن لەگەڵ دایك و باوك لە گەورەترینی ئەو شتانەیە كە موسڵمان پیّ ی نزیك دەبێتەوە لە خوا وە لە خۆشەویسترینیانە لای خوا.

## گەورەیی چاكە كردن لەگەڵ پلك:

١–عن البراء بن عازب عن النبيِّ(ﷺ) قال: الخالةُ بمنزلةِ الأُمِّ.
**صحيح**: رواه الترمذي (١٩٠٤) وغيره.

**واتە**: پلك(خوشكی دایك) لە پلەو پایەی دایك دایە.

٢– عن ابن عمر انَّ رجلاً أتى النبيَّ(ﷺ) فقال: يا رسول الله

إني أصبتُ ذنباً عظيماً فهل لي من توبة؟ قال: هل لك من أُمّ؟ قال: لا، قال: هل لكَ من خالةٍ؟ قال: نَعَم، قال: فَبِرَّها. صحيح: رواه الترمذي(١٩٠٤).

١-خاله: خوشكی دايك، پلك، پوور، ميمك.

واته:

پياوێك هاته لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من گوناحێكی گەورەم كردووە، ئايا تەوبەم بۆ هەيە؟ فەرمووی: دايكت هەيە؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: ئەدی پلكت هەيە؟ (خوشكی دايك)، گوتی: بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: جا دە چاكەی لەگەڵ بكە.

## سوود:

قال مكحول وإمام احمد: بِرُّ الوالدين كفارةٌ للكبائر.

واته: چاكە كردن لەگەڵ دايك و باوك دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناهە گەورەكان.

## گەورەيی دوعا كردن بۆ دايك و باوك:

١-عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): إنَّ الرَّجُلَ لَتُرفَعُ دَرَجَتُهُ في الجنَّةِ فيقولُ: أنَّي لي هذا؟ فَيُقالُ: باسْتغفارِ ولدِك لك. صحيح: رواه ابن ماجه(٣٦٦٠) وغيره، انظر(صحيح الجامع:١٦١٧).

واته: بێگومان پياوی وا هەيە پلەی بەرز دەكرێتەوە لە بەهەشت، جا دەڵێ: من ئەوەم لە كوێ بوو؟ پێ دەگوترێ:(ئەوەت دەست كەوتووە) بە هۆی داوای لێخۆش بوونی منداڵەكەت بۆ تۆ.

**سوود**:

یەکێك لەو چاکە گەورانەی منداڵ بیکات لەگەڵ دایك و باوکی دوعاو پارانەوەو داوای لێخۆش بوون کردنە بۆیان لە خوا جا چ لە کاتی ژیانیان دا بێت چ لە دوای مردنیان.

قال بعض الصحابة(ترك الدعاء للوالدين يضيق العيش على الولد) واتە: یەکێك لە ئەسحابەکان دەڵێ: وازهێنان لە دوعا کردن بۆ دایك و باوك ژیان تەسك دەکاتەوە لەسەر منداڵ. جا لەوانەیە کەسی وا هەبێت منداڵ بووەو باوك و دایکی مردووە، یا لەگەڵ دایك و باوکی خراپ بووەو ئێستا مردوون و ئەو پەشیمانە، یا خۆزگە دەخوازێ کە دایك و باوکی مابانە بۆ ئەوەی چاکەی زیاتری لەگەڵ دا بکردبانە.

دەفەرموو مادام ئەتۆ ماوی هێشتا کارەکە کۆتایی پیێ نەهاتووە ئەم دوو دوعایە رۆژانە زۆر بکە ئومێد وایە ئەگەر ئەزیەتی دایك و باوکیشت دابێت لە دونیادا لە قیامەت بە چاکەکار حیسابت بۆ بکریێ.

١-(ربِّ اغفر لي ولِوالديَّ وارْحَمهما كما ربَّياني صَغيرا).

واتە: پەروەردگارم لە گوناهی خۆم دایك وباکم خۆشبە وەرەحمیان پیێ بکەیت هەر چۆن ئەوان منیان پەروەردە کرد بە منداڵی.

خوا دەفەرمویێ﴿وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴾ (الأسراء: ٢٤).

٢- وە زۆر بڵێ﴿ربِّ اغفر لي ولِوالديَّ و للمؤمنينَ والمؤمنات﴾ ئەم داوای لێخۆش بوون کردنە پاداشتەکەی بە ملیار حیسابی بۆ دەکریێ لە لای خودای گەورە.

## باسی (صِلَة الرَّحم)

١-عن أبي أيّوب قال: جاء رجلٌ إلى النبيِّ(ﷺ) فقال: دُلَّني على عَمَلٍ أعمَلُهُ يُدنيني من الجنَّة ويباعدني من النار؟ قال: تَعبُد الله ولا تشركُ به شيئاً وتُقيمُ الصلاة وتُؤْتي الزّكاة وتَصِلُ ذا رَحِمِك، فلما أدبرَ قال رسول الله(ﷺ): إنْ تَمَسَّكَ بِما أُمِرَ بِهِ دخَلَ الجنة. رواه البخاري(١٣٩٦) ومسلم(١٣).

١-دلني: دَلَّ: نيشانى دا، يَدُلُّ: نيشان دەدات، دُلَّني: نيشانم بدە.

٢- يُدنيني: دنا: نزيك بۆوە، يَدنو: نزيك دەبێتەوە، يدنيني: نزيكم بكاتەوە.

ادبر: پشتى تێ كرد، رووى وەرگێرا.

٤- تَمسَّك:(التمسك) دەست پێوە گرتن.

واتە: پياوێك هاتە لاى پێغەمبەر(ﷺ) گوتى كردەوەيەكم نيشان بدە بيكەم، نزيكم بكاتەوە لە بەهەشت وە دوورم بكاتەوە لە ئاگر؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: خوا بپەرستە و هيچ هاوبەشێكى بۆ بريار مەدە، وە نوێژ بكە، وە زەكات بدە، وە سيلەى رەحم جێ بەجێ بكە. جا كاتێك پياوەكە رۆيشت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: ئەگەر دەست بەوە بگرێ كە فەرمانى پێكراوە دەچێتە بەهەشت.

### سوود:

١-ئەمانە لە سيلەى رەحمن:

١-دايك و باوك لە پێش هەموويان، وە داپيرو باپيران.

٢- كچ و كور، هەر چەندە بەرەو خوار بڕوا واتە: منداڵ و منداڵی منداڵیان.

٣- براو خوشك، هەر چەندە بەرەو خوار بڕوا.

٤- دایكی شیری.

٥- مام و خاڵ.

٦- پلك(خوشكی دایك و باوك).

٧- پاشان خزمی تر(ئامۆزا، پورزا، خاڵۆزا، .... هتد).

٢- قال الإمام النووي(رحمه الله): صلة الرحم: هي الإحسان الى الأقارب على حسب حال الواصل والموصول فتارة تكون بالمال، وتارةً تكون بالخدمة، وتارةً تكون بالزيارة والسلام وغير ذلك.

وقال عثيمين(رحمه الله): في المجتمع المسلم المحافظ فما عَدَّهُ الناس صلة فهو صلة، وما عدّوه قطيعة فهو قطيعة[1].

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فَلْيُكرمْ ضَيفهُ ومن كانَ يؤمنُ بالله واليوم الآخر فَلْيَصلْ رَحِمَه ومن كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلْيقل خيراً أو لِيَصْمُت. رواه البخاري (٦١٣٨).

واتە: هەر یەكێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانی بگرێ، وە هەر یەكێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با سیلەی ڕەحم جێ بە جێ بكات، وە هەر یەكێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی خێر بكات یا با بێ دەنگ بێت.

(1) شرح (رياض الصالحين)، عُثيمين.

**سوود**:

قال عمرو بن دينار: تَعْلَمُنَّ انَّهُ ما من خُطوةٍ بعد الفريضة أعظمُ أجراً من خطوةٍ الى ذي الرَّحم.

واته: عەمری کوری دینار دەڵێ: دەزانن هیچ شەقاوو هەنگاوێك لە دوای هەنگاونان بۆ فەرزەکان گەورەتر نی یە لەو هەنگاوەی کە بۆ جێ بە جێ کردنی سیلەی رەحم دەهاوێژرێ.

٣- عن أنس أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: مَنْ أحَبَّ ان يُبسَطَ لَهُ في رزقه، و يُنسأَ لَهُ في أَثَرِهِ فَلْيَصِلْ رحِمَهُ. رواه البخاري(٢٠٦٧) ومسلم(٢٥٥٧).

١-يُنسأَ: يؤخر، دوا بکەوێ.

٢- اثرهَ: الأثر: الأجل، ئەجەل.

واته:

هەر یەکێك پێی خۆشە رۆزی فەراوان بێت، وە ئەجەلی دوا بخرێت با سیلەی رەحم جێ بەجێ بکات.

٤- عن جبير بن مطعم عن النبيِّ (ﷺ) قال: لا يَدْخُلُ الجنّةَ قاطِع. قال سفيان يعني قاطع رحم. رواه البخاري(٥٩٨٤) ومسلم(٢٥٥٦).

واته:ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی کە سیلەی رحم دەپچرێنێ.

٥- عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله(ﷺ) الرَّحِمُ مُعَلَّقَةٌ بالعرشِ، تقول: مَنْ وَصَلَني، وَصَلَهُ الله، ومَنْ قطعني، قطعه الله. رواه البخاري(٥٩٨٩) ومسلم(٢٥٥٥).

واته: خزمایەتی هەڵواسراوە بە عەرشی(خوا) دەڵێ: هەر یەکێك دەم گەیەنی خودا بیگەیەنی، وە هەر یەکێك دەم پچڕێنی خودا بیپچڕێنێ.

**سوود:**

١-ئیمام(ذهبي) لە کیتابی(الکبائر)دا پچراندنی سیلەی رەحم لە ریزی گوناهە گەورەکان باس دەکات. لە کەبیرەی نۆیەم. وە هەروەها(هیثمي)یش لە(زواجر) لە ریزی گوناحە گەورەکانی باس دەکات لە کەبیرەی سێ سەدو سێ.

٦- عن عبدالله بن عمرو عن النبيِّ(ﷺ) قال: ليس الواصِلُ بالمكافِيء، ولكنِ الواصِلُ الذي إذا قُطِعَتْ رَحِمَهُ وصَلها. رواه البخاري(٥٩٩١).

واتە: ئەو کەسە سیلەی رەحمی جێ بەجێ نەکردووە، کە ئەگەر بەرامبەرەکەی سیلەی رەحمی لەگەڵدا جێ بەجێ بکات ئەویش بیکات وە ئەگەر ئەو نەیکرد ئەویش نەیکات، بەڵکو سیلەی رەحم جێ بەجێ کار ئەو کەسەیە کە خزمەکەی پەیوەندی لە گەڵیا دەبڕێ ئەو خزمایەتیەکە تازە دەکاتەوە.

**سوود:**

موسڵمان ئەگەر بەرامبەرەکەی سیلەی رەحمی لەگەڵدا جێ بەجێ نەکرد ئەو هەر لەسەری واجبە کە سیلەی رەحمی لەگەڵ دا جێ بەجێ بکات، تۆ واجیی سەرشانت جێ بەجێ دەکەی پاداشت وەردەگری، ئەویش بەم کارەی تووشی گوناهە گەورەکان دەبێت.

٧- عن سلمان بن عامر قال: قال رسول الله(ﷺ): إنَّ الصَّدقة على المسكين صدقةٌ وعلى ذي الرَّحم اثنتانِ صَدَقَةٌ وصِلَةٌ. صحيح: رواه الترمذي(٦٥٨) وانسائي(٢٥٨٢).

واته: بێگومان خێرو سەدەقە بە هەزار ئەوە بە یەك خێر حیساب دەكرێ، بەڵام ئەگەر بیدەی بەوانەی كە سیلەی رەحمتن بە دوو خێر حیساب دەكرێ هەم خێرو سەدەقە هەم سیلەی رەحمیش.

٨- عن أمّ المؤمنين(ميمونة بنت الحارث) أنّها أعتقتْ وليدةً ولم تَستأْذِنِ النبيَّ(ﷺ) فلَمّا كان يومُها الذي يَدور عليها فيه، قالت: أشَعرْتَ يا رسول الله أني أعتقتُ وليدَتي؟ قالَ: أوَ فَعلتَ؟ قال: نعم، قال: أما إنَّكِ لو أعطيتِها أخوالَكِ كان أعظمَ لأَجرِك. رواه البخاري(٢٥٩٢) ومسلم(٩٩٩).

١-وليدە: جاریە. كەنیزە.

واته: دایكی ئیمانداران مەیمونەی كچی حارث كەنیزەكی ئازاد كردووە داوای رێپێدانی نەكردووە لە پێغەمبەر(ﷺ)، جا كاتێك ئەو رۆژە هاتووە كە نۆرەی بێت پێغەمبەر(ﷺ) لای بێت، پێ ی فەرموو: ئایە هەستت كردووە كە من جاریەكەمم ئازاد كردووە؟ فەرمووی ئایا وات كردووە؟ فەرمووی: بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر بتبەخشیبا بە خاڵەكانت پاداشتت زیاتر دەبوو.

## باسي جيران- دراوسێ:

١-عن أبي هريرة قال: قال رسول رسول الله(ﷺ): من كان يؤمنُ بالله واليوم الآخِرِ فلا يُؤْذِ جارَهُ. رواه البخاري(٦٠١٨) ومسلم(٤٧).

واته: هەر كەسێك باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە با ئازاری جیرانەكەی نەدات.

**سوود**:

١-قال الحسن:(ليس حُسنُ الجوار كَفُّ الأذى، ولكن حسن الجوار إحتمال الأَذى).

واته: باش بوون لەگەڵ جیران تەنها ئەوەندە نییە ئەزیەتی نەدەی، بەڵكو باش بوون لەگەڵ جیران سەبرو ئارام گرتنە لەسەر نارەحتیەكانی.

٢- عن عائشة: حَدُّ الجوار أربعون داراً من كلِّ جانب.

واته: سنووری جیرانەتی چل ماڵە لە هەر لایەكەوە.

٣- جائیز نییە ئەزیەتی جیراندان تاوەكو ئەگەر خۆی یا یەكێك لە منداڵەكانی هەڵسان بە ئەزیەت دانت.

٢- عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): المؤمن من أمِنهُ الناس، والمسلم من سلم المسلمونَ من لسانهِ ويده، والمهاجر من هجر السوءَ، والذي نَفسي بيده لا يدخل عبدٌ الجنة لا يأمنُ جارهُ بَوائِقه[1].

---

(1) صحيح رواه ابن حبان(٥١٠) وابو يعلي(٤١٨٧).

واتە: ئیماندار ئەو کەسەیە کە خەڵك لێی ئەمین بن، وە موسڵمان ئەو کەسەیە کە موسڵمانان لە دەست و زمانی سەلامەت بن،وە کۆچکەر ئەو کەسەیە کە کۆچ بکات لە گوناح و خراپە، وەسوێندم بەوەی گیانی منی بە دەستە ناچێتە بەهەشت بەندەیەك کە جیرانەکەی لە شەڕو شۆری ئەمین نییە.

٣- عن ابن عمر و عائشة(رضي الله عنهما) قالا: قال رسول الله(ﷺ): مازالَ جبريلُ يُوصِيني بالجارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أنَّهُ سَيُورِّثُهُ. رواه البخاري(٦٠١٤) ومسلم(٢٦٢٤).

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (جبریل) ئەوەندە ئامۆژگاری کردم لە بارەی مافی دراوسێ تا وا گومانم برد کە دراوسێ میرات و کەلەپوور لە دراوسێکەی دەگرێ.

٤- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ النَّبيَّ(ﷺ) قال: والله لا يُؤمنُ، والله لا يؤمنُ، والله لا يُؤمن، قِيلَ مَنْ يارسول الله؟ قال: الذي لا يأمَنُ جارُهُ بوائقَهُ. رواه البخاري(٦٠١٦) ومسلم(٤٦).

واتە: ئەبو هریرە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: بە خوا ئیمان و باوەری نییە، بە خوا ئیمان و باوەڕی نییە، بە خوا ئیمان و باوەڕی نییە! ئەصحابە گوتیان کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەو کەسەی کە دراوسێکەی ئەمین نییە لە شەرو شۆری.

٥- عن عبدالله بن مسعود قال: قلتُ: يا رسول الله أيُّ الذّنب أعظمُ؟ قال: أن تَجعلَ لله نداً وهو خَلقكَ قلتُ ثُمَّ ماذا؟ قال: أن تَقتلَ ولَدكَ خشيةَ أنْ يَطعمَ معك، قُلتُ ثُمَّ ماذا؟ قال: أن تَزني بِحَليلة جاركَ. رواه البخاري(٤٤٧٧) ومسلم(٨٦) والترمذي(٣١٨٢).

واته:(عبدالله) دەڵێ: ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا کام گوناح گەورەترە(لای خوای)؟ فەرمووی: شەریك و هاوتایەك بریار بدەیت بۆ خوا لە کاتێکدا کە ئەو دورستی کردوویت، گوتم لە پاشان چی؟ فەرمووی: ئەوەیە کە منداڵەکەت بکوژی لە ترسی ئەوەی نەوەك نانت لەگەڵ دا بخوات، ووتم لە پاشان چی؟ فەرمووی: ئەوەیە کە زینا لەگەڵ ژنی دراوسێکەتدا بکەیت.

**سوود**:

١-ئیمام ئەحمەد دەڵێ:(لا اعلم بعدَ القتلِ ذنباً أعظم من الزنا).

واته: نازانم لە دوای کوشتنی بە ناهەق گوناهێك هەبیت گەورەتر بیت لە زینا.

٢- (ابن القيم) دەڵێ:(أعظم أنواع الزنى أن يزني بحليلة جاره، ... فالزنى بمائةِ امراةٍ لا زوج لها أيسرُ عند الله من الزنى بامْراة الجار).

واته: گەورەترین جۆری زینا ئەوەیە زینا لەگەڵ خێزانی جیرانەکەتدا بکەی، ... زینا کردن لەگەڵ(١٠٠) ئافرەت کە مێردی نەبێت ئاسان ترە لای خوا لەوەی کە زینا لەگەڵ خێزانی دراوسێکەتدا بکەی.

٦- عن المقداد بن الأسود(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) لأصحابهِ: ما تقولونَ في الزنا؟ قالوا: حرامٌ حَرَّمَهُ اللهُ ورسولُهُ فهو حرامٌ الى يوم القيامةِ قال: فقال رسول الله(ﷺ): لأَن يَزنيَ الرَّجُلُ بِعَشرِ نسوَةٍ أيسَرُ عليه مِن أنْ يزنِيَ بامْرأةِ جارِهِ. قال: ما تقولونَ في السَّرِقةِ؟ قالوا: حَرَّمَهُ اللّهُ ورسولُهُ فهي حرامٌ قال: لأَن يسرِقَ الرَّجُلُ مِنْ عشرةِ أبياتٍ أيسَرُ عَلَيهِ مِنْ أَن يَسْرِقَ من جارِهِ. صحيح: رواه أحمد و صححه الألباني في(الادب المفرد)

للبخاري.

واته: مقدادى كورى ئەسوەد(رەزاى خواى لىٚ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەصحابەكانى فەرموو: چى دەڵێن دەربارەى داوێن پيسى(زنا)، گوتيان قەدەغە(حرام)ە، خواو پێغەمبەرى خوا قەدەغەيان كردووە، داوێن پيسى قەدەغە(حرام)ە تا رۆژى دوايى، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: ئەگەر پياو داوێن پيسى(زنا) بكات لەگەڵ دە ئافرەت ئاسانترە لەسەرى لەوەى داوێن پيسى بكات لەگەڵ ئافرەتى دراوسىٚ ى.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى چى دەڵێن دەربارەى دزى(سرقە) گوتيان: خواو پێغەمبەرى خوا قەدەغەيان كردووە جا دزى كردن قەدەغە(حرام)ە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: ئەگەر پياو لە دە ماڵان دزى بكات ئاسانترە لەسەرى لەوەى كە دزى بكات لە دراوسێكەى.

٧- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رجُلٌ: يا رسول الله إنَّ فُلانَة تُكثرُ من صَلاتها وصدقتها وصيامها غير أنها تُؤذي جيرانها بلسانها. قال: هي في النار. قال: يا رسول الله، فإنَّ فلانة يُذكرُ منْ قلَّة صيامها وصلاتها، وأنَّها تَتَصدَّقُ بالأَثوار منَ الأَقط ولا تُؤذي جيرانها قال: هي في الجنَّة[1].

واته: پياوێك گوتى: ئەى پێغەمبەرى خوا فلانە ئافرەت نوێژو رۆژوو و خێرى زۆر دەكات، بەڵام بەزمانى ئەزيەتى جيرانەكانى دەدات. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى: ئەوە لەئاگرە.

پياوەكە گوتى ئەى پێغەمبەرى خوا فلانە ئافرەتيش باس دەكرێ بەوەى نوێژو رۆژووى زۆر نيەو پارچە كەشكيش دەكاتە خێر، بەڵام

---

(1) رواه احمد والبزار وابن حبان في صحيحه والحاكم وقال صحيح الأسناد، ....

ئەزیەتی جیرانەکانی نادات. پێغەمبەر (ﷺ)، فەرمووی: ئەوە لەبەهەشتە.

٨- عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ): ليس المؤمن الذي يشبع وجاره جائع. **قال الهيثمي في(المجمع) رواه الطبراني وأبو يعلي ورجاله ثقات.**

**واتە: ئیماندار نی یە ئەو کەسەی کە تێر دەبێ و جیرانەکەشی برسییە.**

٩- عن عائشة قالت: قلت: يا رسول الله إنَّ لي جارين فإلى أيِّهما أُهدي؟ قال: إلى أقربهما منك بابا .**رواه البخاري(٦٠٢٠).**

**واتە: عائشە دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا من دوو جیرانم هەیە، دیاری بۆ کامیان ببەم؟ فەرمووی: بەوەیان کە دەرگاکەی لێتەوە نزیکترە.**

١٠- عن أبي هريرة عن النبيِّ(ﷺ) قال: إذا استأذن أحدُكم جارُهُ أن يَغرِزَ خَشبةً في جِداره فلا يمنعهُ. **صحيح: رواه ابن ماجه(٢٣٣٥).**

**واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە دروسێکەی داوای لێ کرد کە رێگەی بدات کە دارێك لە دیوارەکەی بچەقێنێت با قەدەغەی نەکات.**

## سوود:

**با موسڵمان هەوڵ بدات تا بۆی دەکرێت کار ئاسانی بۆ جیرانەکانی بکات لەم جۆرە کارانەو لە شتی تریش دا.**

١١- عن حذيفة قال: قال رسول الله(ﷺ): فتنةُ الرَّجُل في أهله و ماله و جارهِ، تُكفِّرها الصلاة والصَّدَقةُ، والأمرُ بالمعروفِ

والنَّهيُ عن المُنكر. رواه البخاري(٣٥٨٦).

واته: هەر گوناهێك كە پیاوی موسڵمان دەیكات بە هۆی خێزان و ماڵ و جیرانەكەی، ئەوە نوێژو خێرو سەدەقەو فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپە دەیسرنەوە.

١٢- عن عبدالله بن مسعود قال: قال رجلٌ لرسول الله(ﷺ) كيفَ لي أن أعلمَ إذا أحسنتُ وإذا أسأتُ؟ قال النبيُّ(ﷺ) إذا سَمعتَ جيرانك يقولون: أنْ قَدْ أحسَنتَ فقد أحسَنتَ وإذا سَمعتهم يقولون: قد أسأتَ فقد أسأتَ. صحيح: رواه ابن ماجه(٤٢٢٣).

واته: پیاوێك بە پێغەمبەری گوت(ﷺ) من چۆن بزانم كە چاكە كارم یا خراپە كارم؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر گوێت لە جیرانەكانت بوو دەیان ووت تۆ چاكەت كردووەو چاكەكاریت، ئەوە تۆ چاكەكاریت، وە ئەگەر گوێت لەوان بوو دەیان گوت: تۆ خراپەت كردووەو خراپەكاریت. ئەوە تۆ خراپەكاریت.

١٣- عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ) ما من مُسلم يموتُ فَيَشهَدُ لَهُ أربعةٌ من أهلِ أبيات جيرانهِ الأدنيين أنَّهم لا تعلمون منهُ إلاّ خيراً، إلا قال الله تبارك وتعالى: قَد قَبلتُ قولكم او قال بشهادتكم وغفرتُ لَهُ ما لا تعلمون. صحيح: اخرجه الحاكم(١٣٩٨) وابن حبان(٣٠٢٦).

واته: هەر موسڵمانێك بمرێ چوار لە دراوسێ نزیكەكانی شایەتی بۆ بدەن كە ئەوان تەنها چاكە نەبێت لەو هیچی تر نازانن، ئیللا خوا(تبارك وتعالى) دەفەرموێ: قسەكانی ئێوەم وەرگرت(یا فەرمووی) شایەتیەكانی ئێوە، وە لە گوناهەكانی خۆش بووم لەوەی كە ئێوە نایزانن.

١٤- عن أبي زُهير الثَّقفي قال: خَطَبَنا رسول الله(ﷺ) قال: يوشِكُ أن تَعرفوا أهلَ الجَنَّةِ مِنْ أهلِ النَّار، قالوا: بِمَ ذاكَ يا رسول الله؟ قال: بالثَّناء الحسنِ والثناءِ السَّيءِ، أنتم شهداءُ الله بعضكم على بعض. حسن: رواه ابن ماجة(٤٢٢١).

واته: نزيكه خەڵكانى بەهەشتى بناسنەوەو جيايان بكەنەوە لە خەڵكانى دۆزەخى، ووتيان بەچى ئەوە دەناسينەوە ئەى پێغەمبەرى خوا؟ فەرمووى: بە باس كردنى بە چاكەو بە باس كردنى بە خراپە، ئێوە شايەتى دەرانى خوان هەندێكتان لەسەر هەندێكتان.

١٥- عن أبي هريرة قال: جاء رجل الى رسول الله(ﷺ) فقال: يا رسول الله دُلَّني على عمل إذا عملت به دخلتُ الجنّة؟ قال: كن محسناً، قال: كيفَ أعلمُ أني مُحسنٌ، قال: سل جِيرانَك فإن قالوا إنكَ مُحسنٌ فأنت محسن وإن قالوا إنك مُسيءٌ فأنت مسيء. رواه الحاكم(١٣٩٩) وقال هذا حديث صحيح على شرط الشيخين.

واته: پياوێك هاتە لاى پێغەمبەر(ﷺ) ووتى: ئەى پێغەمبەرى خوا كارێكم پێ نيشان بدە ئەگەر كردم بچمە بەهەشت؟ فەرمووى: چاكەكار بە، پياوەكە ووتى چۆن بزانم كە من چاكەكارم؟ فەرمووى: لە جيرانەكانت بپرسە ئەگەر گوتيان تۆ چاكەكارى ئەوە تۆ چاكەكارى وە ئەگەر گوتيان تۆ خراپەكارى ئەوە تۆ خراپە كارى.

## سوود:

هەندێك لەو كارانەى دەبنە هۆى ئەوەى جيرانەكانت بە چاكەكارت بزانن:

١-كاتێك پێیان گەیشتی بە گەرمی سڵاو چاك و چۆنیان لەگەڵ دا بکە.

٢- ئەگەر نەخۆش کەوتن سەردانیان بکەو ئەگەر دەعوەتیان کردی بچوو.

٣- هەوڵ بدە چاکەیان لەگەڵ دا بکەی بە خواردن بێت یا بە یارمەتی دان بێت، یا بەدانی قەرزو پارەو ماڵ بێت یا بە هەر جۆرێکی تر کە رێکەوت.

٤- هەوڵ بدە تا بۆت دەکرێ چاوی خۆت بگرە لە ئاست ئافرەتەکانی جیرانتان.

٥- لە پاش ملەو لە لای جیرانان قەت غەیبەتیان مەکە.

٦- مەهێلە منداڵەکانت بە هەر جۆرێك بیت جیرانەکان ئەزیەت بدەن.

٧- یەکێك لە بنچینەی رەوشتە جوانەکان ئەوەیە کە سەبر بگری لەسەر ئەو نارەحتیانەی لە لایەن خەڵکەوە پێت دەگات، جا تۆش ئارام گر بە لەسەر نارەحتیەکانی جیرانەکەت ئەگەر نا بە شێوەیەکی نەرم و جوان پێیان بڵێ.

٨- زۆر جاران ئافرەت لەسەر جۆگەڵەی ئاوو زبرو خاشاك کێشە دورست دەکەن جا تۆش خێزانەکەت تێ بگەیەنە کەمافی دراوسێ چییە، وە چۆنیش رەفتار بکات لەگەڵ ئەم کێشەیە.

٩- هەوڵ بدە تێکەڵاویان لەگەڵدا بکەیت بە چاکە چونکە لەوانەیە زۆر جار جیران رەخنە لە جیرانەکەیان بگرێت کە ئەو تێکەڵاویان ناکات و لەگەڵیاندا ناوەستێت و ناڕوات و دانانیشێ.

١٠- هەر کارێکی چاکەشت کرد لەگەڵیان دا با هەمووی لە پێناوی خوادا بێت بۆ ئەوەی پاداشت وەربگریەوە.

## حەقی ژن لەسەر پیاوەکەی

١-عن حكيم بن معاوية عن أبيه، أَنَّ رجلاً سأل النبيَّ(ﷺ): ما حقُّ المرأة على الزّوج؟ قال: أنْ يُطعمها إذا طَعم، وأن يكسوها إذا اكتسى، ولا يَضرِبِ الوَجهَ ولا يُقَبِّحْ، ولا يَهجُر إلاَّ فِي البيت. صحيح: رواه أبوداود(٢١٤٢) وابن ماجة(١٨٥٠).

واتە: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر کرد(ﷺ) کە حەقی ژن لەسەر پیاو چییە؟ فەرمووی: ئەوەیە خواردنی پیٚ بدات کاتیٚ کە خۆی خواردنی خوارد، وە پۆشاکی بۆ بکات کاتیٚ خۆی پۆشاکی کرد، لەدەم و چاوی نەدات وە قسەی ناشیرینی پیٚ نەڵیٚ، وە خۆی لیٚ جیا نەکاتەوە مەگەر لە ماڵیٚ دا(لەگەڵیدا نەخەویٚ بۆ تەمیٚ کردنی ئەگەر لاسار بوو).

## مافەکانی ژن بەسەر مێردیەوە:

١-ئەو مارەییەی لەسەری رێك کەوتوون پیٚ ی بدات.

٢- نەفەقەو خەرجی کێشانی ژن و منداڵەکانی.

٣- بە چاکە هەڵس و کەوت کردن لەگەڵی دا.

٤- فەرمانی پیٚ نەدات بە تاوان کردن.

٥- یارمەتیدەر بێت بۆ هاوسەرەکەی لەسەر گوێرایەڵی خواو پێغەمبەر(ﷺ) حەقی ژنە لەسەر پیاو ئەو شتانەی زەروورین لە دین فێری بکات یا ئیزنی بدات کە لە کۆرەکانی عیلم ئامادەبێت.

٦- حەقی ژنە لەسەر پیاو کە نهێنیەکانی بڵاو نەکاتەوە وە باسی

عەیبەکانی نەکات وە لە هەموو نەهێنیەکانیش خەتەر تر نەهێنی سەر جێگا نوستنیانە.

٧- وە لە حەقی ژنە لەسەر پیاوەکەی کە ئیزنی بدات کە لە ماڵ دەربچێت ئەگەر پێویستی پیێ ی هەبوو وەك ئامادەبوونی جەماعەت، یا سەردانی کەس و کاری و خزمانی یا جیرانەکانی، پیاو تووشی گوناهە گەورەکان دەبێت ئەگەر رێگە بگرێ لە خێزانەکەی کە سیلەی رەحم جێ بەجێ بکات، وە پیاویش ئەگەر رێگای سەردانی حەلال لە خێزانەکەی بگرێ لەوانەیە خێزانەکەی تووشی نەخۆشی نەفسی و جەسەدی بێت و بەهۆیەوە تووشی سەر ئێشە بێت لەگەڵیدا جا بۆیە من لێردا بە هەموو پیاوێك دەڵێم هەتا بۆی دەکرێ بەسەرو دڵێکی فراوان داخوازیەکانی خێزانەکی هەمووی جێ بەجێ بکات مادام لە سنووری شەرع نەدەچووە دەرێ.

٨- عبدالعظیم البدوی لە (الوجیز) دا دەڵێ:(من حق المرأة علی الرجل أن یرجع الیها بعد العشاء مباشرة) وە لە حەقی ژنە بەسەر پیاو کە راستەخۆ لە دوای عیشادا بگەرێتەوە لای خێزانەکەی.

٩- وە لە حەقی ژنە لەسەر پیاو ئەگەر دوو ژنی هەبوو یا زیاتر کە عەدل بیت لەگەڵیان دا لە خواردن، خواردنەوە، جل و بەرگ، خانووبەرە، سەر جێگای نووستن.

١٠- لە حەقی ژنە لەسەر پیاو کە ئارام بگرێت لەسەر نارەحتیەکانی ژن. رەوشتە جوانەکان لەگەڵ خێزان هەر ئەوەندە نی یە کە ئەزیەتی نەدەی بەڵکو دەبێ سەبریش بگری لەسەر نارەحتیەکانی.

## بەگوێ كردنی مێرد:

١-عن عبدالرحمن بن عوف(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: اذا صَلَّتِ المرأةُ خَمْسَها، وصامتْ شَهرَها، وحَفظَتْ فَرْجَها، وأطاعَتْ زوجَها، قِيلَ لها ادخُلي الجَنَّةَ مِنْ أيِّ أبواب الجَنَّةِ شِئتِ. صحيح(صحيح ابن ماجه:٦٠٠) و أحمد.

واته: ئەگەر ئافرەت پێنج نوێژە فەرزەكانی كرد، وە مانگی رەمەزان بەرۆژوو بوو، وە داوێنی خۆی پاراست، وە بە گوێی مێردەكەی كرد، پێی دەگوترێ بچۆ بەهەشت، لە هەر دەرگایەكی بەهەشت دەتەوێ.

### سوود:

یەكێك لە مافەكانی پیاو لەسەر خێزانەكەی ئەوەیە كە چی پێ دەڵێ بە گوێ ی بكات تەنها لە گوناح نەبێت.

٢- عن حُصين بن محصن أن عمة لَهُ أتت النبيَّ(ﷺ) فقال لها: أذات زوجٍ أنتِ؟ قالت: نَعَم! قال: فَأينَ أنتِ منهُ؟! قالت ما آلوهُ، إلاّ ما عَجَزْتُ عَنْهُ! قال: كيفَ كُنتِ لَهُ! فَإنَّهُ جَنَّتُك ونارك[1].

واته:(حصين)ی كوری(محصن) گوتویەتی: پلكێكی چوەتە لای پێغەمبەر(ﷺ)، جا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووە: ئایا تۆ مێردت هەیە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: تۆ بۆ ئەو چۆنی؟! گوتی: كەمتەرخەمی لە

(1) قال المنذري رواه: احمد والنسائي بإسنادين جيدين والحاكم وقال: صحيح الإسناد.

گوێڕایەڵی و خزمەت کردنی ناکەم مەگەر ئەوەی کە لە توانام نەبێ. جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تۆ چۆنی بۆ ئەو، بزانە ئەو بەهەشتی تۆیەو دۆزەخی تۆیە.

٣- عن أبي هريرة عن النبي(ﷺ) قال: لو كنت آمراً أحداً أن يسجُدَ لأحَدٍ لأمرتُ المرأةَ أن تَسجُدَ لزوجها. **حسن صحيح: رواه الترمذي(١١٥٩).**

**واتە: ئەگەر فەرمانم بکردایە کە یەکێك سەجدەی بۆ یەکێك ببردایە ئەوە فەرمانم دەکرد کە ژن سەجدەی بۆ مێردەکەی ببردبایە.**

٤- عن ابي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ) إذا دعا الرَّجُلُ امرأتَهُ إلى فراشه فلم تأْته فباتَ غضبان عليها لَعَنَتْها الملائكةُ حتى تُصبح. **رواه البخاري(٣٢٣٧) ومسلم(١٤٣٦).**

**واتە: ئەگەر پیاو داوای سەرجێیی کرد لە خێزانەکەی ژنەکەشی نەچێت، پیاوەکەشی بە تووڕەیی شەوی کردەوە لێ ی، ئەوە ئەو شەوە فریشتەکان تا بەیانی لەعنەتی لێ دەکەن.**

٥- عن أبي هريرة عن النبيّ(ﷺ) قال: إذا باتتِ المرأةُ هاجرة فِراش زوجها لعنتها الملائكةُ حتى تُصبح. **رواه مسلم(١٤٣٦).**

**واتە: ئەگەر ژن شەوی کردەوەو لەگەڵ پیاوەکەی دا نەخەوت، مەلائیکەت لەعنەتی لێ دەکەن تا بەیانی دەکاتەوە.**

**سوود:**

**لە لێکۆڵینەوەکان دەرکەوتووە لەسەت ئافرەت دە یا بیست ئافرەت جنسیان وەکو پیاو بە هێزە جا ئەو ئافرەتانەی جنسیان بەهێزە بە ئاسانی**

لەگەڵ پیاوەکانیان دەگونجێن، وە لە راپرسیەکانیش دەرکەوتووە زۆربەی کێشەکانی پیاوان لەگەڵ ژنەکانیان لەسەر بابەتی جنسیە، جا با ئافرەتی موسڵمان لەم بابەتەدا پا بەند بێت بە شەرعەوە پیاوەکەی هەر چیەکی ویست با بۆی بکات لە خۆرازاندنەوەو جل و بەرگ لەبەر کردن و پرچ داهێنان و بەکار هێنانی داوو دەرمان و هەموو ئەو شتانەی کە ئەو دەیەوێ بە مەرجێ لە سنووری شەرع دەرنەچێت.

٦- عن طلق بن على أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: اذا دعا الرَّجلُ زوجتهُ لحاجتهِ فَلْتأْتهِ وإن كانت على التَّنُور. صحيح رواه الترمذي(١١٦٠).

واتە: ئەگەر پیاو بانگی خێزانەکەی کرد بۆ پێداویستیەکانی با بچێت ئەگەر لەسەر تەندووریش بێت.

**سوود:**

ئافرەت با بزانێت فەرمانەکانی پیاوەکەی بۆ ئەو مادام بۆ گوناح نەبێت ئەوە وەکو نوێژو رۆژوو لەسەری فەرزە جێ بە جێ ی بکات جا با هەواو ئارەزوو و بەهانەی بێ بەڵگە تێکەڵ بەم مەسەلەیە نەکات.

## حەرامە تەنیا کۆبونەوە لەگەڵ ئافرەتی بێگانەدا:

١-عن عقبة بن عامر(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: إيّاكُمْ والدُّخُولَ على النِّساءِ! فقال رَجُلٌ من الأنصار: أفرأيتَ الحَمْوَ؟ قال: الحَمْوُ الموتُ! رواه البخاري(٥٢٣٢) ومسلم(٢١٧٢).

١-الحمو: قريب الزوجة، كأخيه، وابن أخيهِ، وابن عَمِّهِ. واتە: الحمو:

نزيكانی مێرد، وەك برای، كوری برای، ئامۆزای.

مانای فەرموودەكە:

خۆتان بپارێزن لەوەی بچنە شوێنێك... ژوورێك كە ئافرەت بە تەنها لەوێ بێت. پیاوێك لە ئەنساریەكان گوتی: ئەدی ئەگەر خزمی مێردەكەی بوو؟ فەرمووی خزمی مێرد مردنە(واتە ئەو خراپترە).

٢- عن ابن عباس عن النبيِّ(ﷺ) قال: لا يخْلُوَنَّ رجلٌ بامْرأة إلا مَعَ ذي مَحرم. رواه البخاري(٥٢٣٣) ومسلم(١٣٤١).

واتە: با هەرگیز هیچ پیاوێك بە تەنیا كۆنەبێتەوە لەگەڵ ژنێكی بێگانەدا، مەگەر ژنەكە كەسێكی خۆیی خۆی لەگەڵدا بێت.

## سوود:

دروست نییە ئافرەت بە تەنیا لەگەڵ شوفێر سواری یەك سیارە بن چونكە حوكمی(خلوە)ی بەسەردا جێبەجێ دەبێت، بەڵام ئەگەر پیاوێكی تر یان زیاتر یاخود ئافرەتێكی تر یان زیاتر لەگەڵیان بوون ئەوا ئاساییە چونكە حوكمی(خلوە)ی لەسەر نامێنێ. بەڵام ئەوەی باسمان كرد لەسەر سەفەركردن بۆ دەرەوەی شار جێ بەجێ نابێ.

# حەرامە ئافرەت بەبێ مەحرەم و خۆیی سەفەر بكات:

١-عن ابن عباس(رضي الله عنهما) أنَّهُ سمع النبيَّ(ﷺ) يقول: لا يخلُوَنَّ رَجُلٌ بامرأةٍ إلا ومعها ذو محْرمٍ. ولا تُسافرُ المرأةُ إلاَ مع ذِي محْرمٍ، فقال لهُ رجُلٌ: يا رسول الله إنَّ امرأتي خَرجت حاجَّة

وإنِّي اكتُتبتُ في غَزوَةِ كذا وكذا؟ قال انطَلِق فَحُجَّ مَعَ امرأتك. رواه البخاري(١٨٦٢) ومسلم(١٣٤١).

**واتەی ووشە:**

١-لا يخلون: لا: ناهية، حرف مبنيٌّ على السكون.

يخلون: فعل مضارع مبنيٌّ على الفتح لإتصالهِ بنون التوكيد في محل جزم بلا الناهية، (لا يخلون) واتە: با هەرگیز بە تەنیا لەگەڵی کۆنەبتەوە.

٢- اكتتبت: ناو نووس کراوم.

٣- انطلق: بڕۆ.

**مانای فەرموودەکە:**

با هەرگیز هیچ پیاوێکی(بێگانە) لەگەڵ هیچ ئافرەتێکی (بێگانە) بەتەنیا لەگەڵی کۆنەبێتەوە مەگەر ژنەکە خۆیی و مەحرەمی لەگەڵ دابێ، وە با ئافرەتیش سەفەر نەکات مەگەر لەگەڵ مەحرەم و خۆیدا بێت، پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا خێزانەکەم بە تەنیا چووە بۆ حەج وە منیش ناو نووس کراوم بۆ فلان غەزاو فلانە غەزا، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بڕۆ لەگەڵ ژنەکەت حەج بکە.

## سوود:

١-ئافرەت بۆی جائز نی یە بەبێ خۆیی مەحرەم سەفەر بکات، ئەگەر سەفەری حەجیش بێت، یاخود لەم سەرە مەحرەمێکی بە تەیارە بەرێی بکات لەو سەریش مەحرەمێکی پێشوازی لێ بکات ئەمەش جائز نی یە.

٢- مەحرەم خۆییەکەش دەبێت چوار مەرجی تیا بێت:

١-موسڵمان بێت.

٢- بالغ بێت.

٣- عاقل بێت.

٤- نێر بێت.

٣- چوونی ئافرەت بۆ بازار لە ئەصلدا جائزە بە مەرج نەگێراوە بۆ بازار مەحرەمی لەگەڵدا بێت تەنها ئەگەر لە(فتنة) ترسا.

## حەرامە ئافرەت تەماشای عەورەتی ئافرەت بکات:

١-عن أبي سعيد أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: لا يَنظُرُ الرَّجُلُ إلى عورةِ الرَّجُلِ، ولا المرأةُ إلى عورةِ المرأةِ، ولا يُفضي الرَّجُلُ إلى الرَّجلِ في ثوبٍ واحد، ولا تُفضي المرأةُ إلى المرأةِ في الثوب الواحد. رواه مسلم(٣٣٨).

واتە: با پیاو تەماشای عەورەتی پیاو نەکات، وە با ژنیش تەماشای عەورەتی ژن نەکات، وە با دوو پیاو بە رووتی لە ژێر یەك نوێن دا رانەکشێن، وە با دوو ئافرەتیش بە رووتی لە ژێر یەك پێخەفدا رانەکشێن.

## سوود:

١-ابن الجوزي لە(أحكام النساء)دا دەڵێ:(عورة المرأة في حق المرأة كعورة الرجل في حق الرجل، من السُّرَّةِ إلى الرّكبة، ... فلتعلم المرأة انها إذا بلغت سبع سنين لم يجز لأُمها ولا لأختها ولا لبنتها ان تنظر إلى عورتها).

واتە: عەورەتی ژن بۆ ژن وەکو عەورەتی پیاو وایە بۆ پیاو لە ناوك تا وەکو ئەژنۆ چۆکە، ... جا با ئافرەت بزانێ کە گەیشتە حەوت ساڵ جائز نییە بۆ دایکی و خوشکی و کچی کە تەماشای عەورەتی بکەن.

٢- تەماشاکردنی عەورەتی کوڕو کچی کەمتر لە حەوت ساڵ حەرام

نییەو دەست لێدانیشی حەرام نییە، واجبیش نییە لە خەڵکدا بپۆشرێ مادام لە فیتنەو ئاژاوە ئەمین بن.

٣- بۆ مێرد تەماشا کردنی هەموو لەشی خێزانەکەی دورستە، بۆ مەحرەمەکانی تر لە مەزهەبی شافعی تەنها تەماشا کردنی نێوانی ناوك و چۆك دورست نی یە، بەڵام پەیرەوانی ئیمام ئەحمەد دەڵێن: دورستە پیاو تەماشای ئەو شوێنانەی مەحرەم بکات کە بە زۆری دەردەکەون وەك گەردەن و سەروو هەردوو دەست و پێیەکانی، بەڵام نابێت بە ئارەزوو بێت، ئەمەی گوترا دەست لێدانیشیان دەبێت بەڵام بەبێ ئارەزوو.

## حەرامە پیاو خۆی بە ئافرەت بچوێنی وە ئافرەتیش بە پیاو:

١-عن ابن عباس قال: لعَنَ رسول الله(ﷺ) المُتَشَبِّهينَ من الرجال بالنساء والمُتَشَبِّهات من النساء بالرِّجال. **رواه البخاري(٥٨٨٥) وابوداود(٤٠٩٧).**

**واتە:پێغەمبەر(ﷺ) لەعنەتی کردووە لەو پیاوانەی کە خۆیان بە ئافرەتان دەچوێنن وە لەو ئافرەتانەش کە خۆیان بە پیاوان دەچوێنن.**

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: لَعَنَ رسول الله(ﷺ) الرَّجُلَ يَلْبَسُ لِبْسَةَ المرأةِ، والمرأةَ تَلْبَسُ لِبْسَةَ الرَّجُلِ. **صحيح رواه أبوداود(٤٠٩٧).**

**واتە: ئەبوهریرە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) نەفرین(لعنة)ی کردووە لەو پیاوەی کە بەرگی ژنانە لەبەر دەکات، وە لەو ژنەش کە بەرگی پیاوانە لەبەر دەکات.**

## مەرجەكانی حیجابی ئافرەتی موسڵمان هەشتن:

١-دەبێ حیجابەكە هەموو لەش دابپۆشێ، ئەم خاڵە قسەی تریشی لەسەرە.

٢- نابێ حیجابەكە رازاوەو سەرنج راكێشەر بێت.

٣- پێویستە جلەكە ئەستوور بێت و تەنك نەبێت.

٤- دەبێ حیجابەكە پان و بەرین بێ و تەسك نەبێت تا ئەندامێكی لەشی بەدەر نەكەوێ.

٥- نابێ حیجابەكە بۆن خۆش و بۆندار كرابێت.

٦- نابێ حیجابەكە بەجل و بەرگی پیاوان بچێ.

٧- نابێ بە جل و بەرگی كافران بچێ.

٨- نابێ جل و بەرگەكە بۆ ناوبانگی و شۆرەت بێت.

٣- عن أبي هريرة أنَّ النبيَّ(ﷺ) أُتِيَ بِمُخَنَّثٍ قَدْ خَضَبَ يَدَيْهِ ورِجليهِ بالحِنَّاءِ فقالَ النبيُّ(ﷺ) ما بال هذا؟ فقيل يا رسول الله يَتَشَبَّهُ بالنساء، فأُمِرَ بِهِ فَنُفِيَ إلى النقيع، فقالوا: يا رسول الله ألا نَقتُلُهُ؟ فقال: إني نُهيتُ عن قتل المُصلِّين. صحيح: رواه أبوداود (٤٩٢٨).

١-النقيع: ناحيه عن المدينه وليس بالبقيع.

واتە: پیاوێكی ژنانیان هێنا لای پێغەمبەر(ﷺ) خەنەی لە دەست و پێیەكانی دابوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە بۆ وای كردووە؟ گوترا ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە خۆی بە ژنان دەچوێنێ، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەمری كرد پیاوەكەیان دوورخستەوە بۆ نەقیع گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا نەی كوژین؟ فەرمووی: من نەهیم لێ كراوە كە نوێژكاران بكوژم.

**سوود**:

١-حەرامە پیاو خەنە لە دەست و پێیان بدەن تەنها بۆ دەرمان و تیمار نەبێ.

٢- سوننەتە ئەگەر ئافرەت خاوەن مێرد بێت خەنە لە دەست و پێ ی بدات.

٣- بۆ کچ پەیرەوانی ئیمام شافعی دەڵێن باش نییە خەنە لە دەستی بدات، بەلام پەیرەوانی ئیمام مالك دەڵێن دورستە.

## لەو سیفەتانەی ئافرەت پێ ی دەچێتە بەهەشت:

١-عن أنس(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: ألا أُخبِرُكم بِرجالكم في الجنة؟ قلنا: بلى يا رسول الله. قال: النبيُّ في الجنة، والصِّدِّيقُ في الجنّة، والرَّجُلُ يزور أخاهُ في ناحية المصرِ لا يزورهُ إلاّ للهِ في الجنة. ألا أُخبركم بنسائِكُم في الجنّةِ؟ قلنا: بلى يا رسول الله. قال: ودودٌ وَلُودٌ إذا غَضِبَتْ أو أُسيءَ إليها أو غضب زوجها قالت: هذهِ يدي في يَدِكَ لا أكتَحِلُ بَغَمضٍ حتى ترضى. حسن: رواه الطبراني أنظر(صحيح الجامع:٢٦٠٤).

واتە: ئایە خەبەرتان پێ بدەم بەو پیاوانەتان کە دەچنە بەهەشت؟ گوتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: پێغەمبەر لە بەهەشتە، وە راست گۆ لە بەهەشتە، وە پیاوێك سەردانی براکەی دەکات لە لایەکی شاردا، سەردانی ناکات لەبەر خوا نەبێت ئەوەش لە بەهەشتە، ئایە خەبەرتان پێ بدەم بەو ئافرەتانەی کە دەچنە بەهەشت؟ گوتمان بەڵێ ئەی

پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ئەو ئافرەتانەی کە مەحبوبن و منداڵیان دەبێت، ئەگەر تووڕە بوو یا خراپەی لەگەڵ دا کرا، یا مێردەکەی تووڕە بوو،(بە مێردەکەی) دەڵێ: ئەوە دەستم لە ناو دەستت ناخەوم تا رازی نەبیت.

## دەست نوێژی پیاو و ئافرەت بە ماچ و دەست لێدان ناشکێ:

١-عن عروة بن الزبير عن عائشة: أنَّ رسول الله(ﷺ) قَبَّلَ بَعض نسائه ثُمَّ خرجَ إلى الصلاةِ ولَمْ يَتوضّأْ، قلتُ ما هي إلاّ أنت فَضَحِكَتْ. صحيح: رواه ابوداود(١٧٩) والترمذي(٥٠٢).

واتە: عوروە دەڵێ: عائشە فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) یەکێك لە خێزانەکانی خۆی ماچ کرد لە پاشان چوو بۆ نوێژ و دەست نوێژیشی نەشوشتەوە، عوروە دەڵێ: گوتم ئەوە کەس نەبووە تەنها تۆ نەبیت، عائیشەش پێ کەنی.

**سوود:**

نەدەست نوێژی پیاو نە دەست نوێژی ئافرەت بە ماچ و دەست لێدان ناشکێ.

## بینینی خەونی جنسی لە لایەن ئافرەتەوە:

١-عن خولة بنت حكيم، أنها سألتْ رسول الله(ﷺ) عن المرأة ترى في منامها ما يرى الرجُلُ؟ فقال: ليس عليها غُسلٌ حتى تُنزلَ،

كما أنَّهُ ليس على الرَّجل غسل حتى يُنزل. حسن: رواه ابن ماجه(٦٠٢).

واته: خەولەی کچی حکیم لەپێغەمبەری پرسیار کردووە (ﷺ) دەربارەی ئافرەت ئەگەر خەوی جنسی بینی؟ فەرمووی: غوسلی لەسەر نییە تا ئاوی نەیەت، هەروەکو پیاویش(ئەگەر خەونی جنسی بینی) غوسلی ناکەوێتە سەر تا ئاوی نەیەت.

وە هەروەها ئەگەر پیاو ئافرەت لە خەو هەڵسان ئاویان بینی ئەگەر خەونی جنسیشیان نەبینیبوو ئەوە هەر غوسلیان دەکەوێتە سەر.

## سەر بڕاوی ئافرەت حەڵاڵ و جائیزە:

١-عن كعب بن مالك، عن أبيه: أنَّ امرأةً ذبَحَتْ شاةً بحجر، فَذكَرَ ذلكَ لرسول الله(ﷺ) فلَم ير به بأساً. صحيح: رواه ابن(٣١٨٢).

واته: ئافرەتێك مەڕێكی بە بەرد سەر بڕی، جا ئەوەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد ئەویش هیچی لەوەدا نەبینی.

## گەورەیی بەخێوکردنی کچ:

١-عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): منْ عالَ جاريتَين دخَلتُ أنا وهو الجنة كهاتَيْنِ وأشار بأُصْبُعَيْهِ. رواه مسلم(٢٦٣١) والترمذي(١٩١٤).

واته: هەر یەكێك دوو كچ بەخێو بكات من و ئەو ئەوەها وەكو ئەم دووە

پێکەوە دەچینە بەهەشت، ئەنەس دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بۆ دوو پەنجەی کرد:

٢- عن عائشة قالت: قال النبيُّ(ﷺ) منِ ابْتُلِيَ من البنات بشيءٍ فأحسن إليهنَّ كنَّ له ستراً منَ النار. **رواه البخاري(١٤١٨) ومسلم(٢٦٢٩).**

**واتە:** هەر یەکێك تاقی بکرێتەوە بەوەی کە خوا کچی پێبدات، جا ئەویش باش بێت لەگەڵیاندا بۆی دەبنە پەردە لە ئاگر.

## جیا کردنەوەی جێگای نوستنی منداڵ لە تەمەنی دە ساڵیدا:

١-عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جدّه، قال: قال رسول الله(ﷺ): مُرُوا أولادكم بالصلاة وهم أبناءُ سبعِ سنين، واضربوهم عليها وهم أبناء عشرٍ سنين، وفرِّقوا بينهم في المضاجعِ. **حسن صحيح: رواه أبوداود(٤٩٥).**

**واتە:** فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن بە نوێژکردن لە تەمەنی حەوت ساڵیدا، وە لە تەمەنی دە ساڵیدا لەسەر نوێژ لێیان بدەن، وە جێگەی نوستنیان لە یەکتری جیا بکەنەوە.

**سوود:** کورێك تەمەنی گەیشتبێتە(١٠) ساڵ دورست نی یە لەیەك پێخەفدا لەگەڵ دایك و خوشکیدا بخەوێت، بەڵام لە(١٠) ساڵ کەمتر بوو جائیزە، وە هەروەها دورستە هەموویان لە یەك ژوور بخەون بە مەرجێك هەر کەسەو جێگای نوستنی جیا بێت لەوانی تر.

## ئافرەت و رۆژووی سوننەت:

١-عن ابي هريرة عن النبيِّ(ﷺ) قال: لا تصومُ المراةُ وبَعلُها شاهدٌ إلاّ بإذنهِ. رواه البخاري(٥١٩٢) ومسلم(٨٤).

واتە: نابێت ئافرەت رۆژوو-ی سوننەت - بگرێ ئەگەر مێردەکەی لە ماڵەوە بێت بە مۆڵەتی ئەو نەبێت.

## خەتەنەکردنی ئافرەت:

١-عن عمرو ابن شعيب، عن أبيه، عن جَدِّه، قال: قال رسول الله(ﷺ): إذا التقى الخِتانان، وتوارت الحشَفَةُ، فقد وجبَ الغُسلُ. صحيح: رواه ابن ماجة(٦١١).

١-الختانان: الختان: شوێنی برین لە زەکەرو فەرج.

٢- الحشفة: راس الذكر، سەری زەکەر.

واتە: ئەگەر شوێنەکانی خەتەنەکردن بەیەك گەیشتن، سەری زەکەر گوم بوو، غوسل دەرکردن واجب دەبێت(لەسەر پیاوو ژنەکە).

**سوود:**

١-ئەگەر سەری زەکەری پیاو نوقم بوو لە دۆڵی ئافرەت، ئاویش نەیەت هەردووکیان غوسلیان لەسەر واجب دەبێت.

٢- ئەم فەرموودەیە باسی خەتەنەکردنی تێدایە بۆ پیاوو ئافرەت، خەتەنەکردن بۆ پیاوان فەرزە، بەڵام بۆ ئافرەتان نەفەرزەو نە سوننەتە، بەڵکو بۆیان حەڵاڵە ئەگەر بیکەن (سید سابق) لەپەراوێزی (فقه السنه)دا

دەڵێ: (احاديث الأمر بختان المراة ضعيفة لم يصح منها شيء) واتە: ئەو فەرموودانەی فەرمان بەخەتەنەکردنی کچان دەکەن هەمووی زەعیفن‌و هیچیان (صحیح) نین. ئەو شوێنەی کە لە هەموو شوێنەکانی تری ئافرەت لە رووی جنسیەوە پێی دەوورووژێ شوێنی خەتەنەکردنیەتی، جا ئەگەر ئەم شوێنە بەشێوەیەکی نادروست دەستکاری بکرێ لەوانەیە کێشەی زۆری بۆ دروست ببێت لەگەڵ پیاوەکەی دا. هەروەکو پزیشکانی کوردستان دەڵێن زۆربەی ئافرەتانی کوردستان تووشی ساردی جنسی بووینە بە هۆی خەتەنەکردن.

## بوختانی داوین پیسی دانە پاڵ ئافرەتی ئیماندار:

خوا دەفەرموێ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ (النور:٢٣).

واتە: بێگومان ئەوانەی بوختانی زینا دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاکی بێ ئاگای ئیماندار لەعنەت و نەفرینیان لێ کراوە لە دونیاو ئاخیرەتدا وە بۆیان هەیە سزای زۆر گەورە.

١-عن أبي هريرة عن النبي(ﷺ) قال: اجتنبوا السَّبعَ الموبِقات، قالوا يا رسول الله وما هنّ؟ قال: الشرك بالله، والسحرُ، وقتل النفس التي حرم الله إلا بالحق، وأكل الرِّبا، وأكل مالِ اليتيم، والتَّولِّي يوم الزَّحف، وقذفُ المحصناتِ المؤمناتِ الغافلات. رواه البخاري(٢٧٦٦) ومسلم(٨٩).

١-الموبقات: المهلكات: بەهیلاك دەرەكان.

٢- التولي يوم الزحف: التوالي وقت لقاء الجيش للكافر فراراً.

٣- قذف المحصنات: رمي المرأة بالزنا.

واتە: خۆتان بپارێزن لە حەوت بەهیلاك دەرەكان، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەمانە چین؟ فەرمووی: هاوبەشی دانان بۆ خوا، وە سیحرو جادوو، وە كوشتنی یەكێك كە خوا حەرامی كردووە مەگەر بە حەق نەبێت، وە خواردنی ریبا، وە خواردنی ماڵی هێتیم، وەپشت كردن و هەڵاتن لە كاتی گەیشتن بە لەشكری كافران وە بوختانی داوێن پیسی دانە پاڵ ئافرەتانی داوێن پاكی بڕواداری بێ ئاگا.

## سوود:

١-ئیمام(ذهبي) لە(كتاب الكبائر)دا بوختانی داوێن پیسی دانە پاڵ ئافرەتی ئیماندار بە یەكێك لە گوناهە گەورەكان دەدانێ.

٢- ابن مسعود(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ:(قذف المحصنة تهدم عمل مئة سنة)[1].

واتە: بوختانی داوێن پیسی دانە پاڵ ئافرەتی داوێن پاك كارو كردەوەی سەد ساڵ دەروخێنێ و لەناو دەبات.

(1) جامع العلوم والحكم.

## تاقمە ئافرەتێکی جەهەندەمی:

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) صنفانِ منْ أهلِ النّار لَمْ أرَهُما: قومٌ مَعَهُمْ سِياطٌ كَأَذنابِ البَقَر يَضرِبونَ بها الناس، و نساءٌ كاسياتٌ عاريات مميلاتٌ مائلاتٌ. رؤوسُهُنَّ كأَسْنِمَةِ البُختِ المائلة، لا يدْخُلْنَ الجنَّة ولا يجدْنَ ريحها. وإنَّ ريحها ليُوجَدُ مِنْ مَسيرةِ كذا وكذا. رواه مسلم(٢١٢٨).

**ماناى ووشه:**

١-صنفان: دوو پۆل، دوو تاقم.

٢-لم أرهما: نەم بينيون(واتە هێشتا پەيدا نەبوونە)

٣- سياط:(أسواط) و(سياط) كۆن، تاكەكەيان(سَوط)ە واتە: قامچی.

٤- أذناب: كۆيە، تاكەكەی(ذَنَب)ە واتە: كلك.

٥- كاسيات عاريات: واتە: پۆشتەن و روتيشن، واتە: جل و بەرگيان لەبەرە بەڵام هەندێ لە لەشيان رووتە.

٦- اسنمة: كۆيە، تاكەكەی(سنام)ە، واتە: كۆپارە، ووشتر كۆپارەيەك يا دوو كۆپارەی هەيە كە بەرز بۆتەوە لەسەر پشتی بريتی يە لە گەنجينەيەك بۆ كۆكردنەوەی خۆراكە ماددەی چەوری بۆ ئەوەی لە كاتی كەم خۆراكيدا كەڵكی لێ وەربگرێت.

٧- المائلة: واتە:: لار، ئەم لاريە سيفەتە بۆ كۆپارەكە.

واتە: دوو پۆڵ و تاقم هەن دۆزەخين، من نەمديون: كۆمەڵێك قامچييان بەدەستە وەك كلكی چێل وايە پێ ی لە خەڵكی دەدەن، (تاقمەكەی تر) ئافرەتانێكن پۆشتەن و رووتيشن، خەڵك لە خشتە دەبەن و وە هەم

خۆشیان لە خشتە چوونە، سەریان وەکو کۆپارەی خواری حوشتر وایە، ئەوانە نە دەچنە بەهەشت وە نە بۆنی بەهەشتیش دەکەن، لەگەڵ ئەوەی کە بۆن و بەرامەی بەهەشت لە دوری ئەوەندەو ئەوەندە دەکریّ.

## حەرامە خاڵ کوتین و برۆکردن و پرچ تیّخستن:

١–عن ابن مسعود قال: لعَنَ[1] الله الواشمات والمستوشمات، والمُتَنَمِّصاتِ، والمتفلّجاتِ للحُسنِ، المغيِّراتِ خلق الله. رواه البخاري(٤٨٨٦) ومسلم(٢١٢٥).

واتە: ابن مسعود دەڵێ: خوا نەفرین و لەعنەتی کردووە لەو ئافرەتانەی کە خاڵ دەکوتن، وە ئەو ئافرەتانەی داوای خاڵ کوتان دەکەن بۆ خۆیان، وە لەوانەش کە داوای برۆ باریك کردن دەکەن بۆ خۆیان، وە لەوانەش کە کەلێن و بۆشایی لە ددانەکانیان دورست دەکەن بۆ جوانی، ئەوانەی خەلقی خوا دەگۆڕن.

### سوود:

قال الليث بن سعد(رحمه الله)(إن النهي عن وصل الشعر مختص بالوصل بالشعر، ولا بأس بوصل شعر المرأة بصوف وخرق وغيرها، وقد نقل ابو عبيد قول الليث عن كثير من الفقهاء) فتح الباري/١٠/٣٧٥.

---

([1]) اللعن: الطرد والإبعاد من الخير، یاني: فریّدانو دوور خستنەوە لەخیّرو چاکە کە دەڵیّی خوا لەعنەتی لیّکرد، واتە دوری خستەوە لەرەحمەتی خۆی.

٢- عن ابن عمر(رضي الله عنهما) أنَّ رسول الله(ﷺ) لَعَن الواصلةَ والمستوصلةَ ، والواشمَةَ، والمستَوشمَةَ. **متفق عليه.**

**١-الواصله: ئەو ئافرەتەی کە پرچی خۆی یا پرچی غەیری خۆی دەگەیەنێ بە پرچی ژنێکی تر.**

**٢-المستوصله: ئەو ئافرەتەی کە داوای پرچ تێخستن دەکات بۆ خۆی.**

**٣- الواشمه: ئەو ئافرەتەی خاڵ دەکوتێ.**

**٤- المستوشمه: ئەو ئافرەتەی داوای خاڵ کوتان دەکات بۆ خۆی.**

**ماناى فەرموودەکە:**

**عبدالله کوری ئیمام عومەر(رەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) نەفرین(لعنه)تی کردووە لەو ئافرەتەی کە پرچی خۆی یا پرچی غەیری خۆی دەگەیەنێ بە پرچی ژنێکی تر، وە ئەو ئافرەتەش کە داوای پرچ تێخستن دەکات بۆ خۆی، وە ئەو ئافرەتەش کە خاڵ دەکوتێ، وە ئەو ئافرەتەش کە داوای خاڵ کوتان دەکات بۆ خۆی.**

## سوود:

**هەر وەك لە باسی فەرموودەی پێشتر باسمان کرد کە پرچی عەمەلی کە پرچی ئافرەت نی یە جائیزە لەسەر بکرێ بە تایبەتی بۆ ئەو ئافرەتەی پرچی کەمە دەیەوێ خۆی برازێنیتەوە بۆ مێردەکەی.**

## حەیزو زەیستانی(الحیض والنفاس):

١-عن معاذة قالت: سألتُ عائشةَ(رضي الله عنها) فقُلتُ ما بالُ الحائضِ تَقضي الصَّومَ ولا تَقْضي الصَّلاةَ؟ فقالت: أحَروريةٌ أنت؟ قُلْتُ: لَستُ بحروريةٍ، ولكني أسألُ. قالت: كانَ يُصيبنا ذلك. فنُؤْمَرُ بِقَضاءِ الصَّومِ ولا نُؤْمَرُ بقَضاءِ الصَّلاة. **رواه: البخاري ومسلم(٣٣٥).**

**١-حروريه: ناوی كۆمەڵێك لە(خوارج)ەكان بوو، لەبەر ئەوە ئەو ناوەیان لێنرابوو، لەبەر ئەوە لە شوێنێك كۆببوونەوە كە پێی دەگوترا (حروراء )، ئەوانە دەیان گوت ئافرەتی حەیزدار ئەو نوێژانەی كە لە كاتی لە حەیز دابوونی دا نایكات واجبە بیانگێرێتەوە.**

**مانای فەرموودەكە:**

**موعازە(رەزای خوای لیَ بێت) دەڵێ: لە عائیشەم پرسی(رەزای خوای لیَ بێت) گوتم: بۆچی ئافرەتی حەیزدار رۆژوو دەگێرێتەوە بەلاّم نوێژ ناگێرێتەوە؟ عائشە(رەزای خوای لیَ بێت) گوتی تۆ(حرورية)ی؟ گوتم من(حرورية)نیم، بەلاّم پرسیار دەكەم، عائشە(رەزای خوای لیَ بێت) گوتی: ئێمە تووشی حەیز دەبووین، جا فەرمانمان پیَ دەكرا كە رۆژوو بگێرینەوە، وە فەرمانمان پیَ نەدەكرا كە نوێژ بگێرینەوە.**

٢- عن أمّ سلمةَ(رضي الله عنها) قالت: كانت النفساء تجلس على عهد رسول الله(ﷺ) أربعين يوماً. **حديث حسن صحيح: رواه ابن ماجه وابوداود والترمذي.**

**واتە: ام سلمە(رەزای خوای لیَ بێت) دەڵێ: ژنی زەیستان داری لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) چل رۆژ دادەنیشت.**

**سوود**:

١-(نُفاس) پێناسەی لە شەرعدا(وهو الدَّمُ الخارجُ عَقِبَ الولادة).

واتە: ئەو خوێنەیە کە لە دوای منداڵ بوون دەردەچێ.

٢-ئەوەی لە کاتی حەیزو زەیستانی دا حەرامە(ما يحرم بالحيض والنفاس):

أ-نوێژکردن.

ب- رۆژوو گرتن.

ج- سووڕانەوە(طواف) بە دەوری(كعبة)دا.

د- جووت بوون(جیماع) لەگەڵ پیاودا.

٣- ئافرەتی زەیستان داری ئەگەر پێش چل رۆژ خوێنی وەستا بۆ نمونە(١٠) رۆژ لە دوای منداڵ بووندا خوێنی وەستا ئەوە خۆی دەشواو پاك دەبێتەوە، ئەو کاتە لە نوێژکردن و شتی تر وەکو ئافرەتێك حیسابی بۆ دەکرێ کە لە حەیزو زەیستانیدا نییە، بەڵام ئەگەر چل رۆژی بەسەرداچوو خوێنی نەوەستا ئەوە خۆی دەشواو پاك دەبێتەوە، ئەو کاتە حیسابی(مستحاضة) بۆ خۆی دەکات.

٤- ئافرەتی زەیستان داری وەکو ئافرەتی حەیزدار دەبێت رۆژووەکە بگرێتەوە بەڵام نوێژ ناگێڕێتەوە.

٥- امام نووی لە شەرحی صحیحی(مسلم)دا دەڵێ:(.... وإن وَطئها عامداً عالماً بالحيضِ والتَّحريم مُختاراً فَقَد ارتكبَ مَعصيةً كبيرةً نَصَّ الشافعي على أنها كبيرة...).

واتە: ئەگەر پیاو(جیماع)ی لەگەڵ خێزانی کرد(لەو کاتەی کە لە حەیزدایە) بە ئەنقەست ئاگادار بوو بە بوونی حەیزەکە زانا بوو بەوەی کە

حەرامە بە ئیختیاری خۆی و بەبێ تۆبزی لێ کردن ئەوە گوناحێکی گەورەی ئەنجام داوە، امام شافعی دەقی لەسەر ئەوە هەیە کە لە گوناحە گەورەکانە.

## یاری کردن لەگەڵ خێزان لە ماوەی حەیزدا:

١-عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ): اصنعوا كُلَّ شيءٍ إلاّ النكاح. رواه مسلم(٣٠٢) وأبوداود(٢٥٨).

واتە: لەگەڵ خێزانتان دا هەموو شتێ بکەن لە ماوەی حەیزدا تەنها جووت بوون نەبێت.

**سوود**:

ئەگەر ئافرەت پاك بۆوە لە حەیز جائیز نییە پیاوەکەی سەرجێیی لەگەڵدا بکات تا ئافرەتەکە غوسلی حەیز لە خۆی دەرنەکات.

٢- عن بعض ازواج النبيِّ(ﷺ) أنَّ النبيَّ(ﷺ) كان إذا أراد من الحائض شيئاً ألقي على فرجها ثوباً. صحيح: رواه أبوداود(٢٧٢).

واتە: یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: کاتێك کە پێغەمبەر(ﷺ) بیویستبایە لەگەڵ خێزانێکی کە لە حەیزدایە شتێك بکات قوماشێکی بەسەر فەرجیدا دەدا (ئەوجا ئەوەی بیویسبایە دەیکرد).

## جووت بوون لە ڕێگای کۆم و لە کاتی حەیزدا:

١-عن ابي هريرة عن النبيّ(ﷺ) قال: لا ينظر الله إلى رجلٍ جامع امرأتهُ في دُبُرها. صحيح: رواه ابن ماجة(١٩٢٣).

واتە: خوا بە چاوی ڕەحمەت تەماشای ئەو پیاوە ناکات کە لە ڕێگای کۆمەوە لەگەڵ ژنەکەی جووت دەبێت.

٢- عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ) مَن أتى حائضاً أو امرأةً في دبرها، أو كاهناً فصَدَّقَهُ بما يقول، فقد كفر بما أُنزل على محمد. صحيح: رواه الترمذي(١٣٥) وابن ماجة(٦٣٩).

١-كاهن: هو الذي يخبر عن المغيبات في المستقبل. واتە: ئەو کەسەیە کە قسە لە غەیب دەکات لە دوا ڕۆژ.

واتە: هەر یەکێك بچێتە لای خێزانەکەی و لەگەڵیدا جووت بێت لەو کاتەی کە لە حەیزدایە، یا بچێتە لای ئافرەتێك جووت بێت لەگەڵیدا لە ڕێگای کۆمیەوە، یا بچێتە لای کەسێك کە قسە لە شتی غەیبی دەکات کە فلانە شت و فلان دەبێت لە دوارۆژدا، وە باوەڕیشی پێ بکات، ئەوە کوفری کردووە بەو قورئانەی ڕەوانەکراوە بۆ موحەممەد(ﷺ).

## زۆربەی خەڵکی دۆزەخ ئافرەتن لەبەرچی؟

١-عن عبدالله بن عمر عن رسول الله(ﷺ) انّهُ قال: يا مَعشَرَ النساءِ تَصَدَّقْنَ وأكثِرنَ الإستغفارَ فَإنّي رَأيتُكُنَّ أكثر أهل النار، فقالت امرأةٌ منهنَّ جَزلَةٌ: وما لنا يا رسول الله أكثرَ أهلِ النار؟ قال تُكثِرنَ اللّعنَ وتَكفُرنَ العشيرَ وما رأيت مِن ناقصات عقلٍ ودينِ

أَغلبَ لِذي لُبّ مِنكُنَّ. قالت: يا رسول الله و ما نُقصانُ العقل والدِّين؟ قال: أما نُقصانُ العقلِ فَشهادةُ امرأتين تعدلُ شهادةَ رجلٍ فهذا نقصان العقل وتمكثُ الليالي ما تُصلي، وتُفطرُ في رمضان فهذا نُقصانُ الدِّين. رواه البخاري(٣٠٤) ومسلم(٧٩).

١-جزله: بەدەم و پل و زمان پاراو.

٢- تكفرنَ: دادەپۆشن.

٣- العشير: مێرد.

٤- لب: عقل - ژیری.

واتە: ئەی کۆمەڵی ژنان خێروخێرات بکەن وە زۆر داوای لێ بووردن لە خوا بکەن، چونکە من ئێوەم بینیوە زۆربەی خەڵکی دۆزەخ بوون. ئافرەتێکی زمان پاراو لەوان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەبەر چیمان ئێمە زۆربەی خەڵکی ئاگرین؟ فەرمووی: زۆر نەفرین دەکەن، وە چاکەی مێردیش دادەپۆشن(سپلەن لەگەڵ مێردتان) وە نەم بینیوە لەوانەی کە عەقل و دینیان ناتەواوە زاڵتر بن بەسەر خاوەن عەقل لە ئێوە.

ژنەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەم عەقلی و کەم دینیمان چییە؟ فەرمووی: کەم عەقلیتان بریتییە لەوە کە شایەتی دوو ژن یەکسانە بە شایەتی پیاوێك ئەوە کەم عەقلیەکەتان، وە چەند شەو دەمێنێتەوە نوێژ ناکا وە لە رەمەزاندا رۆژوو ناگرێ، ئەمەش کەم ئایینی یەکەتان.

## سوود:

من پێم وایە قورس ترین شت کە ئافرەت جێ بەجێ ی بکات ئەوەیە کە بەو شێوەی شەرع فەرمانی پێ دەکات لەگەڵ مێردەکەی هەڵس و کەوت

بکات ئافرەتی وا هەیە چەندین رۆژو مانگ و ساڵ قسە لەگەڵ مێردەکەی ناکات، ئافرەتی وا هەیە لەبەر منداڵەکان دەخوێنێ بۆ دژایەتی کردنی باوکیان، ئافرەتی وا هەیە دژایەتی کەس و کاری مێردەکەی دەکات کە بەمەش پیاو زۆر سەخڵەت دەبێت، ئافرەتی وا هەیە بەردەوام هەنجەت بە مێردەکەی دەگرێ لەوانەیە زۆربەی هەنجەکانیشی لە شەرع دا جێ ی نەبنەوە.

جا با ئافرەت بزانێ مێرد بەهەشت یا دۆزەخیەتی یەکێك لە توندترین هێرشەکانی شەیتان بۆ سەر ئافرەتان ئەوەیە کە خراپ بن و خراپە بکەن لەگەڵ مێردەکانیان.

٢- عن ابن عباس وعمران بن حصين عن النبيّ(ﷺ) قال: إطّلعت في الجنّة فرأيت أكثر أهلها الفقراء، واطّلعت في النار فرأيتُ أكثرَ اهلها النساء. رواه البخاري(٦٤٤٩) ومسلم(٢٧٣٧).

واتە: سەرنجی ناو بەهەشتم دا زۆربەی خەڵکەکەی لە هەژارەکان بوون، وە سەرنجی ناو دۆزەخیشم دا زۆربەی خەڵکەکەی ژنان بوون.

# مردوو و بابەتی پەیوەندیدار پێیەوە
# (كتاب الجنائز)

## تاقی کرانەوە بە نارەحەتی

خوا دەفەرموێ﴿وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ﴾ (البقرة:١٥٥-١٥٧).

واتە: سوێند بە خوا تاقیتان دەکەینەوە بە هەندێك لە ترس و برسێتی و کەم بوونی ماڵ و دارایی و خەڵکی(کەس و کارتان) و بەروبوم جا مژدە بدە بە خۆڕاگران(١٥٥) ئەوانەی کە لەگەڵ دوو چاری سەختی یەك بوون دەڵێن(إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ) ئێمە هەر هی خواین و هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە(١٥٦) ئا ئەوانە دورودوو بەزەیی بەسەر ئەوان دا دەبارێ لە لایەن پەروەردگاریانەوە وە ئەوانە ئەو کەسانەن هیدایەتیان وەرگرتووە (١٥٧).

١-عن صهيب بن سنان قال: قال رسول الله(ﷺ): عجباً لأَمرِ المُؤمنِ، إنَّ أمْرَهُ كُلَّهُ خَيرٌ، ليسَ ذاكَ لأَحَدٍ إلاّ لِلْمُؤْمِنِ إنْ أصابَتْهُ سَرّاءُ شَكَرَ، فَكانَ خيراً لهُ، وإنْ أصابَتهُ ضَراءُ صبَرَ فكانَ خيراً لَهُ.

**رواه مسلم(٢٩٩٩).**

**واته: سەیر بۆ کاری بڕوادار هەموو کارێکی هەر مایەی خێرە، ئەوەش بۆ کەس وا نی یە تەنها بۆ ئیماندار نەبێت، ئەگەر تووشی خۆشی بوو شوکرانەی لەسەر کرد ئەوە بۆی دەبێ بەخێر، وە ئەگەر تووشی زەرەرو زیان بوو ئارامی گرت ئەوە ئەوەش بۆی دەبێ بەخێرو چاکە.**

## سەردانی نەخۆش:

عن أبي هريرة أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: حقُّ المسلم على المُسلم ستٌّ، قيل: ما هُنَّ يا رسول الله؟ قال: إذا لَقيتَهُ فسَلِّمْ عليه، وإذا دعاك فأجبْهُ، وإذا استنصحك فانْصحْ لهُ، وإذا عطس فحمد الله فشَمِّتْهُ، واذا مرض فعُدْهُ، واذا مات فاتّبِعْهُ. **رواه مسلم(٢١٦٢).**

**واته: مافی موسڵمان لەسەر موسڵمان شەش شتە؟ گوترا ئەم شەش شتە چین ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەگەر گەیشتیە لای سەلامی لێ بکە، وە ئەگەر دعوەتی کردی وەڵامی بدەیەوە(بچی بۆ سەر بانگێشتنەکەی)، وە ئەگەر داوای ئامۆژگاری لێ کردیت ئامۆژگاری بکە وە ئەگەر پشمی گوتی(الحمدلله) تۆش بڵێ(یرحمك الله)، وە ئەگەر نەخۆش کەوت سەردانی بکە، وە ئەگەر مرد شوێنی بکەوە.**

**سوود**:

**١-كاتێك موسڵمان بە موسڵمانێك دەگات سوننەتە سەلامی لێ بكات.**

**٢- قال الجمهور: الدعوة تجب في وليمة النكاح وتستحب في غيرها، والله أعلم. واتە:(جمهور) دەڵێن: ئەگەر یەكێك بانگ كرا بۆ زیافەتی بووك گواستنەوە ئەوە واجبە بچێ، وە سوننەتە بۆ غەیری زیافەتی بووك گواستنەوە.**

**٣- عيادة المريض واتە: زيارتهُ، یانی سەردانی نەخۆش، جا سەردانی نەخۆش سوننەتە.**

٢- عن ثوبان عن النبيَ(ﷺ) قال: إنّ المسلم إذا عادَ أخاهُ المُسْلمَ لَمْ يَزَلْ في خُرْفَة الجنّة حتّى يرجع. **رواه مسلم(٢٥٦٨).**

**واتە: بێگومان ئەگەر موسڵمان سەردانی برای موسڵمانی نەخۆشی كرد، بەردەوام لە رنینی میوەی بەهەشت دایە هەتا دەگەڕێتەوە.**

٣- عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ) إنّ الله عَزَّ وجلَّ يقول يوم القيامة: يا ابنَ آدمَ مرضْتُ فَلَمْ تَعُدْني. قال: ياربِّ كيف أعودُك وأنت ربُّ العالمين، قال: أما علمتَ أنَّ عَبدي فُلاناً مرض فلمْ تَعُدْهُ، أما علمتَ أنَّك لوْ عُدْتَهُ لوَجدْتني عنْدَهُ؟ يا ابن آدم استَطْعمْتُك فلَمْ تُطْعمني. قال يا ربِّ وكيف أُطْعمك وأنت ربُّ العالمين. قال أما علِمْتَ أنَّهُ استَطعمك عبدي فلانٌ فلمْ تُطعمْهُ؟ أما علمت أنَّك لو أطعمْتَهُ لوجدْت ذلك عندي؟ يا ابن آدم اسْتسقيتُك فلَمْ تَسْقني قال: يا ربِّ كيف أسْقيك وأنتَ ربُّ العالمين، قال: استَسقاك عبدي فلان فلَمْ تَسْقه أما إنّك لوْ سَقَيتَهُ وجدْتَ ذلك

عندي. رواه مسلم(٢٥٦٩).

واته: بێگومان خوا(عز وجلَّ) له رۆژی قیامەتدا دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد نەخۆش کەوتم کەچی سەردانت نەکردم، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم چۆن سەردانت بکەم تۆیی کە پەروەردگاری جیهانیانی، خوا دەفەرموێ: تۆ دەزانی کە کاتی خۆی فلانە بەندەم نەخۆش کەوت سەرت لێ نەدا، ئەدی نەتدەزانی ئەگەر سەرت لێ بدایە منت لە لای ئەو دەبینی، ئەی ئادەمیزاد داوای نان و خۆراکم لە تۆ کرد کەچی نەتدامێ، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم چۆن خواردنت بدەمێ لە کاتێکدا کە تۆ پەروەردگاری جیهانیانی، خوا دەفەرموێ: تۆ دەزانی کاتی خۆی فلانە بەندەم داوای خواردنی لێ کردی جا تۆش نەتدایێ ئەدی نەتدەزانی ئەگەر پێت بدابا ئێستاکە پاداشتی ئەوەت لە لای من دەبینی، ئەی ئادەمیزاد داوای ئاوم لێ کردی پێت نەدام، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم چۆن ئاوت بدەمێ لە کاتێکدا تۆ پەروەردگاری جیهانیانی، خوا دەفەرموێ: فلانە بەندەم داوای ئاوی لێ کردی پێت نەدا جا ئەگەر ئەو ئاوەت پێ بدابایە ئێستا پاداشتەکەت لای من دەدی.

**سوود**:

موسڵمان کاتێك کە سەردانی نەخۆش دەکات ئەگەر دەیەوێ بۆی بە خێر بنوسرێ دەبێ مەبەستی لە سەردانەکە ڕەزامەندی خوا بێت، چونکە ئەگەر لە سەردانەکە هیچ مەبەستێکی نەبێت، ئەوە هیچ پاداشتێکی بۆ نانوسرێ.

٤- عن أنس قال: كانَ غُلامٌ يهوديٌ يَخدُمُ النبيَّ(ﷺ) فَمَرِضَ، فأتاهُ النبيُّ(ﷺ) يَعودُهُ فَقَعَدَ عندَ رأسه فقالَ لَهُ: أَسْلِمْ، فَنَظَرَ إلى

أبيه وهو عندَهُ فقال لَهُ: أَطِعْ أبا القاسم(ﷺ) فأسْلَمَ، فخَرجَ النَّبيُّ(ﷺ) وهو يقولُ: الحمدُللهِ الذي أَنْقَذَهُ مِنَ النار. رواه البخاري(١٣٥٦).

واته: ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: منداڵە جولەكەیەك خزمەتی پێغەمبەری دەكرد(ﷺ) جا منداڵەكە نەخۆش كەوت، پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی كردو لای سەری منداڵەكە دانیشتو پێی فەرموو: موسڵمان بە، منداڵەكە تەماشای باوكی كرد كە لە لای بوو، جا باوكی پیێ ی گوت بە گوێی(أبو القاسم) بكە، منداڵەكە موسڵمان بوو، جا پێغەمبەر(ﷺ) چووە دەرەوە فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە لە ئاگر ڕزگاری كرد.

**سوود**:

١-سيد سابق لە(فقه السنة)دا دەڵێ:(لا بأس بعيادة المسلم الكافر) واتە: هیچی تێدا نی یە ئەگەر موسڵمان سەردانی كافری نەخۆش بكات.

## قسەی نەخۆش كە دەڵێ تام لێیەو شتی لەم جۆرە:

١-قال عبدالله بن مسعود: دَخَلْتُ على رسول الله(ﷺ) وهو يوعَكُ وَعْكاً شديداً، فَمَسِسْتُهُ بيدي فقلتُ: يا رسول الله، إنَّكَ توعك وعكاً شديداً، فقال رسول الله(ﷺ) أجلْ، إنّي أُعَكُ كما يوعَك رجلانِ منكم، فقلتُ: ذلك أن لكَ أجرين، فقال رسول الله(ﷺ) أجل، ثُمَّ قال رسول الله(ﷺ): ما مِن مُسلمٍ يُصيبُهُ أذىً: مَرَضٌ فما سواهُ إلاّ حَطَّ الله سَيِّئاتهِ كما تُحطُّ الشجرةُ وَرَقَها. رواه البخاري(٥٦٦٠)

ومسلم(٢٥٧١).

١-الوعك: واته: الحمى، يانى: تا.

واته: عبدالله كورى مسعود(رەزاى خواى لىٚ بيٚت) دەڵىٚ: چوومە لاى پيٚغەمبەر(ﷺ) تايەكى توندى لىٚ بوو دەستم دايىٚ گوتم ئەى پيٚغەمبەرى خوا تۆ تايەكى زۆر توندت لىٚ يە، فەرمووى بەڵىٚ وايە، من تام ديٚتىٚ وەكو چۆن دوو پياو لە ئيٚوە تا دەگرىٚ، گوتم ديارە ئەوە لەبەر ئەوەيە پاداشتى تۆ دوو قاتە؟ فەرمووى: بەڵىٚ، لە پاشان پيٚغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: هەر موسڵمانيٚك تووشى ئازاريٚك ببيٚت، نەخۆشى بيٚت يا غەيرى نەخۆشى ئيللا خوا گوناهەكانى دادەپۆشىٚ هەروەكو چۆن دار گەڵاى هەڵدەوەريٚنىٚ.

**سوود**:

١-امام نووى(رەحمەتى خواى لىٚ بيٚت) لە(رياض الصالحين) دا ناوونيشانى بابەتيٚك دەهيٚنيٚتەوە دەڵىٚ:(باب جواز قول المريض: انا وَجعٌ، أو شديد الوجَعِ، أو موعوك أو(وا رأساه) ونحو ذلك وبيان أنه لا كراهة في ذلك إذا لم يكن على سبيل التسخط وإظهار الجزع).

واته: باسى ئەوەى جائزە نەخۆش بڵىٚ: ئازارم هەيە، يا زۆر ئازارم هەيە، يا تام ليٚيە، يا ئاى سەرم و شتى وا، وە ئاشكرا كردنى ئەوەى كە ئەوانە كەرهەتى تيٚدا نى يە ئەگەر لەبەر توورەيى و بىٚ ئارامى نەبيٚت.

٢- قال بعض الحكماء: من كنوز البرّ كتمان المصائب.

## دوعا بۆ نەخۆشی:

١-عن عثمان بن أبي العاص الثقفي(رضي الله عنه) أنَّهُ شكا إلى رسول الله(ﷺ) وَجَعاً يجدُهُ في جَسده مُنذُ أسْلم، فقال رسول الله: ضَعْ يَدَكَ على الذي تألَّمَ مِن جَسَدِك وقُلْ: بسم الله ثلاثاً، وقل سَبعَ مَرّاتٍ: أعوذ بالله وقدرته مِنْ شَرِّ ما أجدُ وأُحاذِر. رواه مسلم(٢٢٠٢) وابوداود(٣٨٩١).

واتە: عوسمانی کوری ابوالعاص(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) بە پیٚغەمبەری گوت(ﷺ) کە لەوەتەی موسڵمان بووە ئازاریٚ لە جەستەی دا پەیدا بووە، جا پیٚغەمبەر(ﷺ) پیٚ ی فەرموو: دەستت لەسەر ئەو شویٚنە دابنیٚ کە لە جەستەت دا دیٚشی وە سیٚ جاران بڵیٚ(بسم الله)، وە حەوت جارانیش بڵیٚ:(أَعوذُ بالله من شَرِّ ما أجدُ وأُحاذِر).

**سوود:**

١-(أَعوذُ بالله من شَرِّ ما اجدُ وأُحاذِر) واتە: خۆم دەپاریٚزم بە خواو بە قودرەت و توانای ئەو لە زیانی ئەو ئازارەی کە هەستی پیٚ دەکەم و مەترسیم لیٚی هەیە.

٢- لە(سنن)ی(ابوداود) ئەم زیادەشی تیادا هاتووە(ففعلت ذلك، فأذهب الله(عزوجل) ما كان بي فَلَم أَزَلْ امُرُ بهِ أهلي وغيرهم) واتە: منیش وام کرد، خودا ئەو ئیٚشەی لەجەستەم دا بوو نەیهیٚشت جا بەردەوام فەرمان بە کەس و کارم و غەیری ئەوانیش دەکەم کە ئەم دوعایە بەم شیٚوەیە بکەن.

٢- عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: كان رسول الله(ﷺ) إذا أَتَى المريض يَدْعو لَهُ قال: أَذْهِبِ البأْسَ، رَبَّ الناس، واشْفِ أنتَ الشَّافي، لا شِفاءَ إلاّ شِفاؤُكَ، شفاءً لا يُغادرُ سَقَماً. رواه مسلم(٢١٩١).

١-البأسُ: الألم الشديد، واته: ئێشێكی توند.

٢- لايغادر: لا يترك، واته: نەهێڵێ.

٣- السقم: المرض، واته: نەخۆشی.

واته: عائشه(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر بچووبا لای نەخۆش دوعای بۆ دەكرد دەیفەرموو(أَذْهِبِ البأْسَ، رَبَّ الناس، واشْفِ انتَ الشَّافي، لا شِفاء إلاّ شِفاؤُكَ، شفاءً لا يُغادرُ سَقَماً) واته: ئەم ئێش و ئازارە لابە، پەروەردگاری خەڵك، وە شیفا بدە تۆ شیفادەری، هیچ شیفایەك نی یە بێجگە لە شیفای تۆ، شیفایەك كە هیچ نەخۆشیەك نەهێڵێ.

٣- عن عبدالعزيز(رضي الله عنه) قال: دَخَلتُ أنا وثابت على أنس بن مالم، فقال ثابت: يا أبا حمزة اشتكيتُ، فقال أنس أَلا أرقيك برقية رسول الله(ﷺ) قال: بلى، قال: اللهمَّ ربَّ الناس، مُذهِب البأس، اشفِ أنت الشافي، لا شافِيَ إلا أنت، شفاءً لا يُغادِرُ سَقماً. رواه البخاري(٥٧٤٢).

١-رقية: تاكە، كۆیەكەی(رقی)یە، واته: القراءة على المريض، یانی: خوێندن لەسەر نەخۆش.

ماناى فەرموودەكە:

عبدالعزيز(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: من و سابت چوینە لای ئەنەسی كوری مالك، سابت گوتی ئەی ئەبو حمزە(واته ئەنەس) نەخۆشم،

ئەنەس گوتی: ئایا دوعات بۆ بکەم به دوعای پێغەمبەر (ﷺ) سابت گوتی بەڵێ، ئەنەس گوتی: (اللهمَّ ربَّ الناس، مُذهِبَ البأس، اشفِ انت الشافي، لا شافيَ إلا انت، شفاء لا يُغادرُ سَقماً) واتە: ئەی خودایە، پەروەردگاری خەڵكی لابەری ئێش و ئازار، شیفا بدە تۆ شیفادەری، هیچ شیفادەرێك نی یە بێجگە لە تۆ، شیفایەك كە هیچ نەخۆشیەك نەهێڵێ.

٤- عن ابن عباس عن النبيِّ(ﷺ) قال: مَنْ عادَ مريضاً لَمْ يَحضُرْ أجَلُهُ فقال عندهُ سَبْع مِرارٍ: أَسأل الله العَظيمَ رَبَّ العرشِ العظيم أن يشفِيَك، إلاّ عافاهُ اللهُ من ذلك المرَض. صحيح: رواه أبوداود(٣١٠٦) والترمذي(٢٠٩٠).

واتە: هەر یەكێك سەردانی نەخۆشێك بكات ئەجەلی نەهاتبیٚ جا لە لای ئەو حەوت جاران بڵێ(أَسأل الله العَظيمَ رَبَّ العرشِ العظيم أن يشفِيَكَ) ئیللا خودا لەم نەخۆشیە چاكی دەكاتەوە.

٥- عن ابن عباس(رضي الله عنهما) أن النبيَّ(ﷺ) دَخَلَ على اعرابيّ يعوده قال: وكان النبيُّ(ﷺ)، اذا دخلَ على مريض يعودهُ قال لَهُ: لا بأسَ، طَهورٌ[1] إن شاءَ الله. رواه البخاري(٣٦١٦).

واتە: ابن عباس(ڕەزای خوای لیٚ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) چووە لای عارەبەكی دەشتەكی نەخۆش، وە ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) بچووبا لای نەخۆشێك و سەردانی بكردبا پیٚ ی دەفەرموو(لا بأسَ، طَهورٌ إن شاءَ الله) واتە: هیچ نی یە پاك كەرەوەیە(بۆت لە گوناهەكانت). ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت.

---

(1) وقوله(طهور) وهو خبر مبتدا اي هو طهور لك من ذنوبك اي مطهرة/ فتح الباري.

## گومانی باش به خوا بردن:

١-عن جابر بن عبدالله الأنصاري قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) قبلَ موته بثلاثة ايامٍ يقولُ: لا يَمُوتَنَّ احَدُكُم إلاّ وهوَ يُحْسِنُ الظّنَّ بالله عَزَّ وجَلَّ. **رواه مسلم(٢٨٧٧).**

**واته: جابر(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: گوێم له پێغەمبەر بوو(ﷺ)، سێ رۆژ پێش مردنی فەرمووی: با هەرگیز هیچ یەكێك له ئێوه نەمرێ، ئیللا ئەو كەسه گومانی باش بێت بەخوا(عز وجلَّ).**

**سوود:**

**١-كەواته موسڵمان به درێژایی ژیانی گومانی باش بێت به خوا، ئومێدی هەبێت به لێبوردنی خواو ترسی هەبێت له سزاكەی وه ئومێدی لێبوردن له لای زیاتر بێت، وه به تایبەتی لەو كاتانەی كه هۆیەكانی مردن ئامادەی دەبن(ولا سیَّما اذا حَضَرت أسباب الموت).**

## ئارام گرتن لەسەر مردنی كەس و كارو منداڵ:

١-عن انس بن مالك(رضي الله عنه) قال: مَرَّ النبيُّ(ﷺ) بامرأة تبكي عند قبرٍ فقال: اتَّقي الله واصبري، قالت: إليك عنّي، فإنَّك لم تُصبْ بمُصيبتي ولم تعرفهُ، فقيل لها إنَّهُ النبيُّ(ﷺ)، فأتت النبيَّ(ﷺ)، فلَمْ تجدْ عندهُ بوّابين فقالت: لَمْ أعرفك، فقال: إنما الصبرُ عند الصَّدمَة الأُولى. **رواه البخاري(١٢٨٣) ومسلم(٩٢٦).**

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) بەلای ئافرەتێك دا تێپەری كە لە لای قەبرێك دەگەریا پێ ی فەرموو: لە خوا بترسەو ئارام بگرە، ژنەكە گوتی: لێم دووربكەوە تۆ وەكو منت بەسەر نەهاتووە ژنەكە نەیناسی كە پێغەمبەرە، جا پێ ی گوترا ئەوە پێغەمبەر بوو(ﷺ)، ئافرەتەكە چووە لای پێغەمبەر(ﷺ) هیچ دەرگەوانێكی نەبینی جا پێی گوت من تۆم نەناسی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئارام گرتن لەیەكەم كاتی موسیبەتە.

## سوود:

عثیمین لە شەرعی(ریاض الصالحین)دا دەڵێ: إن الإنسان اذا لم یصبر أول مَرَّةٍ فَأِنَّهُ یحرم أجرها. واتە: ئادەمیزاد ئەگەر یەكەم جار ئارامی نەگرت ئەوە لە پاداشتەكەی بێ بەش دەبێت.

٢- عن أبي سعيدِ الخدريِّ (رضي الله عنه) قال: أنَّ النِّساء قُلْنَ للنبيِّ(ﷺ)، اجعَلْ لنا يوماً، فوَعَظَهُنَّ وقال: أيُّما امرأةٍ مات لها ثلاثةٌ مِنَ الولَدِ كانوا لها حِجاباً منَ النار، قالت امرأةٌ: واثنانِ؟ قال: واثنان. رواه البخاري(١٢٤٩) ومسلم(٢٦٣٣).

١-من الولد: وهو یشمل الذكر والانثی والمفرد والجمع. واتە: ئەوە نێرو مێ و تاك و كۆ دەگرێتە خۆ/ فتح الباري.

٢-حجاب: پەردە.

مانای فەرموودەكە:

ئافرەتان بە پێغەمبەریان ووت(ﷺ)، رۆژێكمان بۆ دابنێ(بۆ ئامۆژگاری)، پێغەمبەریش (ﷺ) ئامۆژگاری كردن و فەرمووی: هەر ئافرەتێك سێ منداڵی لێ بمرێ بۆی دەبنە پەردە لە ئاگری دۆزەخ،

ئافرەتێك ووتی: ئەگەر دوو منداڵیش بێت؟ فەرمووی: دوو منداڵیش.

## چاو نووقاندنی مردوو:

١-عن أمّ سَلَمَةَ(رضي الله عنها) قالت: دَخَلَ رسول الله(ﷺ) على أبي سَلَمَةَ وقد شَقَّ بَصَرُهُ فَأَغْمَضَهُ، ثُمَّ قال: الرُّوحَ إذا قُبِضَ تَبِعَهُ البَصَرُ. رواه مسلم(٩٢٠).

واته:ام سەلەمە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە لای(ابو سلمة)ی چاوی زەق بوو جا پێغەمبەریش(ﷺ) چاوەكانی نوقاندو لە پاشان فەرمووی: كاتێك گیان(روح) دەكێشرێ چاو شوێنی دەكەوێ.

## چی دەگوترێ لە كاتی موسیبەت دا:

١- عن أم سلمة زوج النبي(ﷺ) تقول: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: ما مِنْ عَبدٍ تُصيبُهُ مُصيبَةٌ فيقولُ: إنا لِله وإنا إليهِ راجعون اللهمَّ أْجُرني في مُصيبتي وأَخلِفْ لي خيراً منها إلا أَجَرَهُ اللهُ في مصيبتِهِ وأخلَفَ لَهُ خيراً منها. قالت: فَلَما تُوفِّيَ أبوسَلَمَةَ قلتُ كما أَمَرَني رسول الله(ﷺ) فَأَخْلَفَ الله لي خيراً مِنهُ، رسول الله(ﷺ). رواه مسلم(٩١٨).

واته: (ام سلمة) كە خێزانی پێغەمبەرە (ﷺ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر بوو(ﷺ) دەیفەرموو: هەر بەندەیەك تووشی موسیبەتەك بوو بڵێ(إنا لِله وإنا إليهِ راجعون اللهمَّ أْجُرني في مُصيبتي وأَخلِفْ لي خيراً منها) واتە: بێگومان ئێمە بەندەو موڵكی خواو دورست كراوی خواین وە ئێمە هەر بۆ

لای ئەو ئەگەڕێینەوە لە ڕۆژی دوایی دا ئەی خودایە پاداشتم بدەوە لەسەر ئەو موسیبەتەم وە باشترم بۆ لە جیٚ ی دابنیٚ، ئیللا خودا لەسەر ئەم موسیبەتەی پاداشتی دەداتەوە وە باشتری بۆ لە جیٚ دادەنیٚ، ام سەلەمە(ڕەزای خوای لیٚ بێت) دەڵیٚ: کاتێك(ابو سلمة) وەفاتی کرد ئەوەم گوت هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) ئەمری پیٚ کردبووم، خودا لە ئەو باشتری بۆ لە جیٚ دانام کە پێغەمبەر بوو(ﷺ).

## هەر یەکێك کۆتا قسەی لا اله الا الله بێت:

١-عن معاذ بن جبل(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) مَنْ كانَ آخِرُ كلامهِ لا اله الا اللّه دَخَلَ الجنَّةَ. **صحيح: رواه أبو داود(٣١١٦).**

**واتە: هەر یەکێك کۆتا قسەی(لا اله الا الله) بێت دەچێتە بەهەشت.**

### سوود:

**١-هەر کەسێك دوا ووتەی(لا اله الا الله) بێت، دەچێتە بەهەشت جا یا بەبیٚ چوونە دۆزەخ و چەشتنی عەزابەکەی دەچێتە بەهەشت یا ئەگەر عەزابیش درا بەقەد تاوانەکانی لە پاشان هەر دەچێتە بەهەشت. والله اعلم.**

## (لا اله الا الله) دان بە گوێ ی ئەوانەی لە گیانەڵادان:

١-عن أبي سعيد الخدري(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) لقّنوا موتاكم[1]: لا اله الا الله.رواه مسلم(٩١٦) وابوداود(٣١١٧) والترمذي(٩٧٨).

واتە:لا اله الا الله یاد بخەنەوەو بدەن بە گوێ ی ئەوانەی کە لە سەرە مەرگ دان.

**سوود:**

**١-ئەگەر ئەوەی لە گیانەڵادایە گوتی(لا اله الا الله) ئەوە تەلقینی بەم ووشەیە لیٚ دووبارە ناکریٚتەوە، بەڵام ئەگەر لە دوای گوتنی لا اله الا الله قسەی تری کرد دیسان(لا اله الا الله) دەدریٚ بە گویٚی دا بۆ ئەوەی بیڵیٚتەوە کۆتا قسەی ئەو بیٚ، با موسڵمان هەوڵ بدات کۆتا قسەی(لا اله الا الله) بیٚت ئەگەر لە دوای گوتنی(لا اله الا الله) قسەیەکی کرد با یەکسەر(لا اله الا الله) بکاتەوە بۆ ئەوەی دوا ووتەی بیٚت.**

**٢- با موسڵمان ئاگادار بیٚت لە کاتی تەلقین دانی ئەوەی لە گیانەڵادایە بە(لا اله الا الله) بە شیٚوەیەکی وا نەدا بە گویٚیدا لەم کاتە زۆر ناسکەدا تووشی گوناح و کوفر بیٚت.**

**٣- تەلقین دان لە دوای شاردنەوە شتیٚکی بیدەعەیە بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر نییە، بەڵام داوای لیٚخۆشبوون کردن و داوای چەسپان بۆ مردووەکە لە دوای شاردنەوەی لە فەرموودەی(صحیح) دا هاتووە.**

---

(1) لقنوا موتاكم: اي ذكروا من حضرهُ الموتُ منكم بكلمة التوحيد بأن تتلفظوا بها عنده.

# نوێژ لەسەر مردوو و ئامادەبوون
# لەسەری تا دەنێژرێ.

١-عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ) مَنْ شَهِدَ الجنازة حتى يُصلي عليها، فلهُ قيراط، ومن شهدها حتى تُدفن فَلَهُ قيراطان، قيل وما القيراطان؟ قال: مثلُ الجبلينِ العظيمين. **رواه البخاري(١٣٢٥) ومسلم(٩٤٥).**

**واتە: هەر کەسێك ئامادەی سەر تەرمێ بێت تا نوێژی لەسەر دەکرێ قیراتێکی بۆ هەیە وە هەر کەسێك ئامادەی بێت تا دەنێژرێش ئەوە دوو قیراتی بۆ هەیە، گوترا دوو قیرات چی یە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: وەکو دوو چیای گەورەن.**

**سوود:**

**لە پێشینەکان ریوایەت کراوە کە هەڵگرتنی جەنازە گوناهە گەورەکانی پێ دەسرێتەوە.**

٢-عن عائشة(رضي الله عنها) عن النبيِّ(ﷺ) قال: مامِن مَيِّتٍ يُصَلّى عليه أُمَّةٌ مِنَ المُسلِمينَ يَبلُغُونَ مائَةً كُلُّهُم يَشفَعُونَ لَهُ، إلاّ شُفِّعُوا فيهِ. **رواه مسلم(٩٤٧).**

**١-الشفاعة: تکا.**

**واتە: هەر مردووەك کە کۆمەڵێ لە موسڵمانان ژمارەیان بگاتە سەد کەس نوێژی لەسەر بکەن، وە هەموویان تکای بۆ بکەن ئیللا خودا تکاکەیان گیرا دەکات بۆی.**

٣-عن ابن عباس(رضي الله عنهما) قال: سمعت رسول

اللهَ(ﷺ) يقول: ما من رَجُلٍ مُسلمٍ يموتُ فيقومُ على جنازتِهِ أربعونَ رجلاً لا يشركون بالله شيئاً إلاّ شَفَّعَهُمُ الله فيه. رواه مسلم(٩٤٨).

واته: هەر پیاو(و ئافرەتێکی) موسڵمان بمرێت، چل پیاو کە هیچ شەرکێك بۆ خوا پەیدا نەکەن، نوێژ لەسەر تەرمەکەی بکەن ئیللا خودا تکایان لیٚ گیرا دەکات بۆی.

## چۆنیەتی نوێژکردن لەسەر مردوو:

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) نَعَى النَّجاشيَّ في اليومِ الذي ماتَ فيهِ خَرَجَ إلى المُصَلَّى فَصَفَّ بهم و كبَّرَ أربعاً. رواه البخاري(١٢٤٥) ومسلم(٩٥١).

١-النحي: اخبار بموت شخص: واتە خەبەردان بە مردنی یەکێك.

ماناى فەرمووده‌کە:

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لیٚ بێت) دەڵیٚ: پێغەمبەر(ﷺ) خەبەری دا بە مردنی نەجاشی لەو رۆژەی کە تیایدا مرد، چوو بۆ شوێنی نوێژکردن ئەصحابەکانی ریزکرد چوار(الله اكبر)ی کرد.

### سوود:

١-نەجاشی) لەقەبە بۆ پادشای حەبەشە کە موسڵمانان لە کاتی خۆی هیجرەتیان کردووە بۆ لای ئەو لە حەبەشە و موسڵمان بووە.

٢- هەروەکو لە فەرموودەی تر هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە چوار(الله اكبر) زیاتریشی کردووە.

٣- نوێژکردن لەسەر مردوو فەرزی(کفایة)یە.

٤- نوێژکردن لەسەر مردووی غائب جائیزە.

# ئەگەر چوار(الله اكبر)ت كرد چی دەڵێی
# لە نوێژكردن لەسەر مردوو:

١-لەدوای (الله اكبر)ی یەكەم سورەتی (فاتحة) دەخوێنی بەنەهێنی.

١-لە دوای(الله اكبر)ی دووەم سەڵەوات لەسەر پێغەمبەر دەدەی. لە باسی نوێژ بەهێزترین سەڵەوات و ماناكەیمان نوسیووە.

٣- لە دوای(الله اكبر)ی سێ یەم و چوارەم دوعا بۆ مردووەكە دەكات. یەكێك لەم دوعایانەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مردووی كردووە بەم شێوەیە(اللهم اغفر لَهُ وارحمهُ واعْفُ عنه وعافه وأكرم نُزُلَهُ ووَسِّع مُدخَلَهُ واغسلهُ بماءٍ وثلجٍ وبَرَد ونَقِّه مِنَ الخطايا كما يُنَقَّى الثَّوبُ الأبيضُ من الدَّنس وأبدلهُ داراً خيراً من داره وأهلاً خيراً من أهله وزوجاً خيراً من زوجه وقه عذابَ القبر وعذاب النار) . رواه مسلم(٩٦٣) والنسائي(١٩٨٣).

دەتوانی ئەم دوعایە لە دوای (الله اكبر)ی سێیەم بكەی. لە مەزهەبی شافعی دا هاتووە دەڵێ: واجبە لەدوای(الله اكبر)ی سێ یەم دوعا كردن بۆ مردوو دوعای واجبیش بۆ ئافرەت و بۆ پیاوو بۆ گەورەو بۆ بچووك هەر ئەوەندەیە بڵێ(اللهم اغفر لَهُ وارحمهُ).

٤- سوننەتە دوعا كردن لەدوای(الله اكبر) كردنی چوارەم ئەگەر لە دوای ئی سێیەمیش كردبێتی، سید سابق لە(فقه السنة)دا دەڵێ: شافعی لە دوای تەكبیرەی چوارەم ئەوەی دەفەرموو(اللهم لا تحرمنا أجره، ولا تفتنا بعدهُ). وە ئەبوهورەیرەش دەڵێ پێشووەكان لە دوای(الله اكبر) گوتنی چوارەم دەیانگوت(اللهم ربنا آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار) ئەوجا سەلام دەدەیەوە.

## زانیاری زیاتر دەربارەی نوێژی مردوو:

١-سید سابق دەڵێ: ئەوەی دەبینرێ پێغەمبەر(ﷺ) لە دوعایەکانی راناوی نێری بەکار هێناوە بۆ مردووی نێرو مێ چونکە راناوەکان بۆ(میت) دەگەڕێنەوە.

٢- ئەگەر لە نوێژی مردوو چەند(الله اکبر) کردن پێ رانەگەیشتی لەگەڵ ئیمام دەتوانی بیانگێڕیەوە وە دەشتوانی نەیان گێڕیەوە لەگەڵ ئیمام سەلام بدەیتەوە.

٣- جائیزە نوێژکردن لەسەر مردوو لە دوای شاردنەوە لە هەر کاتێکدا بێت.

٤- سوننەتە لە نوێژی مردوو تەنها لە گوتنی(الله اکبر)ی یەکەم دەست بەرز بکرێتەوە.

١-عن أبي هريرة أن رسول الله(ﷺ) كبَّر على جنازةٍ فرفَع يديه في أوَّلِ تكبيرةٍ ووضَعَ اليُمنى على اليُسرى. حسن: رواه الترمذي(١٠٧٧).

واتە: ئەبوهورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ)، (الله اکبر)ی کرد لەسەر جەنازەیەك تەنها لە یەکەم جار گوتنی(الله اکبر) دەستەکانی بەرزکردەوە وە دەستی راستەشی لەسەر دەستی چەپەی دانا.

# پەلەکردن لە تەرم:

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: أسرِعوا بالجنازة، فإن تَكُ صالحةً فخَيرٌ تُقدّمونها، وإنْ تكُ سِوى ذلك فشَرٌّ تَضَعونَهُ عن رقابِكُم. **رواه البخاري(١٣١٥) ومسلم(٩٤٤).**

**واتە: پەلە بکەن لە جەنازەدا جا ئەگەر چاك بێت ئەوە چاکەیەکە پێشی دەخەن بۆی وە ئەگەر چاك نەبوو ئەوە شەرێك لە کۆڵی خۆتانی دەکەنەوە.**

٣-عن ابي سعيد الخدري(رضي الله عنه) أن رسول الله(ﷺ) قال: إذا وُضِعَت الجنازةُ واحتَمَلها الرِّجالُ على أعناقِهم فإن كانت صالحةً قالت: قَدِّموني، وإن كانت غير صالحةٍ قالت يا ويلها أين يذهبون بها؟ يَسمَعُ صوتها كُلُّ شيءٍ إلا الإنسان ولو سَمِعَهُ صَعِقَ. **رواه البخاري(١٣١٤).**

**١-لصعق: لغشي عليه، یانی: لەهۆش خۆ دەچوو، لەخۆ دەچوو.**

**واتە: کاتێ تەرمی مردوو دانرا لە ناو دارەتەرما وە پیاوان لەسەر شانیان دانا جا ئەگەر مردووەکە باش بێت دەڵێ: زوو بمبەن، وە ئەگەر مردووەکە باش نەبێت دەڵێ: وای بۆ خۆم بۆ کوێم دەبەن، هەموو شتێ گوێ ی لە دەنگی دەبێت بێجگە لە ئینسان، وە ئەگەر گوێ ی لێبایە لەخۆ دەچوو.**

## چۆنیەتی رۆیشتنی سوارو پیادە لەگەڵ جەنازەدا:

١-عن المغيرة بن شُعبة(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ قال: الرَّاكبُ خَلْفَ الجنازةِ. والماشي حيثُ شاء منها والطفل يُصلَّى عليه. **حديث صحيح: رواه الترمذي(١٠٣٦).**

**واتە: ئەوەی بە سواری یە لە پشت جەنازەوە دەڕوا ئەوەی بە پێیانیش دەڕوا لە کوێیەوە حەز بکا دەروا وە منداڵ نوێژی لەسەر دەکرێ.**

## سوود:

**١-دورستە لە پێش جەنازە یا لە دوایەوە یا لە لای راستی یا لە لای چەپی بڕۆی، بەڵام ئەوەی بە سواریە لە پشتیەوە دەڕوا.**

**٢- لە(أثر)ێك دا هاتووە لە ئیمام علی(رەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی:(المشي خلفها أفضَلُ من المشي أمامها كفضل صلاة الرجل في جماعة على صلاتهِ فذا[1]).**

**واتە: رۆیشتن لە دوای جەنازەوە باشترە لە پێشیەوە وەکو گەورەیی نوێژی پیاوێك کە بە کۆمەڵ(جماعه) بیکات لەسەر نوێژێك کە بە تەنیا بیکات.**

## دوعا بۆ مردوو لەدوای ناشتنی:

١-عن هانِىءٍ مَولى عثمان بن عفان قال: كان النبيُّ(ﷺ) إذا فَرَغَ منْ دَفْنِ الميِّتِ وقَفَ عليه فقال: استَغْفِروا لأَخيكُمْ وسَلُوا لَهُ التَّثبيت فإنَّهُ الآن يُسأَلُ. **صحيح: رواه ابوداود(٣٢٢١).**

---

(1) رواه ابن شيبة في المصنف، وأحمد وغيرهم وحسنه الألباني في الجنائز.

١-التثبيت: چەسپاندن.

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ کە لێ دەبۆوە لە ناشتنی مردوو لەسەری رادەوەستاو دیفەرموو: داوای لێخۆش بوون بکەن بۆ براکەتان وە داوای چەسپاندنی بۆ بکەن چونکە بێ گومان ئێستا پرسیاری لێ دەکرێ..

## دانیشتن لەسەر گۆڕو دورست کردنی خانوو لەسەری:

١-عن جابر(رضي الله عنه) قال: نهى رسول الله(ﷺ) أن يُجَصَّصَ القبرُ وأنْ يُقْعد عليه وأن يُبنى عليه. **رواه مسلم(٩٧٠).**

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) قەدەغەی(نەهی) کردووە لە سپی کردنی گۆڕو دانیشتن لەسەری و دورست کردنی خانوو و گومەت و شتی وا لە سەری.

### سوود:

١-حەرامە دانیشتن لەسەر قەبر، وە شەقاو دانان لەسەری.

٢- حەرامە رێ بدرێ گاگەڵ و ئاژەڵ بەسەریدا برۆن.

٣- حەرامە سەربرین لای گۆر یا لەبەر خوایش بێت.

٤- وە حەرامە هەڵگرتنی قەبر بە گەچ یان بە هەر شتێکی تر، وە نوسین لەسەری.

٥- وە حەرامە دورست کردنی خانوو لەسەری.

٦- حەرامە مزگەوتی لەسەر دورست بکرێ.

٧- حەرامە شکاندنی ئێسقانی مردوو.

٨- حەرامە قەبر لە یەك بست زیاتر بەرزتر بکرێتەوە.

## نوێژ كردن لەلای گۆڕو مزگەوت دورست كردن لەسەری دا:

١-عن أبي سعيد الخدري قال: قال رسول الله(ﷺ): الأرض كُلُّها مَسجدٌ إلاّ المقبرة والحمام. **صحيح: رواه أبو داود(٤٩٢) والترمذي(٣١٧).**

**واتە: زەوی هەمووی مزگەوتە جگە لە قەبرستان و حەمام.**

**سوود:**

**(ابن باز دەڵێ: اذا كان في المسجد قبر فالصلاة فيهِ غير صحيحة سواءً كان خلف المُصلين او امامهم او عن ايمانهم أو عن شمائِلهم[1].**

**واتە: ئەگەر لە ناو مزگەوت قەبر هەبوو نوێژی تیادا دورست نی یە جا قەبرەكە لە پشت نوێژكارەكان بوو یا لە پێشیان یا لە لای راستیان یا لە لای چەپیان بوو.**

٣-عن عائشة قالت: قال رسول الله(ﷺ) في مَرضه الذم لم يَقم منه: لعن الله اليهود والنصارى اتَّخذوا قُبور أنبيائهم مَساجد. **رواه البخاري(١٣٣٠) ومسلم(٥٢٩).**

**واتە: خوا نەفرین و لەعنەتی كرد لە گاورو جولەكەكان چونكە گۆڕی پێغەمبەرەكانیان كرد بە مزگەوت. واتە لەسەر گۆڕەكانیان مزگەوتیان دورست كرد.**

---

(1) **فتاوي مهمة تتعلق بالصلاة**

## جوێن دان به مردووان:

١-عن عائشة(رضي الله عنه) قالت: قال النبيُّ(ﷺ) لا تَسُبُّوا الأموات، فَإنَّهم قَدْ أفضوا إلى ما قَدَّموا. **رواه البخاري(١٣٩٣).**

**١-أفضوا: وصلوا، یانی گەیشتن.**

**واتە: جوێن بە مردوان مەدەن چونکە بێ گومان ئەوان گەیشتن بەوەی کە پێشیان خست(لە چاکەو خراپە).**

### سوود:

**امام(نووی) لە(ریاض الصالحین) دا ناوونیشانی بابەتێك دەهێنێتەوە دەڵێ(باب تحریم سَبُّ الأموات بغیر حَقّ ومصلحةٍ شرعیة...).**

**واتە: باسی ئەوەی حەرامە جوێن دان بە مردووان بە ناڕەواو بێ بەرژەوەندیەکی شەرعی.**

## سەلام کردن لە خەڵکی قەبرستان:

١-عن بریدة(رضي الله عنه) قال: كانَ رسول الله(ﷺ): **يُعَلِّمُهُم** إذا خَرَجوا إلى المقابرِ فكان قائِلُهُم يقولُ: السلام عليكم أهلَ الدِّيارِ مِنَ المؤمنين والمسلمين وإنّا إنْ شاءَ الله للاحقون. أسألُ الله لنا ولكم العافية. **رواه مسلم(٩٧٥).**

**واتە: بورەیدە(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: جاران پێغەمبەر(ﷺ) ئەصحابەکانی فێر دەکرد کاتێ بڕۆن بۆ گۆڕستان(چی بڵێن) جا ئەوان دەیانگوت (هەروەکو چۆن لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فێربوون): (السلام علیکم أهلَ الدِّيارِ مِنَ المؤمنين والمسلمين وإنّا إنْ شاءَ الله للاحقون، أسألُ الله لنا ولكم العافية).**

واتە: سڵاوتان لێ بێت ئەی دانیشتوانی ئەم ماڵانە لە بڕواداران و موسڵمانان وە ئێمەش هەر کات خوا بیەوێ پێیتان دەگەین، داوای سەلامەتی لە خوا دەکەین بۆ خۆمان و بۆ ئێوەش.

## باسی گریان و لەخۆدان و یەخەدادرین و(نیاحە) بۆ مردوو:

١-عن عبدالله بن عمر(رضي الله عنهما) قال: اشتَكى سعد بن عبادة شكوى لَهُ، فأتى رسول الله(ﷺ)، يَعودُهُ مَعَ عبدالرحمن بن عوف و سعد بن أبي وقاص و عبدالله بن مسعود، فَلَما دخَلَ عليه وجَدَهُ في غشيَّةٍ فقال: أَقَدْ قَضى؟ قالوا: لا يا رسول الله! فَبَكى رسول الله(ﷺ) فلما راى القومُ بكاءَ رسول الله(ﷺ) بَكوا، فقال: ألا تَسْمَعون؟ إنَّ الله لا يُعَذِّبُ بِدَمْع العين ولا بِحُزنِ القلبِ ولكن يُعَذِّبُ بِهذا(وأشار الى لسانه) أو يرحم. رواه البخاري(١٣٠٤) ومسلم(٩٢٤).

واتە: عبدالله کوڕی عومەر(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ سەعدی کوڕی عوبادە نەخۆش بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) سەردانی کرد لەگەڵ عبدالرحمن کوڕی عەوف وە سەعدی کوڕی أبو الوقاص وە عبدالله کوڕی مەسعود جا کە چووە لای بینی لە خۆ چووە لەبەر ئێشی نەخۆشیەکەی فەرمووی: ئایا مردووە! گوتیان نەء ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) جا پێغەمبەر(ﷺ) گریا، کە خەڵکەکەش گریانی پێغەمبەریان بینی ئەوانیش گریان جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا نابیستن؟ خوا لەسەر فرمێسکی چاوو خەم و پەژارەی دڵ، ئازارو سزاتان نادات بەڵام بەهۆی ئەوە(پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی کرد بۆ زمانی) سزا ئەدات یا ڕەحم دەکات.

**سوود**:

١-(يجوز البكاء بغير رفع الصوت) گريان بەبێ دەنگ بەرزكردنەوە جائزە.

٢- لە(غاية الأختصار) دا دەڵێ: ولا بأس بالبكاء على الميِّت مِن غير نوحٍ ولا شقّ. واتە: هیچ نی یەو گوناح نییە گریان لەسەر مردوو بێ هاوار كردن و یەخە دادرین.

٣- گریان لەسەر مردوو دورستە چ پێش مردنی پێش ئەوەی گیانی دەرچێ چ لە پاش گیان دەرچوونی.

٢- عن عبدالله بن جعفر أنَّ النبيَّ(ﷺ) أمْهَلَ الَ جَعفرٍ ثلاثاً أن يأتيهم ثُمَّ أتاهُم فقال: لا تبكوا على أخي بَعدَ اليومِ. صحيح: رواه ابوداود(٤١٩٢).

واتە: عبدالله كوری جەعفەر(رەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) سێ رۆژ مۆڵەتی بەكەس و كاری(جعفر) دا كە بۆی بگرێن لە پاشان هاتە لایان فەرمووی: ئیتر لە پاش ئەمرۆ بۆ براكەم مەگرین.

**سوود**:

١-(عبدالعظيم بن بدوى) لە(الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز) دا دەڵێ:(ويجوز لهم(للحاضرين وغيرهم) كشف وجه الميت وتقبيله والبكاء عليه ثلاثة أيّام) واتە: بۆ ئامادەبوان و غەیری ئەوانیش جائزە دەم و چاوی مردوو دەربخەن و ماچی بكەن وە گریان لەسەری بۆ ماوەی سێ رۆژان.

٢- جەعفەری كوری(ابو طالب) ئامۆزای پێغەمبەرە(ﷺ) لەساڵی (٨)ی كۆچی شەهید بووە لە شەری(مؤتة).

٣- عن ابن مسعود(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ليس منّا مَنْ ضَرَبَ الخدود وشَقَّ الجيوبَ ودعا بدعوى الجاهلية. **رواه البخاري(١٢٩٧) ومسلم(١٠٣).**

**واته: له ئێمه نی یه ئەو کەسەی کە لە ڕوومەتی بدا وە یەخەی دا بدرێ، وە وەکو زەمانی جاهیلی بەسەر مردووەکەدا هەر بڵێ.**

## سوود:

**١-گریان لەسەر مردوو دورستە چ بەرلەوەی گیانی دەرچێ و چ پاش گیان دەرچوونی بەو شەرتە لەگەڵ هاوارکردن و لە سنگدان‌و، باس کردنی ڕەوشتە بەرزەکانی نەبێ یەخەدادڕین و موبڕین وبەرگی ڕەش لەبەر کردن و گۆڕینی جل‌وبەرگی عادەتیش حەرامە.**

٤-عن أبي مالك الأشعري(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): النَّائِحَةُ إذا لم تَتُبْ قَبلَ مَوتِها، تُقامُ يوم القيامةِ وعليها سِربالٌ مِن قَطِرانٍ وَدِرعٍ مِنْ جَرَبٍ. **رواه مسلم(٩٣٤).**

**١-النياحة:** مأخوذة من النوح وهو رَفْعُ الصَّوتِ بالبكاء. **واته: النياحة: وەرگیراوە لە(نوح) کە بریتی یە لە دەنگ بەرزکردنەوە لە گریان.**

**٢- سربال: کراس.**

**٣- قطران: النحاس المذاب، مسی تواوە.**

**٤-الدرع: القميص: کراس.**

**٥- جرب: نەخۆسیەکە تووشی پێست دەبێت.**

**واته: ئەو ئافرەتەی کە دەنگی بەرز دەکاتەوە لە گریان ئەگەر پێش مردن تۆبەی نەکات لە ڕۆژی قیامەتدا هەڵدەستێنرێتەوە(لە قەبرەکەی) کراسێکی لە قەترانی لەبەردایە لەگەڵ دیزداشەیەك لە(جرب).**

**سوود**:

**کاتێك کە قەتران و ئەم نەخۆشیە پێستیە کە ناوی(جرب)ە پێکەوە کۆدەبنەوە ئازارەکە زیاتر دەبێت.**

٥- عن أبي بردة بن أبي موسى(رضي الله عنه) قال: وجع أبو موسى وجعا فغُشي عليه، ورأسُهُ في حجر امرأة من أهله فصاحت امرأةٌ من اهله، فلَمْ يستطعْ أن يرُدَّ عليها شيئاً فلمّا أفاق قال: أنا بريءٌ ممّا بريء منهُ رسول الله(ﷺ) فإنَ رسول الله(ﷺ) بريءٌ من الصَّالقة والحالقة والشَّاقَة. **رواه البخاري(١٢٩٦) ومسلم(١٠٤)**.

**١-فَغشي عليه: لەخۆچوو، بورایەوە، لەهۆش خۆچوو.**

**٢- حَجر امرأة: کۆشی ئافرەتێك.**

**٣- أفاق: بەهۆش خۆی هاتەوە.**

**٤- الصالقة: ئەو ئافرەتەی دەنگی بەرز دەکاتەوە لە گریان(التي ترفع صوتها بالبكاء).**

**٥- الحالقة:ئەو ئافرەتەی کە سەری دەتراشێ لە کاتی موسیبەت دا(التي تحلق راسها عند المصيبة).**

**٦- الشاقة: ئەو ئافرەتەی بەرگی دەدرێنێ لە کاتی موسیبەت دا.(هي التي تشق ثوبها عند المصيبة)**

**مانای فەرموودەکە:**

**ئەبو بوردەی کوری ئەبو موسی دەڵێ: ئەبو موسای ئەشعەری(کە دەکا باوکی) تووشی ئێشێك بوو و بورایەوەو لەخۆچوو وە سەریشی لە کۆشی ئافرەتێکی کەس و کاری بوو جا ئافرەتێك لە کەس و کارەکەی هاواری کرد ئەبو موسا نەیتوانی هیچی پێ بڵێ، جا کاتێك بەهۆش خۆی هاتەوە**

فەرمووی ئەمن بەریمە لەوەی کە پێغەمبەری خوا لێی بەریە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەری بوو لەو ئافرەتەی کە دەنگی بەرز دەکاتەوە لە گریان وە ئەو ئافرەتەی کە سەری دەتاشێ لە کاتی موسیبەتدا وە ئەو ئافرەتەی کە بەرگی دەدرێنێ لە کاتی موسیبەت دا.

٦- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): اثنتان في الناس هما بهم كُفرٌ: الطَّعْنُ في النَّسب، والنياحة على الميِّت. رواه مسلم(٦٧).

واتە: دوو شت لە ناو خەڵك دا هەن کوفرن، عەیب گرتن لە رەچەڵك و بنەچەی خەڵك، وە گریان بە دەنگی بەرز لەسەر مردوو.

٧- عن عمر بن الخطاب(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: الميِّتُ يُعَذَّبُ في قبرِهِ بما نِيحَ عليه. رواه البخاري(١٢٩٢) ومسلم(٩٢٧).

واتە: مردوو عەزاب دەدرێ لە گۆڕەکەی بە هۆی ئەو گریانەی کە بە دەنگی بەرز دەکرێ لەسەری.

٨- عن ابن عمر(رضي الله عنهما) قال: لما طُعِنَ عمر أُغميَ عليه فَصيحَ عليه فَلَمّا أفاقَ قال: أَما عَلِمتُم أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: إنَّ الميِّتَ ليُعَذَّبُ بِبكاء الحَيِّ. رواه مسلم(٩٢٧).

واتە: عبدالله کوری عومەر(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: کاتێ عومەر لێ درا لە هۆش خۆچوو، جا هاوار کرا لەسەری کاتێ کە بەخۆهاتەوە فەرمووی ئایا نەتانزانیوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: مردوو بە هۆی گریانی زیندوان عەزاب دەدرێ.

## مردن مایەی حەسانەوەی خەڵکانە:

١-عن ابي قتادة بن ربعي(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) مُرَّ عليهِ بجنازةٍ فقال: مُسْتَريحٌ ومُستراحٌ منهُ قالوا: يا رسول الله : ما المُستريحُ والمستراحُ منهُ. فقال: العبدُ المؤمن يَستَريحُ مِن نصَبِ الدُّنيا، والعبد الفاجر يستَريحُ مِنهُ العباد والبلاد والشَّجرُ والدوابُّ. رواه البخاري(٦٥١٢) وملم(٩٥٠).

واتە: تەرمێ بە لای پێغەمبەردا(ﷺ) تێپەراندرا فەرمووی:(مستريح و مستراح منه) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(المستريح والمستراح منه) چی یە؟ فەرمووی: بەندەی بڕوادار(کە دەمرێ) دەحەسێتەوە لە ماندوو بوونی دونیا وە بەندەی بەدکاریش(کە دەمرێ) بەندەکان و وولآت و دارو درەخت و زەیندەوران لە دەستی دەحەسێنەوە.

## سێ شت دوای مردوو دەکەوێ:

١-عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ) يَتْبعُ الميِّتَ ثلاثةٌ فَيَرجعُ اثنانِ ويبقى معه واحد، يتبعهُ أهله وماله وعمله، فَيَرجِعُ أهلُهُ ومالُهُ ويبقى عَمَلُهُ. رواه البخاري(٦٥١٤) ومسلم(٢٩٦٠).

واتە: سێ شت دوای مردوو دەکەوێ دووان دەگەڕێنەوەو یەکێکیان لەگەڵی دەمێننەوە، کەسوکاریو ماڵی و کردەوەکانی شوێنی دەکەون، کەس و کارەکەی و ماڵەکەی دەگەڕێنەوەو کردەوەکانی لەلای دەمێننەوە.

## خۆزگە بە مردن خواستن:

١-عن أبي عبيد(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: لا يَتَمَنَّى أحَدُكم الموتَ إما مُحسناً فَلَعَلَّهُ يزدادُ وإما مُسيئاً فَلَعَلَّهُ يستَعتبُ. رواه البخاري(٧٢٣٥).

واتە: با هیچ کەسێك لە ئێوە خۆزگەی مردن نەخوازێ جا ئەو کەسە یا چاکەکارە بەڵکو زیاتر کاری چاکە دەکات وە یا خراپەکارە بەڵکو داوای ڕەزامەندی خوا دەکات بە دەست هەڵگرتن لە گوناهان و تۆبە کردن.

٢-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن رسول الله(ﷺ) قال: لا يَتمنَّى أحَدُكُمُ الموتَ ولا يدعُ به مِنْ قَبْلِ أنْ يأتيَهُ إنَّهُ اذا مات أحَدُكم انقطعَ عَمَلُهُ، وإنهُ لا يزيدُ المؤْمِنَ عُمُرُهُ إلاّ خَيراً. رواه مسلم(٢٦٨٢) و

واتە: با هیچ یەکێك لە ئێوە خۆزگەی مردن نەخوازێ وە داواشی نەکات پێش ئەوەی بۆی بێت چونکە بێگومان کاتێ کە یەکێك لە ئێوە دەمرێ کردەوەکانی دەپچڕێن وە تەمەنی درێژیش بۆ ئیماندار هەر خێری زیاتر دەکا.

٣- عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال النبيُّ(ﷺ) لا يَتَمَنَّيَنَّ أحدكم الموتَ من ضُرّ أصابه فإن كانَ لابدَّ فاعلاً فَلْيَقل: أللهمَّ أَحْيِني ما كانت الحياةُ خيراً لي و توَفَّني إذا كانت الوفاة خيراً لي. رواه البخاري(٥٦٧١) ومسلم(٢٦٨٠).

واتە: با هیچ یەکێك لە ئێوە خۆزگەی مردن نەخوازێ لەبەر زیانێك کە

تووشی بووه، ئەگەر هەر زۆری بۆ هات و چاری نەبوو مەرگی خۆی بە ئاوات خواست با بڵێ: ئەی خودایە هەتا ژیانم باشترە بۆم بمژێنە وە ئەگەر مردن بۆم باشترە بم مرێنە.

## سوننەتە خواردن بۆ خاوەن تەعزیە دورست بکرێ:

١-عن عبدالله بن جعفر قال: قال رسول الله(ﷺ) اصنعوا لآلِ جعفر طعاماً فَإِنَّهُ قد أتاهم أمرٌ شغلهم. حسن: رواه أبوداود(٣١٣٢) والترمذي(٩٩٨).

واتە: خواردن بۆ کەس و کاری جەعفەر دورست بکەن چونکە بە راستی کارێکیان بۆ هاتۆتە پێش کە سەرقاڵ و مەشغولی کردوون، کە مردنی جەعفەرە.

## نەهی کراوە لە کۆبونەوە لای کەس و کاری مردوو و خواردن دروست کردن.

١-عن جرير بن عبدالله البجلي قال: كنّا نرى الإجتماعَ إلى أهل المَيِّت وصنعَةَ الطعام من النياحة. صحيح: رواه ابن ماجه(١٦١٢).

واتە: جەریری کوری عبدالله دەڵێ: ئێمە(واتە ئەسحابەکان) وامان دەبینی کە کۆبوونەوە لای کەس و کاری مردوو و خواردن دورست کردن لە شیوەن کردنە.

**سوود**:

دەبێ خۆ لە دوو شت بپارێزێ هەر چەندە خەڵك لێ ی راهاتوون:

١-کۆبوونەوە بۆ تەعزیە لە شوێنێکی تایبەت وەك ماڵ و مزگەوت.

٢- دورست کردنی خواردن لە لایەن کەس و کاری مردوو بۆ ئەوانەی دێنە تەعزیە.

## باس کردنی مردوو یا زیندوو بە باشە یا خراپە:

١-عن انس بن مالك(رضي الله) قال: مَرُّوا بجنازةٍ، فَأَثنوا عليها خيراً فقال النبيُّ(ﷺ) وجبَت، ثُـمَّ مَرُّوا بِأُخرى، فَأَثنوا عليها شَراً، فقال النبيُّ(ﷺ) وجبت، فقال عمر ابن خطاب(رضي الله عنه) ما وَجَبَت؟ قال: هذا أثنيتم عليه خيراً، فوجبت لَهُ الجنّةُ وهذا أثنَيتم عليه شراً فَوَجَبَتْ له النارُ أنتم شهداء الله في الارض. رواه البخاري(١٣٦٧) ومسلم(٩٤٩).

واتە: ئەنەس(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: تەرمێکیان تێپەراند بە(لای پێغەمبەرو ئەصحابەکان) ئەصحابەکان بە باشە باسیان کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: واجب بوو لە پاشان یەکێکی تریان تێپەراند بە خراپە باسیان کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: واجب بوو، جا عومەری کوری خەتتاب(رەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: چی واجب بوو؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوەی بە باشە باستان کرد ئەوە بەهەشتی بۆ واجب بوو وە ئەوەش بە خراپە باستان کرد ئاگری(دۆزەخی) بۆ واجب بوو، ئێوە شاهێدی خوان لەسەر زەوی.

٢- عن أبي الأسود(رضي الله عنه) قال: قَدِمتُ المدينةَ وقد وَقَعَ بها مَرَض فَجَلَستُ إلى عمر بن الخطاب(رضي الله عنه) فمَرّت بهم جنازةٌ فَأُثنِيَ على صاحبها خيراً فقال عمر(رضي الله عنه) وَجَبَت، ثُمَّ مُرَّ بأخرى فَأُثنِيَ على صاحبها خيراً فقال عمر(رضي الله عنه) وَجَبَت، ثُمَّ مُرَّ بالثالثة فَأُثنِيَ على صاحبها شَراً، فقال: وجَبَت، فقال: أبو الأسود: فَقُلتُ وما وجَبَت يا أمير المؤمنين؟ قال: قُلْتُ كما قال النبيُّ(ﷺ): أيُّما مُسلِمٍ شَهدَ لَهُ اربعةٌ بخَير ادخَلَهُ الله الجنةَ فقلنا: و ثلاثة؟ قال: وثلاثة فقلنا: واثنانِ. قال: واثنان، ثم لم نسألهُ عن الواحد. رواه البخاري(١٣٨٦).

واته: ئەبو ئەسوەد(رەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: چوومە مەدینە نەخۆشیەکی تیادا بڵاوبیۆوە، جا لای ئیمام عومەر دانیشتم(رەزای خوای لیٚ بیٚت) جەنازەکیان بەلادا تیٚپەری خاوەنەکەی بە باشە باسی کرا، ئیمام عومەر فەرمووی: واجب بوو لە پاشان یەکیٚکی تریش بەلایان دا بردرا بە باشە باسی مردوەکەیان کرد، ئیمامی عومەر فەرمووی: واجب بوو لە پاشان جەنازەی سیٚیەم رەت کرا بە لایاندا باسی مردووەکە کرا بە خراپە ئیمام عومەر فەرمووی: واجب بوو، ئەبو ئەسوەد دەڵیٚ: گوتم چی واجب بوو ئەی ئەمیری ئیمانداران؟ فەرمووی: ئەوەم گوت هەروەکو چۆن پیٚغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەر موسڵمانیٚك چوار کەس شاهیٚدی بۆ بدەن بە چاکە خودا دەیباتە بەهەشت، ئیٚمەش گوتمان ئەی ئەگەر سیٚ کەس بیٚت؟ فەرمووی: ئەگەر سیٚ کەسیش بیٚت، گوتمان ئەدی ئەگەر دوو کەس بیٚت؟ فەرمووی ئەگەر دوو کەسیش بیٚت لە پاشان پرسیارمان لیٚ نەکرد لە یەك کەس.

٣- عن أبي زهير الثقفي قال: قال رسول الله(ﷺ) يوشِكُ أنْ تعْرفوا أهل الجنَّة من أهل النار، قالوا بِم ذاك يا رسول الله؟ قال: بالثَّناء الحسنِ والثَّناء السَّيء أنتم شهداء الله بعضكم على بعض. **حسن: رواه ابن ماجه(٤٢٢١).**

**واته: نزيكه خەڵكی بەهەشت جیا بكەنەوە لە خەڵكی دۆزەخ، ووتیان بەچی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بە باسكردنی بە چاكەو بە باس كردنی بە خراپە، ئێوە شایەدی خوان هەندێكتان لە سەر هەندێكتان.**

٤- عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ) أهلُ الجنَّة منْ ملأ الله أذُنيه من ثناء الناس خيرا وهو يسمعُ. وأهل النار منْ ملأ أذنيه من ثناء الناس شرًا وهو يسمع. **صحيح رواه ابن ماجة(٤٢٢٤).**

**واته: خەڵكی بەهەشت كەسێكە كە خودا گوێیەكانی پركردەوە لە باسی بە چاكەی خەڵكی وە بۆ خۆیشی دەیبستیٚ. وە خەڵكی دۆزەخیش كەسێكە گوێیەكانی پر دەبێت لە باسی بە خراپەی خەڵكی وە ئەویش دەیبیستیٚ.**

## ئەوەی مردوو سوودی لێ دەبینێ:

**١- دوعاو داوای لێخۆش بوون کردن بۆ مردوو**

خوا دەفەرمووێ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلࣰّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفࣱ رَّحِيمٌ﴾ (الحشر:١٠).

**واتە: ئەو موسڵمانانەی لە پاش کۆچەرو یاریدەدەرەکان هاتوون دەڵێن ئەی پەروەردگارمان لە ئێمەو لەو برایانەشمان خۆش ببە کە پێشمان کەوتوون لە ئیمان هێنانداو هیچ رق و کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە دەربارەی باوەڕداران ئەی پەروەردگارمان بە راستی هەر تۆی دڵسۆزی میهرەبانی.**

## سوود:

**دوعاو داوای لێخۆش بوون کردن بۆ مردوو سوودی پێ دەگەیەنێ.**

**٢-دانەوەی قەرز بۆی:**

١-عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ) نَفْسُ المؤمن مُعلَّقةٌ بدينه حتى يُقضى عنه. **صحيح: رواه الترمذي(١٠٧٨) وابن ماجه(٢٤١٣).**

**واتە: گیانی بڕوادار بەستراوە بەقەرزەکەیەوە ناچێتە بەهەشت تا بۆی ئەدرێتەوە.**

**هەر کەسێك خزمی مردوو بوو یا خزمی نەبوو قەرز لە جیاتی مردووەکە بداتەوە مردووەکە قەرزەکەت لەسەر لا دەچێ.**

### ٣- خێری نەبراوەو ئاسەواری چاکە:

١-عن أبي هريرة أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: اذا مات الإنسان انقطع عنه عَمَلهُ إلا من ثلاثة إلاّ مِن صدقةِ جاريةٍ أو علمٍ يُنتفعُ به أو ولدٍ صالحٍ يدعوا لَهُ. رواه مسلم(١٦٣١).

واتە: کاتێ مرۆڤ مرد کردەوەی کۆتایی دێت لە سێ ڕێگاوە نەبێت: خێرێکی نەبڕاوەو بەردەوام(وەك: مزگەوت، بیرێکی ئاو، قورئانێکی وەقف کراو) یا زانیارییەك سوودی لێ وەرگیرێ، یا منداڵێکی سالح دوعای بۆ بکات.

### ٤-گرتنەوەی ڕۆژوو لە جیاتی مردوو:

١- عن عائشة أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: مَن ماتَ وعليه صيامٌ صام عنه وليُّهُ. رواه البخاري(١٩٥٢) ومسلم(١١٤٧).

واتە: هەر کەسێك مردو ڕۆژوو قەرزار بوو ئەوە با کەس و کارەکەی بۆی بگرێتەوە.

### ٥-ئەوەی منداڵ دەیکات لە کاری چاکە:

خوا دەفەرموێ﴿وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ﴾ (النجم:٣٩).

واتە: هیچ شتێك بۆ ئینسان نییە جگە لە کۆشش و کاری خۆی.

١- عن عائشة قال: قال رسول الله(ﷺ)، إنَّ مِن أطْيبِ ما أكلَ الرَّجلُ مِن كَسبهِ وَولدُهُ مِن كسبهِ. صحيح: رواه أبوداود(٣٥٢٨).

واتە: بێ گومان پاکترین شتێ مرۆڤ بیخوات ئەوەیە لەبەری ڕەنج و کۆششی خۆی بێت و بێگومان منداڵی مرۆڤ لەبەرهەم و ڕەنجی خۆیەتی.

٦-جێ بەجێ کردنی نەزری مردوو:

١- عن ابن عباس أنَّ سعد بن عبادة، استفتى رسول الله(ﷺ) فقال: إنَّ أُمي ماتت وعليها نَذرٌ فقال: اقضهِ عنها. رواه البخاري(٢٧٦١) ومسلم(١٦٣٨).

واتە: سەعدی کوڕی عوبادە پرسیاری لە پێغەمبەر کرد(ﷺ) گوتی: دایکم مردووەو نەزری لەسەرە فەرمووی: بۆی جێ بەجێ بکە.

٧-گەیشتنی پاداشتی ماڵ بەخشین بە مردوو:

عن أبي هريرة أنَّ رجلاً قال للنبيّ(ﷺ) إنَّ أبي مات وترك مالاً ولَم يوصِ فَهل يُكَفِّرُ عنه أن أَتَصدَّقَ عنه قال: نعم. رواه مسلم(١٦٣٠) والنسائي(٣٦٥٢).

واتە: پیاوێك بە پێغەمبەری گوت(ﷺ) باوکم مردووە وە ماڵ و سامانی لە دوای خۆیدا جێ هێشتووە وە هیچ وەسیەتی نەکردووە ئایا ئەگەر من ماڵ ببەخشم بە نیازی گەیشتنی پاداشتەکەی بۆ باوکم گوناهی پێ دەسرێتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ.

## سوود:

١-سەدەقەو ماڵ بەخشین بە نیازی گەیشتنی پاداشتەکەی بە مردوو پێ ی دەگات جا ئەم سەدەقەکردنە لە لایەن کوڕی بێت یان هەر یەکێکی تر بێت.

٢- هەدیە کردنی پاداشتی خوێندنی فاتیحەو قورئان بۆ مردوو پێ ی ناگات، (قال النووي: المشهور من مذهب الشافعي: أنه لا يصل).

# باسی دەججال

**مانای هەردوو ووشەی(المسیح) و(الدجال)**

ووشەی(مسیح) لە زمانەوانیدا لەسەر وەزنی(فعیل)ە لە(مسح)ەوە هاتووە واتە(سڕین) و(دست پێداهێنان) وە یەکێك لە داتاشراوەکانیشی (ساح) بە مانای گەڕان و سیاحەت دێت. وە زانایان دەڵێن(عیسی) سەلامی خوای لیّ بێت پێی دەوترێت(مسیح) لەبەر ئەوەی دەستی دەهێنا بە هەر نەخۆشێکدا چاك دەبۆوە، یان لەبەر ئەوەی لە ژیانیدا زۆر سیاحەت و گەڕانی دەکردو لە شوێنێکدا جێگیر نەدەبوو، وە دەڵێن دەججالیش هەر بە مەسیح ناو دەبردرێت لەبەر ئەوەی چاوی ڕاستی سڕاوەتەوەو روناکی تێدا نەماوە یان لەبەر ئەوەی لە ماوەی چل رۆژدا هەموو زەوی دەگەڕێت.

ووشەی (دجال)یش لە زمانەوانیدا لەسەر وەزنی(فعال)ە لە(دجل)ەوە هاتووە بە مانای داپۆشین و تێکەڵ کردن وە(دجال) بۆیە پیّ ی دەوترێت دەججال چونکە بە فێڵ و درۆ حەق و ڕاستی لە خەڵکی دادەپۆشێت و ڕاست و چەوتیان لیّ تێکەڵ دەکات.

وە پێغەمبەریش (ﷺ) هەردوو(مسیح)ەکەی بەوە لێك جیا کردۆتەوە کە بە(عیسی) سەلامی خوای لیّ بێت دەڵێت(مەسیحی هیدایەت) وە بە دەججالیش دەڵێت(مەسیحی گومرایی) وە لە ڕاستیدا ووشەی(مسیح) لە بنچینەدا شۆرەتی عیسا پێغەمبەرە سەلامی خوای لیّ بێت، بەڵام دەججال چونکە لە کاتی هاتنیدا خۆی وا بە خەڵك دەناسێنێت کە گوایە مەسیحی چاوەڕوان کراوەو هاتۆتە سەر زەوی، بۆیە بەمیش دەوترێت(مەسیح)، بەڵام مەسیحی درۆ و گومرایی نەك مەسیحە ڕاستیەکە کە عیسایە سەلامی خوای لیّ بێت[1].

---

(1) نیشانەکانی رۆژی دوایی و روداوەکانی پێش هاتنی.

## (ده) نیشانەی گەورە پێش هاتنی ڕۆژی دوایی:

١-عن حذيفة بن أسيد الغفاري قال: اطلع النبيَّ(ﷺ) علينا ونحن نتذاكر فقال: ما تذاكرون؟ قالوا: نَذكرُ الساعةَ فقال: إنها لَن تَقومَ حتى ترونَ قبلها عشر آيات، فذكرَ: الدّخان، والدجالَ، والدابّة، وطلوع الشمس مِن مغربها، ونزولِ عيسى بن مريم، ويأجوجَ ومأجوج، وثلاثةَ خسوف، خَسف بالمشرق، وخَسفٌ بالمغربِ، وخَسَفٌ بجزيرة العرب، وآخِرُ ذلك نارٌ تَخرجُ مِن اليمنِ تطرد الناسَ إلى مَحشَرِهم. رواه مسلم(٢٩٠١).

واته: حوزەيفه دەڵێ: جارێکیان پێغەمبەرمان(ﷺ) لێ بەدەرکەوت لە کاتێکدا ئێمە خەریکی قسەو باس بووین فەرمووی ئەوە باسی چی دەکەن؟ وتمان: باسی قیامەت دەکەین. فەرمووی: قیامەت هەڵناستێ هەتا دە نیشانە لە پێش هاتنیدا نەبینن، ئینجا فەرمووی: دووکەڵ و، دەججال و، دابەو، هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە، وە دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم، وە یەئجوج و مەئجوج، وە سێ ڕۆچوون، ڕۆچوونێك لە ڕۆژهەڵات و ڕۆچوونێك لە ڕۆژئاواو ڕۆژوونێك لە دورگەی عەرەب، وە کۆتایی ئەمانەش ئاگرێکە لە یەمەن دێتە دەر خەڵکی ڕاو دەنێت بەرەو شوێنی حەشر کردنیان.

## دەججال گەورەترین فیتنەیە لە مێژووی مرۆڤایەتی:

١-عن عمران بن الحصين قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: ما بين خلق آدم إلى قيام الساعة خلق أكبر مِن الدجال. رواه

مسلم(٢٩٤٦).

واته: له دورست كردنى ئادەم هەتا هاتنى قيامەت هيچ فيتنەيەك نييه له دەجچال گەورەتر بێت.

## دەجچال له ئەسفەهانى ئێران دەردەچێت:

١- عن أنس رسول الله(ﷺ) قال: يتبعُ الدجالَ من يهود أصبهانَ سبعون ألفاً عليهم الطيالسةُ. رواه مسلم(٢٩٤٤).

واته: حەفتا هەزار له جولەكەكانى ئەسفەهان شوێنى دەجچال دەكەون (طيلَسان)يان لەبەردايه (كه جۆره پۆشاكێكه بەلاى سەر لەبەر دەكرێ شۆر دەبێتەوه بەسەر باقى جەستەدا).

### سوود:

١-ئەسفەهان شارێكه له شارەكانى ئێران و دەجچاليش له يەكێك له گەرەكەكانى ئەم شاره دەردەچێت، هەروەك له فەرموودەى(صحيح)دا هاتووه.

٢- دەجچال ئەو پادشايەيه كه جولەكه چاوەڕوانى هاتنى دەكەن و پێيان وايه لەسەر دەستيدا حوكمى هەموو جيهان دەكەن‌و بۆيه بەشى زۆرى شوێنكەوتوانى جولەكەن.

٣- زۆربەى شوێن كەوتووانى دەجچال جولەكەو ئافرەتن.

٤- ئێستا جولەيەكى زۆر لەئەسفەهانى ئێراندا دەژين.

٥- الطيالسة: نوع من اللباس يُلبس على الرأس ويُسدل على بقية البدن، و مفرده طيلسان.

## دەججال کەی دەردەچێ:

١- عن معاذ بن جبل قال: قال رسول الله(ﷺ) عُمرانُ بيتِ المَقدس خَرابُ يَثرب، وخراب يثرب خُروج المَلحَمة، وخروجُ الملحَمَة فتح قُسطنطينية، وفتحُ القسطنطينية خروج الدجال.
حسن: رواه أبوداود(٤٢٩٤).

واتە: ئاوەدان کردنەوەی(بیت المقدس) وێران بوونی شاری مەدینەی بەدوادا دێت، وە وێران بوونی شاری مەدینەش جەنگە گەورەکەی بەدوادا دێت، وە دەرچوونی جەنگە گەورەکەش ئازاد کردنی ئەستامبۆڵی بەدوادا دێت وە ئازاد کردنی ئەستامبۆڵیش دەرچوونی دەججالی بەدوادا دێت.

### سوود:

پاش ئەوەی کە موسڵمانەکان لە جەنگی(الملحمە الکبری)دا سەرکەوتن بە دەست دەهێنن و دواتریش شاری(ئەستامبۆل) ئازاد دەکەن، ئا لەو کاتەدا هەواڵی سەرهەڵدان و هاتنی دەججال بە هەموو جیهاندا بڵاودەبێتەوە جا کە موسڵمانەکان ئەم هەواڵە دەبیستن شپرزە دەبن و دەشڵەژێن کە هەرچی دەسکەوتیشیان هەبووە هەمووی بەجێ دەهێڵن و بە پەلە بەرەو شام دەگەرێنەوە.

## دەجاڵ چل رۆژ دەمێنێتەوە لە زەوی:

١-عن النواس بن سمعان قال(... قلنا يا رسول الله وما لبثُهُ في الارض؟ قال: أربعون يوماً: يومٌ كَسنةٍ ويومٌ كشهرٍ، و يومٌ كجمعةٍ، وسائر أيامهِ كأيّامكم، قلنا يا رسول الله فذلك اليوم الذي كسنةٍ أتكفينا فيه صلاةُ يوم؟ قال: لا أُقدُروا له قدره، قلنا يا رسول الله وما إسراعُه في الارض؟ قال: كالغيث استدْبَرتْهُ الرِّيح،....). **رواه مسلم(٢٩٣٧).**

**واتە: نەوواس دەڵێ(.... گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا دەجاڵ چەند لەسەر زەوی دەمێنێتەوە؟**

**فەرمووی: چل رۆژ، رۆژێکیان وەکوساڵێکە و رۆژێکیان وەکو مانگێکەو رۆژێکیشیان وەکو هەفتەیەکەو سەرجەم رۆژەکانی تری وەك رۆژەکانی ئێوە وایە. گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا ئەو رۆژەی کە ئەوەندەی ساڵێکە ئایا نوێژی یەك رۆژی ئاسایی بەسە بۆمان؟ فەرمووی: نە ء، بەڵکو بە ئەندازەی خۆی ئەندازەی بگرن(واتە لە ماوەی شەو و رۆژێکی ئاسایی پێنج نوێژی تیادا بکەن).**

**گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا خێرایی دەجاڵ چەندە لە زەوی؟ فەرمووی: وەك باران لە پشتیەوە با بیفرێنێ، ....)**

## دەججال چاوێکی کوێرەو
## لە نێو چاوانی نوسراوە کافر:

١-عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ) ما مِن نبيّ إلاّ وقد أنذرَ أمَّتَهُ الأعورَ الكذاب ألا إنَّهُ أعور، وإنَّ ربّكُم عزوجل ليس بأعور، مكتوب بين عينيهِ ك ف ر . رواه البخاري(٧١٣١) ومسلم(٢٩٣٣).

واتە: هیچ پێغەمبەرێك نییە ئیللا ئوممەتەکەی لە دەججالی کوێری زۆر درۆزن ئاگادار کردۆتەوە، ئاگادار بن بێگومان دەججال کوێرە وە بێ گومان پەروەردگاتان(عزوجل) کوێر نی یە، نوسراوە لە نێو چاوانی( ك ف ر).

سوود:

١-هەموو پێغەمبەرێك ئوممەتەکەی لە دەججال ئاگادار کردۆتەوە.

٢- دەججال چاوێکی کوێرە.

٣- دەججال لە نێو چاوانی نوسراوە(ك ف ر) واتە کافر هەموو بڕوادارێکی خوێندەوارو نەخوێندەوار دەتوانێت بیخوێنێتەوە.

٤- کوێری دەججال بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر ئەوەی کە خوا نی یە، چونکە ئەگەر خوا بوایە چاوی خۆی چاك دەکردەوە.

## دەججال رووباری ئاو و ئاگری لەگەڵ دایە:

١-عن حذيفة بن يمان قال: قال رسول الله(ﷺ) إنّ الدجال يَخرُجُ وإنّ معهُ ماءً وناراً، فَأمّا الذي يَراهُ الناسُ ماءً فنارٌ تُحرقُ، وأمّا الذي يَراهُ الناسُ ناراً فماءٌ باردٌ عَذب، فَمَنْ أدركَ ذلك منكُم فَلْيَقَعْ في الذي يَراهُ ناراً، فإنّهُ ماءٌ عذبٌ طيِّب. رواه البخاري(٣٤٥٠) ومسلم(٢٩٣٥).

واتە: بێگومان دەججال دەردەچێ وە بێگومان دەججال(دوو رووباری) ئاوو ئاگری لەگەڵ دایە، جا ئەوەی خەڵك بە ئاو دەیبینن ئەوە ئاگرێكی سوتێنەرە، وە ئەوەی خەڵك بە ئاگری دەبینن ئەوە ئاوێكی ساردی شیرینە، جا هەر یەكێك لە ئێوە بەوە گەیشت با خۆی بخاتە ئەوەیانەوە كە ئەو بە ئاگری دەبینێ چونكە ئەوەیان ئاوێكی شیرین و زوڵاڵ و خۆشە.

**سوود:**

لە فەرموودەیەك دا پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ:(.... ولْيُغَمِّضْ ثُمَّ لْيُطأْطِيءْ رأْسهُ فَيشربَ منهُ فإنَّهُ ماءٌ بارد). **رواه مسلم(٢٩٣٤).**

واتە(كە چووە ناو ئەو رووبارەی كە بە ئاگر دەیبینی) با چاوی بنوقێنێ و لە پاشان سەری شۆربكاتەوەو لێ ی بخواتەوە چونكە بێگومان ئەو ئاوێكی ساردە.

## ئەو شوێنانەی دەججال ناتوانێ بچێتە ناوی:

١-عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ) ليس من بلد إلاَّ سَيطَؤُهُ الدجال إلاَّ مكةَ والمدينةَ وليس نقبٌ من أنقابها إلاَّ عليه الملائكةُ صافِّين تَحرسها فينزلُ بالسَّبخَة فتَرْجُفُ المدينةُ ثلاثَ رجفاتٍ يَخرجُ إليه منها كلُّ كافرٍ ومنافق. **رواه البخاري(١٨٨١) ومسلم(٢٩٤٣).**

واتە: هیچ شارێك نامێنێت كە دەججال پێی تێ نەخات جگە لە مەككەو مەدینە، لەسەر هەر یەكێك لە رێگاكانی فریشتە ریزیان بەستووە پاسەوانی دەكەن جا دەججال لە سەبخە دادەبەزێت ئیتر شاری مەدینە سێ

جاران دەلەرزێت هەرچی کافرو مونافیق هەیە لە شارەکە دەچنە دەرەوە بۆ لای دەجال.

**سوود**:

لە فەرموودەیەکی(صحیح) دا هاتووە کە دەجال نزیکی مزگەوتی(اقصی) و(طور)یش ناکەوێتەوە.

## خۆلادان لە دەجال:

١- عن عمران بن حصين قال: قال رسول الله(ﷺ): من سمعَ بالدجال فلْيَنأَ عنهُ فواللهِ إنّ الرجل ليأْتِيهِ وهو يَحسِبُ أنّهُ مُؤمن فيَتَّبعُهُ ممّا يُبعث بهِ من الشُّبهاتِ أو لِما يُبعَث بهِ من الشبهات. **صحيح**: رواه أبو داود(٤٣١٩).

واتە: هەر کەسێ کە بیستی دەجال هاتووە با خۆی لێ لادات سوێند بە خوا پیاو دێت بۆ لای کە خۆی زۆر بە ئیماندار دەزانێت کەچی شوێنی دەکەوێت بەهۆی ئەو کارە گوماناویانەی کە ئەنجامی دەدات.

## ئەمە چۆنە کە دەجال دەڵێ مردوو زیندوو دەکەمەوە:

١-عن ابي أُمامة قال: قال رسول الله(ﷺ): وإنَ من فتنته أن يقولَ لاعرابيّ أرأيتَ إن بعثْتُ لك أباك وأُمّك أتشهدُ أني ربُّك فيقول نعم فَيتمثل لَهُ شيطانان في صورة أبيه وأمّه فيقولان يا بُنَيَّ اتَّبعهُ فإنه ربّك. (**صحيح الجامع الصغير:٧٧٥٢**).

واته: یەكێك لە فیتنەكانی دەجال ئەوەیە كە بە پیاوێكی دەشتەكی دەڵێت: پێم بڵێ ئەگەر باوكت و دایكت بۆ زیندوو بكەمەوە شایەتی دەدەی كە من پەروەردگاری تۆم؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ، ئیتر دوو شەیتان خۆیان دەخەنە سەر شێوەی باوك و دایكی جا دەڵێن ئەی كورەكەم شوێنی بكەوە ئەوە پەروەردگاری تۆیە.

## خۆ پاراستن لە دەجال:

١-عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): إذا تَشَهَّدَ أحدكم فلْيستَعذ بالله من أربعٍ يقول: اللهم إني أعوذ بك من عذاب جهنم، ومن عذاب القبر، ومِن فتنةِ المحيا والممات، ومِن شرِّ فتنةِ المسيح الدّجال. رواه مسلم(٥٨٨).

واتە: كاتێ كەسێكتان تەحییاتی خوێند با خۆی بپارێزێ بە خوا لە چوار شت، بڵێ: ئەی خودایە خۆم دەپارێزم بە تۆ لە عەزابی دۆزەخ وە لە عەزابی قەبر وە لە فتنەی زیندوو بوونەوەو مردن وە لە خراپەی فیتنەی مەسیحی دەجال.

**سوود:**

پێشینان زۆر گرنگیان بەم دوعایە داوە تۆش هەوڵ بدە بیخوێنی و كەس و كارو خەڵكانی تریش فێر بكەی.

٢- عن ابي الدّرداء انّ النبيّ(ﷺ) قال: مَن حَفِظَ عشرَ آياتٍ مِن أوَّلِ سورة الكهف عُصِمَ مِن الدجال. رواه مسلم(٨٠٩).

واتە: هەر کەسێك دە ئایەتی سەرەتای سورەتی(کهف) لەبەر بکات دەپارێزرێ لە دەجال.

**سوود**:

لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە(ﷺ) کە دەفەرمووێ(فمن ادركهُ منكم فَلْيَقرأ عليه فواتحَ سورة الكهف). رواه مسلم.

واتە: هەر کەسێك لە ئێوە پێ ی گەیشت با سەرەتاکانی سورەتی(کهف)ی بە سەردا بخوێنێت.

## کۆتا باس لە سەر دەجال و کوشتنی دەجال:

دەجال پیاوێکی زەبەلاحە، سورە، قژ لوولە، کوێرە، چاوێکی دەرپەریوەو وەك ترێ ی سەر ئاو کەوتوو وایە، وە هەروەها پیاوێکی نەزۆکە، بانگەشەی خوایەتی دەکات، زۆربەی شوێن کەوتوانی جولەکەو ئافرەتن.

خوای گەورە بۆ ئەوەی بەندەکانی تاقی بکاتەوە توانای زۆری بە دەجال داوە کە بە هۆیانەوە خەڵکێکی زۆر فریو دەدات، شەیتان و دەست و پێوەندەکانی یارمەتی دەجال دەدەن کاتێ دەڵێ مردوو زیندوو دەکەمەوە شەیتانەکان خۆیان دەخەنە سەر شێوەی مردووەکە. وە پێغەمبەریش(ﷺ) دەفەرموێ(لیفِرنَّ الناسُ من الدجال إلى الجبال) رواه مسلم.

واتە: خەڵکان لە ترسی دەجال را دەکەن بۆ چیاکان.

٢-لە کاتێکدا کە موحەممەدی مەهدی و تەواوی هێزەکانی لە ناو

شاری قودس دان دەجچال گەمارۆی ئەم شارە دەدات تەواوی ڕێگاکان دەگرێت هیچ یارمەتی و خواردنێك ناگاتە دەستی موسڵمانەکان بەو شێوەیە موسڵمانان بە گەمارۆدراوی دەمێننەوە هەتا وای لیٚ دیٚت برسیٚتی زۆریان بۆ دەهیٚنیٚت و بیٚ هیٚزو لاوازیان دەکات و نزیك فەوتان دەبنەوە، بۆیە بریار دەدەن دەمەو بەیان هەڵمەت بەرنە سەر سووپاکەی دەجچال، یا ئەوەیە خوای گەورە سەریان دەخات یان وەکو برا موجاهیدەکانی پێشوویان بە پلەی شەهادەت دەگەن.

لە کاتی بەیان ریزەکانیان ڕێك دەخەن بۆ نوێژی بەیانی قامەت دەکرێت موحەممەد مەهدی پێش دەکەوێت بۆ ئیمامەت کردن ئا لەو کاتە کە نیەتیان ئەو رۆژە هێرش بکەنە سەر دەجچال و سوپاکەی پێش ئەوەی موسڵمانان نوێژ دابەستن عیسا پێغەمبەر دادەبەزێتە ناو لەشکری موسڵمانان و بۆ جاری دووەم دەگەرێتەوە سەر زەوی، جا موحەممەدی مەهدی دەکشێتەوە بۆ دوا بۆ ئەوەی عیسا پێش بکەوێت و پێش نوێژیان بۆ بکات، عیسا دەستی دەخاتە نێوان هەردوو شانیەوە پیٚ ی دەڵێت: خۆت پێش بکەوەو پێش نوێژیەکەمان بۆ بکە چونکە قامەتەکە بۆ تۆ کراوە.

جا کە نوێژ تەواو دەبێت عیسا(علیه السلام) دەڵێت دەرگای شارم بۆ بکەنەوە ئەوانیش بۆی دەکەنەوە کە سەیر دەکەن دەجچال لە دوای دەرگاکەوە وەستاوەو حەفتا هەزار جولەکەی لەگەڵ دایە پاشان کە دەجچال چاوی بە عیسا دەکەوێت(علیه السلام) دەتوێتەوە هەر وەك چۆن خویٚ لە ئاودا دەتوێتەوە پاشان هەڵدیٚت ئەویش لە ئاستی دەرگای(لد)ی رۆژهەلات دەیگرێتەوەو دەیکوژێت[1].

(1) نیشانەکانی رۆژی دوایی و رووداوەکانی پێش هاتنی.

# باسی قەبر

## تاقی کردنەوەی ناو گۆر(فِتنةُ القبر[1]):

١-عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: إنَّ العَبدَ إذا وُضِعَ في قبرهِ و تولّى عَنهُ أصحابُهُ، وإنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرعَ نِعالهم، أتاهُ مَلَكانِ فَيُقعِدانِ فيقولان: ما كنتَ تقول في هذا الرجلِ؟ لمحمد(ﷺ) فَأَمّا المؤمِنُ فيَقولُ أشهدُ أَنَّهُ عبدالله ورسولهُ فيقال له: انظر إلى مقعدك مِنَ النار قد أبدلك الله بِهِ مقعداً مِنَ الجنَّةِ فيراهُما جميعاً، قال قتادة: وذُكِرَ لنا أنَّهُ يُفْسَحُ لَهُ في قبره ثُمَّ رجعَ الى حديث أنس قال: وأمّا المنافق والكافرُ فيقال لَهُ: ما كنتَ تقولُ في هذا الرجل؟ فيقول: لا أدري كنتُ أقولُ ما يقول الناس فيقال: لا دَريتَ ولا تليت، ويُضرَب بمطارِقَ مِنْ حديدٍ ضَربةً فَيَصيحُ صَيحةً يَسمَعُها مَنْ يليهِ غَير الثقلين. رواه البخاري(١٣٧٤) ومسلم(٢٨٧٠).

---

(1) لە ناو قەبر سێ شت هەن:(فيتنة القبر، عذاب القبر، نعيم القبر) جا(فتنة القبر) الفتنة: لە زمانەوانی دا واتە:(الامتحان و الاختبار) واتە: تاقی کردنەوە، (فتنة القبر) بریتی یە: لە پرسیاری دوو فریشتەکە لە مردوو. بەڵام(عذاب القبر) بریتی یە لەو ئازارو نارەحەتیانەی کە لە قەبر بە ئینسانی خراپ دەگات وە(نعيم القبر) بریتی یە لەو خۆشیانەی کە لە قەبر بە چاکان دەگات.

١-مطارق: كۆیه تاكەكەی(مطرقة)یه، تۆبز.

٢- الثقلين: مرۆڤ و جنۆكه.

واته: بەندە كاتێ لە ناو قەبرەكەی دادەنرێ هاوڕێیانی پشتی تێ دەكەن و بەجێی دەهێڵن ئەو گوێی لە دەنگی پێڵاوەكانیانه، دوو فریشته دێنه لای دایدەنیشێنن و پێ ی دەڵێن: چیت گوتوه دەربارەی ئەو پیاوە؟ محمد(ﷺ)، جا ئیماندار دەڵێ: شایەتی دەدەم كه(محمد) بەندەی خوایەو ڕەوانەكراوی خوایه ئەوجا پێی دەگوترێ: تەماشای شوێنی خۆت بكه لە ئاگر، خودا بۆی گۆری بە شوێنێك لەبەهەشت جا هەموویان تاماشایان دەكەن، قەتادە دەڵێ: وە ئەوەشمان بۆ باسكراوە كه ئەو كەسه قەبرەكەی بۆ فراوان دەكرێ ئەوجا گەرایەوە بۆ فەرموودەكه فەرمووی: بەڵام دوو ڕوو و كافر پێ ی دەگوترێ: چیت گوتووە دەربارەی ئەو پیاوە؟ دەڵێ: نازانم قسەیەكم دەكرد كه خەڵك دەیان گوت جا پێ ی دەگوترێ: نەتزانیوەو قورئانیشت نەخوێندووە ئەوجا یەك تۆبزی ئاسنی لێ دەدرێ، ئەوسا یەك هاوار دەكات هەرچی لەدەوروبەریەتی دەیبستێ بێجگه لە ئینسان و جنۆكه.

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) إذا قُبِرَ الميِّتُ- أو قال أحدكم - أتاه ملَكان أسودان أزرقان يقالُ لأحدهما: المُنكر والآخر: النكير فيقولان: ما كنت تقولُ في هذا الرَّجل؟ فيقول ما كان يقولُ هو عبدالله ورسوله، أشهد أن لا اله الا الله وأنَّ محمداً عبدهُ ورسولُهُ فيقولان: قد كنا نعلم أنك تقول هذا ثُمَّ يفسح له في قبره سبعون ذراعاً في سبعين ثُمَّ ينوَّر لَهُ فيه، ثُمَّ يقال له: نَم، فيقولُ: أرجعُ إلى أهلي فأخبرهم؟ فيقولان: نَمْ كنومة

العروس الذي لا يُوقِّظُهُ إلاّ أحبُّ أهلهِ اليه حتى يبعَثَهُ اللّه من مَضجَعِه ذلك، وإن كانَ منافقاً قال: سَمعتُ الناس يقولون فقلتُ مثله لا أدري، فيقولان: قد كنا نعلم أنك تقول ذلك، فيقال للارض: التئمي عليه، فتلتئم عليه، فتختلف فيه أضلاعهُ فلا يزالُ معذَّبا حتى يَبعَثَهُ الله من مضجَعِه ذلك. حسن: رواه الترمذي(١٠٧١).

واته: كاتێ مردوو له ناو گۆر دەنرێ- یا دەفەرمووی یەكێك له ئێوه- دوو فریشتەی رەشی شین دێنه لای یەكێكیان پێی دەوترێ (منكر) ئەوی تریان (نكیر) جا پێی دەڵێن چیت گوتووه دەربارەی ئەم پیاوه ئەویش ئەوه دەڵێ كه گوتوویەتی كه بەندەی خواو نێردراوی خوایه(اشهد أن لا اله الا الله وأنَّ محمداً عبدهُ ورسولُهُ) جا دوو فریشتەكه دەڵێن: ئێمه دەمانزانی كه تۆ ئەوه دەڵێ ی له پاشان قەبرەكەی(٧٠) گەز به(٧٠) گەز بۆ فراوان دەكرێ له پاشان بۆشی رووناك دەكرێ، له پاشان پێ ی دەگوترێ: بخەوە، دەڵێ دەچمەوه لای كەس و كارم خەبەریان پێ دەدەم پێ ی دەڵێن بخەوه وەك نوستنی زاوایەكی خەوتوو بەخەبەری نەمێنێ خۆشەویسترین كەس نەبێت له لای ئەو(ئیتر هەر لەوێ دەمێنێتەوه) تا ئەو كاتەی كه خودا زیندووی دەكاتەوه لەو شوێنی نوستنەی دا، بەلاّم ئەگەر دووروو(منافق) بوو دەڵێ: گوێم له خەڵك بوو قسەیەكیان دەگوت منیش وام گوت نازانم دوو فریشتەكه دەڵێن: ئێمه دەمانزانی تۆ وا دەڵێی ئەوجا دەگوترێته زەوی: لەسەری وێك وەرەوه جا زەوی وا لەسەری وێك دێتەوەو(وای دەگوشی) پەراسوەكانی(راست و چەپی) تیادا تێك دەپەرن جا بەردەوام لەم قەبرەدا عەزاب دەدرێ تا خودا زیندووی دەكاتەوه لەم شوێنی پاڵدانەوەی.

**سوود**:

(صالح بن فوزان) له شەرعی عەقیدەی(واسطية)دا له لاپەرە(١٤٣) دا دەڵێ:(والايمان بسؤال الملكين واجب لثبوته عن النبيّ(ﷺ) في احاديث يبلغ مجموعها حد التواتر).

واته: بڕوا بوون به پرسیاری دوو فریشته له ناو گۆر واجبه لەبەر ئەوەی سابت بووه له پێغەمبەرەوە(ﷺ) له چەند فەرموودەیەك كه به هەموویان دەگەنه حەددی(تواتر).

## له قەبردا عەزاب و خۆشی هەن:

١-عن أنس (رضى الله عنه) أن النبى (ﷺ) قال: لولا أن لا تدافَنُوا لدعوت الله أنْ يُسمعَكُمْ من عذابِ القبرِ. رواه مسلم(٢٨٦٨).

واته: ئەگەر له ترسی ئەوە نەبوایه نەوەك مردوان نەشارنەوەو له گۆریان نەنێن، دوعام دەكرد له بەرخوا كه عەزابی قەبر ببیستن.

٢-عن عائشة (رضى الله عنها) أنَّ يهوديّةً دَخَلَت عليها فَذَكرتْ عذاب القبر فقالت لها: أعاذك الله من عذاب القبر. فسَأَلَتْ عائشة رسول الله(ﷺ) عن عذاب القبر فقال: نعم، عذابُ القبرِ حق، قالت عائشة (رضى الله عنها) فما رأيتُ رسول الله(ﷺ) بعدُ صلى صلاةً إلا تعَوَّذَ مِنْ عذاب القبر. رواة البخاري(١٣٧٢).

واته: عائیشه(رەزای خوای لێ بیت) دەڵێ: ئافرەتێكی جولەكه هاته لای باسی عەزابی قەبری كرد به عائشەی گوت: خودا بتپارێزی له عەزابی قەبر، جا عائیشه له پێغەمبەری پرسی(ﷺ) دەربارەی عەزابی قەبر

فەرمووی: بەڵێ: عەزابی قەبر هەیە، ئەوجا عائشە(ڕەزای خودای لێ بێت ) دەڵێ: لە پاشان نەم بینی پێغەمبەر(ﷺ) نوێژێك بكات ئیللا خۆی دەپاراست لە عەزابی قەبر.

٣-عن أنس بن مالك (رضي الله عنه ) قال: قال نبي الله(ﷺ)، إنَّ العبدَ إذا وُضِعَ في قَبرةِ، وتَولّى عنهُ أصحابُهُ، إنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعالهم، قال: يأتيهِ مَلكانِ فَيُقعِدانِهِ فيقولانِ له: ما كُنتَ تَقولُ في هذا الرَّجُلِ؟ قال: فأَمّا المؤمنُ فيقول: أشهد أنه عبدالله ورسوله، قال: فيقال له: انظر إلى مَقعَدك منَ النارِ، قد أبدلَكَ الله به مقعداً منَ الجَنةِ، قال نبي الله(ﷺ) فيَراهُما جَميعاً.

قال قتادة، وذُكِرَ لَنا أنَّهُ يُفْسَحُ لَهُ في قبرهِ سبعونَ ذراعاً، ويُملأُ عليهِ خَضِراً إلى يوم يبعثون. رواه البخاري (١٢٧٤) ومسلم(٢٨٧٠).

واتە: بەندە كاتێ كە لە ناو قەبرەكەی دەنرێ، وە هاورێكانی جێیان هێشت، ئەو گوێ ی لە خشپەی پێلاوەكانیان دەبی دوو مەلائیكەت دێنە لای دایدەنیشێنن وپێی دەڵێن:چیت دەربارەی ئەو پیاوە ووتووە(واتە محمد(ﷺ) جا ئیماندار دەڵێ:شایەتی دەدەم كە ئەو بەندەی خواو رەوانەكراوی بووە. ئەوجا پێی دەوترێ: تەماشای شوێنت بكە لە ئاگر، خودا بۆی گۆڕیوی بە شوێنێك لە بەهەشت، جا هەموویان تەماشایان دەكەن، قەتادە دەڵێ: وە بۆمان باس كراوە كە ئەو كەسە قەبرەكەی حەفتا گەز بۆ فراوان دەكرێ، بۆی پڕی سەوزایی دەكرێت تارۆژی زیندوو بوونەوە

**سوود**:

(صالح بن فوزان) لەشەرعی عقیدەی (الواصطية) دا لە لاپەرە(١٤٤) دەڵێ:(ومذهب اهل السنة والجماعة أن الميت اذا مات يكون في نعيم أو عذاب وانَّ ذلك يَحصل لروحه وبدنهِ كما توارت بهِ الاحاديث عن رسول الله(ﷺ) فيجب الإيمان بهِ ولا يتكلم في كيفيته وصفته لان ذلك لا تدركهُ العقول لأنه من أمور الاخرةِ لا يعلمها إلا الله ومن أطلعهم الله على شيء منه وهم الرسُل صلواتُ الله وسلامه عليهم.

واته: مەزهەبی ئەهلی(سنه) و(جماعه) لەسەر ئەوەیە: ئینسان كاتێ دەمرێ لە نازو نیعمەت دایە یان لە عەزاب وە ئەوەش بۆ گیان‌و جەستەیەتی هەروەكو بە(تواتر) لە پێغەمبەرەوە هاتووە(ﷺ) پێویستە ئیمانمان پێی هەبێت وە قسە نەكرێ دەربارەی چۆنیەتی و سیفەتی، لەبەرئەوە ئەو(نعیم) و(عذاب)ە عەقل و ژیری هەستی پێ ناكات، چونكە لە كاروباری دوا رۆژە وە كاروباری دوا رۆژیش نایزانێ بێجگە لە خواو كەسێ كەخودا ئاگاداری كردبێتەوە بە شتێكی كەئەویش پێغەمبەرانن (صلوات الله وسلامه عليم)

## قەبر دیمەنێكی گەلێ سامناكە:

١- عن هانيء مولى عثمان(رضي الله عنه) قال: كان عثمان اذا وقفَ على قبر بكى حتى يَبُلَّ لحْيتَهُ، فَقِيلَ له: تُذكَرُ الجنّةَ والنارَ فلا تبكي وتبكي مِنْ هذا؟ فقال: إنَّ رسول الله(ﷺ) قال: إنَّ القبر أوّلُ منازل الاخرة فإن نجا منهُ فما بَعدهُ أيسر منهُ وإنْ لم ينج منه فما بَعدهُ أشَدُ منه، قال: وقال رسول الله(ﷺ) ما رأيتُ منظراً قطُّ

إلاّ القبرُ أفْظَعُ منهُ. حسن: رواه الترمذي(٢٣٠٨).

واته:(هانیء) خزمەتكاری ئیمام عثمان(رەزای خوایان لیٚ بیٚت)، دەلیٚ: ئیمام عوسمان كاتیٚ كە لەسەر قەبریٚك رابوەستابا دەگریا تاوەكو ردیٚنی تەردەبوو، پیٚی گوترا ئەوە لەبەر چییە باسی بەهەشت و دۆزەخ دەكریٚ ناگریٚی، بەلاٚم بەبینینی قەبر دەگریٚی، گوتی:پیغەمبەری خوا فەرموویەتی: قەبر یەكەم مەنزلگای دوارۆژە، ئەگەر لەو رزگاری بوو، ئەوەی لە دوایەتی ئاسانترە، بەلاٚم ئەگەر لەو رزگاری نەبوو، ئەوەی دوای ئەو زەحمەت ترە، وە پیغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: قەت هیچ دیمەنیٚكم نەبینبوە، ئیللا قەبر لەو سامناكتر بووە.

## شویٚنی خۆ دیتن لەبەهەشت یا لە دۆزەخ لە ناو قەبردا:

١-عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ) إذا مات الرَّجلُ عُرِض عليه مَقْعَدَهُ بالغداةِ والعشيِّ، إن كانَ مِن، أهل الجنة، فَالجَنَّة، وإنْ كانَ مِن أهل النار، فالنار، قال: ثُمَّ يُقال: هذا مقعدُك الذي تُبعَثُ إليهِ يوم القيامة. رواه البخاري(١٣٩٧) ومسلم(٢٨٦٦).).

واته: هەر كاتیٚك پیاو مرد شویٚنی خۆی نیشان دەدریٚ بە سبەینە و ئیٚوارە، ئەگەر لەخەلٚكی بەهەشت بیٚت، ئەوە شویٚنی خۆی لە بەهەشت نیشان دەدریٚ، وە ئەگەر لە خەلٚكی ئاگر بیٚت شویٚنی خۆی لە ئاگر پیٚ نیشان دەدریٚ، لە پاشان پیٚی دەوتریٚ ئەوە ئەو شویٚنەتە كە زیندوو دەكریٚیەوە بۆلای لە رۆژی قیامەتدا.

## خوێندنی سورەتی(ملك) و پاراستن لەعەزابی قەبر:

١-عن جابر(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) كان لا ينامُ حتى يقرأ(الم تنزيل) و(تبارك الذي بيده الملك). **صحيح: رواه الترمذي(٢٨٩٢) والدارمي(٣٤١٤).**

**واتە: جابر(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پیغەمبەر(ﷺ) نەدەنووست تاوەکو سورەتی(سجدة) و(ملك)ی نەخوێندبایە.**

## سوود:

**١-پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ(سورة تبارك هي المانعة من عذاب القبر) صححه لالبانی**

**واتە: خوێندنی سورەتی(تبارك) موسڵمان مەنع دەكات لە عەزابی قەبر.**

**٢- عن عبدالله بن مسعود( رضى الله عنه) قال من قرأ(تبارك الزي بيده الملك) كل ليلة منعه الله عز وجل بها من عزاب القبر) قال المنذري: رواه النسائى واللفظ له والحاكم وقال صحيح الإسناد.**

**واتە:(عبدالله) كوری مەسعود(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: یەكێك(تبارك الذی بیده الملك) بخوێنی هەموو شەوێك خودا (عز وجل) بەهۆیەوە مەنعی دەكات لەعەزابی قەبر.**

## تەخت كردنى قەبرى بەرز:

١-عن أبي الهَيّاج الأسديِّ قال: قال لي عليُّ بن أبي طالب: ألا أَبعثُك على ما بعثني عليه رسول الله(ﷺ) أنْ لا تَدع تِمثالاً إلا طَمسْتَهُ ولا قبراً مُشرِفاً إلا سويتَهْ. رواه مسلم(٩٦٩).

واتە: ئەبو(هياج) دەڵێ: عەلى كورى أبوتالب(رەزاى خواى لێ بێت) پێى گوتم ئايا رەوانەت نەكەم بۆ ئەوەى كە پێغەمبەر(ﷺ) منى بۆ رەوانە كرد، كە ئەمەيە: هەرچى پەيكەرێكت دى كوێرى بكەرەوەو تێكى بدە، وە هەرچى قەبرێكى بەرزت دى تەختى بكە.

### سوود:

سيد سابق لە(فقه السنه)دا لە باسى(السنة في بناء القبر)دا دەڵێ: حەرامە قەبر لە يەك بست زياتر بەرز بكرێتەوە.

(من السنة أن يرفَعَ القبر عن الارض قدر شبر، ليعرف أنهُ قبر ويحرم رفعه زيادة على ذلك).

## نوێژكردن رووەو قەبرو دانيشتن لەسەرى و...هتد:

١-عن أبي مَرثَدٍ الغَنويِّ قال: قال رسول الله(ﷺ) لا تَجْلسوا على القُبورِ ولا تُصَلُّوا اليها. رواه مسلم(٩٧٢).

واتە: دامەنيشن لەسەر قەبران، وە نوێژيش بەرەو روويان مەكەن.

## سوود:

**له(الوجيز في فقه السنة والكتاب العزين)دا دەڵێ:**

**(ما يَحرم عند القبور) واتە: ئەوەی کە حەرامە لای قەبران بکرێ جا لە خاڵێ حەوتەم دا دەڵێ(الصلاه اليها) واتە: نوێژکردن بەرەو رووی قەبر. کەواتە نوێژ حەرامە بەرەو رووی قەبر بکرێ.**

٢- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ)، لأَن يجلسَ أحدكم على جَمرةٍ فَتُحرقَ ثيابَهُ فتَخلُصَ إلى جلْدهِ خيرٌ مِنْ أنْ يَجلِسَ على قَبرٍ. **رواه مسلم(٩٧١).**

**واتە: ئەگەر یەکێکتان لەسەر پشکۆیەکی ئاگر دابنیشێ، بەرگەکەی بسوتێنی، ئەوجا بگاتە پێستەکەی، باشترە لە بۆی لەوەی کە لەسەر قەبرێك دابنیشێ.**

٣-عن جابر(رضي الله عنه) قال: نهى رسول الله(ﷺ) أن يُجَصَّصَ القبرُ وأن يُقعَدَ عليهِ وأنْ يبنى عليه. **رواه مسلم(٩٧٠).**

**واتە: جابر(رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ:پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کردووە قەدەغەی کردووە کەوا قەبر گەچ کاری بکرێت، وە لەسەری دابنیشرێت، وەخانووی لەسەر دورست بکرێت.**

## سوود

## ئەمانەی لای خوارەوە هەمووی حەرامن لای گۆڕ:

**١-دانیشتن لەسەری.**

**٢- گەچ کاری کردنی**

**٣- خانوو دروست کردن لەسەری**

٤- نووسین لەسەری

٥- لەبستێك زیاتر بەرز بكرێتەوە

٦- پێ كردنی چرا لە سەری

٧- دروست كردنی مزگەوت لە سەری

٨- سەفەر كردن بۆلای

٩- حەرامە رێ بدرێ گاگەڵ و ئاژەڵ بەسەریدا بڕۆن

١٠- سەربڕین لای گۆڕ با لەبەر خواش بێت

١١- نوێژكردن لای گۆڕ ئەگەر بەرەو رووشی نەبێت

١٢- شكاندنی ئێسكی مردوو

١٣- وە كردنی بەشوێنی جەژن و شادی.

# باسی قیامەت

## فووکردن بە (صور) داو چۆنیەتی زیندوو بوونەوە

١-عن ابي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ) ما بين النفخَتَين أربعون، قالوا: يا أبا هريرة أربعون يوماً؟ قال أبيتُ، قالوا: أربعون شهراً. قال أبيتُ، قالوا أربعون سنةً قال أبيت، ثُمَّ يُنزِلُ الله من السماء ماءً فَيَنبُتون كما يَنبُت البقل، قال: وليس من الانسان شيء إلاّ يَبلى إلاّ عظماً واحداً وهو عَجبُ الذَّنَب، ومنهُ يُركَّبُ الخلقُ يوم القيامة. رواه البخاري(٤٨١٤) ومسلم(٢٩٥٥).)

١-النفختين: دوو فووکردنەکە، فریشتەیەك ناوی(اسرافیل)ە کەجاری یەکەم فوو بە کەرەنا(صور، قرن)دا دەکات، دونیا تێك دەچێت، کە بۆ جاری دووەم فووی پیادا دەکاتەوە گیانداران زیندوو دەبنەوە.

٢-ابيت: امتنعت

٣-عجب الذنب: کلێنجە، ئێسکێکی زۆر گچکەیە دەکەویتە کۆتایی بربرەی پشت.

واتە: نێوانی دوو فووکردنەکە چلە، گوتیان ئەی ئەبو هورەیرە چل رۆژە گوتی: نازانم، گوتیان: چل مانگە؟ گوتی: نازانم، گوتیان چل ساڵە؟ گوتی نازانم.

لەپاشان خوا لە ئاسمان بارانێك دەبارێنی سەوزو شین دەبنەوە هەروەکو چۆن گیا شین و سەوز دەبێت، فەرمووی:هەموو شتێ لە لەشی ئینساندا دەرزێ، بێجگە لەیەك هێسك، کە کلێنجەیە، لەرۆژی قیامەت دا دروست کراوەکان لە ئە و دروست دەکرێنەوە.

٢-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: كُلُّ ابن آدمَ ياكُلُهُ التُّرابُ إلاَ عجْبَ الذَّنب منِهُ خُلِقَ وفيهِ يُرَكَّبُ. رواه مسلم(٢٩٥٥)

واته: هەموو شتێکی ئینسان خۆڵ دەیخوا(دەرزێ) بێجگە لە کلێنجە، لەو دروست بوەو لەویش دورست دەکرێتەوە.

٣-عن عبد الله بن عمرو(رضى الله عنهما) قال:جاء اعرابيٌّ إلى النبيِّ(ﷺ) فقال: ما الصُّور؟ قال: قَرْنٌ يُنفَخُ فيهِ. صحيح رواه الترمذي(٢٤٣٠).

١-صور: کەرەنا، شەیپور.

واته:عارەبەکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) گوتی(صور) چییە؟ فەرمووی: شاخێکە فووی پیادا دەکرێ.

## سوود:

خوا دەفەرموێ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ﴾ (الزمر:٦٨).

واته: وە فوو دەکرێ بە کەرەنادا، جا هەموو ئەوانەی کە لە ئاسمانەکان دان و ئەوانەش کە لە زەوی دان دەمرن جگە لەوانەی کەخوا دەیەوێ(نەمرن) لەپاشان جارێکی دیکەش فووی پیادا دەکرێتەوە، جا لە ناکاو هەموو راست دەبنەوەو چاوەڕوانی(جەزاو سزا) دەبن.

# چۆنیەتی بەرێکەوتن بۆ مەیدانی مەحشەر

١- عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيّ(ﷺ) قال: يُحشَرُ الناسُ على ثلاث طرائقَ راغبينَ راهبين واثنان على بَعيرٍ وثلاثةٌ على بعيرٍ وأربعةٌ على بعير وعشرةٌ على بعير، ويَحشُرُ بَقيَّتَهم النارُ تقيلُ مَعهم حيثُ قالوا وتبيتُ معهم حيثُ باتوا وتُصبح مَعهم حيثُ أصبحوا وتمسي معهم حيث امسَوا. **رواه البخاري(٦٥٢٢) ومسلم(٢٨٦١).**

**١- الطرائق: جمع طريقة: وهى الحالة.واته:بار**

**واته: خەلك حەشر دەكرێت لەسەر سێ حالەت ئارەزوو و ترسيان هەيە، دوو كەس لەسەر حوشترێك وە سێ كەس لەسەر حوشترێك وە چوار كەس لەسەر حوشترێك وە دە كەس لەسەر حوشترێك، وە ئەوەی مايەوە ئاگر كۆيان دەكاتەوەو دەيانبا، نيوەڕۆ لە كوێ وچان بگرن ئەوەيش لەوێ دا وچانيان لەگەلْ دا دەگرێ، وەشەو لە كوێ شەو بكەنەوە ئاگرەكەش بە دياريانەوە شەو دەكاتەوە، وە لە كوێ بەيانی بكەنەوە ئاگرەكە لەوێ بەيانيان لەگەلْدا دەكاتەوە، وە لە كوێ ئێوارە بكەنەوە ئەويش لەوێ ئيوارەيان لەگەلْ دا دەكاتەوە.**

## سوود:

**١-ابن حجر لە (فتح الباري) راجيايی زانايان دەهێنێتەوە دەربارەی ئەم حەشرەی كە لەم فەرموودە داهاتووە ئايا لەچ كاتێكە.**

**٢-خطابي دەلْێ: ئەم حەشرە پێش هاتنی قيامەتە، و غەزالی دەلْێ ئەم حەشرە لەدوای دەرچوونە لە قەبر.**

## خەڵكان بەپێ خواسی و رووتی و خەتەنە نەكراوی حەشردەكرێن لەقیامەت:

١-عن عائشة(رضي الله عنها) قالت: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: يُحْشَرُ الناسُ يوْمَ القيامة حُفاةً عُراةَ غُرلاَ. قلتُ يا رسول الله النساءُ والرِّجالُ جمعياً ينظرُ بَعضهم على بَعض؟ قال: يا عائشة الأمرُ أشَدُّ مِنْ أن ينظر بعْضُهُم الى بعض. **رواه مسلم**(٢٨٥٩).

١-**حُفاة**: كۆی(حاف)ە، واتە: پێ خواس، پێ پەتی.

٢- **عراة**: كۆی(عار)ە، واتە: رووت.

٣- **غرلاً**: كۆی(أغرل)ە، واتە: خەتەنە نەكراو.

واتە: خەڵك لەرۆژی قیامەت دا بەپێ خواسی و رووت و خەتەنە نەكراوی حەشر دەكرێت عائیشە(رەزای خوای لێ بێت ) دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا پیاو و ژن هەموویان پێكەوە، هەندیكیان تەماشای هەندیكیان دەكەن؟ فەرمووی: ئەی عائیشە كارەكە لەوە سەخت ترە كە هەندێك تەماشای هەندێك بكەن.

## رۆژ نزیك بوونەوە لە قیامەت و ئارەقە كردن:

١- عن المقداد(رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: تُدنى الشَّمسُ يومَ القيامةِ من الخلق حتى تكونَ منهم كمقدار مِيل، قال سليم بن عامر الراوي عن المقداد: فَوالله ما أدري

ما يعني بالميل، أمسافة الأرض أم الميل تكتحلُ بهِ العينَ قال: فيكونُ الناسُ على قدرِ أعمالهم في العَرقِ فَمنهُم من يكون إلى كعبيه، ومنهم مَن يكون الى ركبتيه ومنهم مَن يكونُ إلى حِقويهِ ومنهم مَن يُلجِمهُ العَرَقُ إلجاماً، وأشار رسول الله(ﷺ) بيدهِ إلى فيهِ. رواه مسلم(٢٨٦٤).

١-تدنى: واته: نزيك دەبێتەوە.

٢- لجام: لغاو.

٣- فيه: دەمى.

واته: له رۆژى قيامەت رۆژ له دورستكراوەكان نزيك دەبێتەوە به ئەندازەى ميلێك.

سولەيمى كورى عامير له ميقداد دەگێرێتەوە كه گوتويەتى: سوێند بەخوا نازانم پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستى پێ چ ميلێك بوو ئايا نێوانى زەوى بوو يا ئەو ميله بوو كه چاوى پێ دەرێژرێ و كلى پێ دەكرێته چاو، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: ئەوجا خەڵكان بەپێ ى كردەوەكانيان له ناو ئارەقەدا دەبن، هەيانه ئارەقە تا گۆزينگى پێيەكانى دێت، وههەيانه ئارەقە هەتا چۆكى دێت، وه هەيانه ئارەقە تا ناوقەدى دێت، وههەيانه ئارەقە لغاوى دەكات بەلغاوكردن.

## سوود:

قال ابن علان: واستثنى الله تبارك وتعالى الأنبياء والشهداء ومن شاء الله من المؤمنين والمؤمنات ثم أشدّ الناسِ عَرَقاً الكفار ثُمَّ أهل الكبائر[1].

---

(1) معاني أحاديث رياض الصالحين(مصطفى محمد عمارة).

واته: خودا(تبارك و تعالى) پێغەمبەران و شەهیدەكان و ئەوەش كەخوا بیەوێ لە ئیمان دارانی پیاو ئافرەت نایان خاتە ناو ئەو ئارەقەیە، ئەوەش كە لە هەموو خەڵك زیاتر دەكەوێتە ناو ئەو ئارەقەیە كافرەكانن لە پاشان خاوەنی گوناحە گەورەكان.

## لەقیامەت چوار پرسیار لەبەندەكان دەكرێ:

١- عن أبي برزة الاسلمي(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) لا تزولُ قَدما عبدٍ يوم القيامة حتى يُسأل عن عمره فيما أفناه، وعن علمهِ فيم فعَلَ وعن مالهِ من أين اكتسبَهُ و فيم أنفقهُ وعن جسمهِ فيم أبلاه. صحيح: رواه الترمذي(٢٤٢٥).

واتە: لە رۆژی قیامەتدا پێیەكانی هیچ بەندەیەك لە شوێنی خۆی نابزوێ تاوەكو پرسیاری لێ دەكرێ: لە تەمەنی كە لە چیدا بەسەر بردووە، وە لەو زانستەی هەیبووە لەچیدا بەكاری هێناوە، وە لە ماڵ و سامانەكەی لە كوێ پەیدای كردوەو لەچی سەرفی كردووە، وە لەجەستەی لەچیدا تاقی كردۆتەوە.

## (مفلس)كێ یە لەقیامەت دا:

عن أبي هريرة: انَّ رسول الله(ﷺ) قال: أتدرون ما المفْلِسُ؟ قالوا: المُفلِسُ فينا مَن لا درهمَ لَهُ ولا متاعَ[1] فقالَ: إنَّ المفلس مِنْ أُمَّتي مَن يأتي يومَ القيامةِ بصلاة وصيامٍ وزكاةٍ و يأتي قد شتم

---

(1) المتاع: كل ما ينتفع به من عروض الدنيا.

هذا وقذفَ هذا وأكل مالَ هذا وسفك دَم هذا وضرب هذا فيُعطى هذا من حسناته و هذا من حَسناته فإن فنيت حَسَناتهُ قبلَ أن يُقضى ما عليهِ أُخِذَ مِن خطاياهم فَطُرِحَت عليه ثُمَّ طُرحَ فِي النار. رواه مسلم(٢٥٨١).

**واته: ئايا دەزانن مايه پووچ(مفلس) كیّ یه؟ گوتیان مایه پووچ له ناو ئیّمەدا ئەو كەسەیه كه پارەو ماڵی نیه، جا پیّغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: مایه پووچ له ئۆممەتی من ئەو كەسەیه كه رۆژی قیامەتیّ دیّت نویّژو رۆژوو و زەكاتی پیّ یه، بەلاّم جویّنی بەم داوەو، بوختانی بەوەوه كردوه و ماڵی ئەوی خواردوەو، خویّنی ئەوی رشتوه، لەوی داوه، ئەوجا له چاكەو خیّرەكانی دەدریّت بەم و بەو، جا ئەگەر چاكەكانی تەواو بوون پیّش ئەوەی ئەوەی لەسەریەتی بیداتەوه، له تاوانی ئەوان -خاوەن مافەكان-، وەردەگیریّ و فریّ دەدریّنه سەر كابرای تاوانبار، لەپاشان -كابرا-، فریّ دەدریّته ناو ئاگر.**

## له قیامەت هەموو كەسیّ حەقی بۆ دەگەریّتەوه:

١-عن ابي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ) مَنْ كانَت لهُ مَظلمةٌ لأخيه من عرضه أو شيءٍ فَلْيتَحلَّلْهُ منه اليوم قبل أنْ لا يكونَ دينارٌ ولا درهمٌ، إنْ كان لهُ عملٌ صالحٌ أُخذَ منهُ بقدرِ مَظلمته، وإن لم تَكُنْ لهُ حسناتٌ أُخذَ مِن سيِّئات صاحبه فحُمِلَ عليه. **رواه البخاري(٢٤٩٤).**

**واته: هەر یەكیّك زوڵمیّكی له كەسیّك كردووه، دەربارەی ناموس، یان شتیّكی تر، با له دونیا حەقەكەی پیّ بداتەوه، پیّش ئەوەی رۆژیّك دابیّت**

دينار و درهەم نەبێت، ئەگەر كردەوەی چاكی هەبێت بە ئەندازەی ستەمەكەی چاكەی لێ وەردەگیرێ، وە ئەگەر چاكەی نەبوو ئەو كاتە لە خراپەكانی ستەم لێكراوەكە وەردەگێرێ دەخرێتە سەر ستەمكارەكە.

٢- عن ابي سعيد الخدري عن رسول الله(ﷺ) قال: إذا خَلَصَ المؤمنون من النار حُبِسوا بِقنطرةٍ بينَ الجنَّةِ والنار، فَيَتَقاصُّون مَظالم كانت بينهم في الدنيا حَتَّى إذا نُقُّوا وهُذِّبوا أُذنَ لهم بدخول الجَنَّة فوالذي نفسُ محمد بيدهِ لأحدُهم بِمَسْكَنِهِ في الجنَّةِ أدَلُّ بمنزلهِ كان في الدنيا. رواه البخاري(٢٤٤٠).

١-قنطرة: پرد.

٢- تَهذيب: پاككردنەوە.

واتە: كاتێ بڕوادارەكان قوتاریان دەبێ لە ئاگر، لەسەر پردێك لە نێوانی بەهەشت و جەهەندەم رادەگیرێن، تۆڵە لە یەكتری دەستێننەوە لەسەر ئەو زوڵموستەمانەی كە لە دونیادا لەنێوانیان دا هەبووە؟ تا كاتێ پاك و خاوێن دەكرێنەوە، ئەوجا رێگەیان پێ دەدرێ كە بچنە بەهەشت، جا سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بە دەستە، هەر یەكەیان بە ماڵە كانیان لە بەهەشت شارەزاترن لە ماڵەكانیان لە دونیا.

٣-عن ابي هريرة أنَّ رسول الله(ﷺ) قال:: لَتُؤَدُّنَّ الحقوقَ إلى أهلها يومَ القيامةِ حتى يُقادَ للشَّاةِ الجَلحاء من الشَّاةِ االقَرناءِ. رواه مسلم(٢٥٨٢).

١-الشاة الجلحاء: بزنی بێ قۆچ.

٢- الشاة القرناء: بزنی بە قۆچ.

واته: به تەئكيد لە رۆژی قيامەتدا هەموو هەقیٚ دەدەنەوە بە خاوەنەكانيان، تاوەكو تۆڵە وەردەگيرێتەوە بۆ بزنی بیٚ قۆچ لە بزنی بە قۆچ.

## پێغەمبەر(محمد) (ﷺ) زۆرترين شوين كەوتەی هەيەو يەكەم كەسێكە دەرگای بەهەشتی بۆ دەكرێتەوە:

١-عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ) أنا أكثرُ الأنبياء تَبَعاً يوم القيامةِ وأنا أوَّلُ مَنْ يَقْرَعُ بابَ الجَنَّة. رواه مسلم(١٩٦).

واته: پيغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووی: من لە هەموو پێغەمبەران شوێن كەوتەم زياترە لە رۆژی قيامەتدا، وە من يەكەم كەسم كە لە دەرگای بەهەشت دەدەم.

٢- عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ) آتي بابَ الجَنَّةِ يوم القيامةِ فَأسْتَفْتِحُ، فيَقولُ الخازنُ: مَنْ أنت؟ فأَقولُ: محمد، فيقولُ: بِكَ أُمرتُ لا افتحُ لأحدٍ قبلَكَ. رواه مسلم(١٩٧).

واته: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویٚ: لەرۆژی قيامەت دا دەچمە لای دەرگەی بەهەشت، داوای كردنەوە دەكەم، جا دەرگەوانی بەهەشت دەڵیٚ ئەتۆ كێی؟ دەڵێم(محمد) جا دەڵیٚ: بە تۆ فەرمانم پیٚ كراوە، پێش تۆ بۆ هيچ كەسێكی تر دەرگا نەكەمەوە.

## شەفاعەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەقیامەت دا بۆ هەموو ئوممەتی:

١-عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ) لِكلِّ نَبيّ دعوةٌ مُستَجابةٌ، فَتَعَجَّلَ كُلُّ نبيّ دَعْوَتَهُ وإني اختبأتُ دَعوتي شَفاعَةً لأُمتي يومَ القيامةِ فَهيَ نائِلةٌ إن شاءَ الله مَنْ ماتَ مِنْ أُمّتي لا يُشرِكُ بالله شيئاً. رواه البخاري(٦٣٠٥) ومسلم(١٩٩).

واتە: هەموو پێغەمبەرێك دوعایەكی قەبول كراوی بۆ هەیە، هەموو پێغەمبەرێك دوعاكەی خۆیان لە دونیادا كردوە، بەلاّم من دوعاكەم شاردۆتەوە، تكا(شفاعة) دەكەم بۆ ئوممەتەكەم لە رۆژی دواییدا، ئەگەر خوا بیەوێ ئەم شەفاعەتە بەر هەموو كەسێ دەكەوێ لەئوممەتەكەم كەمردبێ و هیچ هاوبەشێكی بۆ خودا پەیدا نەكردبێ.

## حەوزی پێغەمبەر لەگۆرەپانی(محشر)

١-عن أنس بن مالك قال: أَغفى رسول الله(ﷺ) إغفاءةً فَرَفَعَ رَأسَهُ مُتَبَسِّماً، فإمّا قال لهم، وإمّا قالوا لَهُ: يا رسول الله لِمَ ضَحِكْتَ؟ فقال: إنَّهُ أُنزلت عليَّ سورةٌ فقَرأ(بسم الله الرحمن الرحيم إنا أعطيناك الكوثر) حتى خَتَمَها فلَما قرأها قال: هل تدرون ما الكوثر؟ قالوا: الله و رسولهُ أعلم، قال: فإنَّهُ نَهرٌ وَعَدَنيه ربي عزَّ وجلَّ في الجنَّةِ وعليه خيرٌ كثير، عليه حوضٌ تَرِدُ عليهِ أُمَّتي يومَ القيامةِ آنيتُهُ عَدَدُ الكواكب. صحيح: رواه ابوداود(٤٧٤٧).

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) سەر خەوێكی شكاندو ئەوجا سەری بەرزكردەوە

بەزەردە خەنەوە، جا یا پێی گوتن، یاپێیان گوت، ئەی پێغەمبەری خوا بۆ پێکەنی؟ فەرمووی: پێش کەمێ لەمەوبەر سورەتێکم بۆ دابەزی، ئەوجا خوێندیەوە(بسم الله الرحمن الرحيم إنا أعطيناك الكوثر) تا تەواوی کرد، جاکاتێ کەخوێندیەوە فەرمووی: دەزانن(کوثر) چییە؟ گوتیان: خوداو پێغەمبەری خوا دەزانن، فەرمووی: (کوثر) رووبارێکە خودا(عز وجل) وەعدەی پێ داوم بمداتێ لە بەهەشت، خێرو بێرێکی زۆری لەسەرە، حەوزێکی لەسەرە(واتە دەرژێتە ناو حەوزێك) لە رۆژی قیامەت ئۆممەتی من دێنە سەری(ئاوی تیادا دەخۆنەوە) جامەکانی بە قەد ئەستێرەکانن.

٢- عن عبدالله بن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ) حَوضي مَسيرةُ شَهرٍ ماؤهُ أَبيضُ مِنَ اللبنِ وريحهُ أطيبُ مِن المِسكِ وكيزانهُ كنجوم السّماء مَن شرِبَ منها فلا يَظمأ أبداً. رواه البخاري(٦٥٧٩).

واتە: حەوزەکەم بە ئەندازەی مانگە رێیەکە، ئاوەکەی لە شیر سپی ترە، بۆنی لە بۆنی میسك خۆشترە، گۆزەکانی سەری وەکو ئەستێرەکانی ئاسمانێ وان، هەر یەکێك لێی بخواتەوە قەت تێنووی نابێتەوە.

**سوود**:

لە گۆڕەپانی حیساب لە قیامەتدا پێغەمبەر(ﷺ) حەوزێکی هەیە ئوممەتەکەی ئاوی تیادا دەخواتەوە.

(و قد اجمع أهل السنة والجماعة على اثبات الحوض) ئەهلی(سنە)و (جماعە) یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کەحەوز هەیە.

طحاوي دەڵێ(الحوض الذي أكرمهُ الله تعالي بهِ غياثاً لأمتهِ حق) واتە:

حەوزی پێغەمبەر(ﷺ) راستە، بەم حەوزە خوا رێزی لە پێغەمبەر(ﷺ) ناوەو فریای تێنوبووانی ئومەتەکەی دەکەوێ لە گۆرەپانی(محشر).

## تێپەرین بەسەر پردی سیرات دا:

١-عن أبي هريرة وحذيقة قالا: قال رسول الله(ﷺ) يَجْمَعُ اللهُ تبارك وتعالى الناسَ فيقومُ المُؤمنونَ حَتَّى تُزلَفَ لَهُمُ الجنّة فيأتونَ آدمَ فيقولونَ: يا أبانا استفتح لنا الجنّة فيقولُ: وهل أخرَجَكُم مِنَ الجنَّةِ إلاّ خطيئةُ أبيكُم آدم! لستُ بصاحبِ ذلك اذهَبوا إلى ابْني إبراهيم خليل اللهِ قال فيقولُ إبراهيم: لستُ بصاحبِ ذلك إنّما خليلاً مِن وراء وراءَ، اعمدوا إلى موسى(ﷺ) الذي كلّمه الله تكليماً فيأتونَ موسى(ﷺ) فيقول: لستُ بصاحب ذلك اذهبوا إلى عيسى كلمة اللهِ ورُوحهِ فيقولُ عيسى(ﷺ) لستُ بِصاحِبِ ذلك فيأتونَ محمداً(ﷺ) فَيقومُ فيُؤذَنُ لَهُ وتُرسَلُ الأمانةُ والرَّحِمُ فتقومان جنبتَي الصِّراطِ يميناً وشمالاً، فَيَمُرُّ أوَّلُكُم كالبَرقِ قال: قُلتُ: بأبي أنت وأُمِّي: أيُّ شيءٍ كمَرِّ البَرقِ؟ قال ألم تَروا إلى البرقِ كيفَ يَمُرُّ و يرجعُ في طرفَةِ عينٍ؟ ثُمَّ كمَرِّ الرِّيحِ ثُمَّ كَمَرِّ الطَّيرِ و شَدِّ الرِّجالِ تجري بِهم أعمالُهم ونبيّكم قائِمٌ على الصِّراط يقول: ربِّ سَلِّمْ سَلِّم، حتّى تعجزَ أعمالُ العبادِ حتى يجيءَ الرَّجُلُ فَلا يَستطيعُ السَّيرَ إلاّ زَحفاً قالَ و في حافتَي الصِّراط كلاليب معلَّقَةٌ مأمورةٌ بأخذِ مَن أُمِرتْ بِهِ فَمَخْدُشٌ ناجٍ و مَكدوسٌ في النار. والذي نفس أبي هريرة بيده إنَّ قَعرَ جهنم لسبعون خريفاً . رواه مسلم(١٩٥).

واته: خوا(تبارك وتعالى) خەڵكان كۆدەكاتەو، بڕوادارەكان رادەوەستن تابەهەشت لێیان نزیك دەبێتەوە، دەچنە لای ئادەم دەڵێن ئەی باوكی ئێمە داوا بكە دەرگای بەهەشت بكرێتەوە بۆمان، دەڵێ: ئەدی چی ئێوەی دەركرد لە بەهەشت هەر گوناهەكەی باوكتان ئادەم نەبوو، من خاوەنی ئەوە نیم، برۆنە لای ئیبراهیمی كورم كە دۆستی خودایە، جا ئیبراهیم دەڵێ من خاوەنی ئەوە نیمە، من دۆستی خوا بووم لە پشتەوە پشتەوە(واتە لە من زۆرنزیكتر هەیە) بڕۆنە لای موسا(ﷺ) كە خودا قسەی لەگەڵی دا كردووە بەقسە كردن، ئەوجا دەچنە لای موسا(ﷺ) دەڵێ: من خاوەنی ئەوە نیم، بڕۆنە لای عیسا بە ووشەی خوا(كُن) واتە ببە دورست بووە، وە گیان(روح)ێكی لەلایەن خواوە كراوەتە جەستەی، جا عیسا(ﷺ) دەڵێ من خاوەنی ئەوە نیم، جا دەچنە لای محمد(ﷺ) ئەویش هەڵدەستیو رێی پێ دەدرێ، سپاردە(أمانه)و صیلەی رەحم دەنێردرێن لەم لاو ئەولای پردی سیرات لەراست و لە چەپی رادەوەستن، جایەكەمەكانتان وەكو برووسك تێ دەپەڕن، گوتی گوتم بە باوك و دایكمەوە بە قوربانت بم رۆیشتنی وەكو بروسك چۆنە؟ فەرمووی: نەتان بینیوە كە بروسك بە چاو تروكاندنێ دێتو دەڕوا؟ لە پاشان وەكو رۆیشتنی با، لەپاشان وەكو رۆیشتنی باڵندە(بەسەر پردی سیرات دا تێپەردەبن) وە وەكو پیاوێك كە بە حوججەت رابكات، خێرایی و سستیان بەپێ ی كردەوەیانە. وەپێغەمبەری ئێوەش راوەستاوە لەسەر پردی سیرات هەر دەفەرمووێ: پەروەردگارم سەلامەتی بكە سەلامەتی بكە.

تا بەرە بەرە ئەوانە دێنە پێشەوە كە كردەوەكانیان لە بارەیاندا نییە كە بیان پەڕێنێتەوە، تاپیاوی وا دێت ناتوانێ بڕوا بە قونەخشكێ و لەسەر

چۆك نەبێت، لە هەردوو لای پردی سیرات قولاب هەڵواسراوە، فەرمانیان پیێ کراوە بە گرتنی هەر یەکێك کە ئەمری پیێ دەکریێ بیگریێ، جاهەندێك بەبریندراری قوتاری دەبیێ، وەهەندێکیش پاڵی پێوە دەندریێ(بۆ ناو دۆزەخ) ئەبو هورەیرە(رەزای خودای لیێ بێت) دەڵیێ: سوێندم بەوەی گیانی ئەبو هورەیرەی بە دەستە ژێری جەهەندم حەفتا ساڵە ریێ یە.

## درێژی ماوەی وەستان لە قیامەت:

١-عن عبدالله بن مسعود عن النبي(ﷺ) قال: إنَّ الرَّجُلَ لَيُلجمُهُ العرقُ يومَ القيامة فيقولُ: يا ربِّ أرِحْني ولَوْ إلى النار. **رواه الطبراني في الكبير بإسناد جيد.**

واتە: پیاوی وا هەیە لە رۆژی قیامەت دا ئارەقە لغاوی دەکات و تاگوێی دێت، دەڵیێ: ئەی پەروەردگارم ئیسراحەتم پیێ بدە(لەم ناخۆشیە رزگارم بکە) ئەگەر بۆ ناو ئاگریش بێت.

٢-عن عبدالله بن مسعود عن النبيِّ(ﷺ) قال: يَجمَعُ اللهُ الأوَّلين والآخرين لميقاتِ يومٍ معلومٍ قياماً أربعين سنةً شاخِصةً أبصارهم ينتظرون فصلَ القضاء....) **صحيح: رواه الطبراني في المعجم الكبير (٩٦٤٧).**

شاخصة أبصارهم: چاوەکانیان کراوەیە ناینوقێنن.

واتە: خودا پێشینان و پاشینان هەموویان کۆدەکاتەوە لە کاتێکی دیاری کراو لە رۆژی زانراوا بە وەستاوی ماوەی چل ساڵ چاوەکانیان زەقەو چاوەڕوانی مەحکەمە دەکەن.

## درێژی ماوەی قیامەت لەسەر ئیماندار:

١-عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ) يومُ القيامة على المؤمنين كقَدر ما بين الظهر والعصر. صحيح: انظر(صحيح الجامع:٨١٩٣).

واتە: (درێژی) ڕۆژی قیامەت لەسەر ئیمان داران وەکو ئەندازەی نێوانی نیوەڕۆ و عەسر وایە.

## هەندێ لەوانەی لە قیامەت لەژێر سێبەری خوا دان:

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: سَبعةٌ يُظِلُّهُم الله في ظلِّه يوم لا ظلَّ إلاّ ظلُّهُ: إمامٌ عادلٌ، وشابٌّ نَشأَ في عبادةِ الله عز وجلَّ، ورجلٌ قَلْبُهُ مُعلّقٌ بالمساجد، ورجلان تحابا في الله اجتمعا عليه وتَفرَّقا عليه، ورجُلٌ دعَتْهُ امْرأةٌ ذاتُ مَنْصبٍ وجمالٍ فقال: إنّي آخاف الله، ورجُلٌ تصَدَّقَ بصدقةٍ فأخفاها حتى لا تعلم شمالُهُ ما تُنْفِقُ يَمينُهُ[1]، ورجُلٌ ذكر الله خالياً ففاضَتْ عيناهُ. رواه البخاري(١٤٢٣) ومسلم(١٠٣١).

واتە: حەوت دەستە هەن خوا لە ڕۆژی قیامەت دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆی کە لەو ڕۆژەدا هیچ سێبەر نی یە تەنها سێبەری ئەو نەبێت:

-پێشەوایەکی دادپەروەر.

- وە گەنجێك لە عیبادەت و خوا پەرستیدا پێگەیشتبێ.

- وە پیاوێك دڵی بەسترابێتەوە بە مزگەوت.

- وە دوو پیاو لەبەر خوا یەکتریان خۆش ویستبی لەسەر ئەم

---

(1) ئەمە(کنایە)یە بۆ زۆر شاردنەوەیە.

خۆشەویستیە کۆبونەتەوە وە لەسەریشی جیا بوونەتەوە.

– وە پیاوێك ئافرەتێکی خاوەنی پلەو پایەو جوان بانگی بکات(بۆ زینا کردن لەگەڵی دا) جا ئەویش بڵێ: من لە خوا دەترسم.

– وە پیاوێك خێرێك بکات و بیشارێتەوە تاوەکو دەستی چەپی نەزانێ کە دەستی ڕاستی چی بەخشیووە.

– وە پیاوێك کە تەنیایەو کەس نایبینێ یادی خوا بکات و فرمێسك بە چاوی دا بێتە خوارەوە(لەترسی خوا).

٢- عن ابي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): منْ أنْظرَ مُعْسراً أو وَضَع لَهُ أظلَّهُ اللهُ يوم القيامة تحت ظلَّ عَرْشه يوم لا ظلَّ إلاّ ظلّهُ. صحيح رواه الترمذي(١٣٠٦)

١- مَنْ انْظَرَ مُعْسِراً: کەسێ مۆڵەتی قەرزدارێکی نەدارا بدات.

٢- وضع له: أي ترك له شيئا مما له عليه. واتە: هەندێ لەو قەرزەی کە لە سەریەتی دایبشکێنێ و لێی خۆش بێت.

**مانای فەرموودەکە:**

هەر کەسێك مۆڵەتی قەرزدارێکی نەدارا بدا، یا شتێك لە قەرزەکەی دابشکێنێ بۆی خودا لە ڕۆژی قیامەت دایدەنێ لە ژێر سێبەری عەرشی خۆیدا لەو ڕۆژەی کە هیچ سێبەرێك نی یە تەنها سێبەری ئەو نەبێت.

٣-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): إنَّ الله يَقولُ يومَ القيامةِ: أينَ المُتحابُّونَ بجلالي؟ اليوم أُظلُّهُم في ظلِّي يومَ لا ظلَّ إلاّ ظلِّي. رواه مسلم(٢٥٦٦).

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ: بێگومان خودا لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرمووێ: کوان ئەوانەی لە دونیادا لەبەر گەورەیی من یەکتریان خۆش ویستووە؟ ئەمرۆ دەیانخەمە ژێر سێبەری خۆم، کە ئەمرۆ ئەو ڕۆژەیە هیچ سێبەرێك نییە بێجگە لە سێبەری من نەبێت

## دۆزەخ ئێستا هەیە

١-عن ابن عمر(رضي الله عنه) قال: قال النبيّ(ﷺ) إذا مات الرَّجُلُ عُرِضَ عَليهِ مَقْعَدُهُ بالغداةِ والعشيِّ، إن كان من اهل الجنة، فالجنة، وإن كان مِن أهل النار، فالنار، قال: ثُمَّ يقال: هذا مَقعَدُك الذي تُبعَثُ إليهِ يَومَ القيامةِ. رواه البخاري(١٣٧٩) ومسلم(٢٨٦٦).

واتە: هەر کاتێك پیاو مرد شوێنی خۆی نیشان دەدرێ بە سبەینەو ئێوارە، ئەگەر لە خەڵکی بەهەشت بێت، ئەوە شوێنی خۆی لە بەهەشت نیشان دەدرێ، وە ئەگەر لە خەڵکی ئاگر بێت شوێنی لە ئاگر پێ نیشان دەدرێ، لەپاشان پێی دەوترێ ئەوە ئەو شوێنەتە کە زیندوو دەکرێیەوە بۆلای لە رۆژی قیامەت دا.

**سوود**:

١- (طحاوي) لە (العقيدة الطحاوية) دا دەڵێ: (والجنة والنار مخلوقتان لا تفنيان أبداً ولا تَبيدان وانَّ الله تعالى خلق الجنة والنار قبل الخلقِ)

واتە: بە هەشت و جەهەندەم دوو دورست کراون، هەرگیز تێك ناچن و لەناو ناچن، وەخوای بەرز بەهەشت و جەهەندەمی پێش خەڵکی دورست کردووە.

## گەورەیی جەهەندەم:

١-عن عبدالله ابن مسعود(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ يَومَئِذٍ لها سَبعونَ ألفَ زِمامٍ مَعَ كُلِّ زمامٍ سَبعونَ أَلفَ مَلَكٍ يَجُرُّونها. رواه مسلم(٢٨٤٢).

واته: له ڕۆژی قیامەت دۆزەخ دەهێندرێ حەفتا هەزار لغاوی هەیە، لەگەڵ هەر لغاوێکدا حەفتا هەزار مەلائیکەتی لەگەڵ دایە رایدەکێشن.

## قوڵی جەهەندەم:

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) قال: كنَّا مَعَ رسول الله(ﷺ) إذ سَمِعَ وَجبَةً فقالَ النبيُّ(ﷺ) تدرونَ ما هذا؟ قالَ: قلنا: الله ورسولُهُ أعلم، قال: هذا حَجَرٌ رُمِيَ بِهِ في النار مُنذُ سبعينَ خريفاً فهو يهوي في النار الان حتى انتهى الى قَعرِها. رواه مسلم(٢٨٤٤).

١-وجبة: له(مختار الصحاح)دا دەڵێ:(الوجبة) السَّقطة مَعَ الهدَّة. واته: شتێك بكەوێ و دەنگی لەگەڵ دا بێت.

٢- رمي: واته(قذف) یانی: فڕێ درا.

٣-خريفا:(خريف)واته: پایزکه له لێرەدا مەبەست پێ ساڵه.

٤- يهوي: واته(ينزل) یانی: دەچێته خوار.

٥- قعرها: واته: أسفلها، یانی: ژێرەوەی.

**مانای فەرموودەکە:**

ئەبو هوریرە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئێمه لەگەڵ پێغەمبەردا بووین(ﷺ) دەنگی شتێکی کەوتووی گوێ لێ بوو جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەزانن ئەوە چ بوو؟ گوتمان: خواو پێغەمبەری خوا دەزانن،

**فەرمووی: ئەوە بەردێك بوو حەفتا ساڵە فڕێ دراوەتە ناو جەهەندەم لەو کاتەوە هەر لە ناو دۆزەخا دەچێتە خوارەوە تا ئێستا گەیشتە بنی دۆزەخ.**

## گەرمی ئاگری دۆزەخ:

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: نارُكم هذه التي يُوقدُ ابن آدَمَ، جزءٌ مِنْ سَبعينَ جُزءاً من حَرِّ جَهَنَّمَ، قالوا: والله إن كانت لكافيةً يا رسول الله قال: فَإنَّها فُضِّلَتْ عليها بِتسعةٍ وستِّينَ جزءاً، كُلُّهُنَّ مثلُ حَرِّها. **رواه مسلم(٢٨٤٣).**

**واتە: ئەو ئاگرەی ئێوە کە ئادەمیزاد دەیکاتەوە یەك بەش لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ گەرمە ئەصحابەکان گوتیان: بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر ئاگری دۆزەخ بە ئەندازەی ئەو ئاگرەی ئێمە گەرم بێ هەر بەسە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەسا ئاگری جەهەندەم شەستو نۆ بەشی بۆ زیاد کراوە بەسەر ئاگری دونیا هەر بەشەك لەو شەست و نۆ بەشە گەرمایی یەکەی وەکو گەرمایی ئاگری دونیایە.**

## ئەو دۆزەخیەی لە هەمووان عەزابی سوکترە:

١-عن النعمان بن بشير(رضي الله عنه) قال: سمعتُ رسول الله(ﷺ) يقول: إنَّ أهونَ أهل النار عذاباً يوم القيامة لَرَجُلٌ توضَعُ في أخمصِ[1] قدَميه جمرَتان يغلي منهما دِماغُهُ. **رواه**

---

(1) **اخمص: هو المتجافی من الرجل عن الارض. یانی: ئەوەی لە بنی پێ جیابۆتەوە لە زەوی دەکەوێتە نێوان قومپانی و پێشەوەی پێ.**

البخاري(٦٥٦١) ومسلم(٢١٣).

١-جمرتان: جووت(مثنى)يه، تاكهكهى(جمرة)يه، يانى: پشكۆ.

واته: بێگومان له ڕۆژى قيامهت ئهوهى له خهڵكى ئاگر كه له ههموويان عهزابى سووكتره پياوێكه دوو پشكۆ ئاگر له ژێر پێيهكانى دادهنرێ، ئيتر مێشكى بههۆى ئهو دوو پشكۆ ئاگرهوه دهكوڵێ.

## لهشى كافر زۆر گهوره دهبێت له دۆزهخ دا:

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيِّ(ﷺ) قال: إن غِلظَ جِلدِ الكافرِ اثنانِ وأربعون ذراعاً وإنَّ ضِرسَهُ مِثلُ أُحُدٍ، وإنَّ مجلسَهُ مِن جهنم كما بين مكة والمدينة. صحيح: رواه الترمذي(٢٥٧٧).

١-(الضرس) واته: السن يانى: ددان.

٢-ذراع: باسك.

٣- نێوانى مهككهو مهدينه(٤٠٠) كيلۆمهتر زياتره.

واته: ئهستورى پێستى كافر چل و دوو(٤٢) باسكه، وه ددانى وهكو چياى ئوحوده وه شوێنى دانيشتنى له جهههندهم وهكو نێوانى مهككه و مهدينهيه.

٢-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) عن النبيّ(ﷺ) قال: ما بينَ مَنْكِبي الكافرِ مَسيرةُ ثلاثةِ أيّامٍ للرّاكبِ المُسرِعِ. رواه البخاري(٦٥٥١) ومسلم(٢٨٥٢).

واته: نێوانى دوو شانى كافر(له جهههندهم) سێ ڕۆژه ڕێگهيه بۆ سوارى خێرا.

## دۆزەخیەکان لە ئاگردا وەك یەك نین:

١-عن سمرة بن جندب(رضي الله عنه) أنَّ النبيّ(ﷺ) قال: مِنهُم مَنْ تأْخُذُهُ النّارُ إلى كَعْبيهِ ومنهم مَن تأخُذُهُ النّارُ إلى رُكبَتَيهِ ومنهُم مَن تأخُذُهُ النارُ إلى حُجزَتهِ ومنهُم مَنْ تأخُذُهُ النّار إلى تَرقُوَتهِ. رواه مسلم(٢٨٤٥).

١-حجزته: هي مقعد الإزرار والسراويل (ناوقەد).

٢- ترقوته: هي اعلى عظام الصدر (بەرزترین ئێسكی سینك).

واتە: جەهەندەمی وا هەیە ئاگر هەتا گۆزینگەکای دیٚ وە ئیوا هەیە ئاگر هەتا چۆکەکانی دیٚ وە ئیوا هەیە ئاگر هەتا ناوکی دیٚ وە ئیوا هەیە ئاگر هەتا ملی دیٚت.

## دۆزەخ دەورە دراوە
## بەوەی نەفس حەزی لیٚ دەکات لە خراپە:

١-عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: حُجِبَتِ النّار بالشَّهوات، وحُجِبَتِ الجَنَّةُ بالمكارِهِ. رواه البخاري(٦٤٧٨) ومسلم(٢٨٢٢).

واتە: دۆزەخ دەورە دراوە بەوەی کە نەفس حەزی لیٚ دەکات لە خراپە وەك(زینا کردن، نەزرکردن، غەیبەت کردن) وەبەهەشت دەورە دراوە بەناخۆشی وەك(نوێژکردن، رۆژووگرتن).

**سوود**:

خوا دەفەرمووێ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلۡجَحِيمَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلۡجَنَّةَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ﴾ (النازعات:٣٧-٤١).

واتە: ئنجا ئەو کەسەی یاخی بوو بێ(٣٧) وە ژیانی جیهانی هەڵبژاردبێ(٣٨) بێ گومان دۆزەخ جێگایەتی(٣٩) وە ئەو کەسەی کە ترسابێ لە گەورەیی پەروەردگاری و جڵەو گیریی نەفسی خۆی کردبێ لە ئارەزووی خراپە(٤٠) بێگومان بەهەشت جێگایەتی(٤١).

## سەختی دۆزەخ و خۆشی بەهەشت:

١-عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) يُؤْتى[1] بأَنْعَمِ أهلِ الدُّنيا مِن أهل النار، يوم القيامة فَيُصبَغُ[2] في النار صَبغَةً[3] ثُمَّ يُقالُ: يا ابن آدم هل رأيتَ خيراً قطُّ؟ هَل مَرَّ بِكَ نعيم قطُّ؟ فيقول لا والله يا ربِّ ويؤتى بأشَدِّ الناسِ بُؤساً[4] في الدنيا مِن أهل الجَنَّةِ فَيُصبَغُ صَبغَةً في الجنة فيقال لَهُ: يا ابن آدم

---

(1) يُؤتى: دەهێنرێ

(2) يصبغ: واتە: يغمد، یانی نوقم دەکرێ.

(3) صبغة: واتە: غمسة، یانی یەك جار نوقم دەکرێ.

(4) بؤسا: البؤس هو الشدة، یانی: تەنگانە.

هل رأيت بؤساً قطُّ؟ هل مَرَّ بك شدَّةٌ قطُّ؟ فيقول لا والله يا ربِّ ما مَرَّ بي بؤسٌ قطُّ ولا رأيتُ شِدَّةً قطُّ. رواه مسلم(٢٨٠٧).

واته: له رۆژی قیامەت کیّ له دونیا له هەموو خەڵکی زیاتر له ناو نازو نیعمەت دا بووه لەوانەی که دۆزەخین دەهیّنریّ یەك جار له ناو ئاگر نوقم دەکریّ له پاشان پیّ ی دەوتریّ ئەی ئادەمیزاد ئایا قەت خۆشیەکت بینیوه ئایا قەت نیعمەتیّکت هاتۆتەری؟ دەڵیّ: نا(والله) ئەی پەروەردگارم وه کیّش له دونیادا زۆر له تەنگانەو ناخۆشی دا بووه له خەڵکی بەهەشت دەیهیّنن یەك جار دەبردریّته ناو بەهەشت جا پیّی دەوتریّ ئەی ئادەمیزاد ئایا قەت ناخۆشیت دیوه؟ هیچ سەختی و تەنگانەیەکت هاتۆته ری؟ دەڵیّ: نا بەخوا ئەی پەروەردگارم نه ناخۆشیم تووش بووەو نه تەنگانەم دیوه.

## زۆربەی خەڵکی دۆزەخ ئافرەتن:

١- عن ابن عباس وعمران بن حصين عن النبيِّ(ﷺ) قال: إطّلعت في الجنّةِ فرأيت أكثر أهلها الفقراء واطّلعتُ في النار فرأيتُ أكثر أهلها النساء. رواه البخاري(٦٤٤٩) ومسلم(٢٧٣٧).

واته: سەرنجی ناو بەهەشتم دا زۆربەی خەڵکەکەی له هەژارەکان بوون وه سەرنجی ناو دۆزەخیشم دا زۆربەی خەڵکەکەی له ژنان بوون.

**سوود:**

ئەم بابەته له باسی ئافرەت به دریّژتر باس کراوه.

## دۆزەخیەكان نامرن:

عن عبدالله بن عمر أنّ رسول الله(ﷺ) قال: إذا صار أهلُ الجنة الى الجنة وصار أهل النار إلى النار أُتِيَ بالموت حتى يُجعلَ بين الجنة والنار ثُمَّ يُذبَحُ ثُمَّ يُنادى منادٍ يا أهل الجنة لا موتَ و يا اهل النار لا موت، فيزداد أهلُ الجنة فرحاً الى فرحهم ويزداد أهلُ النار حُزناً إلى حُزنهم. رواه مسلم(٢٨٥٠).

واته: كاتێك كە خەڵكی بەهەشت چونە بەهەشت وە خەڵكی ئاگر چوونە ئاگر مردن دەهێنن تاوەكو لە نێوانی بەهەشت و دۆزەخی دادەنێن لە پاشان مردن سەر دەبردرێ لە پاشان بانگ دەرێك بانگ دەكات ئەی خەڵكی بەهەشت مردن نییە( بۆ هەتا هەتایێ تیایدا دەمێننەوە) وە ئەی خەڵكی ئاگر مردن نییە(بۆ هەتا هەتایی نامرن لە دۆزەخ دا) ئینجا خەڵكی بەهەشت دڵخوش تر دەبن وە خەڵكی ئاگریش غەمبارتر دەبن.

## باسی بەهەشت:

### بەهەشت لەچی دورست کراوە:

١-عن ابي هريرة، قلنا: الجنة ما بناؤُها؟ قال(ﷺ): لَبِنَةٌ مِن فِضةٍ ولَبِنةٌ مِنْ ذهب، ومِلاطها المِسكُ الأذفَرُ، وحَصباؤُها اللُّؤْلؤُ والياقوت وتُربَتُها الزَّعفرانُ مَن دخَلها يَنعمُ ولا يبأسُ ويُخَلّدُ ولا يموتُ ولا تَبلى ثيابُهم ولا يَفنى شبابُهم. **صحيح: رواه الترمذي(٢٥٢٦).**

١-لبنة: خشت.

٢- ملاط: ئەو قورەیە یا بلّێن ئەو چیمەنتۆیەیە کە دیواری پیّ دەکریّ.

٣- لا تبلى: نارزیّ، کۆن نابێت.

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵیّ(بە پێغەمبەرمان گوت(ﷺ) بەهەشت لە چی دورست کراوە؟ فەرمووە: خشتێکی زیوەو خشتێکی زێرە، وە قوڕی (نێوانی خشتەکان) میسکە، وە زیخەکەی مرواری و یاقوتە، وە خاکەکەی زەعفەرانە، هەر کەسێك بچێتە ناوی لە نازو نیعمەت دا دەژیت و تووشی عەزاب نابێت وە بۆ هەتا هەتایە دەمێنێت و نامرێت، جلەکانیان کۆن و رزی نابن، وە گەنجێتیشیان لەناو ناچیّ(و هەر دەمێنیّ).

### رەشمالێکی مرواری بۆ ئیماندار:

١-عن أبي بكر بن عبدالله بن قيس عن ابيه عن النبي(ﷺ) قال: إنَّ لِلمؤمن في الجنة لَخَيمةً مِن لُؤْلؤَةٍ واحدةٍ مُجَوَّفَةٍ طولها

سِتّون ميلاً، لِلمؤمن فيها أهلونَ، يطوفُ عليهمُ المؤمن فلا يَرى بعضُهم بَعضاً. رواه البخاري(٤٨٧٩) ومسلم(٢٨٣٨).

١-مجوف: ناو بۆش.

٢- ميلاً: ئيمام(نووى) دەڵێ: الميل:(ستة الاف ذراع).

واته: بێگومان بۆ بڕوادار هەیە لە بەهەشت رەشماڵێك لە یەك دەنكە مرواری ناو بۆش، درێژیەكەی(٦٠) میلە، بۆ بڕوادار هەیە لەو رەشماڵە كۆمەڵێ خێزان، بڕوادار بەسەریان دا دەسورێتەوە كەسیان كەسی تر نابینن.

## بەهەشت هەشت دەرگای هەن:

خوا دەفەرموێ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ﴾ (الزمر:٧٣).

واته: وە كەسانێ كە لە پەروەردگاریان دەترسان دەبرێن بۆ بەهەشت پۆل پۆل تا كاتێ دێنە(نزیكی) بەهەشت و دەرگاكانی دەكرێنەوە، وە دەرگاوانەكانی بەوان دەڵێن سەلامتان لێ بێت ئێوە پاك و خاوێن بوون( لە تاوان لە دونیادا) كەواتە بڕۆنە ناو بەهەشت بە هەمیشەیی و بۆ هەتا هەتایە.

١-عن سهل بن سعد عن النبي(ﷺ) قال: فِي الجنة ثمانيةُ أبواب فيها بابٌ يُسمّى الرّيان لايَدخلُه إلاّ الصائمون. رواه البخاري (٣٢٥٧).

واتە: لەبەھەشتدا ھەشت دەرگا ھەیە، دەرگایەکی تێدایە ناوی رەییانە(واتە تێراو) بێجگە لە رۆژوو گران کەسی دیکە لیّ ی ناچێتە ژوورەوە.

٢- عن ابي هريرة أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: مَن أَنفَقَ زوجين في سبيل الله نودي مِن أبواب الجنّة: يا عبدالله هذا خيرٌ، فمَن كانَ من أهل الصلاةِ دُعِيَ مِن باب الصلاةِ، ومَن كانَ مِن أهل الجهاد دُعِيَ مِن باب الجهادِ، ومَن كان مِن أهل الصيام دُعي مِن باب الرَّيّان ومَن كان مِن أهل الصّدقةِ دُعِيَ مِن باب الصّدقة، فقال أبوبكر: بأبي أنت وأُمي يا رسول الله ما على مَن دُعِيَ مِن تلك الأبواب من ضرورة، فهل يُدعى أحدٌ من تِلكَ الأبوابِ كُلِّها؟ قال: نعم، وأرجو أن تكون منهم. رواه البخاري(١٨٩٧) ومسلم(١٠٢٧).

واتە: ھەر کەسێك جوتێك دوو شت ببەخشێت لە ڕێی خوادا(وەك دوو مەر، دوو بزن، یا مەڕێك و بزنێك، دوو مریشك، دوو فەردە شەكر، دوو فەردە برنج، دوو تەنەكە رۆن، ...) لە ھەموو دەرگاکانی بەھەشتەوە بانگ دەکریّ، (دەرگاوانی بەھەشت بانگی دەکەن دەڵێن) ئەی بەندەی خوا ئەم دەرگایە باشە(وەرە لێرە بچۆ ژوورەوە) جا ئەوەی خاوەنی نوێژە لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەکریّ، وە ئەوەی لە ئەھلی جیھاد بێت لە دەرگای جیھادەوە بانگ دەکرێت وە ئەوەی لە ئەھلی رۆژوو بێت لە دەرگای رەییانەوە بانگ دەکریّ، وە ئەوەی لە ئەھلی خێرو سەدەقە بێت لە دەرگای خێرو سەدەقەوە بانگ دەکرێت، ئەبوبکر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەس ھەیە لە ھەموو دەرگاکانەوە بانگی لێبکرێت؟ فەرمووی: بەڵیّ ئومێد دەکەم تۆ یەکێك بیت لەوان.

**سوود**:

**من انفق زوجين: اي: شيئين من كل شيء ويطلق الزوج على الصنف والنوع وعلى كل مقترنين و نقيضين و شبيهين.**

## له بهههشت دا سهت پله ههیه:

١-عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ) في الجنَّةِ مِئَةُ درجة ما بينَ كُلِّ درجتين مئةُ عام. **صحيح: رواه الترمذي(٢٥٢٩).**

**واته: له بهههشت دا سهت پله ههیه، نێوانی ههردوو پلهیهك سهت ساڵه.**

## فیردهوس بهرزترین شوێنه له بهههشت:

١-عن عبادة بن صامت أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: في الجنّة مئَةُ دَرَجة ما بين كُلِّ درَجَتَين كما بينَ السماء والأرض والفردوسُ أعلاها درجةً ومنها تَفجرُ أنهارُ الجنّةِ الأربعة ومن فوقها يكونُ العرشُ فإذا سألتم الله فَسلُوهُ الفردوس. **صحيح: رواه الترمذي(٢٥٣١).**

**واته: له بهههشت دا سهت پله ههیه، نێوانی ههر پلهیهك بۆ پلهیهكی تر وهكو نێوانی زهوی و ئاسمانه، وه فیردهوس بهرزترین پلهیهتی وه ههر لهوێش چوار رووبارهكهی بهههشت ههڵدهقوڵێن وه له سهرووی فیردهوس عهرشی خوایه جا ئهگهر داواتان له خوا كرد داوای فیردهوسی لیٚ بكهن.**

٢- عن العرباض بن سارية قال: قال رسول الله(ﷺ): إن سألتمُ

الله فسلُوهُ الفردوسَ فإنَّهُ أعلى الجنَّةِ. قال الهيثمي في مجمع الزوائد(١٠/١٨٦٤٩) رواه البزار و رجاله ثقات.

واته: ئەگەر داواتان لە خوا کرد داوای فیردەوسی لێ بکەن چونکە بێگومان فیردەوس بەرزترینی بەهەشتە.

## ئەوانەی دەچنە فیردەوس داوا ناکەن بچنە شوێنێکی تر.

خوا دەفەرموێ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ كَانَتۡ لَهُمۡ جَنَّـٰتُ ٱلۡفِرۡدَوۡسِ نُزُلاً ﴿١٠٧﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبۡغُونَ عَنۡهَا حِوَلاً﴾ (الكهف:١٠٧-١٠٨).

واته: بەڕاستی ئەوانە کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە وە کردەوە چاکەکانیان کردووە بەهەشتەکانی فیردەوس جێگای(میوانداری) ئەوانە(١٠٧) بە بەردەوامی تیایدا دەمێننەوە داوای گواستنەوە ناکەن لەو (بەهەشتە) دا (١٠٨).

## بەهەشت ئەوەی دڵ حەزی لێ بکات تیایەتی:

خوا دەفەرموێ﴿يُطَافُ عَلَيۡهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكۡوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُ وَأَنتُمۡ فِيهَا خَـٰلِدُونَ﴾ (الزخرف:٧١).

واته: بەسینی و پەرداغی ئاڵتونی(خواردن و خواردنەوە) دەگێڕن بەسەریاندا، وە لەو بەهەشتەدا هەیە ئەوەی دڵ حەزی لێ بکات وە چاو خۆشی و لەزەتی پێ بکات بە بینینی وە ئێوە بە هەتا هەتایی دەمێننەوە تیایدا.

١-عن أبي أَيُّوبَ قال: أتى اعرابيّ النبيّ(ﷺ) فقال: إنّي أحبُّ الخيلَ و هل في الجنة خيل؟ فقال: اذا دخلتَ الجنةَ أُتيتَ بفرس من ياقوتٍ لَهُ جناحان فَحُمِلْتَ عليه فطار بك في الجنةِ حيثُ شئتَ. صحيح: انظر(السلسة الصحيحة:٣٠٠١).

واتە: کابرایەکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) گوتی: من ئەسپم خۆش دەوێت ئایا بەهەشت ئەسپی تیایە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر چویە بەهەشت ئەسپێکت پێ دەدرێ لە یاقووت دوو باڵی هەیە، سواری ئەم ئەسپە دەکرێی جا دەتفرێنێ لە ناو بەهەشت بۆ هەر کوێیەك ئارەزوو بکەیت.

## بەهەشتیەکان(٣٣) ساڵن:

١-عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ) يَدخُلُ أهلُ الجنّةِ الجنةَ جُرداً مُرداً بِيضاً جُحداً مُكحَّلينَ أبناء ثلاثٍ وثلاثين وهم على خلقِ آدم(ﷺ) ستّونَ ذراعاً في سبعةِ أذرُعٍ. رواه الطبراني وأحمد وصححه أحمد شاكر.

١-جردا: لاشەیان بێ مووە.

٢- مردا: دەم و چاویان بێ مووە، بێ ریشن.

٣- جعد: قژ لوول.

واتە: خەڵکی بەهەشت دەچنە بەهەشت لەشیان مووی پێوە نییە بێ ریشن، سپینە، پرچیان لوولە چاو جوان و کل رێژن، تەمەنیان(٣٣)ساڵە، لەسەر شێوەی ئادەمن(ﷺ) شێست باسك درێژ بە پانی حەوت باسك.

**سوود**:

بەهەشتیەکان ژن و پیاویان تەمنیان(٣٣) ساڵە.

## خەڵکی بەهەشت بێ موو و بێ ردێنن:

١-عن أبي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ) أهلُ الجنةِ جُردٌ مُرد كُحْلٌ لا يَفنى شبابهم ولا تَبلى ثيابهم. **حسن: رواه الترمذي(٢٥٣٩).**

واتە: خەڵکی بەهەشت لەشیان بێ موومو ریشیان نی یە چاو بەکلن گەنجێتیان لە ناو ناچێ‌و پۆشاکیان رزی و کۆن نابێت.

## خەوتن نی یە لە بەهەشت:

١-عن جابر قال: سُئل نبي الله(ﷺ) أينامُ أهلُ الجنةِ؟ فقال(ﷺ): النومُ أخو الموتِ وأهلُ الجنة لا ينامون. **صحيح: رواه الطبراني انظر(الصحيحة:١٠٨٧).**

واتە: پرسیار لە پێغەمبەر کرا(ﷺ) کە ئایا خەڵکی بەهەشت دەخەون؟ فەرمووی: نوستن برای مردنە وە خەڵکی بەهەشت ناخەون.

## مردن نی یه له بەهەشت:

١- عن ابن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ) إذا صار اهل الجنة إلى الجنةِ وأهلُ النّار إلى النّار، جيءَ بالموت حتى يجعلَ بين الجنة والنّار ثُمَّ يُذبَحُ ثُمَّ يُنادي منادٍ: يا أهلَ الجنةِ لا موت يا أهل النار لا موتَ، فيزدادُ أهلَ الجنةِ فرحاً إلى فَرحهم و يزدادُ أهل النار حُزناً إلى حُزنهم. رواه البخاري(٦٥٤٨).

كاتێك كە بەهەشتیەكان چوونە بەهەشت و دۆزەخییەكان چوونە دۆزەخ، مردن دەهێنرێت هەتا دەخرێتە نێوانی بەهەشت و دۆزەخەوە لە پاشان سەر دەبردرێت، لە پاشان بانگ دەرێك بانگ دەكات: ئەی خەڵكی بەهەشت مردن نەما ئەی خەڵكی ئاگر مردن نەما جا بەهەشتییەكان خۆشیان لەسەر خۆشییەكانیانەوە زیاتر دەبێت ودۆزەخییەكانیش خەمیان لەسەر خەمیانەوە زیاتر دەبێت.

## سوود:

١-خوا دەفەرموێ﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ﴾ (الدخان:٥٦).

واتە: بێجگە لە مردنی یەكەم(كە لە دونیا چەشتویانە) ئیتر مردنی تیادا نا چەژن(واتە لە بەهەشت).

وا خوا دەفەرموێ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ

﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ خَيۡرُ ٱلۡبَرِيَّةِ ٧ جَزَآؤُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ ٨﴾ (البينة:٧-٨).

**واته:بێگومان ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردوە هەر ئەوانەن چاکتری هەموو دورست کراوەکانی خوا(٧) پاداشتی ئەوان لای پەروەردگاریان چەند بەهەشتێکە کە شوێنی نیشتەجیٚ و مانەوەن جۆگەی ئاوی زۆر بە ژێریانا دەڕوات ئەمێننەوە لەو بەهەشتانەدا بە ئێجگاری هەتایە بیٚ دوا هاتن و بڕانەوە خوا لەوان ڕازی ئەبیٚ و ئەوانیش لە خوای خۆیان ڕازی ئەبن ئەو پاداش و بەهرەیە بۆ کەسێکە کە لە جیهانا ترسا بیٚ لە پەروەردگاری خۆی.**

## بینینی خودا لە بەهەشت:

**خوا دەفەرمویٚ**﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ ٢٢ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ ٢٣﴾ **(القیامە:٢٢-٢٣).**

**واتە: زۆر ڕووخسار لەو ڕۆژەدا گەشاوەن(٢٢) تەماشای پەروەردگاریان دەکەن(٢٣).**

**وە خوا دەفەرمویٚ**﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ وَلَا يَرۡهَقُ وُجُوهَهُمۡ قَتَرٞ وَلَا ذِلَّةٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ **(یونس:٢٦).**

واتە: بۆ ئەوانەی چاکەیان کردوە پاداشتی چاکتر(بەهەشت)و زیاتریان هەیە( کە بینینی خوایە) دەم و چاویان دا ناگریّ(لیّ ی نانیشیّ) هیچ رەشی و تەپ و تۆزو ریسواییەك ئەوانە هاوڕیّ ی بەهەشتن ئەوانە لەو(بەهەشتە) دان بە هەمیشەیی.

١-عن صهيب عن النبيِّ(ﷺ) قال: إذا دَخَلَ أهلُ الجَنةِ الجَنَّةَ يقول الله تبارك وتعالى: تريدون شيئاً أزيدكُم؟ فيقولون: ألَم تُبَيِّضْ وُجُوهَنا؟ ألَم تُدْخِلْنا الجَنَّةَ وتَنجِّنا مِنَ النار؟ فَيَكشِفُ الحجابَ فَما أُعطوا شيئاً أحَبَّ اليهم مِنَ النَّظَرِ الى رَبِّهم عَزَّ وجلّ. رواه مسلم(١٨١).

واتە: کاتێك کە بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشت خودا(تبارك وتعالى) پێیان دەفەرمویّ: شتێکی ترتان دەویّ هەتا بۆتانی زیاتر بکەم؟ جا ئەوانیش دەڵێن ئایا رووت سپی نەکردین؟ ئایا نەت خستینە بەهەشت؟ وە لە ئاگر رزگارت نەکردووین. جا خودا پەردە لادەبات بەهەشتیەکان هیچ شتێکیان پیّ نەدراوە خۆشەویستر بێت لایان لە تەماشا کردن بۆ پەروەردگاریان(عز وجل).

## بەئومێدی شادبوون بەبینینی خوا ئەمە بکە

عن جرير بن عبدالله قال: كُنّا جُلُوساً عند رسول الله(ﷺ) إذ نَظَر الى القمر ليلةَ البَدرِ فقال: أمَا إنّكم سَتَرون ربَّكُم كما ترونَ هذا القمر لا تُضامُّون في رُؤْيَتهِ فإن استطعتم أن لا تُغلَبُوا على صلاةٍ قَبلَ طلوعِ الشَّمس و قبلَ غُروبها، ثم قرأ جرير﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ

﴿رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ غُرُوبِهَاۖ﴾ رواه البخاري(٥٥٤) ومسلم(٦٣٣).

واته: جەریری کوڕی عبدالله(ڕەزای خوای لیٚ بیٚت) دەڵیٚ: ئیٚمە لە لای پیٚغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین تەماشای مانگی چواردەی کرد فەرمووی: چۆن ئیٚستا ئەو مانگی چواردەیە دەبینن بیٚ گومان ئەوها پەروەردگارتان دەبینن لە بینینیدا توشی هیچ زەحمەتیٚ نابن(دەی بە ئومیٚدی شاد بوون بە بینینی پەروەردگارتان) تا دەتوانن ئاگاداری نویٚژی بەیانی و عەسر بن و مەیان فەوتیٚنن، ئینجا جەریر ئەم ئایەتەی خویٚندەوە﴿وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ غُرُوبِهَاۖ﴾.

## لە بەهەشت شتی وا هەیە بە خەیاڵی بەشەردا نەهاتووە:

١-عن ابي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ) قال الله: أعددتُ لعبادي الصالحينَ ما لا عينٌ رأتْ ولا أُذنٌ سمِعتْ ولا خطرَ على قلبِ بشَر. فاقرؤوا إنْ شئتم﴿فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ﴾ (السجدة:١٧). رواه البخاري(٣٢٤٤) ومسلم.

واته: پیٚغەمبەر(ﷺ) دەفەرمویٚ: خودا فەرموویەتی: دام ناوە بۆ بەندە چاکەکانم نە چاو بینیویەتی وە نە گویٚ گویٚ ی لیٚ بووە وە بە دڵی هیچ

ئادەمیزادێکیش دا نەهاتووە، جا بخوێننەوە ئەگەر حەز دەکەن﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾ (السجده:١٧).

**واتە: جا هیچ کەس نازانێ ئەوەی بۆیان شاردراوەتەوە لەوەی چاو پێ ی خۆش دەبێت.**

## جیاوازی شوێنی بەهەشتیەکان:

١-عن ابي سعيد الخدري عن النبي(ﷺ) قال: إنَّ أهل الجنة يَتراؤون الكواكب الدَّريَّ الغابِر في الأُفق مِن المشرق أو المغرب لتفاضُل ما بينهم. قالوا: يا رسول الله تلك منازلُ الأنبياء لا يبلغُها غيرهم؟ قال: بلى والذي نفسي بيده رجالٌ آمنوا بالله وصدَّقوا المرسلين. **رواه البخاري(٣٢٥٦) ومسلم(٢٨٣١).**

**واتە: بێگومان خەڵکی بەهەشت خەڵکی ناو باڵەخانەکان دەبینن لە سەروویانەوە هەروەکو چۆن ئێوە ئەو ئەستێرە زۆر گەشانە دەبینن کە دوور کەوتونەتەوە لە کەناری ئاسمان نزیك بونەتەوە لە رۆژهەڵاتەوە یا لە رۆژ ئاواوە خەریکن ئاوا دەبن، ئەم بەرزی و نزمیەش لەبەر جیاوازی پلەو پایەی نێوانیانە.**

**گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە شوێنی پێغەمبەرەکانن بێجگە لەوان کەسی تری ناگاتێ؟ فەرمووی: وا نییە سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەوانە پیاوانێکن باوەڕیان هێناوە بە خواو نێردراوەکانی خواشیان بە راست زانیوە.**

## لەبەهەشتدا منداڵی ئیماندار بە باوك و دایكی ئیمانداری دەگات:

خوا دەفەرموێ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖۚ كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ﴾ (الطور:٢١).

واتە: وە ئەوانەی بڕوایان هێناوە وە ڕۆڵەو نەوەكانیان شوێنیان كەوتوون لە ئیمان و باوەڕدا نەوەكانیان دەگەیەنین پێیان(لە بەهەشت دا) وە هیچ شتێ كەم ناكەینەوە لە كردەوە چاكەكانی باوك و دایكە ئیماندارەكان هەموو كەسێ بەستراوەو بەند كراوە بە كردەوەی خۆیەوە.

**سوود**:

١- (ابن عباس) دەڵێ: إنّ الله ليرفَعُ ذرية المُؤمن في دَرَجته وإنْ كانوا دونَه في العَمَل لِتَقَرَّبهم عينه) (ابن كثير).

واتە: خودا منداڵی ئیماندار بەرز دەكاتەوە بۆ پلەی ئەو هەر چەندە منداڵەكەش پلەی نزم تر بێت لە دایك و باوكەكە ئەمەش بۆ ئەوەیە كە چاویان پێیان گەش بێتەوە.

٢-(والله أعلم) كە ژن و مێرد بەیەك دەگەیێنرێن یا دایك و باوك و منداڵەكانیان ئەوە كامیان پلەی نزمتر بێت بەرز دەكرێتەوە بۆ لای پلە بەرزەكە.

## بەهەشتیەکان داخ لە یەك شت دەخۆن:

١-عن معاذ بن جبل قال: قال رسول الله(ﷺ) ليس يَتحسّرُ أهلُ الجَنّةِ على شيء، إلا على ساعةٍ مَرّت بهم لَم يَذكروا اللهَ عزّ وجَلّ فيها. رواه الطبراني والبيهقي، وحسنه السيوطي.

تحسُّر: ئاخ هەڵکێشان، داخ کێشان، داخ خواردن.

واتە: خەڵکی بەهەشت ئاخ ناکێشن لەسەر هیچ شتێك تەنها لەسەر کاتێك نەبێت کە بەسەریان دا ڕۆیشتووە(لە دونیادا) یادی خوای زاڵ و پایە بەرزیان تیادا نەکردووە.

**سوود:**

قال بعض السلف: يُعرَضُ على ابن ادم يومَ القيامَةِ ساعات عُمرهِ فَكُلّ ساعةٍ لَم يَذكرِ الله فيها تَتقَطّعُ نفسهُ عليها حسرات[1].

واتە: یەکێك لە پێشینەکان دەفەرموێ: لە ڕۆژی قیامەتدا ئادەمیزاد کاتەکانی تەمەنی نیشان دەدرێ جا هەر کاتێك لە تەمەنی بەسەر چووبێ یادی خوای تیادا نەکردبێ لە داخان نەفسی شەق شەق دەبێت.

(1) جامع العلوم الحکم.

## بەهەشتیەکان بە سێ جۆر بازن دەرازێنرێنەوە وە پۆشاکیشیان لە ئاوریشمە:

خوا دەفەرمێ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤۡلُؤٗاۖ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ﴾ (الحج:٢٣).

واتە: بەراستی خوا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە دەیانخاتە بەهەشتانێك کە رووباری زۆر بە ژێریاندا دەڕوات(ئەوان) دەرازێنرێنەوە لەو(بەهەشتانە)دا بە بازنی زێرو مرواری وە پۆشاکیان لە بەهەشتدا ئاوریشمە.

وە خوا دەفەرموێ﴿وَحُلُّوٓاْ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٖ﴾ (الإنسان:٢١).

واتە: وە رازێنراونەتەوە بە بازنی زیو.

## بازاڕی بەهەشت:

١-عن أنس بن مالك: أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: إنَّ في الجنَّة لَسُوقاً يأتونها كُلَّ جُمُعَةٍ فَتَهُبُّ ريحُ الشَّمالِ فَتحثُو في وُجُوهِهِم وثيابهم. فيزدادُونَ حُسناً وجمالاً فَيَرجِعونَ إلى أهليهم وقد ازدادوا حسناً وجمالاً. فيقولُ لَهُم أَهلوهم: واللهِ لقدِ ازدَدْتم بَعدَنا حسناً وجمالاً فيقولون: وأنتم والله لقد ازددتم بعدنا حسناً وجمالاً. رواه مسلم(٢٨٣٣).

واته: بێگومان بەهەشت بازارێكی لێیە هەموو هەینییەك (بەهەشتیەكان) دەچن بۆ ئەو بازارە ئەوجا بای باكوور هەڵ دەكات و دەدات بە دەم چاوو جل‌و بەرگیاندا جوانی و قەشەنگی یان زیاد دەكات ئەوجا دەگەڕێنەوە لای خێزانەكانیان ئەوانیش جوانی و قەشەنگییان زیادی كردووە، جا خێزانەكانیان پێیان دەڵێن: سوێند بە خوا لە دوای ئێمە جوانی و قەشەنگیتان زیادی كردووە جا ئەوانیش دەڵێن: وە ئێوەش سوێند بە خوا لە دوای ئێمە جوانی و قەشەنگیتان زیادی كردووە.

## ئاخیر كەس كە دەچێتە بەهەشت چی پێ دەدرێ:

١-عن عبدالله بن مسعود قال النبيّ(ﷺ) إني لَأَعلم آخِر أهل النار خُروجاً منها. وآخِر أهل الجنة دخولاً. رجل يَخرجُ منَ النار كبواً فيقول الله: اذهب فادْخُل الجنة فيأتيها فيُخيَّلُ إليه أنها ملأى فيرجعُ فيقول: يا ربَّ وجدتُها ملأى فيقول: اذهب فادخل الجنة فيأتها فَيُخَيَّلُ إليهِ أنّها مَلأى فيرجعُ فيقول: يا ربِّ وجدتُها ملأى، فيقول: اذهب فادْخلِ الجنّة فإنّ لك مثلَ الدنيا وعشرةَ أمثالها- أو إنَّ لك مثل عشرةِ أمثال الدنيا- فيقولُ تَسخَرُ مِنّي أو تَضحَكُ مني وأنت الملِك، فلقد رأيت رسول الله(ﷺ) ضحك حتى بَدتْ نواجذه، وكان يقالُ: ذلك أدنى أهلُ الجنة منزلة. **رواه البخاري(٦٥٧١) ومسلم(١٨٦).**

واتە: من زۆر بە باشی دەزانم كە دواهەمین كەس كە لە دۆزەخ دەردەچێ كێیە وەدواهەمین كەس كە دەچێتە بەهەشت كێیە، پیاوێكە لەسەر دەست و پێیان بە گاگۆڵكە لە دۆزەخ دێتە دەرەوە، جا خودا

دەفەرمویٚ: بڕۆ بچۆ ناو بەهەشتەوە جا ئەویش دەچیٚ بەرەو بەهەشت وا دەکەویٚتە پیٚش چاوی کە بەهەشت پڕە، جا دەگەڕیٚتەوە دەڵیٚ: ئەی پەروەردگارم بەهەشتم بینی پڕ بوو، جا خودا پیٚ ی دەفەرمویٚ: بڕۆ بچۆ بەهەشتەوە جا ئەویش دەچیٚ بۆ لای بەهەشت وا دەکەویٚتە بەر چاوی کە بەهەشت پڕە، دیسان دەگەڕیٚتەوە دەڵیٚ: ئەی پەروەردگارم بینیم پڕ بوو، جا خوا پیٚی دەفەرمووی: بڕۆ بچۆرە ناو بەهەشت بە قەد دنیاو دە ئەوەندەی تریش(لە بەهەشت) بۆ تۆ بیٚت یا دە ئەوەندەی دونیا بۆ تۆ بیٚت، پیاوەکە دەڵیٚ: گاڵتەم پیٚ دەکەی یا پیٚم پیٚ دەکەنی لە کاتیٚکدا کە تۆ پادشای، (ابن مسعود) دەڵیٚ: پیٚغەمبەرم بینی(ﷺ) پیٚکەنی تا ددانەکانی دوواوەی بەدەرکەوتن، وە گوتراوە: ئەوە نزمترین شویٚن و مەنزڵگای خەڵکی بەهەشتە.

**سوود**:

١-گیٚرەرەوەی ئەم فەرموودەیە لە دوو شویٚن گومانی هەیە نازانی پیٚغەمبەر کامیانی فەرمووە لە(فإن لكَ مثل الدنيا و عشرة أمثالها- او إنّ لكَ مثلَ عشرة امثال الدنيا) وە هەروەها لە(تسخر مني او تضحك مني).

٢- وە ئەوە(وكان يقال: ذلك ادنى اهل الجنة منزلاً) فەرموودە نی یە.

## ئەوانەی بیٚ حیساب و عەزاب دەچنە بەهەشت

١-عن ابن عباس عن النبيِّ(ﷺ) أنَّهُ قال: عُرِضَت عليَّ الأُمَمُ فرَأيتُ النَّبيَّ ومعَهُ الرُّهَيطُ والنَّبيَّ ومعهُ الرَّجُلَ والرَّجلان والنَّبيَّ ليس معهُ احَدٌ، إذ رُفِعَ لِي سَوادٌ عظيم فَظَنَنْتُ انَّهُم أُمَّتي فقيلَ لي:

هذا موسى وقَومُهُ، فنَظرتُ فإذا سوادٌ عظيم فقِيلَ لي: هذه أُمَّتُكَ ومَعَهُم سَبعون ألفاً يَدخلون الجنَّةَ بغيرِ حسابٍ ولا عذابٍ، ثُمَّ نَهَضَ فَدَخَلَ منزلَهُ فَخاضَ الناسُ في أولئك فقال بَعضهم فَلَعَلَّهم الذين صَحبوا رسول الله(ﷺ) وقال بَعضُهم فَلَعَلهم الذين وُلِدوا في الإِسلامِ فَلَم يُشرِكوا بالله شيئاً وذكروا أشياء. فَخرجَ عليهم رسول الله(ﷺ) فأخبروهُ فقال:(هم الذين لا يستَرقونَ ولا يكتوُونَ ولا يتطيرون وعلى رَبِّهِم يَتَوَكَّلون).

فقام عكاشة بن محصن فقال: أُدْعُ الله أن يَجعَلَني منهم فقالَ: أنت منهم، ثُمَّ قام رجلٌ آخَرُ فقال: أُدْعُ الله أن يَجعَلَني مِنهم فقال سَبَقَك بِها عكاشة. رواه مسلم(٢٢٠).

ماناى ووشه:

١-عرضت: نيشانم درا. له(جامع الفريد) دا دهڵێ: ئەم نيشان درانه له شەوى(اسراء ومعراج)دا بووه.

٢- الأمم: كۆى(امة)ه كه بريتى له ئۆممەتى پێغەمبەرەكان.

٣- الرهيط: گچكه كراوەى(رهط)ه كه له سێ تاوەكو نۆيه.

٤- لا يسترقون[1]: داوا ناكەن بەسەريان دا بخوێنن.

(الرُّقي) كۆى(رقية)يه. و(الرُّقية): القراءة على المريض، واته: خوێندن لەسەر نەخۆش.

---

(1) فعند شيخ الاسلام/ أن الرُّقية اذا فعلها الإنسان بنفسهِ او بغيره فإنها لاتنافي التوكل وانَّ الذي ينافي تمام التوكل هو طلب الرقية من الناس.... .

**ماناى فەرموودەكە:**

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئوممەتی پێغەمبەرەكانم نیشانددرا پێغەمبەرم بینی(رهیط)ێكی لەگەڵ دا بوو(رهط: لە سێ تاوەكو نۆیە) وە پێغەمبەرم بینی پیاوێك یا دوو پیاوی لەگەڵدا بوو وە پێغەمبەرم بینی كەسی لەگەڵدا نەبوو، رەشاییەكی گەورەم نیشان درا وا گومانم برد ئەوە ئوممەتەكەی منە پێم ووترا ئەوە موساو گەلەكەیەتی ئەوجا تەماشام كرد رەشاییەكی گەورەم بینی پێم ووترا ئەوە ئوممەتەكەتە وە حەفتا هەزار كەسیان لەگەڵ دایە بەبێ لێپرسیبنەوەو بێ عەزابدان دەچنە بەهەشت لە پاشان پێغەمبەر(ﷺ) هەستا چۆوەماڵەكەی خۆی، ئەوجا خەڵك دەربارەی ئەو حەفتا هەزارە دوان و موناقەشەیان كرد هێندێكیان دەیان گوت: لەوانەیە ئەو حەفتا هەزارە ئەوانەبن كە هاورێیەتی پێغەمبەریان كردووە وە هەندێكیان دەیان گوت: لەوانەیە ئەو حەفتا هەزارە ئەوانە بن كە لە ئیسلاما لە دایك بوونە هیچ شەریكیان بۆ خوا دانەناوە وە چەند شتێكیان باس كرد، جا پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو و چووە ناویان ئەصحابەكان هەواڵیان بە پێغەمبەر دا(ﷺ) كە چیان گوتووە لە نێوانی خۆیان دا جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوانە ئەوانەن: كە لە كەس داوا ناكەن بەسەریاندا بخوێنن وە داوا لە كەس ناكەن كە داخیان بكەن وە رەشبین نین بە باڵندەو شتی لەم جۆرە وە پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن.

عوكاشەی كوری محصن هەستا گوتی: دوعام بۆ بكە لە خوا كە لەوان بم پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی تۆ لەوانی، لە پاشان پیاوێكی تر هەستا گوتی: دوعام بۆ بكە لە خوا لەوانم بگێری پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: عوكاشە پێشت كەوت.

٢-عن أبي بكر قال: قال رسول الله(ﷺ): أُعطيت سبعينَ ألفاً مِن أُمتي يدخلونَ الجنةَ بغير حساب وجوههم كالقمر ليلة البدر قلوبهم على قلب رجلٍ واحد فاستزدتُ ربي عز وجلّ فزادني مع كُلِّ واحدٍ سبعين ألفاً. صحيح: رواه أحمد انظر(صحيح الجامع:١٠٥٧)

واتە: پێم بەخشرا حەفتا هەزار کەس لە ئوممەتەکەم دەچنە بەهەشت بەبێ حیساب روویان وەك مانگی شەوی چواردەیە دڵیان وەکو دڵی یەك پیاو وایە جا داوای زیاترم کرد لە پەروەردگارم(عز وجل) ئەویش لەگەڵ هەر یەکێکدا حەفتا هەزاری بۆ زیاد کردم.

## حۆری و هاوسەر لە بەهەشت دا:

خوا دەفەرموێ﴿إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ ﴿٥٥﴾ هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴿٥٨﴾﴾ (يس:٥٥-٥٨).

واتە: بەراستی بەهەشتیەکان ئەمرۆ لە خۆشیو شادیدا سەر قاڵن(٥٥) خۆیان و هاوسەرەکانیان لە سێبەرەکاندا لەسەر تەخت(ی رازاوە) پاڵیان داوەتەوە(٥٦) لەو(بەهەشتە)دا بۆیان ئامادەیە میوەهات و هەرچی داوا بکەن(٥٧) سەلام(یان لێ دەکرێ) بە ووتە لە لایەن پەروەردگاری میهرەبانەوە(٥٨).

وە خوا دەفەرموێ﴿وَعِندَهُمۡ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ عِينٞ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ

﴿بَيۡضٞ مَّكۡنُونٞ ۝٤٩﴾ (الصافات:٤٨-٤٩).

**واتە: وە ئافرەتانی چاو گەورەیان لایە کە جگە لە مێردەکانیان سەیری کەس ناکەن(٤٨) وەکو هێلکەی داپۆشراون(٤٩).**

**وە خوا دەفەرموێ**﴿وَحُورٌ عِينٞ ۝٢٢ كَأَمۡثَٰلِ ٱللُّؤۡلُوِ ٱلۡمَكۡنُونِ ۝٢٣﴾ (الواقعة:٢٢-٢٣).

**حور: جمع: حوراء، وهي الشديده بياض العين مع شدة سوادها.**

**واتە: حور، تاکە، کۆیەکەی(حوراء)ە ئەو ئافرەتەی سپیاتیەکەی چاوی زۆر سپییە وەرشاتیەکەشی زۆر رەشە. عین: تاکە، کۆیەکەی(عیناء)ە وهی واسعه العین. ئەو ئافرەتەیە کە چاوی گەورەیە.**

**واتە: وە حۆری چاوە رەش و چاو گەورە(٢٢) وەك مرواری ناو سەدەف وان.**

**وە خوا دەفەرموێ**﴿وَكَوَاعِبَ أَتۡرَابٗا﴾ (النبأ:٣٢).

**واتە: وەکچانی تازە مەمك کردووی هاو تەمەن (دەدرێ بەپارێزکاران)**

**وە خوا دەفەرموێ**﴿فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنّٞ ۝٥٦ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ۝٥٧ كَأَنَّهُنَّ ٱلۡيَاقُوتُ وَٱلۡمَرۡجَانُ ۝٥٨﴾ (الرحمن:٥٦-٥٨).

**واتە: لەو باخانەدا هەن حۆریانێك کە تەنها چاویان لە مێردی خۆیانە پێش ئەوان دەستی کەسیان لێ نەکەوتووە نە لە ئادەمیو نە لە**

جنۆكه(٥٦) جا بەكام نیعمەتانی پەروەردگارتان بێ بروان(٥٧) ئەو(حۆریانە) وەك یاقووت و مەرجان وان(٥٨).

وە خوا دەفەرموێ﴿فِيهِنَّ خَيْرَٰتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧١﴾ حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴿٧٢﴾﴾ (الرحمن:٧٠-٧٢)

واتە: تیایاندا هەیە ئافرەتانی ئاكار چاكی ڕواڵەت جوان(٧٠) جا بەكام نیعمەتانی پەروەردگارتان بێ بڕوان(٧١)(ئەو ئافرەتانە كە ڕەشێنەكەی چاویان زۆر ڕەشە وە سپێنەكەی چاویان زۆر سپییە ڕاگیركراون لەخێوەتەكان دا(لە خێوەتەكان نایەنەدەر(٧٢).

## هەموو بەهەشتیەك دوو خێزانی پێ دەدرێ:

١-عن أبي هريرة أنَّ رسول الله(ﷺ) قال: أَوَّلُ زُمرةٍ تَدخُلُ الجنَّة على صورة القمر ليلة البدر والذين على إثرهم كأَشدِّ كوكب إضاءةً، قلوبهم على قلب رجلٍ واحد لا اختلافَ بينهم ولا تباغض، لِكُلِّ امريءٍ منهم زوجتان كُلُّ واحدةٍ منهما يُرى مُخُّ ساقها من وراءِ لَحمها من الحسن يُسبِّحونَ الله بكرةً و عشيّاً لا يَسقمون ولا يمتخِطون ولا يَبصقون آنيتهم الذهبُ والفضة وأمشاطهم الذهب وَوَقودُ مَجامرهم الأَلُوَّةُ وَ رَشحُهم المسكُ. رواه البخاري(٣٢٤٦).

١-زمرة: جماعه، كۆمەڵ.

٢- ليلة البدر: شەوی چواردە.

٣- المخ: مۆخ ئەوەی لە ناو هێسك و ئێسقان دایە(ما في داخل العظم)

٤- ولا يمتخطون: چلم لە كەپوویان نایێ.

٥- الأمشاط: كۆیە تاكەكەی(المشط) واتە: شە، شانە.

٦- وَقود: سوتەمەنی، ئەو شتەی ئاگری پیٚ دەكەیەوە.

٧- الرشح: العرق، ئارەقە(رشحهم) ئارەقەیان.

واتە: یەكەم كۆمەڵ و دەستە كە دەچنە بەهەشت لەسەر ویٚنەی مانگن لە شەوی چواردەدا دەستەی دوای ئەوان وەك گەشترین ئەستیٚرە وان، دڵەكانیان وەكو دڵی یەك پیاو وایە نە جیاوازیءو ناكۆكیان لە نیٚواندا هەیە نە دەغەزو رقءو كینە، هەر یەكیٚك لەوان دوو هاوسەری هەیە هەر یەكیٚك لەم دوو هاوسەرە مۆخی ئیٚسقانی لاقی دەبینریٚ لە پشت گۆشتەكەیەوە لە جوانیدا بەیانی و ئیٚوارە یادو تەسبیحاتی خودا دەكەن، نەخۆش ناكەون وە چلم ناسرن وە تف ناكەن قاپەكانیان زیٚرو زیون وە شەیەكانیان زیٚرە وە سوتەمەنی بخوردانەكانیان عودە وە ئارەقەیان مسكە.

## سوود:

١-خوا دەفەرمویٚ﴿وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ﴿٤٨﴾﴾ (الحجر:٤٧-٤٨).

واتە: وە دادەڕنین هەر كینەو بوغزیٚك كە لە دڵیاندا بووبیٚ برای یەكترن بەرامبەر یەكترن لەسەر كورسی(٤٧) لەویٚدا ماندوو بونیان تووش نایەت وە هەرگیز لەو(بەهەشتە) دەرناكریٚن.

٢- شەهید(٧٢) حۆری پیٚ دەدریٚ هەر وەك لە فەرموودەی پیٚغەمبەردا هاتووە.

٣- هێندێك بەڵگە دەهێنینەوە كە بەهەشتیەكان لە دوو خێزان زیاتریان پێ دەدرێ.

## ئافرەتی بەهەشت زۆر بە شەوق و بۆن خۆشن:

عن أنس بن مالك عن النبيّ(ﷺ) أنَّهُ قال:(.... ولو أنَّ امْرأةً مِن أهلِ الجنّةِ اطّلعتْ إلى أهل الأرض لأضاءَتْ ما بينهما ولَمَلأَتْهُ ريحاً، ولَنَصيفُها على رأسها خيرٌ من الدنيا وما فيها) رواه البخاري(٢٧٩٦).

واتە: وە ئەگەر ئافرەتێك لە خەڵكی بەهەشت تەماشای زەوی بكات نێوانیان رووناك دەكاتەوە وە پری دەكات لە بۆن(ی خۆش) وە ئەو سەرپۆشەی كە لەسەریەتی باشترە لە دونیاو لەوەی تێیدایە.

## ژیانی جینسی لە بەهەشت:

١-عن أبي هريرة قال: قِيلَ يا رسول الله هل نصل إلى نسائِنا في الجنةَ؟ فقال: إنَ الرجلَ لَيَصلُ في اليوم إلى مِئَة عَذراء. صحيح: رواه الطبراني(الصغير:٧٩٥) والبزار(٣٥٢٥).

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێ: گوترا ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لە بەهەشتدا دەگەین بە ئافرەتەكانمان و لەگەڵیان جووت دەبین؟ فەرمووی: بێ گومان پیاو(لە بەهەشت) لە رۆژێكدا لەگەڵ سەت كچدا جووت دەبێت.

٢- عن أبي هريرة قال: قيل للنبيّ(ﷺ) أنطأُ في الجنة؟ قال: نعم والذي نفسي بيدهِ دحماً دحماً، فإذا قام عنها رجعت مطهرة

بكراً. حسن: رواه ابن حبان(٧٤٠٢) والبزار(٣٥٢٤).

واته: ئەبو هورەیرە دەڵێ: بە پێغەمبەر گوترا(ﷺ) ئایا لە بەهەشتدا جووت دەبین و جیماع دەکەین؟ فەرمووی: بەڵێ سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەستە جیماع لە دوای جیماع دەکەن هەرکە پیاوەکە کاری خۆی تەواو کرد ئافرەتەکە پاك دەبێتەوەو دەبێتەوە کچ.

٣- عن زيد بن أرقم قال: قال رسول الله(ﷺ) إنَّ الرَّجل مِن أهلِ الجنةِ لَيُعْطى قوةَ مِائَة رجلٍ فِي الأكلِ والشربِ والشَّهوةِ والجماع، حاجةُ أحدهم عرَق يفيضُ مِن جِلده فَإذا بطنهُ قد ضَمرَ. صحيح: انظر(صحيح الجامع:١٦٢٧).

واته: بێگومان پیاوێك لە خەڵكی بەهەشت هێزو توانای سەت پیاوی پێ دەدرێ لە خواردن و خواردنەوەو ئارەزوو و جیماع کردن پێداویستی یەکێك لەوان(بۆ سەر ئاوکردن) ئارەقەیە بە پێستیدا دێتە خوارەوە ئیتر زگی گچکە و سیس دەبێتەوە.

٤- عن أنس عن النبيِّ(ﷺ) قال: يُعطى المؤمن فِي الجنة قوةَ كذا وكذا فِي الجماع قيلَ يا رسول الله أَوَ يُطيق ذلك؟ قال: يُعطي قوةَ مئة. حسن صحيح: رواه الترمذي(٢٥٣٦).

واته: ئیماندار لە بەهەشت هێزو تاقەتی ئەوەندەو ئەوەندەی پێ دەدرێ بۆ جیماع کردن، گوترا ئەی پێغەمبەری خوا ئایا توانای ئەوەندەی هەیە؟(دیارە ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) باسی کردووە جیماعیکی زۆر بووە) فەرمووی(هەر پیاوەو) هێزی سەت زەلامی پێدەدرێ.

## حۆریانی بەهەشت بەرگری
## لە مێردەکانیان دەکەن لە دونیادا:

١-عن معاذ بن جبل عن النبيّ(ﷺ) قال: لا تُؤذي امرأةٌ زوجها في الدنيا إلاّ قالت زوجتهُ مِن حور العين لا تُؤذيه قاتَلك الله فَإنما هو عندكِ دَخيل يُوشِكُ أن يُفارِقَكِ إلينا. صحيح: رواه الترمذي(١١٧٤).

واتە: هیچ ئافرەتێك مێردەكەی ئەزیەت نادات لە دونیادا ئیللا خێزانە بەهەشتیەكەی لە(حور العین) پێی دەڵێ ئەزیەتی مەدە خوا بتكوژێ ئەوە لای تۆ میوانە زۆری نەماوە كە تۆ بەجێ بێڵێ و بگەرێتەوە بۆ لامان.

## ژن بۆ دوا مێردی دەبێت لە بەهەشت:

١-عن أبي الدرداء قال: قال رسول الله(ﷺ): أيُّما امرأةٍ تُوفىَ عنها زوجها فتزوجت بعده فهي لآخر أزواجها. صحيح: انظر(صحيح الجامع:٢٧٠٤).

واتە: هەر ژنێك مێردەكەی بمرێت و دوای ئەو شوو بكاتەوە بۆ دوا مێردی دەبێت(لە بەهەشت دا).

## دەتەوێت حۆریت بێ ژمار پێ بدرێت:

١-عن معاذ بن انس(رضي الله عنه) أنَّ النبيَّ(ﷺ) قال: مَنْ كَظَمَ غيظاً وهوَ قادرٌ على أنْ يُنْفِذَهُ دعاهُ الله على رؤوسِ الخلائقِ يومَ القيامةِ حتى يُخَيِّرَهُ من الحور العِين ما شاء. حسن: رواه

ابوداود(٤٧٧٧) والترمذي(٢٠٢٨).

واته: هەر یەکێك تورەیی یەك بخواتەوەو قوت بداتەوە، وە توانای ئەنجامدانیشی هەبێت و بتوانیٌ رقەکەی برێژیٌ، ئەوە لە رۆژی قیامەت خوا لەبەر چاوی خەڵك بانگی دەکات و دەیکا بەسەر پشك کە بە ئارەزووی خۆی لە(حور العین) هەڵبژێریٌ چەندی دەویٌ.

## خزمەتکارەکانی بەهەشت:

خوا دەفەرمویٌ﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا﴾ (الإنسان:١٩).

١-مخلدون:قال قتادة: اي لا يموتون وقيل: عُني ب(مخلدون)انهم دائم شبابهم لا يتغيرون عن تلك السن.

٢- لؤلؤاً منثورا: قال قتادة: مِن كثرتهم وحسنهم.

مانای ئایەتەکە:دەگەرێن بەسەریاندا نەوجەوانانی هەمیشەیی کاتێك بیان بینیت وا دەزانیت دانەی مرواری پرژاوون.

وە خوا دەفەرمویٌ﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ﴾ (الطور:٢٤).

واتە: وە دەگەرێن بە سەریاندا کورانی نەوجەوانی خۆیان دەڵیٌ ی مرواری ناو سەدەفن(لە جوانی و پاکی دا).

وە خوا دەفەرمویٌ﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ

﴿وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾﴾ (الواقعة:١٧-١٨).

١-معين: جارية من نهر لا ينقطع أبداً.

واتاى ئايەتەكان: تازە لاوى هەميشەيى بەسەرياندا دەگەڕێن(١٧) بە پەرداغ و دۆڵكە و گەلاَسى پڕ لە شەرابى سەرچاوەى ڕەوان(١٨).

١-عن انس قال: قال رسول الله(ﷺ): إنَّ أدنى أهل الجنةِ درجةً لمن يقومُ على رأسهِ عشرة آلاف خادم بيد كل واحدٍ صفحتان واحدة مِن ذهبٍ والأُخرى مِن فضة. أخرجه الطبراني وقال الهيثمي(المجمع:١٨٦٧٠) رجال ثقات.

واتە: بێگومان ئەوەى نزمترين پلەى هەيە لە بەهەشت دە هەزار خزمەتكار لاى سەريەوە وەستاوە هەر يەكێك لەوان دوو قاپى بە دەستەوەيە يەكێكيان لە زێڕو ئەوى تريان لە زيو.

٢- عن عبدالله بن عمرو قال: إنَّ أدنى أهل الجنّة منزلةً مَن يسعى عليه ألف خادم كلّ خادم على عملٍ ليس عليه صاحبه. صحيح: أخرجه البيهقي أنظر(صحيح الترغيب والترهيب:٣٧٠٥).

واتە: عبدالله كورى عەمر دەڵێ: بێگومان ئەو كەسەى لە نزمترين پلەى بەهەشدايە ئەوەيە هەزار خزمەتكار دێن و دەچن لە خزمەتكردنيدا هەموو خزمەتكارێك كارێك دەكات هاورێكەى ئەو كارە ناكات.

## باڵندەی بەهەشت:

خوا دەفەرموێ﴿وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ﴾ (الواقعة:٢١).

واتە: وە گۆشتی هەر باڵندەیەك كە حەزی لیّ بكەن.

١-عن انس قال: قال رسول الله(ﷺ) إنّ طير الجنّة كأمثال البخت يرعى في شجر الجنة فقال ابوبكر: يا رسول الله إنّ هذه لطير ناعمة فقال: أكلتها انعم منها-قالها ثلاثا- وإني لأرجو أن تكون ممن يأكل منها. حسن: رواه أحمد في(المسند:١٢٨٩٨).

واتە: بێگومان باڵندەی بەهەشت وەك حوشتری بوخت وایە(جۆرێكە لە حوشتر ملی زۆر درێژە) لە درەختی بەهەشت دەخۆن، ئەبوبەكریش ووتی: بە راستی ئەی پێغەمبەری خوا ئەو بالندانە نەرم و ناسكن ئەویش فەرمووی: ئەوەی دەیانخوات نەرم و ناسكترە-سیّ جار ئەوەی فەرموو- وە هیوادارم تۆ لەو كەسانە بیت كە لێیان دەخۆن.

**سوود**:

ئەبو ئومامە دەڵێت(إنّ الرجل من أهل الجنة ليشتهي الطير من طيور الجنة فيقع في يده منفلقاً نَضِجاً. (حسن موقوف).

واتە: پیاوێكی بەهەشتی حەز لە تەیرێك لە تەیرەكانی بەهەشت دەكات تەیرەكە دێتە ناو دەستی یەوە بە شەق كراوی و برژاوی.

## میوەو داروباری بەهەشت:

خوا دەفەرموێ﴿وَلَهُمۡ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ (محمد:١٥).

واتە: وە لەوێ هەموو جۆرە میوەیەکیان بۆ ئامادەیە.

وە خوا دەفەرموێ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي ظِلَٰلٖ وَعُيُونٖ ﴿٤١﴾ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٤٢﴾ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٤٤﴾﴾ (المرسلات:٤١-٤٤).

واتە: بێگومان پارێزکاران لە سێبەرو(قەراغی) کانیاوی زۆرن(٤١) وە لەناو میوەهاتێکدان کە حەزی لێ دەکەن(٤٢) پێیان دەڵێن) بخۆن و بخۆنەوە نۆشتان بێت بە هۆی ئەوەی کە دەتان کرد(٤٣) بێگومان ئێمە ئاوا پاداشتی چاکان دەدەینەوە(٤٤).

١-عن ابن عباس قال: قال رسول الله(ﷺ) إني رأيت الجنةَ فتناولتُ عُنقوداً ولو أصبتهُ لأكلتم منه ما بَقيتِ الدنيا وأُريتُ النار فلَم أرَ منظراً كاليومِ قَطُّ أفظعَ، ورأيت أكثر أهلها النساء قالوا: بم يا رسول الله؟ قال: بكُفرِهِنَّ، قيل: يكفرن بالله؟ قال يكفُرنَ العَشيرَ، ويكفرنَ الإحسانَ، لو أحسنتَ إلى إحداهُنّ الدّهرَ كُلَّه ثمَ رأت منك شيئاً قالت: ما رأيت منك خيراً قطُّ. رواه البخاري(١٠٥٢) ومسلم(٩٠٧).

واتە: بێگومان من بەهەشتم بینی جا دەستم برد بۆ هێشووە ترێیەك ئەگەر لێم بکردباوە بێگومان تا دونیا دەما هەر لێتان دەخوارد. وە ئاگرم نیشان درا قەت هیچ دیمەنێکی خراپترم وەکو ئەو رۆژە نەبینیوە وە بینیم

زۆربەی ئەوانەی کە تیایدا بوو ئافرەت بوون گوتیان بەچی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بە داپۆشینیان. گوترا: کوفر بە خوا دەکەن؟ فەرمووی: چاکەی مێریان دادەپۆشن وە چاکەش دەدەپۆشن، ئەگەر بە درێژایی زەمان چاکە لەگەڵ یەکێکیان بکەیت لە پاشان شتێکی لێت بینی دەڵێ: قەت هیچ خێرێکم لێت نەبینیوە.

٢- عن أنس بن مالك عن النبي(ﷺ) قال: إنّ في الجنة لشجرةً يسيرُ الرّاكبُ في ظلِّها مِئةَ عام لا يَقطعها. رواه البخاري(٣٢٥١) ومسلم(٢٨٢٦).

واتە: بێگومان لە بەهەشتدا درەختێ هەیە سوار سەد ساڵان لە سێبەرەکەی دەڕوات هێشتا نایبرێت.

## لە رووبارەکانی بەهەشت:

خوا دەفەرموێ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْكَبِيرُ﴾ (البروج:١١).

واتە: بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە بۆ ئەوان هەیە بەهەشتانێك کە رووباری زۆر بە ژێریان دا دەڕوات ئا ئەوەیە سەرکەوتنی گەورە.

وە خوا دەفەرموێ﴿مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ۖ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ

وَمَغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡۖ كَمَنۡ هُوَ خَٰلِدٞ فِي ٱلنَّارِ وَسُقُواْ مَآءً حَمِيمٗا فَقَطَّعَ أَمۡعَآءَهُمۡ﴾ (محمد:١٥).

واته: شێوەی ئەو بەهەشتە وایە کە بەڵێن دراوە بە پارێزکاران چەندەها ڕووباری تێدایە لە ئاوی تێك نەچوو وە چەندەها ڕووبار لە شیر کە تامی نەگۆڕاوە وە چەندەها ڕووبار لە ئارەقو شەرابێك کە خۆشو بەلەزەتە بۆ ئەوانەی ئەیخۆنەوە وەچەند ڕووبارێك لە هەنگوینی پاڵاوتەکراو وە لەویٚ لە هەموو جۆرە میوەیەك هەیە بۆ ئەوان لەگەڵ لێبوردن لە پەروەردگاریانەوە(ئایا ئەو بەهەشتیانە) وەکو کەسانێك وان کە لە ئاگری دۆزەخ دابن بە هەمیشەیی، وە ئاوێکیان دەرخوارد ئەدریٚ کە لە پلەی هەرە بەرزی گەرمیدایە کە ئەیخۆنەوە ریخۆلەکانیان پارچە چارچە ئەکات.

١-عن أبي هريرة عن النبيّ(ﷺ) قال: فإذا سألتُم اللهَ فسلُوه الفردوسَ فإنَّهُ أوسط الجنة وأعلى الجنة وفوقهُ عرش الرّحمن ومنهُ تَفجَّرُ أنهارُ الجنة. رواه البخاري(٧٤٢٣).

واتە: ئەگەر داواتان لە خوا کرد داوای فیردەوسی لیٚ بکەن چونکە ئەو ناوەڕاستی بەهەشتەو بەرزترین شوێنی بەهەشتە، وەسەرەوەی ئەو عەرشی خوایە وە لەوێوە ڕووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵن.

٢- عن عبدالله بن عمر قال: قال رسول الله(ﷺ) الكوثرُ نهرٌ في الجنّة حافتاهُ مِن ذهبٍ ومجراهُ على الدُّرِّ والياقوت تُربتهُ أطيبُ مِن المِسكِ وماؤهُ أحلى من العسل وأبيض من الثلجِ. صحيح: رواه الترمذي(٣٣٦١) وابن ماجة (٤٣٣٤).

واتە: کەوسەر رووبارێکە لە بەهەشت ئەملاو ئەولای لە زێرە شوێنی پێدا ڕۆیشتنی ئاوەکە لە دوڕو گەوهەرە خاکەکەشی بۆنی خۆشترە لە میسك وە ئاوەکەی لە هەنگوین شیرین ترەو لە بەفر سپی ترە.

**سوود**:

پێغەمبەر(ﷺ) لە مەیدانی مەحشەر حەوزێکی هەیە کە خوا پێی داوە ئوممەتەکەی ئاوی لێ دەخۆنەوە ئەم حەوزە ئاوی لەو رووبارەی بەهەشت بۆ دێ کە ناوی کەوسەرە.

## داوای بەهەشت کردن لە خوا:

١-عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله(ﷺ): من سألَ اللهَ الجنّةَ ثلاثَ مراتٍ قالتِ الجنّةُ: أللهمَّ أدخلهُ الجنّةَ ومَنِ استجارَ من النار ثلاث مَرّات قالتِ النار: اللهمَّ أجِرهُ مِنَ النار. **صحيح: رواه الترمذي(٢٥٧٢).**

واتە: هەر کەسێك سێ جاران داوای بەهەشت لە خوا بکات بەهەشت دەڵێ: ئەی خودایە بیبە بەهەشت وە هەر کەسێك سێ جاران خۆی لە ئاگر بپارێزێ ئاگر دەڵێ: ئەی خودایە بیپارێزە لە ئاگر.

٢- عن ابي هريرة قال: قال رسول الله(ﷺ): ما استَجارَ عَبدٌ مِنَ النّار سَبْعَ مَرّاتٍ إلاّ قالَت النارُ: يا رَبِّ إنَّ عَبدكَ فلاناً استَجارَ منّي فأَجرهُ، ولا سأَلَ عبدٌ الجَنَّةَ سَبْعَ مَرّاتٍ إلا قالَتِ الجنةُ ياربِّ إنَّ عَبدَكَ فلاناً سألَني فأدْخِلهُ الجنةَ. **صحيح: رواه أبو يعلي في المسند(٦١٩٤).**

واتـه: هـيچ بەندەيـەك خـۆى نەپاراسـتووه لـه ئـاگر حـەوت جـاران ئـيللا ئاگر گوتوويـەتى: ئـەى پـەروەردگارم فلانـه بەنـدەت خـۆى لـەمن پاراسـتووه جا تۆش بپارێزه وه هـيچ بەندەيـەكيش داواى بەهەشـتى نـەكردووه حـەوت جاران ئيللا بەهەشـت گوتوويـەتى: ئـەى پـەروەردگارم فلانـه بەنـدەت داواى منى كردووه جا تۆش بيبه بەهەشت.

# سەرچاوەکان


١ فتح الباري شرح صحيح البخاري
٢ شرح النووي على صحيح مسلم
٣ سنن أبي داود بتحقيق الالباني
٤ سنن الترمذي بتحقيق الالباني
٥ سنن النسائي بتحقيق الالباني
٦ سنن ابن ماجه بتحقيق الالباني
٧ صحيح الجامع الصغير للالباني
٨ رياض الصالحين بشرح ابن عثمين
٩ الترغيب والترهيب- منذري
١٠ نوسراوەکانی مامۆستا علی باپیر
١١ پوختـــەی تەفـــسیری قورئـــان مامۆستا محمد بامۆکی
١٢ صفة الصفوة-ابن الجوزي
جامع العلوم والحكم
١٣ القول المفيد على كتاب التوحيد- عثمين
١٤ موسوعة الاخلاق الاسلامية
١٥ الوجيز في فقه السنةوالكتاب العزيز
١٦ بە هەشت- محمد ملا فائق
١٧ فقة السنة- سيد سابق
١٨ تفسير الطبري
١٩ تفسير ابن كثير
٢٠ ايسر التفاسير
٢١ فەرهەنگی شیرین
٢٢ مختار الصحاح
٢٣ ريـــاض الـــصالحين –تـــاج/ وەرگێرانی نوری فارس
٢٤ سير اعلام النبلاء
٢٥ الاذكار –نووي
٢٦ صحيح البخاري – تحقيق – خليل مأمون
٢٧ الجواب الكافي – ابن القيم
٢٨ الزواجر – هيثمي
٢٩ الكبائر- ذهبي
٣٠- نیـــشانەکانی رۆژی دوایـــیو رووداوەکـــانی پـــێش هـــاتنی – مامۆستا هاوری
٣١- گەلێ سەرچاوەی تریش

# ناوەڕۆك